




# شەرحی ئاسان

## بەسەر (جمع الجوامع)ەوە

مەلا موسای بیارە

١٤٢٦ك - ٢٠٠٥ز بەرگی یەکەم

# شەرحی ئاسان

## بەسەر( جمع الجوامع )دوە

مەلا موسای بیارە

١٤٢٦ك- ٢٠٠٥ ز

بەرگی یەکەم - چاپی دووەم

بسم الله الرحمن الرحیم


- شەرحی ئاسان بەسەر ( جەمع الجوامع )ەوە
- نوسینی : مەلا موسای بیارە
- بەرگی یەکەم - چاپی دووەم
- چاپەمەنی سیما
- تیراژ: ( ٥٠٠ ) دانە.
- ژمارەی سپاردن : ( ٣٢١ )ی ساڵی ٢٠٠٣ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

## پێشەکی:

کتێبی (جمع الجوامع) لەزانستی (أصول الفقه)دا کلیلی خەزێنەی راوبۆچوونی هەموو زانایانی ئەهلی فیکرو فیقهە لەبەرئەوە دارشتنەکەی رەنگاڵەی چەندەها خاوەن فیکرە زۆر گرانە، بۆیە بەباشم زانی بەگوێرەی توانای خۆم شەرحێکی ئاسانی لێبکرێت و دەستگیری قوتابی سەرەتایی بێت بۆ لەسەرپێی خۆوەستانی. داواکارم لەهەموو رێزدارو فێرخوازێکی ئازیز کە:

یەکەم: چاوپۆشی لەهەڵەی چاپ بکەن.

دووەم: چاوپۆشی بکەن لەجۆری وەرگێرانەکەی چونکە زیاتر تەرجومەی حەرفیە لەبەرئەوەی بابەتێکی زانستی رووتە.

سێیەم: لایەنی تەندروستی مۆڵەتی نەدام لەپاش تەواوبوونی کۆمپیوتەر بەوردی پێداچونەوەی تێدا بکەم.

چوارەم: نزاو دوعای خێری زۆرم هەیە بۆ مامۆستا ئازیزەکانم هەموو ئەو برا خۆشەویستانەی یارمەتی دەرم بوون بۆ تەواو کردنی ئەم کتێبەو گەیشتنی بەدەستی ئێوەی رێزدار لەو بەرێزانە مامۆستا سجادی، کوڕانی حاجی ئەحمەد، کاک کامیل، ئەحمەدی کورم، کاک عەبدوڵڵا، کاک عومەر، مامۆستا محەمەد سەید نەجمەدین. هەرکەسێکی تری بەرێز بەهەر شێوەیەك یارمەتی دەرم بوون سەربەرزو ئاسودەو کامەران بن لەهەردوو دنیادا.

موسا حبیب کریم

پێشنوێژ لەمزگەوتی محەمەدی حاجی رەشید

سلێمانی - شەهیدانی ئازادی

٥ شعبان ١٤٢٤ك - ٢٠٠٣/١٠/١

## پێشەکی چاپی دووەم:

کتێبی (جمع الجوامع) لەوە بەناوبانگترە کەقسە لەسەر ناساندنی بکرێت، بەتایبەتی لەچوارچێوەی حوجرەکانی کوردستانو لەلای (مەلا) باشی ئەم نیشتمانە پێوەرێکی بنەڕەتی بوو لەڕووی وتنەوەی بەفەقێو خوێندنو لێتێگەیشتنی لەلایەن فەقێوە.. هەروەك لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی بەکتێبێکی دەگمەن سەیر کراوەو لەزۆربەی زانکۆکاندا بەشێك بووە لە (منهج) بەتایبەت لەئەزهەردا.

بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەقە شەرعیو یاساییەکان زانستی ئوسوڵ هێندە گرنگە وتراوە (هەر کەس ئاشنای – اصول الفقە – نەبێ متمانە بەزانستەکەی ناکرێت) لەلایەکی ترەوە ئوسوڵ گەورەترین دەروازەیە بۆ داخڵ بوونی عەقڵ بەزانستە ئیسلامیەکانو کرانەوەی لەگەڵیاندا، چونکە عەقڵ تەنها بنەمایەکە کەتەکلیفە خواییەکان دابەزنە سەریو لەوێوە بەرجەستە بکرێن لەژیانی رۆژانەدا.

کتێبی (جمع الجوامع) گەورەترین شاکاری بواری ئوصوڵە تا ئەمڕۆش بۆیە وادەبینم بەکوردی کردنی ئەم کتێبە لەلایەن مامۆستای زۆر بەڕێزو ئازیزەوە (مەلا موسای بیارە) هەنگاوێکی بوێرانە بووەو شەونخونیو رەنجو ماندووبوونی زۆری ویستووە، لای هەموو زانست خوازێکی کورد زمانو مامۆستایانو فەقێی حوجرەکان، جێگەی پێزانینو دەست خۆشیە، خوای گەورە نمویان زیادو زیاتر بکاتو بەرهەمو شاکاری باشتری بەدوادا بێتو جێگەی قبوڵی خوێنەرانی ئازیزو رەزامەندی خودای گەورە بێت.

مەلا ئەبوبەکر پێنجوێنی

٢٠٠٥/٣/١٠

## دیاری بێت:

*بۆ گیانی بەرزەفڕی گەورە مامۆستام (مەلا عبدالرحمن)ی خانەقای بیارە، ئەو مامۆستایەی کەبەبێ هیچ کرێو پاداشتێکی (من) فێری قورئانو ڕێگەی زانستە شەرعییەکانی کردم. لەگەڵ چەند گەنجێکی تری بیارەدا.

*ئەو مامۆستایەی کەژیانی دنیای لەچوار دیوارێکی تاریكو متوازیعدا گوزەراند، بەڵام هەمیشە چاوی بڕیبووە پلە بەرزەکانی بەهەشتو پشودانو حەسانەوەی بۆ ئەوێ هەڵگرتبوو.

*بۆ گیانی گەورە شێخی خاوەنی خانەقا، شێخ (ضیاء الدین)ی عەودالّی زانستو پەناگەی مەلاو فەقێ. بۆ شێخ (نجم الدین)ی دنیا نەویستو شێخ (علاء الدین)ی موجاهید کەخانەقای بیارەیان کردبووە سەفارەتی بەهەشت. لەو سەردەمەداو مەلا (عبدالرحمن)ی گەورە مامۆستای منیش یەکێك بوو لەوەرگرانی جەواز لەو خانەقایەدا (خوایە بەگومانی منیان لەگەڵ بکە).


## سوپاسو پێزانین

لەبەپایان گەیشتنی ئەم بەرهەمەدا بەپێویستی دەزانم کەڕێزو سوپاسی زۆرم ئاراستەی ئەم مامۆستا ئازیزانە بکەم:

مامۆستا مەلا (عبدالرحمن)ی سجادی، مامۆستا (محەمەد نجم الدین)، مامۆستا مەلا (عبدالله) پێشنوێژی مزگەوتی ئەبوبەکری سدیق، مامۆستا مەلا (محەمەد) خەڵکی کوردستانی ئێران، مەلا (ئەبوبەکر) پێنجوێنی.

ئەم بەڕێزانە هەریەکەیان بەجۆرێك هاوکاریان کردووم لەخوای گەورە دەخوازم پاداشتی چاکەیان بداتەوەو ئەم بەرهەمەش لەمن قبوڵ بکات.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله على[1] إفضاله والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله[2] هذا ما اشتدت اليه حاجة المتفهمين لجمع الجوامع[3] من شرح يحلُّ ألفاظه[4] ويبيّن مراده[5] ويحقق مسائلَه[6] ويحرّرُ دلائله[7] على وجه سهل للمبتدئين[8] حسنٍ للناظرين[9] نفع الله به آمين[10] قال المصنف رحمه الله تعالى[11] {بسم الله الرحمن الرحيم نحمدك اللهمّ}[12] اي نصفك بجميع صفاتك يا الله إذ الحمد كما قال الزمخشري في الفائق الوصف بالجميل[13]

---

(١)سوپاس و ستایش لایق بە خودایە (٢)-حەمدیشی دەکەین لەسەر ئەوەی هەرچی نیعمەتێکی بەخشیوە بە خەڵك بەبێ ئیستیحقاقە -إفضال- واتە: چاکە کردنێك لەروی ئیستیحقاقەوە نەبێ، هەموو رەحم و بەزەییو میهرەبانیەك: کە شایستە بێ بۆ مەقامی حەزرەتی رەسول، لەگەڵ هەموو ئەمین بونێکی دونیا و دینی، بۆ سەر گەورەی ئێمە حەزرەتی محمدﷺو ئەوانەی شوێن کەوتەی ئەون.

(٣)ئەمەی کە لەمەودوا دێ چەند مەسائیلێکن ئەوانەی دەیانەوێ لە (جمع الجوامع) بگەن زۆر پێویستیان پێیان هەیە (٤)جا ئەو مەسائیلانە بریتین لە شەرحێك هەر گرێیەك لە لەفزەکانی (جمع الجوامع) دا هەیە دەیان کاتەوە (٥)وە ئەو شەرحە چ مەبەستێکی (جمع الجوامع) هەبێ رونی دەکاتەوە (٦)وە هەرچی مەسائیلی (جمع الجوامع) هەیە بەبەڵگەوە دەیان سەلمێنێ (٧)وە هەرچی بەڵگەو دەلیلی (جمع الجوامع) هەیە پاڵفتەی دەکات ئەوەی شایستە نەبێ لای دەبا (٨)- ئەو حەلل و تەبینو تەحقیق و تەحریرە - لەسەر شێوازێکی سەهل و ئاسانە بۆ قوتابیانی سەرەتایی أصول - شارح چونکە خۆی زۆر زانا بووە ئەم (جمع الجوامع) ەی زۆر بە ئاسان داناوە بەنیسبەت توانایی خۆیەوە (٩)ئەم شەرحە بۆ ئەوانەی لێی وردەبنەوە زۆر جوانە (١٠)خوایە بەهۆی ئەم شەرحەوە سودو قازانج بەخەڵك ببەخشە، خوایە لێم قبوڵ بفەرموی و بێ‌ی‌بەدەممەوە.

(١١)دانەری (جمع الجوامع) رەحمەتی خوای لەسەر بێ وتویەتی (١٢)(بسم الله الرحمن الرحيم) دەست دەکەم بەدانانی ئەم کتێبە، داوای یارمەتیو کۆمەکی لە(الله) دەکەم کە خوایەکی رەحمان و رەحیمە، حەمدو ثەناو سوپاسیشت دەکەم ئەی خوایە.

(١٣)-(نحمدك) یانی (نصفك) چونکە ناوی هیچ سیفەتێکیشی نەبردوە حەمدەکە بۆ (ئیستیغراقە) واتە: ئەی خوایە؛ ئێمە تۆ تەوسیف ئەکەین بە هەموو سیفاتی بەرزی

وكلٌ من صفاته تعالى جميلٌ[1] ورعاية جميعها أبلغ في التعظيم[2] المراد بماذكر[3] إذ المراد به إيجاد الحمد لا الإخبار بأنه سيوجد[4] وكذا قوله نصلي ونضرع المراد به إيجاد الصلاة والضراعة لا الإخبار بأنهما سيوجدان[5] واتى بنون العظمة[6] لإظهارِ ملزومِها الذي هوَ نعمةٌ[7] من تعظيم الله له بتأهيله للعلم[8] إمتثالاً لقولهِ تعالى: ﴿ وأمّا بنعمة ربّك فحدّث ﴾[9]

---

خۆت وەك ڕەززاقیەت و عالمیەت و قادریەت، جابۆچی حەمد تەوصیف کراوە بە (جمیع الوصف) ؟ ئەمیش دەڵێ: چونکە حەمد کردن وەك زومەخشەری لە کتێبی (الفائق)دا ووتویەتی: وەسف بە جەمیلە (١)بۆنموونە: ئەگەر وتت: ئەو کابرایە عالمەو جوانەو بەتوانایە ئەوە حەمدت کردوە، دەخۆ سیفاتیخوا هەموویان جەمیل و جوانن (٢)کەوابوو منیش تەوسیفی خوا بەهەموو سیفاتی دەکەم ، جا کەسێك بڵێ: خۆ دەبوو وەصف کردنەکە بەیەك سیفەت جیٚبەجیٚ ببیٚ؟ ئەمیش دەڵێ: ئاخر ئەگەر ریعایەتی هەموو سیفاتی خوا بکریٚ، ئەوە ئەو پەڕی تەعزیمو مەقامی خوا بەگەورە زانینە. (٣)تەعزیمێکی وەها کە مەبەست بە (نحمدك) هەر ئەوەیە: کە مەقامی پڕ شکۆداری خوا بەبوڵند گریٚ (٤)-ئەو تەعزیمو بەگەورە گرتنە بەهەمویان دروست دەبیٚنەك بە یەکێکیان چونکە (الله) یانی زاتێك! کەخاوەنی هەموو سیفاتی بەرزبیٚ. یەکێك پرسیاربکا و بڵێ: کەی عەزەمەت لەحیکایەت دایە؟ ئەمیش دەڵێ: من حیکایەت ناکەم من خۆم حەمدو سوپاسی خوا دەکەم – چونکە مەبەست بەو حەمدە یانی خۆم تەوصیفی خوا بە هەموو سیفاتی بەرز دەکەم نەك هەواڵدان بیٚ کە زیدو بکر حەمدی خودا دەکەن (٥)هەر وەك ئەمە کە لەمەودوا دانەر دەڵێ: (نصلّي و نضرّع ) مەبەست پیٚی خۆم داوای بەزەییو میهرەبانی خودا دەکەم نەك هەواڵدان بیٚ بەوەی کەسەلات و تەزەروع لەمەودوا لەلایەن خەڵکەوە ئەکریٚت– واتە: ئەمانە جوملەی ئینشائین نەك ئیخبارین ئیخبار عەزەمەتی تیانییە. حەمد بەجوملەی فعلیە عەزەمەتی تیایە. (٦)ئەی بۆ نەیوت: (أحمدك) بۆ وتی: (نحمدك) ؟ فعلی مضارع بە نون و مەبەست یەك کەس بیٚ بۆ عەزەمەتە (٧)جا کەی خۆ بەزلزانین ڕەوایە؟ فەرمووی (لإظهار ملزومها) – بۆ دەرخستنی مەلزومی عەزەمەتە– ئەو مەلزومەیش گەورییە (٨)مەلزومەکەش بریتیە لەوەی: کەخوا ئەمی گەورە کردوەو کردویەتی بە ئەهلی ئەم عیلمە (٩)–لازم عەزەمەتی مەقامی(الله)یە مەلـــزومیش گەورەکردنی ئەمەیە تۆ ئیعتیراف بە عەزەمەتی خوا بکەی خوایــش تۆ بەرز ئەکاتــەوە، مەبەســت ئەوە نیە خــۆی بەگەورە بــزانیٚ، مــەبەســت ئەوەیە: ئەم عەزەمەتە خوا کــردویــەتی... واتە

وقال ماتقدّم، دون نحمَدُ الله الأخصر منه[1] للتلذذ بخطاب الله وندائه[2] وعدَلَ عن الحمد لله الصيغة الشائعة للحمد[3] إذ القصد بها الثناء على الله تعالى بأنّه مالك لجميع الحمد من الخلق[4] لا الإعلام بذلك[5] الذي هو من جملة الأصلِ في القصد بالخبر من الإعلام بمضمونه إلى ماقاله[6] لأنّه ثناءٌ بجميع الصفات[7] برعاية الأبلغيةِ كما تقدّم[8]وهذا بواحدةٍ منها[9] وإن لم تُراع الأبلغيةُ هناك[10] بأن يُراد الثناءُ ببعض الصفات[11]

---

خەڵكینە؛ بزانن: خوا منی گەورە كردوە . جا لەبەرچی ئەم نیعمەتە دەردەخا؟ لەبەر فەرمانبەرداریی ئەو فەرموودەی خودا: كە فەرموویەتی: ﴿ وامّا بنعمة ربّك فحدّث ﴾ باسی ئەو نعمەت و چاكانە بكە: كە خودای خۆت لەگەڵی كردوی (١)دانەر رستەی (نحمدك اللهمّ)ەی هێناو نەیوت: (نحمد الله) كە ئەم لەوەی خۆی كورت تر بوو (٢)لەبەر لەزەت وەرگرتن بوو بە گفتوگۆكردن لەگەڵ خودا بەشێوازی روبەڕوی كە كافی ختابەكە دەیگەیەنێ و هاوار لێكردنی كە (نداء)ەكە ئاماژەی پێدەكا.

(٣)–لەلایەكیترەوە صیفەتی غائب ئەم لەزەتەی تێدا نیە لەم شوێنەدا. دانەر لای دا لە (الحمد لله) كە رستەیەكی بلاْوە بۆ سوپاسكردنی خودا (٤)–چونكە– مەبەست بەو وشە بلاْوە سوپاس كردنی خوایە و وەسف كردنیەتی بەوە كە خوا خاوەنی هەموو حەمدو وەصف كردنێكە لەلایەن خەڵكەوە بكرێ (٥)– نەك مەبەست – خەڵك ئاگاداركردن بێ بەوە خوا خاوەنی هەموو حەمدێكە. (٦)كە ئەم ئاگاداركردن و (إعلامە) یەكێكە لە ئەفرادی قاعدەی هەواڵ–، كە وتت هەواڵ، گشت گیرە بۆ اعلام بۆ ئیخبار، جاری وا هەیە مەبەست بە(خبر)(إعلام)ە جاری وایش هەیە هەواڵدانە بەبەرامبەر كە (إعلام) بە (مضمون)ی خبر بەشێكە لە (خبر) جا دانەر لەرستەی مەشهوری (حمد) كردن لای دا: كە(الحمد لله)یە بۆ ئەوەی خۆی وتی: (نحمدك) واتە: لەجوملەی اسمیەوە لایدا بۆ جوملەی فعلیە. ئەصل لە خەبەردا ئیفادەی حوكمە بە موخاتەب كە ئیفادەی خەبەری پێئەڵێن بەلاْم (إعلام)یموخاتەب بە حكم لازمی فائدەی خەبەرە. (٧)چونكە ئەو حەمدەی كردویە سوپاس و تەوسیفی خوایە بەهەموو سیفەتەكانی نەك تەنها یەك سیفەت كە خاوەنیەتیە (٨)(الحمدلله) دەیگەیەنێ ئەمەش بەهۆی ریعایەت و رەچاوكردنی ئەبلەغیەتێك: كەلەمەو پێش ئاماژەی پێكرا (الحمدلله)تەنها یەك وەسفە لەو سیفاتانە (٩)(نحمدك) توسیف بە هەموو سیفات ئەگەیەنێكاتێ رعایەتی (١٠)ئەی ئەگەر موراعاتی ئەبلەغیەت نەكرێ لە(نحمدك)دا (١١)بەم شێوە كە ئیرادەی سەنای خوا بكرێ بەهەندێ سیفات. ئەبلەغیەت بكرێ .

فذلك البعض أعمّ من هذه الواحدة[1] لصدقه بها[2] و بغيرها الكثير[3] فالثناء به أبلغ من الثناء بها في الجملة أيضاً[4] نعم الثناء بها من حيث تفصيلها أوقع في النفس من الثناء به[5] {على نعمٍ}[6] جمع نعمة بمعنى إنعام[7] والتنكير للتكثيرو التعظيم[8] اي إنعامات كثيرة[9] منها الإلهام لتأليف هذا الكتاب والإقدار عليه[10] وعلى صلة نحمد[11] و إنّما حمد على النِّعم اي في مقابلتها لامطلقاً[12] لانّ الأول واجب والثاني مندوب[13] وَ وَصف النِّعم بما هو شأنها بقوله{يوْذنُ الحمدُ} عليها {بازديادها}[14] اي يعلم بزيادتها[15]

---

(١)ئەو كاتەش ئەو هێندە هەر گشتگیرو زۆرترێکە تا ئەم تاکە سیفەتە کە خاوەنیەتیە (٢)چونکە: کە وتت هەندێ کۆمەڵێك صیفات دەگرێتەوە ئەو تاکەشی تیادایە (٣)زۆرێکی تریش جگە لەو تاکە هەر دەگرێتەوە. (٤)کەوابوو وەسفکردنی خوا بە بەعزێك صیفات رەوانترە لەستایش کردنی بەوەسفێکی(في الجملة)دوبارە.

(٥)بەڵێ ستایش کردن بەیەك وەسف لەجێیکدا دیاری بکرێت لەدەروىدا زیاتر جی‌ی خۆی دەکاتەوە هەتا ستایشێك بەهەندێکی نادیار. (٦)خوایە حەمدی تۆ دەکەم لەسەر چەندەها نیعمەت (٧)نیعمەت بە (معطى) دەڵێن ، حەمدیش لەسەر زات دەکرێ نەك لەسەر فیعل- واتە حەمدی تۆ دەکەم لەسەر چاکە لەگەڵ کردنەکانت نەك لەسەر دەست و چاوو ئەندامەکانی تر – بۆیە دەڵێ لەسەر بەخشینی نیعمەتەکان واتە بەخشیشەکانت (٨)وشەی(نعم) کە بەشێوەی کۆو تەنکیر هێناویەتی تەنکیرەکە بۆ ئەوەیە کە نیعمەتەکان زۆرن زۆر گەورەشن. (٩)واتە بەخشیشەکان زۆرن لە ژمارە نایەن و گەورەن (١٠)کە یەکێك لەو نیعمەتانە ئەوەیە دانانی ئەم کتێبەت خستنە دڵی منەوە، یەکێکی‌تر ئەوەیە من توانام نەبوو تۆ توانات پێ بەخشیم هێزم شکا بەسەریدا (١١)واتە على (متعلقة) بە (نحمد)ەوە (١٢)علەتی حەمدەکەیە واتە لەخۆمەوە ستایش ناکەم، ئەوەندە توانام نی‌یە بەڵکوو بەهۆی نیعمەتەکانەوەیە، جا خۆ عاقڵ و ژیر ئەوەیە خزمەتی خەڵکی بکا بەبێ نعمەت بەخشیش، بۆیە حەمدی لەبەرامبەر نعمەتەکانەوە کردوە نەك حەمدی (مطلق) واتە بێ(مقابل).

(١٣)حەمد لەسەر نعمەت واجبە بەبێ (مقابل)ی نعمەت سوننەتە (١٤)ئەگەر هەر (نحمدك اللّهمّ) بوتایە خێری‌سوننەتەکەی بوو بەس ،واتە جوملەی (یؤذن الحمد) سیفەتی (النّعم)ە، دەخۆ ئەم وەسف کردنی(النّعم) بەشێکە کەکاروشوغلی خۆیەتی، وەك وەسف کردنی ئاگرە بەگەرمی کەکاری خۆیەتی، حەمد لەسەر نعمەتیش کارو پیشەی خۆیەتی کە زیاد دەبێ. (١٥)واتە هەواڵ دەدات بە زیاد بوونی نعمەتەکان.

لأنّه متوقف على الإلهام له و الإقدار عليه[1] وهما من جملة النّعم[2] فيقتضيان الحمد[3] وهو مؤذن بالزيادة المقتضية للحمد ايضاً[4] وهلمّ جرّاً[5] فلا غاية للنّعم[6] حتّى يوقف بالحمد عليها[7] ﴿ وإن تعدّوا نعمة الله لاتحصوها ﴾[8] وازدادَ وزادَ اللازم مُطاوعا زاد المتعدي[9] تقول زاد اللهُ النعمَ عليّ فازدادتْ وزادتْ[10] {ونصلّي على نبيّك محمّدﷺ}[11] من الصلاة عليه المأمور بها[12] وهي الدّعاء بالصّلاة اي الرحمة عليه[13] اخذاً من حديث أمرنا الله انْ نصلّي عليك فكيفَ نصلّي عليكَ؟ قال: قولوا اللّهمّ صلّ على محمّدٍ الخ رواه الشيخان إلاّ صدره فمسلم[14] والنبيّ إنسان أوحي اليه بشرعٍ وإنْ لمْ يُؤمر بتبليغه[15]

---

(١)چونكه حەمدی بۆ ناكریٚ تا نەخریٚتە دڵیەوە، وەهەتا هیٚزی پیٚ نەدریٚ توانای بەسەر حەمد كردندا ناشكیٚ (٢)(إلهام و إقدار) یش هەردوكیان لەریٚزی نعمەدان (٣)دە ئەوانیش هەردووكیان داخوازی ئەوە ئەكەن حەمدیان لەسەر بكریٚ (٤)حەمدەكەی ئەوانیش هەواڵی چەندەها نعمەتی تر ئەدات كە ئەوانیش داخوازی حەمدن دوبارە (٥)هەروەها هەموو تاكە نیعمەتیٚك دوو نعمەت لەگەڵ خۆیدا رادەكیٚشیٚ. (٦)كەوابوو نعمەت لەبن نایەن (٧)تا ستایش لەسەر ئەو نیعمەتانە كۆتایی پیٚبیٚ (٨)ئەی ئەوەنیە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وإن تعدّوا نعمة الله لاتحصوها ﴾ ئەگەر بتانەویٚ نعمەتی خوا بژمیٚرن كۆتایی ژمارەیان نایێن (٩)فعلی (إزداد)و فعلی(زادَ)ی لازم هەردووكیان(مطاوع)ی (زاد) ی موتەعەددین(زاد المتعدي) (١٠)وەك بڵیٚت خوا نیعمەتەكانیلەسەرم زیادكردوە ، ئەوانیش (فإزدادتْ و زادتْ) قەبوڵی زیادبونیان كردووە زیاد بوون.

(١١)خودایە داوا دەكەین رەحمەتی خۆت بریٚژی بەسەر پیٚغەمبەری خۆت دا كە محمدەﷺ (١٢)لەو سەلات و رەحمەتەی بەسەردا بریٚژی كە فەرمانی پیٚكراوە بەئایەتی ﴿صلّوا عليه وسلّموا تسليماً﴾ (١٣)كە بریتیە لە دوعاو داوای رژاندنی رەحمەت و فەرو میهرەبانی بەسەر پیٚغەمبەردا (١٤)لەچی وەرگیراوە كە فەرمانمان پیٚدراوە ، وەرگیراوە لەفەرموودەی: (امرنا الله ...الخ) واتە فەرمانمان پیٚكراوە داوابكەین خوا رەحمەتت بەسەردا بریٚژیٚ، ئایا چۆن بۆت داوابكەین ؟ فەرمووی: بڵیٚن: خوایە رەحمی خۆت بریٚژە بەسەر محمد داﷺ بوخاریو موسلیم هەردوكیان ریوایەتیان كردوە جگە لەسەرەتای فەرموودەكە نەبیٚ هەر موسلیم ریوایەتی كردوە: (امرنا الله انْ نصلّي عليك)یە. (١٥)نەبی: بەكەسیٚك دەوتریٚ لەریٚگەی وەحیو نیگاوە شەرع و ریٚبازیٚكی بۆ هاتبیٚ بافەرمانی پیٚ نەدرابیٚ بە گەیاندنی بە خەڵك.

فإن أُمرَ بذلكَ فرسولٌ ايضاً[١] او وأمر بتبليغه ولم يكن له كتاب او نسخٌ لبعض شرع من قبلَهُ كيوشع[٢] فإن كان له ذلك فرسولٌ ايضاً[٣] قولان فالنَّبيُّ اعمَّ من الرسول عليهما[٤] وفي ثالث انهما بمعنىً وهو معنى الرسول على الأول المشهور[٥] وقال: نبيّك دون رسولك لأنّ النّبيَّ اكثر استعمالاً[٦] ولفظه بالهمزة من النبأ اي الخبر[٧] لأنّ النّبيّ مخبرٌ عن الله[٨] وبلا همز وهو الأكثر[٩] قيل إنه مخفف المهموز بقلب همزته ياءً[١٠] وقيل إنّه الأصل من النَّبوة بفتح النون وسكون الباء اي الرفعة[١١] لأنّ النّبيَّ مرفوع الرتبة على غيره من الخلق[١٢] ومحمد علم منقول من إسم مفعول المضّعف[١٣] وسمِّيَ به نبينا بإلهامِ من الله تعالى تفاؤلاً بأنّه يكثرُ حمدُ الخلقِ لهُ لكثرةِ خصالهِ الجميلةِ[١٤] كما رُوِيَ في السير انّه قيل لجدّه عبدُ المطلب وقد سمّاه في سابع ولادته لموتِ ابيهِ قَبلها[١٥] لِمَ سمّيتَ إبنك محمّداً و ليس من اسماء آباءك ولا قومك[١٦]

---

(١)ئەگەر فەرمانی پێدرابێ بەگەیاندنی ئەوە رەسولیشە (٢)یاخود فەرمانیشی پێدرابێ بەگەیاندنی بەڵام کیتابی نەبۆ بێ نەسڕینەوەی هەندێ ڕێبازی پێش خۆی وەك حەزرەتی (یوشع) (٣)ئەگەر ئەوەی هەبێ ئەوە رەسولیشە دووبارە وەك نەبییە، (٤)جا ئەم دوو پێناسە دوو قەولن، کەوابوو وشەی (النّبيُّ) گشتگیرترە لە(الرسول) لەسەر بڕیاری هەردوو قەولەکە (٥)لەقەولێکی سێهەمدا هەردووکیان یەك پێناسەیان هەیە یەك واتایان هەیە کە بریتیە لە مانای رەسول لەسەر پێناسەی قەولی یەکەم کە ئەو پێناسەیە مەشهورە. (٦)جاخۆ پێغەمبەری ئێمەﷺ (رسول)ە بۆچی وتی: (نُبيِّك)؟ چونکە وشەی (النَّبيَّ) زۆرتر بەکاردێ (٧)وشەی (النَّبيَّ) کە حەرفی کۆتایی هەمزەبێ لەوشەی (النبأ) وەرگیراوە بەواتای (الخبر) واتە هەواڵ (٨)چونکە پێغەمبەر ﷺ هەواڵ بەخەڵکی دەدات لەلایەن خواوە (٩)بەبێ هەمزە وشەی (النَّبيَّ) زۆرترە (١٠)وتراوە (النَّبيَّ) موخەففەفی (مهموز)ە (النَّبأ) هەمزە کراوە بەیێ ئینجا پیتی یێ لە یێ دا دەغم کراوە بووە بە(النَّبيَّ) (١١)وتراوە ئەصلەکەی لە (النَّبوة) بەمانا بڵندیە (١٢)چونکە مەقامی پێغەمبەرﷺ بەرزترە لەپلەی هەموو دروستکراوەکانی تر (١٣)محمد ناوێکە وەرگیراوە لە(اسم مفعول) ی بابی (تفعيل)-(مفعَّل) (١٤)پێغەمبەرمان ناونراوە بە محمدﷺ بەهۆی الهامێك کە لەلایەن خواوە بووە بەهیوایی ئەوە: کە خەڵك ستایشی زۆری بکەن لەبەر زۆری سیفاتی پەسەندکراوی جوانی (١٥)وەك لە ژیاننامەدا ریوایەتکراوەوە دەڵێن: بە (عبد المطلب)ی باپیری گوتراوە کە لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بونیدا ئەو ناوی نا، (١٦) چونکە مردنی باوکی پێش لەدایك بوونی بووە، بۆ کوڕەکەت ناوناوە محمد؟ لە کاتێکدا ئەو ناوە لەنێوان باپیران و خزمەکانتان دا نیە.

قال: رجوت أن يُحمد في السماء والأرض وقد حقّق الله رجاءه كما سبق في علمه تعالى[1] {هادي الأمّة لرشادها} أي دالها بلطف{لرشادها} يعني لدين الإسلام[2] الذي هو لتمكّنه في الوصول به إلى الرشاد وهو ضدُّ الغنى كانّه نفسه[3] وهذا ماخوذ من قوله تعالى: ﴿ وإنّك لتهدي الى صراط مستقيم ﴾ اي دين الإسلام[4] {وعلى آله}[5] هم كما قال الشافعيﷺاقاربه المؤمنون من بني هاشم و المطلب إبني عبدمناف[6] لأنهﷺ قسّم سهم ذوي القربى وهو خمس الخمس بينهم تاركاً منه غيرهم من بني عمّيهم نوفل و عبدشمس مع سؤالهم له رواه البخاري[7] وقال إنّ هذه الصدقات إنّما هي اوساخ الناس و إنّها لاتحلُّ لمحمد ولا لآل محمد رواه مسلم[8] وقال لااحلّ لكم اهل البيت من الصدقات شيئاً ولا خسالة الأيدي[9] إنّ لكم في خمس الخمس مايكفيكم او يغنيكم اي بل يغنيكم رواه الطبراني في معجمه الكبير[10]

---

(١)وتی:بەو هیوایە لەئاسمان و زەویدا ستایش و باسی چاکەی بکرێ (٢)بێگومانیش خوا بەتەواوی هیواکەی هێنایەجێ. بەو شێوەش لە عیلمی خوادا تێپەڕی کردبوو (٣)محمدێك کە ڕێنموونیگەری میللەتە واتە ڕێ پیشاندەری گەلە بەنەرم ونیانی بۆ ئاینی ئیسلام بۆ دینی ئیسلام پیێ ئەووترێ: (رشد) چونکە ڕوشد یانی گومڕا نەبوون و گەیشتن بەمەتڵەب (رشد) دژی گومڕایە، ئیسلام خودی ڕوشدە، واتە: ئیسلام خودی گەیشتن بەمەتڵەبە (٤)ئەمەی من دەیڵێم: کە پێغەمبەر ڕێپیشاندەری خەڵکە بۆ ئیسلام وەرگیراوە لەفەرموودەی خوا: کە دەفەرموێ: بێگومان تۆ پێغەمبەری ڕێنموونی گەری خەڵکی بۆ ئاینی ئیسلام.

(٥)خوایا ڕەحمو بەزەییت بڕژێنی بەسەر ئالی محمدا. (٦)ئەوانیش وەك شافیعی فەرموویەتی بریتین لە خزمە موسوڵمانەکانی ئەوانە کە نزیکن بە پێغەمبەرەوە لەنەوەی هاشم و مطلب کە هەردوکیان کوڕی عبدمەنافە. (٧)چونکە پێغەمبەر ﷺ بەشی (ذوي القربى)ی دابەش کرد کە بریتیە لە (خمس الخمس)١\٥ بەشی دایە ئەو دوو بەرەمامەیە، بەرە مامەکانی تری بێبەش کردن وەك نەوەی هەردوو مامی: نوفل و عبدشمس لەگەڵ ئەوشدا داوایان لێکرد بخاری گێڕاویەتیەوە (٨)فەرمووی: ئەم هەموو زەکات و صەدەقەیە چڵك و پیسی خەڵکە حەلاڵ نییە بۆ محمد ﷺ و ئالی محمد مسلم ئەم فەرموودەیی گێڕاوەتەوە (٩)وەفەرموویەتی هیچ شتێك لەصەدەقات بۆتان ڕەوا نابینم ئەی ئال و بەیتی محمد هەتا ئەندازەی ئەوەی دەستی پیێبشۆری بەڕەوای نازانم بۆئال وبەیت. (١٠)چونکە ئێوە لە(خمس الخمس)دا ئەوەندەتان هەیە کەبەشتان بکات یاخود دەوڵەمەنتان بکات ، واتە: نەك بەشتان بکات بەڵکو دەوڵەمەنتان بکات

والصّحيح جواز إضافته الى الضمير كما استعمله المصنف[1] {وصحبه}هو اسم جمع لصاحبة بمعنى الصّحابي وهو كما سيأتي من اجتمع مؤمنا بسيدنا محمد ﷺ[2] وعَطَف الصّحب على الآل الشامل لبعضهم لتشمل الصّلاة باقيهم[3] {ما}مصدرية ظرفية {قامت الطروس}اي الصحف جمع طِرس بكسر الطاءِ {والسطور}[4] من عطف الجزء على الكل صرّح به لدلالته على اللفظ الدالّ على المعنى[5] {لعيون الألفاظ} اي المعاني التي يدلّ عليها باللفظ ويهتدي بها كما يهتدي بالعيون الباصرة[6] وهي العلم المبعوث به النَّبيَّ الكريم[7] {مقام بياضها}اي الطروس {وسوادها}اي سطور الطروس[8]

---

طبراني له معجم الكبيردا گێڕاويەتيەوە (١)ئايا كە ئال بۆ ئەشراف بەكاردێ دروستە ئيزافە بكرێ بۆ لای زەميرێ كە شاراوەو مەخفی دەگەيەنێ؟ ئەميش دەڵێ : قەول و رای دروست ئەوەيە دروستە ئيزافەی ئال بكرێ بۆ لای زەمير ئەوەتا دانەری ئەم كتێبە وای كردوە، واتە: دانەر ئيزافەی ئالی كردوە بۆ لای زەميری شاراوە. (٢)وە رەحمەتی خۆت برژێنی بەسەر هاوڕێيانی پێغەمبەرداﷺ صحب ئيسمی جمعی (صاحبة) نەك (مطلق الصاحب) ئەويش بەمانای (صحابيّ) كە بريتيە: -وەك لەمەودوا باسی دێ- كەسێكە لە حاڵی ئيمانداريدا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ كۆبوبێتەوە (٣)چونكە ئال هەندێ لە هاوەڵان دەگرێتەوە، بۆيە عەتفی كردوە، بۆ ئەوەی دوای بارينی رەحمەتەكە گشتگيربێ بۆ هاوڕێكانی تری كە ئال نين. (٤)(ما) كە مەسدەرييە، واتە: جوملەكەی دوای خۆی دەكا بە تەئويل مەسدەر وە هەروەها (ما) كە زەرفييە، واتە زەمان موقەدەر ئەكرێ (الطروس) واتە: كاغەز بەلأم كاغەزێك لێی نوسرابێ نەك هەموو كاغەزێك (السطور) واتە دێڕەكان ، واتە هەتا كاغەزو دێڕ مابێ رەحمو بەزەيی خوا بڕژێ بەسەر پێغەمبەر دا. (٥)(سطر) بەشێكە لە (الطروس) كەوابوو عەتفی جوزئە لەسەر كول، دانەر بەڕونی ناوی جوزئەكەی بردوە، چونكە خەت بەڵگەيە لەسەر لەفزلەفزيش دەلآلەت لەسەر مانا دەكا. (٦)واتە خودايە! بەردەوام رەحمەتی تۆ ببارێ بەسەر پێغەمبەرﷺ و ئالی هەتا مانەوەی تيانوس و دێڕ بمێنێتەوە ، واتە هەتا تيانوس و خەت پارێزراون بۆ چاوانی لەفزەكان، واتە: بۆ ئەو مانايانەی لەفزەكان دەلآلەتيان پێدەكرێ لەسەريان و هيدايەت و رێنمونيان پێبكرێ وەك چۆن هيدايەت ورێنمونی بەچاوی باصر پەيدادەبێ. (٧)بۆيە تەشبيهی معانی بە(عيون باصرة)ی كردوە ئەو معانيەش بريتيە لەو زانيارييەی پێغەمبەریﷺ بەرێزی پێ نێرراوە. (٨)بەئەندازەی مانەوەی سپيايی تيانوسەكان و هەتا مانەوەی رەشايی دێرو تيانوسەكان، هەتا

المعنى نصلّي مدة قيام كتب العلم المذكور قيام بياضها وسوادها اللازمين لها[١] وقيامُها بقيام أهلِ العلم[٢] لأخذهم إياه منها[٣] كما عُهِدَ[٤] وقيامُهم الى الساعة[٥] لحديث الصحيحين بطرق لاتزال طائفة من امتي ظاهرين على الحق حتّى يأتي امر الله[٦] اي الساعة كما صُرّح في بعض الطرق[٧] قال البخاري: وَ هُمْ أهلُ العلم[٨] اي لإبتداء الحديث في بعض الطرق بقوله[٩] من يُرِد الله بهِ خيراً يُفَقّهْهُ في الدين[١٠] وابّد الصّلاة بقيام كتب العلم المذكور لأنّ كتابه هذا المبدوء بما هي منه من كتب ما يُفهم به ذلك العلم[١١] {ونَضْرَعُ} سكون الضاد بضبط المصنف[١٢]

---

سپیایی بمێنێ کاغەز دەمێنێ وەهەتا ڕەشایی بمێنێ ڕەشایی خەت دەمێنێ.

(١)واتە داوای دابەزینی ڕەحمەتی خوا دەکەین بۆ گیانی پێغەمبەرﷺ لەماوەی ئەو کتێبانەی خزمەتی ئەو زانیارە ناوبراوە دەکات . بە ئەندازەی مانەوەی سپیایی تیانوسەکان و ڕەشایی خەتەکان کە هەردووکیان لازمی کتێبەکانن ، واتە هەتا سپیایی بمێنێ تیانوس دەمێنێ وە هەتا ڕەشای بمێنێ خەتیش دەمێنێ.

(٢)دەخۆ مانەوەی ئەو کتێبانە بەمانەوەی ئەهلی عیلمە (٣)چونکە زانایان عیلم و زانیاری لەو کتێبانە وەردەگرن (٤)وەك عادەت وایە عیلم و زانیاری لە کتێب وەرگیرێ نەك لە خەڵك. (٥)خۆ مانەوەی زانایانیش هەتا ڕۆژی قیامەتە (٦)ئەی چۆن دەزانێ زانایان هەر دەمێنن ؟ چونکە لەبەر ئەو فەرموودە کە بوخاری و مسلم بەچەندەها ڕێگە ریوایەتیان کردوە دەفەرمووێ: واتە بەردەوام دەستەیەك لەئوممەتی من بەسەر حەق و ڕاستی دا زاڵن هەتا قیامەت دێ (٧)جا چۆن دەزانی (أمر الله) بەمانا قیامەتە ؟ چونکە لەهەندێ ریوایەتدا بەسەراحەت دەفەرمووێ: (حتّى تأتي الساعة) (٨)ئەی چۆن دەزانێ ئەو دەستەیە ئەهلی عیلمن؟ ئەمیش دەڵێ: بوخاری ووتویەتی: ئەوانە ئەهلی عیلمن (٩)چونکە سەرەتای فەرموودەکە لەهەندێ ریوایەتدا باسی ئەهلی عیلم دەکاو فەرمویەتی (١٠)(من يُرِد الله بهِ خيراً يُفَقّهْهُ في الدين) هەر کەس خوا ئیرادەی خەیری پێبێ لە دین حاڵی ئەکات وتێگەیشتووی ئەکا لە مەسائیلە شەرعیەکان دا.

(١١)ئەی بۆ نەیوت (الى الأبد) لەباتی ئەوەی پێشو؟ دانەر داوای ڕەحمەتی هەتا هەتایی کرد بەمانەوی ئەو کتێبانەی کە باس لەعیلمێك ئەکا کە بە پێغەمبەرﷺگەیەنراوە ، چونکە ئەم کتێبەی دانەر سەرەتاکەی دەست پێ دەکا بە (خطبة)ییك کە (صەلات) بەشێکە لەو(خطبة) یە لەو کتێبانەیە ئەبنە هۆ بۆ حاڵی بوون لەعیلمی رسالە پەیامی پێغەمبەر ﷺ. (١٢)وشەی (نضرع) خاوەنی دەقی (جمع الجوامع)ە بەسکونی ضاد نوسیویەتی.

**اي نخضع و نَذلُ {اليك} يا الله[1] في {منع الموانع} اي نسألك غاية السؤال من الخضوع والذلّة ان تمنع الموانع[2] اي الأشياء التي تمنع اي تعوق {عن إكمال} هذا الكتاب {جمع الجوامع} تحريراً[3] بقرينة السياق[4] الذي إكماله لكثرة الإنتفاع[5] به فيما آملهُ[6] خيورٌ كثيرةٌ[7] وعلى كل خيرٍ مانع[8] واشار بتسميته بذلك الى جمعه كل مصنَّف جامع[9] فيما هو فيه[10] فضلاً عن كل مختصر[11] تعني مقاصد ذلك من المسائل و الخلاف فيها[12] دون الدلائل واسماء اصحاب الأقوال إلا يسيراً منهما فذكره لنكتٍ ذكرها في آخر الكتاب[13]**

---

**(١)واتە: خودایە! بەملکەچی و زەلیلییەوە روت تیٚدەکەین. (٢)واتە: بەو پەڕی ملکەچیو زەلیلیەوە داوات لیٚدەکەین، ئەو شتانەی ریٚگرن لەبەردەمماندا تۆ قەدەغەیان کەیت و نەیان هیٚلّی(٣)ئەوانەی ریٚگرن لەتەواوکردنی ئەم کتیٚبە (جمع الجوامع) لەڕوی بەشیٚوەی تەواوکردن و نووسینی. (٤)چونکە ئەم قسانە دوای نوسینی بووە، ئەمەش بەبەلّگەو قەرینەی دارشتن و نووسینی عیبارەتەکەیە دەزانم بەتایبەت وشەی (اللآتي) دەی گەیێنیٚ. (٥)ئەو(جمع الجوامع)ەی تەواو کردنەکەی لەبەر سود بەخشی زۆریٚ. (٦)چۆن دەزانی سوود بەخشە؟ چونکە دانەر هەر ئەوەی بەهیواو ئاواتی خۆی کردوە (٧)تەواوکردنەکەی چەندەها خیٚری هەرە زۆری هەیە (٨)دەخۆ بەسەر هەموو خیٚریٚکیشەوە ریٚگریٚکیش هەیە.**

**(٩)بەکورتی (جمع الجوامع) چەندەها خیٚرو سوودی تیابیٚ بەو پلەیشە چەندەها مانع و ریٚگرشی هەیە ، دانەر ئامارژەی بەناونانەکەی کرد بۆ کۆکردنەوەی هەموو دانراویٚکی جامع و گشتگیر (١٠)کۆکەرەوەی شتیٚکە کە (جمع الجوامع) لە بارەیەوە ئەدویٚ نەك زانیاری نحو صرف و بلاغە (١١) زیاد لەوەش هەموو نوسراویٚك بەکورتی لەبارەی ئوصولەوە هەبیٚ (جمع الجوامع) گرتویەتیە خۆی.**

**(١٢)باشە تۆ دەلّیٚ ی (كلّ مصنّفٍ) ئایا هەموو دانراوەکانی هیٚناوەو نەقلّی کردووە ئەمیش دەلّیٚ :مەبەستی دانەر ئەوەیە واتە مەقاصدو مەبەستەکانی ئەو دانراوەی نەقلّ کردووە کە مەسائلی خلاف وجیاوازی عولەمایانیان تیایە، نەك پیٚشەکیودیٚباجەکانیان. (١٣)نەقلّی ئەو مەسائیلانەو خاوەنی قەولەکان بەلّگەیان لەگەلّ نەهیٚناوە جگە لەهەندیٚکی کەم نەبیٚ بۆ مەسائیل و قەولەکان هیٚناویەتی ئەویش باسکردنەکەیان لەبەر چەند نوکتەیەکە دانەر باسی کردون لەکۆتایی کتیٚبەکەیەوە.**

**{الآتي من فن الأصول}[1] بإفراد فنّ[2] وفي نسخة بتثنيته[3] وهي أوضح[4] أي فنّ أصول الفقه و فنّ أصول الدّين[5] المختتم بما يناسبه من التصوف[6] والفنّ النّوع[7] و فنّ كذا من إضافة المسمّى الى الإسم كشهر رمضان ويوم الخميس[8] ومن وما بعدها بيان لقوله {بالقواعد القواطع}[9] قدّم عليه رعاية للسجع[10] والقاعدة قضية كلية يتعرّف منها احكام جزئياتها[11] نحو الأمر للوجوب حقيقةً و العلم ثابت لله تعالى[12] والقاطعة بمعنى المقطوع بها[13] كعيشة راضية[14]**

---

(١)(جمع الجوامع) يێك هەرچی قواعدی قاطعة هەیە لە عیلمی اصول دا هەمووی هێناوە (٢)وشەی (فنّ) بە موفرەدو تاك بیخوێنەرەوە (٣)لە نوسخەیەكیتردا بە (مثنی) نوسراوە واتە نوسراوە (فنّي) (٤)ئەو نوسخە رونترەو چاكترە ئەگەر بە (تثنیة) بێ (٥)واتە عیلمی (أصول الفقه) وعیلمی (أصول الدین) (٦)جا خۆ ئەم كتێبە تەنها ئەم دوو عیلمەی تیانیە تەسەوفیشی تیایە؟ ئەمیش دەڵێ تەسەوف شتێكی جیانیە بەڵكو (أصول الدین) ە كۆتایی بەشێك موناسبی ئوصولی دینە ئەویش تەسەوفە چونكە هەردوكیان بۆ (إثبات عقیدة)یە.

(٧)فەنن بەمانا جۆرە. (٨)كە دەڵێ (وفنّ كذا) ناونراوەكەت خستۆتە پاڵ ناوەكە وەك دەڵێ مانگی رەمەزان یان رۆژی پێنج شەممە، ئیزافەی شەهر كراوە بۆلای مانگی رەمەزان وەهەروەها ئیزافەی رۆژیش كراوە بۆ لای پێنج شەممە. (٩) پیتی(من) و ئەوەی یێت بەدوایدا تەفسیری (بالقواعد القواطع) دەكەن (١٠)(مبیّن) ی پێش (مبیَّن) خستوە چاودێری سەجعەكەی كردوە، و كۆتایی رستەكانی پاراستووە. (١١)(قاعدة) قەزیەیەكی كولیەحوكمی هەموو جوزئەكانی لەوەوە دەزانرێ (١٢)وەك (الأمر للوجوب) و (العلم ثابت لله تعالی)ئەم دوو نمونە یەكێكیان بۆ (اصول الفقه) ئەوی تریشیان بۆ (أصول الدین). هەرچی ئەمر هەیە بۆ وجوبە ، وەك (اقیموا الصلاة) بۆ ئەمرە، ئەمریش بۆ وجوبە كەوابوو (اقیموا الصلاة)بۆ وجوبە:

اقیموا الصلاة امر – وكلّ امر للوجوب - فنتیجةً اقیموا الصلاة للوجوب

صغری كبری نتیجة

یاخود دەڵێ عیلم بە سامانڵ و سایەقەی ئەمڕۆ (علمه)عیلمیش ثابتە بۆ خوا ، كەوا بوو خوا عالیمە بە سامانڵ و سایەقەی ئەمڕ. كەوا بوو عیلم بەسامانڵی ئەمڕۆ ثابتە بۆ خوا . (١٣)(قاطع) اسمی فاعلە لێرەدا بەمانای اسم مفعولە كە (مقطوع بها)یە (١٤)چونكە (قاطع) كە عولەماكانن (مقطوع بها) كان قەزیە كولیەكانن، كەئەمەش وەكوو (راضیة) بەمانای (مرضیة) یە.

**من اسناد الفاعل الى المفعول[١] لملابسة الفعل لهما[٢] والقطع بالقواعد بقطعية ادلّتها[٣] المبيّنة في محالها[٤] كالعقل المثبت للعلم والقدرةِ لله تعالى[٥] والنصوص والإجماع المثبتةِ للبعث و الحساب[٦] وكإجماع الصَّحابة المثبت لحجية القياس وخبر الواحد[٧] حيثُ عمل كثيرٌ منهم بهما[٨] متكرراً شائعاً مع سكوت الباقين[٩] الذي هوفي مثل ذلك من الأصول العامةوفاقٌ عادةً[١٠] وفيما ذكرهمن الأصول قواعدُ قواطعُ تغليبٌ[١١] فإنَّ من اصول الفقه ماليس بقطعيٍ[١٢] كحجية الإستصحاب ومفهوم المخالفة[١٣] ومن اصول الدّين ما ليس بقاعدة[١٤]كعقيدة إنّ الله موجودٌ وإنّه ليس بكذا كما سيأتي[١٥]**

---

(١)چونكە خاوەنەكەی رازیە نەك عیشەكە ، (عیشة مرضیة)، لێرەدا ئەوەی هی فاعلەكەیە كە (قاطعة) كەیە دراوەتە پاڵ (مفعول بە) یەكە، كە (قواعد) ەكەیە، كەوابوو (مجازیة) نەك (حقیقیة) (٢)چونكە فیعل مولابەسەی هەیە بە فاعیلیشەوە بە مفعولیشەوە وەك (راضیة) رەبتی هەیە بە فاعلەكەیەوە كە ساحیبەكەیە رەبتیشی هەیە بە مفعولەوە چونكە لەسەری واقع دەبێ (٣)قاعدەكانی گومان بڕ دەبێ بەڵگەكانی بێگومان بن واتە بەهۆی بەلَگەكانیەوە گومانبڕ دەبێ نەك هەر لەخۆیانەوە.

(٤)كە هەریەك لەجێی خۆیدا رون دەكرێتەوە (٥)وەك بورهانی عەقڵی ئیسپاتی عیلم و قودرەت و دەسەلأت بۆ خوای گەورە دەكا (٦)عەقڵ كە حەرەكەی فەلەك دەبینێ كەچەندە گەورەیەو بەچ نزامێكی وورد كاردەكا دەزانێ كە خاوەنەكەی دەبێ كە خاوەنی عیلم و قودرە بێ، دەقەكانی قورئان و (إجماع ئیسپاتی زیندوبوونەوەو لێپرسینەوە دەكەن (٧)وەك ئیجماعی صەحابەكان ئیسباتی بەبەڵگە بوونی قیاس و خەبەری تاك (خبر الواحد) دەكا (٨)جا كوا هەموویان رایان لەسەر بووە ؟ ئەمیش دەڵێ زۆربەی زۆریان عەمەلیان كردوە بە قیاس و خەبەری تاك (خبر الواحد) (٩)چەندەها جار وتەكانیان بلأوبوەتەوە بەناو خەڵكدا لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانی تر بێدەنگ بوون. (١٠)كە ئەو بێدەنگیە بەرەزاو موافق بوون دەدرێتە قەڵەم بەشێوەیەكی ئاسایی لەبابی قیاس خەبەری تاك و (استصحاب) دا كە یەكێكن لە اصول و قەواعیدی عامە. (١١)جا خۆ هەندێ قاعدە هەیە (مقطوعٌ بها) نیە؟ ئەمیش دەڵێ: ئەوەی دانەر بەیانی كردوە وتی: {من الأصول قواعدُ قواطعٍ} واتە: هەندێ ئوصول هەن بنەماێكی گومان بڕن ئەمە بۆ تەغلیبە چونكە زۆربەیان (قاطع)ن نەك هەموویان (١٢)هەندێ ئوسول هەن قەتعی نین. (١٣)وەك(إستصحاب) و (مفهوم مخالفة) بە حوجەتكردن (١٤)وەهەندێ ئوسولدین هەن قاعیدە نین و قەزیەیەكی كولی نین.

(١٥)وەك بڕوایپەكتاپەرست دەڵێ: بێگومان خوا موجودەو هەیە دەیئەمەقەزیەیەكی

{البالغ من الإحاطة بالأصلين}[1] لم يقلْ الأصولين الذي هو الأصل[2] إيثاراً للتخفيف[3] من غير إلباس[4] {مبلغَ ذوي الجِدِّ}بكسر الجيم اي بلوغ اصحاب الإجتهاد[5] {والتشمير}[6] من تلك الإحاطة[7] {الوارد} اي الجائي[8] {من زهاءِ مأة مصنَّفٍ}بضمّ الزاي والمدّ اي قدرها تقريباً[9] من زهوته بكذا اي حزرتُهُ[10] حكاه الصغاني[11] قلبت الواو همزة لتطرفها إثرَ الفٍ زائدٍ كما في كساء[12] {منهلاً} حال من ضمير الوارد[13] {يُروي}بضمِّ اوّله اي كلّ عطشان إلى ماهو فيه[14] {ويَميرُ}بفتح اوّله يعني يشبع كلَّ جائع الى ما هو فيه[15] من مارَ اهلَهُ اتاهم بالمِيرَة اي الطعام الذي من صفته انَّهُ يشبعُ[16] فحذف معمول للتعميم مع الإختصار بقرينة السياق[17]

---

كولی نیە چونكە مەوضوعەكەی زاتێكی موعەیەنە كە (الله) یە، یاخود دەڵێ خوا جیسم نیە یاخود رەنگی نیە، ئەمیش هەروەها لەمەودوا باسەكەیان دێ. (١)(جمع الجوامع) ێك گەیشتوە بەپلەیەك كە دەوری دوو زانیاری بدا كە (أصول الفقه) و (أصول الدِّين)ە. (٢)بەوێنەی گەیشتنی ئەو كەسەی خاوەنی ئەوپەڕی تێكۆشـ[illegible] و خۆ هەڵكردن بێ، كەسێ سەعی و تێكۆشان بكات دەگاتە كوێ ئەم (جمع الجوامع)ی منیش ئەگاتە ئەوێ (اصولين)نەووت كە حەقیش وابوو وای بووتایە..

(٣)لەبەر ئەوە وشەی ئاسانی هەڵبژارد (٤)ئەی ئەمە چۆن دەزانرێ ئەم ئەصلە مەبەست پێی (أصولة) ئایا لەیەكچون رونادا (التباس)، ئەمیش دەڵێ هیچ ئیلتباسێك رونادا چونكە لەپێشەوە (اصول)ی ووتوە. (٥)بەوێنەی گەیشتنی ئەوكەسانەی خاوەنی ئەوپەڕی تێكۆشانن (٦)خۆهەڵكردن (٧)ئەو كەسەی خاوەنی سەعیو خۆهەڵكردن بێ لەو (إحاطة) (٨)(جمع الجوامع)ێك كە هاتووەو حاصل بووە (٩)لەنزیكەی سەد ١٠٠ دانراو بەبڕی پیتی زێی (زُهاء)مەدە پێدانی، ماناكەی ئەوەیە ئەندازەی نزیكەی سەد كتێب، (١٠)تەقدیرم بەوەندەكردوە (١١)(صغاني)وای گەڕاندوەتەوە (١٢)جا (زُهاء) ئەسڵ و ریشەكەی (زُهاو) قەلبی پیتی واوەكە كراوە بە همزە چونكە واو لەتەرەفی ئاخری وشەوە لەدوای ئەلفی زیادەوە بێ ئەكرێت بە هەمزە وەك لەوشەی (كساء) ئەو عەمەلیاتە كراوە ئەصلەكەی (كساو) ن بوو كردمان بە (كساء). (١٣)وشەی (منهلاً) حالە لە راناوی (ضمير)ی(الوارد) (١٤)هەموو تینویەك بەمەسائیلەكانی (جمع الجوامع) تێر ئاو ئەبێ (١٥)هەموو تینویەك بەو مەسائیلانەی (جمع الجوامع) لێی ئەدوێ تێردەكا. (١٦)(مار أهله) واتە: خواردنێكی بۆ هێنان كە تێریان بكات. (١٧)مفعولی هەردوو فیعلەكان حەزفكراوە لەبەر گشتگیری و كورتی بەبەڵگەو قەرینەی داڕشتنی دەقی نوسینەكە دەزانم گشتگیری مەبەستە.

والمنهلُ عينُ ماءٍ تورَدُ ووصفَهُ بالإرواء و الإشباع كما في ماء زمزم[١] فإنَّهُ يُروي العطشان ويُشبعُ الجوعان[٢] ومن استعمال الجوع والعطش في غير معناهما المعروف كما هنا[٣] قول العرب: جعتُ الى لِقائِكَ اي اشتقت وعطشت إلى لقائك اي اشتقت حكاه الصغاني[٤] {المحيطِ}ايضاً{بزبدةٍ} اي خلاصة {ما في شرحَي المختصرِ} لإبن الحاجب {والمنهاج} للبيضاوي[٥] وناهيك بكثرة فوائدهما[٦] {مع مزيدٍ} بالتنوين بضبط المصنف{كثيرٍ} على تلك الزبدة ايضاً[٧]

{وينحصرُ}جمع الجوامع يعني المعنى المقصود منه[٨] {في مقدِّماتٍ}بكسر الدال كمقدِّمة الجيش للجماعة المتقدِّمة منه من قدَّم اللازم بمعنى تقدَّمَ ومنه لاتقدِّموا بين يدي الله[٩] وبفتحها على قلَّةٍ كمقدَّمة الرَّحلِ في لغة من قدَّمَ المتعدي[١٠]

---

(١)بەكانی ئاوێك دەوترێت خەڵك بچنە سەری كانی ئاوەكەی وەصف دار كرد بەوە تێر ئاوی (الإرواء)ئەمە باشە بەڵام ئاو چۆن برسی تێر دەكا؟ (٢)چونكە وەك ئاوی زەمزەم وایە، تینو تێر ئاو ئەكاو برسی تێر ئەكا. (٣)بەكارهێنانی (جوع) و (عطش) بۆ غەیری مانای دیاری خۆیان وەك لێرەدا كراوە ئاساییە وەك لەزوبانی عەرەبەكانەوە وتراو (٤)(جُعتُ الى لقائِكَ) بەواتای موشتاق و عەودالی بەخزمەت گەیشتنت بوم، صغانی وای گەڕاندوەتەوە. (٥)(جمع الجوامع)وەك مەبەستەكانی سەد دانراوی تیایە كاكڵەی ئەو دوو شەرحەی خۆیشی داوە، كەیەكێكیان بەسەر موختەسەری (إبن الحاجب)وەیە ئەویشیان بەسەر (منهاج) (بیضاوي)وەیە (٦)ئەو دوو كتێبە ئەوندە سوودو قازانجیان زۆرە بواری تەماشاكردنی نوسراوی‌ترت ناهێڵێ (٧)لەگەڵ زیادەیەكی زۆردا بەسەر ئەو كاكڵەوە دووبارە (٨)ئەم (جمع الجوامع) كورتكراوەتەوە لە چەند پێشەكی‌یەك و حەوت كتێب، جا خۆ تائێرە داخڵی (جمع الجوامع) لەگەڵ ئەوەش نە (مقدمة) و پێشەكیە و نە داخڵی حەوت كتێبەكەیە؟ ئەمیش دەڵێ ئاخر مەبەست ئەوەیە مانای مەبەست و مەقصودی (جمع الجوامع) كورتكراوەتەوە.
(٩)ئەگەر بەكەسرەیی پیتی دالەكە بێ ئەوە وەكو (مقدِّمة الجيش) وایە ، كە كۆمەڵێك سەرباز پێش سوپا دەكەون كاری پێویست ئامادە دەكەن بۆ سوپاكە ، لەم كاتەدا وشەی (مقدِّمة) لە فیعلی (قدِّم)ی لازم دەبێ واتە مفعولی نابێ ماناكەی بە فاعل تەواو دەبێ كە بە مانای (تقدِّم) ئەم ﴿ لاتقدِّموا بين يدي الله﴾ ئەم ئایەتەش هەر لە (قدِّم)ی لازمە واتە: ئەوانە لەخزمەت پێغەمبەردابوون ئیهتیمام بەوەمەكەن پێش یەكتركەون.
(١٠)ئەگەر بەفەتحەی پیتی دالەكە بخوێنرێتەوە ئەمەش كەمە ئەوە لەلوغەتێكا بەمانا بەشی‌پێشەوەی كۆپانی حوشتر هاتووە ئەگەر بە فەتحە بخوێنرێتەوە (مقدَّمة)

اي في امور متقدّمةٍ او مقدّمة على المقصود بالذات للأنتفاع بها فيه[1] مع توقفه على بعضها[2] كتعريف الحكم واقسامه[3] إذ يُثبتها الأصوليّ تارة ويَنفيها اخرى[4] كما سيأتي {وسبعة كتبٍ} في المقصود بالذات[5] خمسةٌ في مباحث ادلّةِ الفقه الخمسة الكتاب والسنة والإجماع والقياس و الأستدلال[6] والسادس في التعادل والتراجيح بين هذه الأدلة عند تعارضها[7] والسابع في الإجتهاد الرابط لها بمدلولها[8] وما يتبعة من التقليد وأحكام المقلّدين وآداب الفتيا[9] وما ضمَّ اليه من علم الكلام المفتتح بمسئلةِ القليد في أصول الدين المختتم بما يناسبه من خاتمة التصوّف[10]

ئەوە ریشەکەی (قدّم)ی موتەعەدیە (١)واتە (جمع الجوامع) کورتکراوەتەوە لەچەند شتێکی پێش کەوتوو یاخود پێش خراو بەسەر (المقصود بالذات) واتە مەبەستی سەرەکی بۆ ئەوەی خەڵك سود وەرگرێ لە مەقسودو مەبەستەکان بەهۆی ئەو پێشەکیانەوە (٢)لەگەڵ ئەوەشدا مەقسودەکە متوەقیفەو بەستراوە زانینەکەی لەسەر هەندێ لە پێشەکیەکان. (٣)وەك پێناسەی حوکم و بەشەکانی حوکم کە پێنجن (٤)جا پێویستی چیە بە تەعریفی حوکم و بەشەکانی؟ ئەمیش دەڵێ: چونکە ئەقسامی حوکم، ئوسولی(اصولي) جاری واهەیە ئیسباتی ئەکا وەکو پاش بیعسەت، جاری وایش هەیە نەفی دەکا وەك پێش بیعسەت، تانەی زانی چۆن نەفیو ئیسباتی بکەی. (٥)ئەم (جمع الجوامع)ە کورتکراوەتە سەر چەند پێشەکیەك و حەوت کتێب لەبارەی مەقسود بەزاتەوە (٦)واتە مەبەستی خۆیی پێنج کتێبیان لەبارەی توێژینەوەی هەر پێنج دەلیلە فقهیەکانەوەن کە قورئان و فەرموودەو ، کۆیی زانایان هەڵگۆزان و بەڵگەو سەلماندن (٧)شەشەمیان لەبارەی (تعادل و ترجیح)ەوەیە لەنێوان دەلیلەکان دا لەکاتی بەگژا چونی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریاندا (٨)حەوتەم لەبارەی (إجتهاد)ەوەیە کە ئەدلەکان دەبەستێ بە مەدلولەکانیانەوە (٩)بەلای موجتەهیدەوە واتە ئەو شتە دەلیلە لەسەر ئەوە، وەکو ﴿اقیموا الصلاة﴾ دەلیلە لەسەر وجوبی نوێژ هەروەها چۆن باسی (إجتهاد) دەکا باسی ئەوەش دەکا کە دێ بەشوێن ئیجتیهاددا وەك تەقلید و ئەحکام موقەلدین تەقلید چۆنە، کابرای موقەلید چۆن رەفتار بکا؟ هەروەها باس لەئادابی فەتوا ئەکاو کەسی موفتی چۆن ئەرکی خۆی جێبەجێ بکا لەبارەی فتواوە. (١٠)هەروەك کتێبی حەوتەم قسە لەبارەی ئەوەش دەکا کە لێکنراوەو رێکخراوە لەگەڵ (إجتهاد)دا ئەویش عیلمی کەلامە، لەکوێوە دەست پێدەکا؟ دەست پێدەکا بەمەسئەلەی تەقلید کە ئەویش کۆتایی دێ بەشتێك کە گونجاوە لەگەڵ (أصول الدّین)دا ئەویش کۆتاییەکە لەبارەی تەسەوفەوە.

## {الكلام في المقدمات}[1]

إفتتَحها بتعريف اصول الفقه[2] ليتصوّره طالبه[3] بما يضبط مسائله الكثيرة[4] ليكون على بصيرةٍ في تطلُبها[5] إذ لو تطلّبها قبل ضبطها[6] لم يأمن فواتَ ما يرجيه[7] وضياع الوقت فيما لايعنيه[8] فقال: {اصول الفقه} اي الفنُّ المسمّى بهذا اللقب المشعر بمدحه بإبتناء الفقه عليه[9] إذ الأصل ما يبتنى عليه غيره[10]

---

(١)گفتوگۆیەك لەسەر پێشەكیەكان

(٢)دانەر دەرگای گفتوگۆی پێشەكیەكانی بەپێناسەی (اصول الفقە) دەست پێكردوە (٣)بۆیە بەمە دەست پێدەكا، بۆ ئەوەی فێرخواز و تالبی (اصول الفقە) دیمەن و سورەتی (اصول الفقە) لەمێشكیدا گەلاڵە بێ‌و رەسمی بگرێ. (٤)بەچی؟ بەپێناسەو تەعریفێك كە هەموو مەسائیلە زۆرەكانی (اصول الفقە) لەمێشكی قوتابیدا بپارێزو لەخۆ بگرێ.

(٥)چونكە نابێ بلێ: (اصول الفقە) ئەم مەسئەلەیەو ئەو مەسئەلەیە هەمووی عومری خۆی سەرف بكا مەسائلی (اصول الفقە) بۆ ژمارە نایە ، بەلاّم بەیەك تەعریفی (جامع و مانع) هەموو تەعریفەكانی تێدا كۆدەكاتەوە ، جا كەسێ دەڵێ: خەراپەی چیە ؟ بانەی زانی ئەمیش دەڵێ: ئاخر بۆ ئەوەی فێرخوازو تالبی (اصول الفقە) لەسەر شەوق و چاورۆشنی بێ لەكەسب و بەدوا گەڕانی مەسائلی (اصول الفقە) دا (٦)جا خراپەی چیە بابگەڕێ بەشوێنیاندا؟ ئەمیش دەڵێ : چونكە ئەگەر بگەڕێ بەشوێن مەسائلەكاندا پێش ئەوەی بە پێناسەیەك لەبەریان بكا زو حاڵی بێ لێیان (٧)ئەمین نابێ لەدەست چونی ئەوەی بەهیوایە دەستی كەوێ.

(٨)چونكە لەوانەیە توشی مەسئەلەیەك بێ (اصول الفقە) بێ بەلاّم چونكە تەعریفەكەی نەزانیوە لەدەستی داوە، یاخود خۆی زۆر خەریك كردوە بەشتێكەوە كاتی خۆی هەمووی تیا سەرف كردوە كەچی مەبەستی ئەو نەبووەو لە (اصول الفقە) نیە.

(٩)دانەر لەبەر ئەوەی وتمان وتی: ئەو عیلم و فەننەی ناودەبرێ بەم لەقەبە واتە (اصول الفقە) ، بەتەو لەقەبە هەواڵدەر و ئاگاداركەرە بە پیاهەڵدانی ئەم فەننە، ئامارە بەوە دەكا مەدحی دەكا، بەدروست كردنی فیقە لەسەر ئەساسی (اصول الفقە)دەبێ (١٠)وشەی ئەصل بریتیە لەو بنەڕەتەی دیواری لەسەر دروست دەكرێ.

{دلائل الفقه لإجمالية}[١] اي غير المعيّنة[٢] كمطلق الأمر و النهي وفعل النبيّﷺ والإجماع والقياس والإستصحاب[٣] المبحوث عن اولها بأنه للوجوب حقيقة[٤] والثاني بأنه للحرمة كذلك[٥] والباقي بأنها حجج[٦] وغير ذلك[٧] ممايأتي[٨] مع ما يتعلق به[٩] في الكتب الخمسة[١٠] فخرج الدلائل التفصيلية[١١] نحو:﴿ اقيموا الصلاة ﴾ و ﴿ ولا تقربوا الزنى﴾ و صلاتهﷺ في الكعبة كما اخرجه الشيخان و الإجماع على انّ لبنت الإبن السدسُ مع بنت الصلب حيث لاعاصب لهما، وقياس الأرز على البُر في إمتناع بيع بعضه ببعضٍ إلاّ مثلاً بمثلٍ يداً بيد كما رواه مسلم، واستصحاب الطهارة لمن شكّ في بقائها[١٢]

---

(١)بەم واتایە (فقه)و (اصول الفقه) وەك بینایەك وایە بنەڕەتەكەی (اصول الفقه)ە، چوارچێوەكەشی (فقه)ەكەیە كە(فقه) موحتەرەم بێ مەبناكەشی ئەبێ زۆر بەڕێز بێ. ئەو فەننە ناودەبرێ بەم لەقەبە بریتیە لەچەند مەسائیلێك كە لە سەرەنجامدا قسە لەسەر دەلائلی إجمالیەكانی فقه دەكا (٢)خودی هەموو بەڵگە ئجمالیەكانیفقە (إجمالية) یانی جوزئیاتی دەلائیلەكان حەسر نیە واتە دیاری كراو نیە (٣)كولیاتەكان مەعلوم نین وەك ئەمری موتڵەق و نەهیو فیعل نەبیو (النَّبیِّ)ﷺ ئیجماع و قیاس و ئیستصحابی موتڵەق (٤)(اصول الفقه) لەبارەی ئەمانەوە ئەدوێ، باس دەكرێ لەبارەی یەكەمیانەوە دەووترێ: ئەمری حەقیقی بۆ ووجوبە. (٥)دوەمیش كەنەهیە دەوترێ بۆ حورمەتە حەقیقەتەن (٦)ئەوانی تر دەوترێ بۆ حوجەتن (٧)باسی ئەوانە دەكاو غەیی ئەوانەش دەكا وەك عام و خاص هتد...(٨)لەوانەی لەمەودوا دێن (٩)تەنها خۆیان باس ناكرێن بەڵكو، لەگەڵ ئەوەش پەیوەندن پێیەوە.

(١٠)واتە بەخۆیان و بەئەحواڵیانەوە، جا ئەم دەلائیلە پێنجەو غەیری ئەوانیش لە كوێ دێن؟ لەو پێنج كتێبەی ئەوەڵدا (١١)جا مادام ووتت: (اصول الفقه) بریتیە لەچەند مەسائلێ سەرەنجامەكانیان دەلائلە ئیجمالیەكانی (فقه)ن، كەوابوو بەو تەعریف و پێناسەیە دەلائلە تەفسیلیەكان چونەدەرەوە.

(١٢)لە(اصول الفقه) نین وەكوو ئەمری ﴿ أقيموا الصلاة ﴾ وە نەهی ﴿ ولاتقربوا الزنى ﴾ وەنوێژی پێغەمبەرﷺ لەناو كەعبەی پیرۆزدا وە ئیجماع لەسەر ئەوە كچی كوڕ لەگەڵ كچدا لەجێیەكدا نێرینەیەكیان لەگەڵدا نەبێ بیانكا بە (عصبة)، یاخود وەك (قیاس)ی برنج لەسەر گەنم لە قەدەغەكردنیفرۆشتنیهەندێ لەم بەهەندێ لەو، مەگەر بە ئەندازەی یەك بن وەهەردوكیشیان حازربن، یاخودوەكو: ئەصل مانەوەی دەست نوێژە بۆ كەسێ گومانی هەبێ لە بێ دەست نوێژیدا و یەقینی هەبێ لەدەست نوێژدا.

فليس اصولَ الفقه[1] وإنّما يذكر بعضها في كتبه للتمثيل [2] {وقيل} اصول الفقه {معرفتها} اي معرفة دلائل الفقه الإجمالية[3] ورجّحَ المصنّف الأول بانّه اقرب الى المدلول لغةً[4] إذ الأصل لغةً الأدلةُ[5] كما في تعريف جميعهم الفقه بالعلم بالأحكام لانفسها[6] إذ الفقه لغة الفهمُ[7] {والأصوليُّ} اي المرء المنسوب الى الأصول[8] اي المتلبس به[9] {العارفُ بها} اي بدلائل الفقه الإجمالية[10] {وَ بطرقِ إستفادتها}[11] يعني المرجحات المذكور معظمها في الكتاب السادس[12] { و} بطُرُقِ {مستفيدها}[13]

---

(١)ئەمانە هەموو (أصول الفقه) نین (٢)چونکە ئەمانە مەسائل نین بەڵکو نمونەو میسالن، کەوابوو ئەمانە دەلیلی تەفسیلین نەك ئیجمالی ، جا کە ئیجمالی نین بۆ لە (أصول الفقه) دا باس دەکرێن؟ باسی هەندێکیان لەکتێبەکانی (أصول الفقه)دا دەکرێن تەنها بۆ وێنە هێنانەوەیە (٣)هەندێك دەڵێن : (أصول الفقه) بریتیە لە ناسینی مەسائیلی ئەدلە ئجمالیەکانی فقه (٤)جا ئەگەر بوترێ (أسماء العلوم) هەموو کات و هەمیشە سێ قەولی تێدا هەیە: ١-هەندێ ئەڵێن ناوە بۆ مەسائلەکان. ٢-ناوە بۆ زانینی مەسائلەکان. ٣-ناوە بۆ ئەو مەلەکەیە پەیدابووە لەبارەی مەسئەلەکانەوە، ئیتر تۆ بۆ یەکەمت هەڵبژارد؟ ئەمیش دەڵێ : دانەر پێناسەی یەکەمی هەڵبژارد چونکە مانای یەکەم نزیکترە لەمانا لوغەویەکەی، چونکە ئەمە یاسایە هەرمانایێك لە لوغەتەوە نزیك بێ ئەوە چاکە (٥)چونکە(أصول) لە لوغەتا بەواتای ئەدلەیە.

(٦)ئەی ئەمە هاووێنەی هەیە؟ بەڵێ وەك پێناسەی هەموو زانایان بۆ فقه. وتویانە: فقه بریتیە لە علم بەئەحکامی شەرعی نەخودی ئەحکامەکان بێ (٧)بۆ وایان ووتوە؟ چونکە فقه واتا لوغەویەکەی تێگەیشتن و زانینە ،لەسەر ئەم ئەساسە پێناسەی فقهیان کردووە.

(٨)ئوسولی بەکەسێك ئەوترێ نیسبەت بدرێ بۆ لای (علم الأصول) (٩)چ بەجۆرێ ئامادەی وەرگرتن بێ یاخود وەری گرتبێ ؟ واتە ئوصولی بێ و بیزانێ و وەصف دار بێ پێی (١٠)ئەبێ هەموو دەلائلە ئیجمالیەکانی فقه بزانێ. (١١)وەزانابێ بەچەندەها رێگەو شێوازی کەڵك وەرگرتن لە دەلائلە ئیجمالیەکان.

(١٢)مەبەست بە رێگاکان زانینی (مرجّحات)ە چونکە بەوە پلەی هێزو لاوازی بەڵگەکان دەزانرێ وە هەڵیان دەبژێرێ کە زۆربەی (مرجّحات) (بەسەرادراو) لەبەشی شەشەم دا باسی لێوە دەکرێ. (١٣)وەهەم دەبێ ئوسولی هەموو رێگا و شێوازێ بزانێ کەی ئەو کەسەی کەڵك لە دەلائلە ئیجمالیەکان وەردەگرێ لە چ رێگەیەکەوە دەڕوا بۆ نەتیجەو ئەنجام.

**يعني صفات المجتهد المذكورة في الكتاب السابع[١] ويعبَّرُ عنها شروط الإجتهاد[٢] وبالمرجحات اي بمعرفتِها تُستَفادُ دلائل الفقه[٣] اي ما يدُلُّ عليه من جملة دلائله التفصيلية[٤] عندَ تعارُضِها[٥] وبصفات المجتهد اي بقيامها بالمرءِ[٦] يكون مستفيداً لتلك الدلائل[٧] اي اهلاً لإستفادتها بالمرجِحات[٨] فيستفيد الأحكام منها[٩]**

---

(١)مەبەست بەو ڕێگایانەش لێرەدا زانینی سیفاتی (مجتهدة)کە لە بەشی حەوتەمی ئەم کتێبەدا باسی لێوە دەکرێ (٢)بە سیفاتی (مجتهد) دەڵێن: مەرجەکانی ئیجتیهاد (٣)لێرەوە دەست پێدەکات شەش ڕەخنە لەدانەر دەگرێ: ١-(مرجّحات)و سیفاتی (مجتهد)ی بۆ بە (اصول)ە داناوە ؟ ٢-بۆ دەلائلی ئیجمالی متەوەقفن لەسەر زانینی سیفاتی (مجتهد) وەك (مرجّحات)ی حیساب کردون؟ کەچی متەوەقیفەکان جیان لەیەك ، لەسیفاتی (مجتهد)دا متەوقف نین لەسەر زانینی سیفاتی (مجتهد) بەڵکو ئەبێ موتەوەقف موتەلەبس بێ بەسیفاتی (مجتهد)ەوە، نەك وەك کوفر زانین بێ، هەموومان سیفاتی کافر دەزانینبەڵام موتەلەبس نین پێیەوە (الحمد لله)ئەبێ ئوسولی موتەسف بێ بەسیفاتی (مجتهد)ەوە نەك بیانزانێ .

٣-ناسینی ڕێگاکان(مرجحات)و (صفات)ی (مجتهد)دانەر وادەزانێ ڕێی دەلائلە ئیجمالیەکانن ، لەواقیعدا ڕێگای دەلائلە تەفسیلیەکانن. ٤- لەتەشبیهەکەش وادەرئەکەوێ کە سیفاتی (مجتهد) و(مرجحات)لەیەك جەنبەوەن، لە (مرجحات) دا ئەبێ بیانزانێ، بۆ سیفاتی (مجتهد)ئەبێ مەتەسف بێ پێیانەوە .

٥- کەووتویانە (فقیه) (مجتهد)ە وای زانیوە ئەمە تەعریفە ، ئەمە تەعریفی(فقیه) نیە. ٦- وای زانیوە کەس تەعریفی(فقیه)ی بەعالم نەکردوە. بۆ لابردنی ئەم ڕەخنانە دانەر دەستی پێکردو وتی: {واتە بەزانینی (مرجحات) کەڵك لە بەڵگە (فقه)یەکان وەردەگیرێ (٤)ئەگەر (مرجحات) نەزانرێن نازانرێ کامە دەلیلی کامە، دەلائلە ئیجمالیەکان نا، بەڵکو، واتە ئەوەی دەلالەت لەسەر(فقه)ەکە ئەکا، کە حاڵی وایە یەکێکە لەدەلائلە تەفسیلیەکان.(٥)کەی دەزانی ئەمە دەلیلەو ئەوە دەلیل نیە کاتێ بەگژ یەکدا بچن.

(٦)بەزانینی(مرجحات) (مجتهد) دەزانێ کامیان بەهێزە . سیفاتی (مجتهد) بەزانین نابێ بەڵکو مەبەست بەرجەستە بونیانەو دەبێ ئەوسیفاتەی تێدا بێ، (٧)ئەمجار (مجتهد) کەڵك وەردەگرێ لەو دەلائلە تەفسیلانەی موتەعارزی یەکن (٨)واتە لیاقەتی هەیە کەڵك لەدەلائلە تەفسیلیەکان وەرگرێ بەهۆی مورەجەحاتەکانەوە،کاتێ کە سیفاتی (مجتهد)ی هەبێ و(مرجحات) بزانێ (٩)ئەمجار بالفعل ئەحکامیان واتە (فقه).

ولتوقف استفادة الأحكام منها الّتي هي الفقه على المرجّحات وصفات المجتهد[١] على الوجه السابق[٢] ذكروها في تعريفي الأصول[٣] الموضوع لبيان مايتوقف عليه الفقه من أدلته لكن الإجمالية كما تقدّم[٤] دون التّفصيلية[٥] لكثرَتها جداً[٦] ومن المرجحات[٧] وصفات المجتهد[٨] واسقطها المصنِّف كما علمت لما قاله[٩] من انّها ليست من الأصول[١٠] وإنّما تذكر في كتبه[١١] لتوقّف معرفته على معرفتها[١٢] لأنّها طريقٌ اليه[١٣] و ذكرها حينئذٍ في تعريف الأصولي كذكرهم في تعريف الفقيه ما يتوقف عليه الفقه[١٤] من شروط الإجتهاد حيث قالوا الفقيه المجتهدُ، وهو ذو الدرجة الوسطىعربيّةً وأصولاً إلى آخر صفات المجتهد[١٥] وما قالوا الفقيه العالم بالأحكام[١٦]

---

(١)٢+جايەكێ دەڵێ بۆ (مصنِّف) ی خارج كرد لەتەعريفەكەدا؟ دەڵێ : لەبەر ئەوەی وەرگرتنی ئەحكامی فقهی لە ئەدلە تەفسيليەكان وەستاون (متوقف) لەسەر (مرجحات) و سيفاتی موجتەهد ٢)لەسەر شێوەی پيشوو (٣)واتە مورەجەحات و سيفاتی موجتەهيدی تێدابیٚلەبەر ئەوە زانايان لە: هەردوو پێناسەی ئوسول دا مورەجەحات و سيفاتی موجتەهيديان زيكر كردوە (٤)چ تەعريف بە مەسائل بێ چ تەعريف بە تەسديق بێ. چونكە ئوسول دانراوە بۆ رون كردنەوەی ئەوەی فقە وەستاوە لەسەری كە سێشتە : ١- كە يەكێكيان بەڵگەكانی (فقە)ن بەڵام مەبەست دەلائلە ئيجماليەكانن (٥)نەك دەلائلە تەفصيليەكان. (٦)لەبەر زۆريان.

(٧)٢-مورەجەحاتە (٨) ٣- سيفاتی موجتەهيدە (٩)دانەر لەتەعريفی (اصول)دا باسی (مرجّحات) و (صفات)ی (مجتهد)ی لابرد. وەك لەپێشەوە زانيت (١٠)ئەويش لەبەر ئەوەی لە (منع الموانع)دا ووتويەتی ، چونكە لە (اصول نين) (١١)كە باسی ئەكرێن لەكتێبەكانی(اصول) دا (١٢)لەبەر ئەوە ناسينی (اصول) بەستراوە بەناسينیمورەجەحات و سيفاتی موجتەهيدەوە (١٣)چونكە مورەجەحات و سيفاتی موجتەهيد رێگەو هۆكارێكن بۆ گەيشتن بە (اصول) (١٤)ئەی بۆ لە تەعريفی (اصول)دا باسيان كردون؟ ئاخر باسكردنی مورەجەحات و سيفاتی موجتەهيد لە تەعريفی علمی(اصول)دا وەك تەعريفی زانايانە بۆ (فقيە) بەوە كردوە كە(فقە)ی لەسەر (متوقف)ە، لەگەڵ ئەمەش (فقيە) بەكەسێ ئەڵێن (فقە) بزانێ.

(١٥)ووتويانە (فقيە) ئەوەيە مەرجەكانی (إجتهاد)ی تيابێ، كەووتويانە (فقيە) يانی (مجتهد) ئەويش بريتيە لەكەسێ كە خاوەنی پلەی مامناوەندی بێ لەعەرەبیو (اصول) زانيندا. هەتا كۆتايی سيفاتی موجتەهيد. (١٦)نەيان ووتوە (فقيە) ئەوەيە زانابێ بە ئەحكامی (فقە)ی .

هذا كلامه الموافق لظاهر المتن[1] في انّ المرجّحات وصفات المجتهد طريقٌ للدلائل الإجمالية[2] الذي بنى عليه مالَمْ يُسبَق اليه[3] كما قال مَنْ أسقطها من تعريفي الأصول[4] وانت خبيرٌ مما تقدَّم بأنّها طريق للدلائل التفصيلية[5] وكأنّ ذلك سرى اليه[6] من كون التفصيلية جزئيات الإجمالية وهو مندفعٌ بأنّ توقُّفَ التفصيلية على ماذُكر من حيث تفصيلها المفيد للأحكام[7] على انّ توقُّفها على صفات المجتهد[8] من ذلك من حيث حصولها للمرء لامعرفتها[9] والمعتبر في مسمَّى الأُصُليّ معرفتها لا حصولها كما تقدَّمَ كلُّ ذلك[10]

(١)ئەم قسەی دانەرە لە (منع الموانع) دا موافقتی زاهری ئەم مەتنەیە، (٢)کە مورەجەحات و سیفاتی موجتەهید رێگەیێکن بۆ گەیشتن بە دەلائل ئیجمالیەکان (٣)دەخۆ ئەمە هەڵەیەکە بینای شتێکی لەسەر کردوە لەپێشی ئەودا کەس نەی‌کردووە

(٤)چونکە ئەمانەی لەتەعریفی (أصول) نەووتون بەلاّم لەتەعریفی (أصولي) دا کردونی بەبەشێك لەپێناسەکەی ، وەك ئەوە وایە بڵێ ئەم شتە لە بغداد نیە بەلاّم لە بەغدادیّ هەیە، شت ئەگەر لە (منسوب اليه) ەکەدا نەبوو ئەوە لە (منسوب)ەکەیشدا نیە. وەك دانەر ووتویەتی لە هەردوو پێناسەی (أصول)دا.

(٥)(مرجّحات) و (صفات) ی (مجتهد)ی‌وەلاناون و کێشی بۆ دیاری نەکردون . تۆ ئاگاداری ئەوەی پێشوی کە مورەجەحات و سیفاتی موجتەهید رێگای دەلیلە تەفسیلیەکانن نەك ئیجمالیەکان (٦)من وابزانم دانەر بەشەودا چوە بۆ ئەو رایەی نەك بەرۆژدا چونکە ئینسان بەشەو چوو بۆشتیّ ئەکەوێتە هەڵەوە. (٧)ئەمیش لەوەوە بۆی چوە کە دەلائلە تەفسیلیەکان بەشێکن لە ئیجمالیەکان، بەلاّم ئەمە بۆچونی دانەرە (وهو مندفع) واتە ئەویش پاڵپێوە ئەنریّ بەوەستانی دەلائلە تەفسیلیەکان لەسەر مورەجەحات و سیفاتی موجتەهید لەم لایەنەوە کە ئەحکامە (فقه)یەکان دەگەیەنن نەك لەو جەنبەوە کە جوزئیەکان لە دەلائلە ئیجمالیەکانن.

(٨)ئەگەر زید رەنگی سوربیّ کەی پێویست دەکا رەنگی منیش سوربیّ، زید کە جوزئێکە لەئینسان عەوارزەکانی بۆ هەموو ئەفرادی ئینسان نابیّ، بڵێ مادام زید سورە ئەوەی ئینسان بیّ ئەبیّ سوربیّ، دووەم وەستانی دەلائلە ئیجمالیەکان لەسەر سفاتی موجتەهید (٩)حاڵەتی سیفاتی دەبیّ ئەو سیفەتانە بۆ موجتەهید پەیدا بووبن نەك بیانزانیّ، بەلاّم مورەجەحات بەس زانینە. (١٠)باوەرپێکراوە لە ناوەرۆکی ئوسولی زانینی مورەجەحات و سیفاتی موجتەهیدە نەك پەیداکردنیان وەك ئەوەی کە هەمووی تێپەری کردو لەپێشەوە ووترا.

**وبالجملة فظاهر معرفة أن الدلائل الإجمالية المذكورة في الكتب الخمسة[١] لاتتوقف على معرفة شيئٍ من المرجِّحات وصفات المجتهد[٢] المعقود لهما الكتابان الباقيان[٣] لكونها من الأصول[٤] فالصوابُ ما صنعوا من ذكرها في تعريفيه[٥] كأن يُقال أصول الفقه دلائل الفقه الإجمالية وطرق إستفادة و مستفيد جزئياتها[٦] وقيل معرفة ذلك[٧] ولاحاجة الى تعريف الأصولي للعلم به من ذلك[٨] وامّا قولهم المتقدِّم الفقيه المجتهد وكذا عكسه الآتي في كتاب الإجتهاد[٩] فالمراد به بيان الما صدق[١٠] اي مايصدُقُ عليه الفقيه وهو ما يصدُقُ عليه المجتهد والعكس[١١] لا بيان المفهوم[١٢] وإن كان هو الأصل في التعريف[١٣]**

---

**(١)بەکورتی و پاڵفتەی ئەوەی پێشوو، ئەوەی روون و ئاشکرابێ و زاڵ بێ بەسەر راکانی تردا: زانینی دەلائلە ئیجمالیەکانە کە لە پێنج بەشی ئەم کتێبەدا باسکراون (٢)راوەستاونین وەك دانەر وای دەزانێ لەسەر زانینی (مرجّحات) و (صفات)ی (مجتهد) (٣)دوو بەشەکەی ئەم کتێبە دانراوە بۆ باسی ئەو دوانە (٤)چونکە ئەم دوانە بەشێکن لە (أصول) نەك لەسەر وێستێنراون(موقوف عليه) (٥)قسەی راست ئەوەیە ئەو زانایانە کردویانە کە (مرجّحات) و (صفات)ی (مجتهد)یان لە هەردو پێناسەی (أصول)دا باس کردوە (٦)بەم شێوەیە بوترێ(أصول الفقه) سێ شتە: ١-(الدلائل الإجمالية) واتە دەلائیلی ئیجمالی فقە ٢- رێگای ئیستیفادە کە مورەجەحاتن.**

**٣-رێگاکانی سوودمەنی جوزئیاتی دەلائلە ئیجمالیەکانە کە سیفاتی موجتەهیدن ، جوزئیات دەلائلە تەفصیلیەکانی (٧)ووتراویشە: ناسین و زانینی ئەو سیانەیە (٨)ئیتر پێویست بەم تەعریف و پێناسەی (أصولِي) نیە، چونکە کە (أصول) زانرا ئیتر (أصولِي)ئەزانرێ، کە بغداد ناسراو زانرا ئیتر بغدادی ئەزانرێو ئەناسرێ.**

**(٩)بەڵام ئەو قسەی پێشوو کەزانایان کردویانە ووتویانە (فقيه)(مجتهد)ە و(مجتهد)یش(فقيه)ە کە لەوەودوا لەباسی (إجتهاد)دا دێ، ئەوە (١٠)مەبەست بەم قسەیە ماسەدەقیەتی نەك تەعریف و پێناسەی (١١)چونکە تۆ کە دەڵێ ی ئینسان زید و بەکرە ئەوە ماسەدەقی ئینسانە نەك حەقیقەت و تەعریفی ئینسان : واتە پێکهاتەی ئینسان زیدوبەکرواحمدومحمودە بەڵام تەعریفیئینسان(الحيوان الناطق)ە واتە ئەوەی دەووترێ: (فقيه) پێشی ئەوترێ (مجتهد) هەروەها ئەویشی پیێ دەوترێ (مجتهد) پێشی دەوترێ (فقيه) (١٢)ئەو قسەی زانایانە بەیان و پێناسەی حەقیقی و مەفهومیان نیە (١٣)هەرچەند قاعدە وایە ئەگەر شتێ تەعریف بکرێ ئەبێ بەیانیمەفهوم وماهیەتی بکرێ نەك پێکهاتەی(ماصدق)ی، لێرەش حەق وابوو وابێ.**

لأنّ مفهومهما مختلف[1] ولاحاجة الى ذكره للعلم به من تعريفي الفقه و الإجتهاد[2] فما تقدَّمَ من انّهم ماقالوا الفقيه العالم بالأحكام اي الخ [3] لذلك[4] على انّ بعضهم قاله تصريحاً بما عُلِم إلتزاماً[5]

{والفقه العلمُ بالأحكام} اي بجميع النسب التامّة[6] {الشرعية} اي الماخوذة من الشرع المبعوث به النّبيِّ الكريمﷺ[7] {العمليَّة} اي المتعلّقة بكيفية عمل قلبي او غيره[8] كالعلم بأنّ النية في الوضوء واجبةٌ وأن الوتر مندوب[9] {المُكتَسبُ} ذلك العلم {من ادلّتها التفصيلّية} اي من الأدلّة التفصيلية للأحكام[10] فخرج بقيد الأحكام العلم بغيرها من الذوات والصفات[11] كتصور الإنسان والبياض[12]

---

(١)چونكە مەفهومی ئەم دوانە جیان لەیەك بەلأم پێكهاتیان (ما صدق) یان یەكە مەفهوم و مانای(فقيه) زانایەكی وردبینە لەئەحكامی فقهی عەمەلیدا، (مجتهد) بەوە ئەڵێن ئەحكامی فقهی عەمەلی دەربهێنێ، واتە فقیه زانایە بەلأم موجتەهید دەرهێنەرە(مستخرج)ە. (٢)پێویست ناكا پێناسەی (فقيه)و (مجتهد) بكرێ چونكە بە تەعریفی پێناسەی فقه (فقيه) دەناسرێ ، وەبە پێناسەی ئیجتیهاد (مجتهد) دەزانرێ.

(٣)ئەوەی كە رای بورد وتویانە فقیه واتە: عالم و زانا بەئەحكامی (فقه)، (مجتهد) دەرهێنەری ئەحكامە (٤)ئەوە بۆ نەیان وتووە؟ لەبەر ئەوە بوو كەوتمان: بە پێناسەی فقه (فقيه) دەناسرێ ، وەبە پێناسەی ئیجتیهاد (مجتهد) دەزانرێ. (٥)هەرچەندە هەنێ لەزانایان بە سەراحەت و راشكاوی تەعریف و پێناسەیان كردون واتە ئەوەی بە (إلتزام) و پێویست دەزانرێ ئەوان سەراحەت و راشكاوانە ووتویانە.

(٦)(فقه) بریتیە لەعیلم و زانین بە هەموو حوكمێك (بریارێك) كە نیسبەت بدرێ بۆ لای شەرع واتە یاسای خوا (٧)وەرگیراو لەو شەرعەی كە پێغەمبەری ئیسلام پیێ نێرراوە (٨)ئەو حوكمە شەرعیە مەبەستە كە پەیوەندی هەیە بەچۆنیەتی كارو كردەوەی مرۆڤەوە ، ئەو كردەوەش بەدڵ بكرێ یاخود بە ئەندامێكی تری مۆڤ بكرێ (٩)وێنە بۆ هەردوكیان عیلم وزانیاری بەوە كە نیەت واجبە لە دەست نوێژدا ئەمە نموونە بۆ عەمەل و كردەوەی قەلبی، یاخود عیلم بەوەی وەتر مەندوبەو هانی خەڵكی زۆر لەسەر كردنی دراوە (١٠)واتە دەبێ ئەو عیلمە وەرگیرابێ لە بەڵگە تەفسیلیەكانی ئەحكامی فقە نەك لە كتێب وەرگیراوبن.

(١١)بەوشەی (الأحكام) لە پێناسەكەدا عیلم بەغەیری ئەحكام چووەدەر، مەبەست بە غەیرە ئەحكام عیلم بەزات و سیفاتە. (١٢)وەكو تەسەوری ئینسان بكرێ ئەو وێنەیە لەمێشكدا دروست ئەبێ پیێ ناوترێ (فقه)، یاخود كە تەسەوری سپیایی كاغەز

**وبقيد الشرعيّة العلمُ بالأحكام العقلية و الحسِّية[1] كالعلم بأنّ الواحد نصف الإثنين و انّ النار محرقة[2] وبقيد العَمليَّة العلم بالأحكام الشرعية العلميَّة اي الإعتقاديَّة[3] كالعلم بأنّ الله واحدٌ وانَّهُ يُرى في الآخرة[4] وبقيدِ المكتسب علمُ الله وجبريلَ و النَّبيَّ ﷺ بما ذُكر[5] وبقيدِ التفصيلية العلمُ بذلكَ المكتسبُ للخلافيّ من المقتضي[6] والنافي[7] المثبت بهما مايأخذهُ من الفقيه ليحفظهُ عن إبطال خصمه[8] فعلمُهُ مثلاً بوجوب النية في الوضوءِ لوجود المقتضي اوبعدم وجوبِ الوترِ لوجودِ النافي ليس منَ الفقهِ[9]**

---

**ئەکەی وێنەی سیفەتیسپیەتی کاغەزت بۆ ئەگیریٚ، ئەو عیلمەی کە پەیدا بووە لە تەسەوری زاتی ئینسان و سیفەتی سپیایەتی دا (فقە)ی پیٚناوتریٚ (١)بەوشەی (الشرعیة) عیلم بەهەموو حوکمیٚکی عەقلّی و هەستی چووەدەر (٢)وەك ئەوە کە دەزانریٚ یەك نیوەی دووە، ئەمە حوکمیٚکی عەقلّیە یاخود ئاگر سوتیٚنەرە ئەم عیلمە بەهەست پەیدا ئەبیٚ بەهۆی دەست لیٚدانەوە.**

**(٣)وە بەوشەی (العملیة) عیلم بە ئەحکامی شەرعی عیلمی و زانیاریەکان چووە دەرەوە واتە حوکمی عەقیدەیی چووە دەرەوە (٤)چونکە ئەم عیلمە پەیوەندی بەکردەوەوە نیە پەیوەندی بەدەرون و بیرو باوەڕەوە هەیە، وەك ئەمە بلّیٚی خوا تاك و تەنهایە یاخود بلّیٚی خوا لەدوارۆژدا دەبینریٚ (٥)ئەمانە حوکمی شەرعی عیلمین واتە لەبەشی عەقیدەن لە عەمەل و کردەوە نین ، بەوشەی (المکتسب) عیلم و زانیاری خوا و جوبرەئیل و پیٚغەمبەر ﷺ لەپیٚناسەی فقهدا چووە دەر.**

**(6)وە بەوشەی (التفصیلیّة) لە پیٚناسەکەی (فقە)دا ئەو عیلمەی بە حوکمیٚکی شەرعی پەیدا دەبیٚ بۆ زانایەکی خیلافی کە لە دەلیلی ئیجمالی وەری دەگریٚوەك دەلیلی (المقتضی) واتە داخوازی کردن (7)بۆ وێنە مالکیەکان فەرموویانە دەستهیٚنان بەسەر ئەندامەکانی لاشەدا لە کاتی دەست نویٚژو خۆشۆردندا واجبە لەبەر داخوازیٚك کەبە زانیاری خۆیان ئەیدۆزنەوە نەك فیٚری بووبن بەهۆی تەقلیدەوە، هەروەها (النافي) (٨)وەك شافعیەکان فەرموویانە ئەو دەستهیٚنانە واجب نییە نەفی لیٚ ئەکەن هەریەکەیان لە پیٚشەوا مالك و شافعی نەقلّیان کردوە بە پیٚچەوانەی یەکتریەوە، بۆیە پیٚی ئەلّیٚن (خلافی) کە ئەو خلافە سابت ئەبیٚ بە موقتەزیو نافیەکە کە وەرگیراوە لە (فقیە) ئەوەی وەری گرتووە بۆ ئەوەی بیپاریٚزیٚ بەرامبەر دژەکەی بەتالّی ئەکاتەوە.**

**(٩)بۆ وێنە زانایەکیخلافی لەمەزهەبیشافعیدا ئەو عیلمەی بۆ پەیدا دەبیٚ کە نییەت لە دەست نویٚژدا واجبە لەبەر بوونیداخوازیٚك کە دەلیلی ئیجمالی سەر مەزهەبەکەیەتی نەك لەبەر حەدیسی(إنّما الأعمال بالنیات) یاخود واجب نەبوونی نویٚژی وەتر لەبەر**

وعبّروا عن الفقه هنا بالعلمِ[١] وإن كان لظنيَّةِ ادلتهِ ظناً[٢] كما سيأتي التعبير به عنه في كتاب الإجتهاد[٣] لأنَّهُ ظنُّ المجتهدِ الذي هو لقوّتهِ قريبٌ من العلمِ[٤] وكون المراد بالأحكام جميعها[٥] لاينافيه قول مالك من اكابر الفقهاء في ستٍ وثلاثين مسئلةً من اربعين سُئِل عنها لاادري[٦] لأنَّهُ متَهيّئٌ للعلم[٧] بأحكامها بمعاودة النظر وإطلاق العلم على مثل هذا التهيؤِ شائعٌ عرفاً[٨] يُقال فلانٌ يعلم النحو ولايُراد انّ جميعَ مسائله حاضرةٌ عنده على التفصيل بل إنَّه متهيئٌ لذلك[٩] وما قيل من انّ الأحكام الشرعية قيدٌ واحدٌ جمع الحكم الشرعي المعرف بخطاب الله[١٠] الآتي فخلاف الظاهرِ[١١] وان آل الى ما تقدَّم في شرح كونهما قيدين كما لايخفى[١٢]

---

نەبوونی داخوازێك. كە دەلیلی ئیجمالی مەزهەبەكەیەتی. ئا ئەو جۆرە عیلمانە كەسەرچاوەكەیان دەلیلی ئیجمالی خودی سەر مەزهەبەكەیەتی (فقە)ی پیّ ناوتریّ و (فقە) نیە. (١)ئەی باشە بۆ تەعریفی (فقە)ی بەعیلم كردوە ئەبوایە بە (ظنّ)ی بكردایە ، واتە لێرەدا فقهیان بۆ بەعیلم تەعبیر داوەتەوە. (٢)لە كاتێكیشدا كە (فقە) هەمووی (ظنّ)ە لەبەر ئەوەی كە بەڵگەكانی زەنین (٣)واتە سەد دەر سەد نین ، چونكە هەموویان نەقڵكراون وەك لەبەشی ئیجتهاد دا تەعبیر كراوە بە (ظنّ) (٤)نەك وەكو ئێرە كە بەعیلم لیكدراوەتەوە كە دەڵێ: (الفقه الظنُّ) بەلاّم بۆیە لێرە بە عیلم تەعبیر كراوە چونكە ئەو زانایانە ئەوەندە زەنی موجتەهیدەكەیان لەلا بەهێز بووە زەنەكەیان زۆر نزیك لە عیلمەوە زانیووە. (٥)لەپێناسەكەدا ووترا عیلم بەهەموو ئەحكام نەك بەهەندێكیان (٦)ئەمەش دژ نیە بۆ وەلاّمی مالك كەیەكێكە لەپیاوە موجتەهیدەكان خاوەنی مەزهەبێكە لە چل پرسیاردا وەلاّمی سیو شەشی رەدكردەوەو فەرمووی نازانم (٧)چونكە ئیمام مالك ئامادە بوو بۆ ئەوەی حوكمی ئەو (٣٦)ە بزانیّ ئەگەر چاوو بیرێكی پیا بخشاندایە، بۆیە تەهەیوئی دەبڕیّ بەسەد عیلم دا.

(٨)ئەم جۆرە ئامادەبوونانە عیلمی بەواتا (ظنیان) بەسەردا بڕیّ زۆر بلاّوە لە عورفی زانایاندا (٩)چونكە دەوتریّ فلاّن كەس نەحو دەزانیّ مەبەست ئەوە نیە هەموو مەسائیلی نەحو بەتەفسیل لە هەموو كاتێكدا لەلای ئامادەیەو ئەتوانیّ بیانڵیّ بەڵكوو مەبەست ئەوەیە ئامادەیە بۆ ئەوە. (١٠)ئەوەش كە ووتراوە ئەحكامی شەرعی یەك قەیدە بەواتای ئەو حوكمە شەرعیەیە كە لەمەودوا پێناسە دەكریّ بە (خطاب الله). (١١)تا ئەم قسەیە پێچەوانەی قسەی روون و ئاشكرایە (١٢)هەرچەندە سەرەنجام دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی پێشەوە كە بەدوو قەید شەرحیان دەكات ، وەك شاراوە نیەو نابیّ لەسەر كەسیّ ووردبین بیّ.

{والحكمُ} المتعارف بين الأصوليين[١] بالإثبات[٢] تارة والنفي أُخرى[٣] {خطاب الله} اي كلامهُ النفسيُّ الأزلَيَّ المُسمّى في الأزل خطاباً حقيقة على الأصح كما سياتي[٤] {المتعلق بفعل المكلّف}[٥] اي البالغ العاقلُ تعلُقاً معنوياً قبل وجوده كما سياتي[٦] وتنجيزيّاً بعد وجوده بعدَ البعثة[٧] إذ لاحكمَ قبلَها كماسياتي[٨] {من حيثُ إنّهُ مكلّفٌ} اي ملزم مافيه كلفة كما يعلم مما سيأتي[٩] فتناول الفعل القلبيَّ الإعتقادي وغيرَه[١٠] والقولي وغيره[١١]

---

(١)ئەلف و لامی وشەی (الحكم) بۆ عەهدە: واتە ئەو حوكمە لەنێوان زانایانی (اصول) دا ناسراوە (٢)بەرامبەر بە ئەهلی فەترە – ئەهلی فەترە بەو کەسانە ئەڵێن کە پێش زەمانی پێغەمبەر مردون بانگەوازیان پێنەگەیشتوە – جارێك بەسەلماندنی حوكم بۆیان واتە (مكلّف) ن موكەلەفن (٣)جارێکیش نەفی دەکەن واتە موكەلەف نین (٤)خیتاب پێویست ناکا موخاتەبی هەبێ ئەمە بە ئیعتیباری بوونی داهاتوو، لە کەلامی نەفسی ئەزەلی خوا کە هەر لە ئەزەلدا ناودەبرێ بە خیتابی حەقیقی بەلای رای رونترو راسترە، وەك لەمەودوا باسی دێ (٥)نەك بەئیعتیباری لەمەودوا دێ ئەو حوكمە بەواتای گفتو گۆی خوایە، پەیوەندە بەکارو رەفتاری موكەلەفەوە. (٦)ئەویش بەکەسێ دەڵێن لەروی جەستەوە پێگەیشتبێ و لەبارەی عەقڵو هۆشیشەوە هۆشیاربێ، جا دوو جۆرە تەعەلوق و پەیوەندی هەیە: ١-پەیوەندییەکی مەعنەوی (بالقوة) واتە لەتوانادا هەیە پێش پەیدابوونی موكەلەفەکە، وەك لەمەودوا دێت.

(٧)٢-پەیوەندییەکی (تنجيزي) کتوپڕی واتە جێبەجێ بکرێ (بالفعل) کە ئەویش دوای پەیدا بوونی موكەلەف دەبێ لەدوای ناردنی پێغەمبەر دەبێ لەگەڵ پێگەیاندنیو تێگەیاندنیدا (٨)چونکە ئەو حوكمەی باسمان کرد پێش هاتنی پەیامی خوایی وجودی نیە وەك لەمەودوا دێ (٩)بەکورتی کەلامی ئەزەلی خوا بەدوو جۆر عەلاقەی بە نوێژو حەج و زەکاتی موكەلەفەوە هەیە ١-ئەوەیە دروستی کردون. ٢-ئەوەیە واجبی کردون ، جا ئەو حوكمەی عەلاقەی بە(فعل) و کرداری موكەلەفەوە هەیە لەوبارەیەوە کە ئەو موكەلەفە(مكلّف)ە واجبە لەسەری واتە تەکلیفی تەنجیزیمان مەبەستە ، ئەی تەکلیف بەچی دەڵێن ؟ بریتیە لەوەی قورسی وگرانی تیادا هەبێ لەسەر دەرون وەك واجب و حەرام ، مەشەقەتیان تیا هەیەو ئەوانی تریش وەك دەزانرێو وەردەگیرێ لەوەی لەمەودوا دێ. (١٠)پێناسەی ئەو حوكمە گشتگیرە بۆ هەموو فیعلێکی قەلبی ئیعتیقادی وەك بوونی خوا و ئەوانیتر (١١)وەبۆ فیعلی قەلبی غەیر ئیعتیقادی وەك بوونی نیەت لە دەست نوێژدا.

**والكفّ[١] والمكلف[٢] الواحد كالنبيّ ﷺ في خصائصه والأكثر من الواحد[٣] والمتعلّق بأوجه التعلق الثلاثة[٤] من الإقتضاء الجازم وغير الجازم[٥] والتخيير الآتية[٦] لتناول حيثية التكليف للأخيرَين منها[٧] كالأول الظاهر[٨] فإنَّهُ لولا وجود التكليف لم يُوجدا[٩] الا ترى الى إنتفائهما قبل البعثة كإنتفاءِ التكليف[١٠] ثمّ الخطاب المذكور يدلّ عليه الكتابُ والسنَّةُ وغيرهُما[١١] وخرج بفعل المكلّف خطابُ الله المتعلق بذاته وصفاته[١٢] وذوات المكلفين[١٣] والجمادات كمدلول[١٤]**

---

(١)وەبۆ تەكليفی قەولی وەك الله اكبر تەحەرم، یاخود غەیرە قەولی وەك جێبەجێكردن زەكات و حەج، وەهەروەها گشتگیرە بۆ هەموو قەدەغەكراوێك (٢)هەروەها ئەو تەعریفە شامیلە بۆ تاكە موكەلەفێك وەك پێغەمبەرﷺ لە تایبەتمەندیەكانی خۆیدا. (٣)وەهەروەها شامیلە بۆ زیاتر لەیەك موكەلەف

(٤)وەك نوێژ بۆ كەسێك، هەروەها ئەو تەعریفە شامیلە بۆ كەلامە نەفسیەك موتەعەلق و پەیوەندار بێ بەفیعلی موكەلەفەوە بە یەكێك لەو سێ پەیوەندییانەوە (٥)وەك كەلامە نەفسییەك كە داخوازی كردنی كارێك دەكا، ئەمیش دوو جۆرە: ا- (الجازم) داخوازییێكی پێویست وەك واجب بێ. ب- (غیر الجازم) داخوازییێكی غەیرە پێویست وەكو (سنة)) سوننەت ، یاخود داخوازی نەكردنی كارێك دەكا ئەمەیش دوو جۆرە: ١-جازمە، وەك حەرام. ٢-غەیرە جازمە وەك كەراهەت . (٦)كەوابوو ئەو سێ پەیوەندیە : ١- داخوازی جازم ٢- داخوازی غەیرە جازم ٣- (التخییر) واتە دانە دەست ئارەزوو كە ئەو سیانە لەمەودوا بەدرێژی باسیان لێوە دەكرێ.

(٧)جا تۆ ووتت تەكلیف ئەوەیە قورس و گرانی تیادا بێ ، ئەو قورس و گرانیە لە غەیرە جازم و تەخییردا نیە؟ ئەمیش دەڵێ : چونكە تەكلیف شامیلە بۆ دووەم و سێهەمی ئەم داخوازیە (٨)وەك شامیلە بۆ یەكەم بەڵام لەیەكەمدا زۆر بە رونی دیارە (٩)بەڵام دوهەم وسێهەم بەدەوری یەكەم دا ئەسوڕێنەوەو خزمەتكاری یەكەمن . چونكە ئەگەر تەكلیف نەبێ ئەم دووانەش نەدەبوون (١٠)نابینی غەیرە جازم و تەخییر نین پێش هاتنی پەیام وەك تەكلیف نیە (١١)پاش ئەم پێناسە ئەبێ بزانی: ئەو خیتابەی باسكرا جاری واهەیە قورئان ئەیگەیەنێ جاری واهەیە سوننەت جاری واش هەیە غەیریئەم دووانەیە بەڵكوبەقیاس وئیجماع(١٢)دانەر وتی:حوكمی موتەعارەف ئەوەیە پەیوەندی هەبێ بە فیعلی موكولەفەوە،بەم وشەیە ئەم گفتوگۆیێ دەچێتەدەر كە پەیوەندی هەیە بەزاتی خواو سیفاتی خواوە (١٣)یاخود پەیوەندی هەیە بەخودی موكەلەفەكانەوە (١٤)یاخود بەدروستكراوە بێ گیانەكانەوە هەبێ.

﴿ الله لا إلـه إلاّ هـو خـالق كـلّ شـيئ ﴾[١] ﴿ ولقـد خلقنـاكم ﴾[٢] ﴿ ويـوم نسـيِّرُ الجبال﴾[٣] وبما بعدَهُ مدلول وماتعملون من قوله تعالى:﴿ والله خلقكم وما تعملون ﴾ فإنَّهُ متعلقٌ بفعل المكلَّف من حيث إنهُ مخلوق لله تعالى[٤] ولاخطاب يتعلّقُ بفعل الغير البالغ العاقل[٥] ووليُّ الصّبيّ و المجنون مخاطب بأداء ماوجب في مالهما منه كالزكاة و ضمان المتلَفِ[٦] كما يُخاطبُ صاحبُ البهيمةِ بضمان ما أتلفتْهُ حيثُ فرَّطَ في حفظها لتنزّل فعلها في هذه الحالة منزلة فعله[٧] وصحة عبادة الصبيّ كصلاته و صومه المُثاب عليها ليس لأنَّهُ مأمورٌ بها كالبالغ بل ليعتادها فلا يتركها بعد بلوغه إن شاء الله ذلك[٨]

---

(١)ئەم رستەیە گفتوگۆی ئەزەلی خوایە، بەلاّم حوکمی موتەعارف نیە، چونکە باس لە زاتی خواو سیفەتی خوا دەکا (٢)ئەمیش حوکمی موتەعارف نیە، چونکە باس لە زاتی ئینسان دەکا (٣)ئەمیش هەروەها چونکە باس لە جەمادات ئەکا (٤)وە بە هۆی ئەو قەیدەی دێت بەشوێن ئەم وشەیەدا (من حیثُ إنَّهُ مكلَّفٌ) دەچێتەدەر مانـای (وماتعملون) ئەوەی ئێوە دەیکەن کە بەشێکە لە ئایەتی﴿ والله خلقكم وما تعملون ﴾ خوا ئێوەی دروستکردوە ئەوەیش دەیکەن هەر خوا دروستی کردوە، بۆ دەچێتەدەر؟ چونکە ئەوەی کەلامی ئەزەلیە پەیوەندی هەیە بە فیعلی موکەلەفەوە ، بەلاّم لەوبارەیەوە کە دروستکراوی خوایە (٥)نەك لەو بارەوە کە ئەو ئینسانە موکەلەفە بەئەنجام دانیئەو کارە، هەروەها هیچ خیتابە تەکلیفێك نیە پەیوەندی هەبێ بەکارو کردەوەی مرۆڤی نابالغی عاقڵەوە یا بالغی غەیرە عاقڵەوە.

(٦)جا بۆ زەکات واجبە لە ماڵی منداڵدا بدرێ ؟ ئەمیش دەڵێ سەرپەرشتیری منداڵ و شێت موخاتەب و فەرمان پێدراوە لە ئەنجامدانی ئەو واجبەی کە رو لە هەر شتێکی ئو دوانە بکات (نەك خودی خۆیان) وەك ئەو زەکاتەی لە ماڵیاندا واجب دەبێ (٧)یاخود ئەو بژاردنەوەی کە واجب دەبێ لە ماڵیاندا بەهۆی زیانێك کە لە ماڵی خەڵکی دەدەن ، بۆ ئەم حوکمە ئایا وێنەیەك هەیە؟ بەڵێ وەك خاوەنی ئاژەڵێك فەرمانی بەسەردا دەدرێ بەبژاردنەوەی ئەوەی ئاژەڵەکەی دەیفەوتێنێ لە هەر جێگەیەکدا کە گوێ نەدابێ بە پاراستنی ئەو ئاژەڵە لە زیان دان. چونکە زیانی ئاژەڵەکەی لەم کاتی گوێ پێنەدانەی دا بەکاری خۆی حیساب دەکرێ.

(٨)ئەی باشە بۆ عیبادەتی منداڵ سەوابی هەیە ؟ لەگەڵ ئەوەشدا ختابی کەلامی ئەزەلی نەبەستراوە پێیەوە؟ ئەمیش ئەڵێ: دروستە بەندایەتی منداڵ وەك بەجێهێنانی نوێژو رۆژوەکەی کە پاداشتی دەدرێتەوە لەبەر ئەوە نیە فەرمانی پێدراوە ئەو خوا پەرستیە بکا وەکو ئادەمیزادی پێگەیشتوو، بەڵکو لەبەر ئەوەیە خویپێوە بگرێ ئیتر

**ولايتعلّق الخطاب بفعل كلّ بالغٍ عاقلٍ[1] كما يعلمُ مما سياتي[2] من إمتناع تكليف العاقل و الملجأ و المكرهِ[3] ويرجع ذلك في التحقيق الى إنتفاءِ تكليفِ البالغ العاقلِ في بعضِ احواله[4] وامّا خطاب الوضع الآتي فليس من الحكم المتعارف[5] كما مشى عليه المصنّفُ[6] ومن جعلهُ منهُ كما إختاره إبن الحاجب زاد في التعريف السابق ما يُدخِله[7] فقال خطابُ الله المتعلّقُ بفعلِ المكلّفِ بالإقتضاء أو التخيير أو الوضع[8] لكنه لايشمل من الوضع ما متعلّقهُ غيرُ فعلِ المكلّفِ[9] كالزوال سبباً لوجوب الظهرِ[10] واستعمل المصنف كغيره (ثمَّ) للمكان المجازيّ كثيراً[11]**

---

تەرکی نەکا دوای بالغ بوونی ئەگەر خوا ویستی لەسەر بیٚ. (١)گفتوگۆی ئەزەلی خوا پەیوەندی نیەبکارو کرداری هەموو کەسێکەوە کە بالغ و عاقل بیٚ (٢)وەك دەزانریٚ لەوەی لەمەودوا دیٚ (٣)ئەوەش کەدیٚ وەك قەدەغەکردنی تەکلیف لە مرۆڤی بیٚئاگاه یاخود بیٚدەسەلات وەك کەسێك لەبەرزاییەکەوە بەربێتەوە یاخود زۆرلیٚکراو.

(٤)ئەمانە خیتابی موتەعارف رویان تیٚناکا هەر چەندە بالغ و عاقلیشن، لەواقع و نەفس ئەمردا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی تەکلیف لەسەر مرۆڤی بالغ و عاقل لە هەندیٚ بواری ژیاندا (٥)مەبەستمان (خطاب التكلف)ە نەك (خطاب الوضع) ئەمە گشت گیرە بۆ هەموو کەس دەکا بەلاّم (خطاب الوضع) کە لە مەودوا دیٚ ئەو لە حوکمی موتەعارفی نێوان زانایانی (اصول) نیە (٦)وەك دانەریش لەسەر ئەوە رۆیوە واتە باسیکردوە (٧)وە ئەگەر کەسێکیش (خطاب الوضع)ی بەبەشێك لە حوکمی موتەعارف دانابیٚ، (إبن الحاجب) ئەو رایەی هەڵبژاردوەو بەچاکی زانیوە ، ئەوە لەپێناسە رابووردوەکەدا شتێکیان زیادکردوە کە ئەویش بێتە ناو چوارچێوەی پێناسەی حوکمی موتەعارف.

(٨)بەم شێوە ووتویەتی: حوکم بریتیە لە گفتوگۆی خوای گەورە کە پەیوەندبیٚ بەفیعلی موکەلەفەوە ئەو پەیوەندیەش بە: أ-داخوازی بیٚ بۆ کردن یانەکردن ب- بەتەخییرو دانە دەست ئارەزوبیٚیا بە(وضع) بیٚ (٩)واتە شتیٚ بکریٚ بەمەرج بۆ شتیٚ، یاشتێك بکریٚ بەسەبەب بۆ شتێکیتر ، یاشتێك بکریٚ بە(مانع) و قەدەغە بۆ شتێکیتر، بەلاّم ئەم پێناسە گشتگیر نابیٚ بۆ(وضع)ی شتێك کە موتەعەلەقەکەی فیعلی موکەلەف نەبیٚ (١٠)وەك تێپەڕ بوونی رۆژ لەناوەراستی ئاسماندا بەرەو رۆژئاوا هۆکارە بۆ واجب بوونی نیوەڕۆ ،چونکە زەوال فیعلی موکەلەف نیە. (١١)دانەری ئەم کتێبە و بێجگە لەویش وشەی (ثمّ) یان، زۆر بەکارهێناوە بۆ مەکانی مەجازی .

ويُبيِّن في كلِّ محلٍّ بما يناسبهُ كما سيأتي[١] فقولُهُ هنا[٢] {ومنْ ثمَّ} اي من هنا[٣] وهو انَّ الحكم خطاب الله[٤] اي من اجلِ ذلك نقول[٥] {لاحكم إلاّ لله}[٦] فلاحكم للعقلِ بشيئٍ[٧] مما سيأتي عن المعتزلة[٨] المعبِّر عن بعضه بالحسن والقبح[٩] ولمّا شاركهُ في التعبير بهما عنهُ ما يحكم به العقلُ وفاقاً[١٠] بدأبه تحريراً لمحلِّ النزاع[١١] فقال {والحُسْنُ والقُبْحُ}للشيئِ {بمعنى ملائمةِ الطبعِ و منافرتهِ} كحسن الحلو و قبحِ المرِّ {و}بمعنى {صفة الكمال و النّقصِ} كحسن العلم و قبحِ الجهلِ . {عقليٌّ} اي يحكم به العقلُ إتفاقاً[١٢]

---

(١)—كە لە حەقیقەت و راستی دا بۆ مەکانی حەقیقی دانراوە— وە لە هەموو جێگایەکدا ئەو مەکانە مەجازیە رون دەکرێتەوە ، بەشتێك کە شیاوی ئەو جیٚیە بیٚ وەك لەمەودوا دیٚ (٢)بۆ وێنە دانەر کە لێرەدا دەڵیٚ (٣)واتە لەبەر ئەو شتەی کە ئێستە وتمان (٤)بەلاّم مانا حەقیقیەکەی لەبەر ئەو مەکانی ئەویٚ واتە لەبەر ئەو شتەی لەویٚ ووتراوە کە بریتیە لە حوکم یانی (خطاب الله) (٥)واتە لەبەر ئەوە کە حوکم (خطاب الله)یە دەڵێین (٦)هیچ حوکمێك نیە بۆ کەس جگە لە بۆ خوا نەبیٚ.

(٧)—چونکە (خطاب الله) تایبەتە بە (الله)وە — دەی کەوابوو عەقڵ و ژیری بۆی نیە هیچ جۆرە حوکمێك بەهیچ جۆرە شتێك بدات (٨)— بەچاك یان خراپ، بەکردن یان نەکردن کە سەرەنجامەکەی پاداشت یاخود تۆڵەبیٚ— لەوەی کە لەمەودوا دیٚ لەبارەی موعتەزیلەوە(معتزلة) (٩)تەعبیر ئەدرێتەوە لە هەندیٚ لەوەی کە دیٚ بە (حُسن و قُبح) عەقڵی (١٠)کاتێك ئەوەی عەقڵ حوکمی پیٚدەکات هاریکاری کردبیٚ لە تەعبیرو دەربڕینی ئەو رێبازەیەدا بە(حُسن و قُبح) (وفاقاً) واتە ئێمەیش و ئەوانیش (معتزلة) هەر حوکمی عەقڵی پیٚدەڵێین ، یەك قسەین لەهەندیٚ (حُسن و قُبح)دا

(١١)—لەبەر ئەوەی هاورای ئەوانین لە هەندێکیاندا — دانەر سەرەتا دەستی کرد بەباسکردنی ئەو (حُسن و قُبح)ی هاوقسەین لەبەر پاڵفتەکردن و جیاکردنەوەی جیٚی کێشەی ئێمەو ئەوان (١٢)لەبەر ئەوە دانەر وتی: (حُسن و قُبح) سیٚجۆرە ، دوانیان هەمومان یەکڕاین تیایاندا سێهەمیان جیٚی کێشەی هەردوو لامانە:

١—حوسنێك بەواتای گونجان لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا ، بۆیە حوکم دەکەی بەچاکەی ئەو شتە وەك جوانی شیرینی هەنگوین، یاخود ناشیرینی دەربڕی بەسەر تاڵیدا لەبەر نەگونجانی لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا ، ئەم دوو بڕیارە دوو حوکمە بڕیاری سروشت و عەقڵ و ژیرین. ٢—وەحوسنێك بەواتای سیفەتی کەمال بیٚ، وەك حوکمدان بەسەر زانیاریدا بەجوان و قەشەنگ ، یاخود (قُبح) بەواتای سیفەتی نەقس و ناتەواو بیٚ،

{و بمعنى ترتبٌ} المدح و{الذم عاجلاً}والثواب {والعقاب آجلاً}كحُسنِ الطّاعةِ و قُبحِ المَعصيةِ {شرعيٌّ} اي لايحكمُ به إلاّ الشرع المبعوث به الرُسُل[1] اي ليُؤخذُ إلاّ من ذلك ولايُدرَكُ إلاّ بهِ[2] { خلافاً للمعتزلة}في قولهم إنّه عقليٌّ اي يحكم به العقلُ[3] لما في الفعل من مصلحةٍ او مفسدةٍ يتبعها حسنهُ و قبحُهُ عبد الله[4] اي يدرك العقل ذلك[5] بالضرورة كحسن الصّدق النافع و قبح الكذب الضار[6] او بالنظر كحسن الكذب النافع و قبح الصّدق الضار[7] وقيل العكس[8] ويجيئ الشرع مؤكّداً لذلك[9]

---

وەك حوكمدان بەسەر نەزانيدا بە قوبح و ناشيرين ، ئەمەش عەقڵ بڕياری لەسەر ئەدا بەتاك ڕەوی خۆی، بیٚ ئەوەی پێويستی هەبیٚ بە حوكمی شەرع، بەرای هەردوو لامان.

(١) ٣-بەلاَم ئەگەر (حُسن و قُبح) بەواتای سوپاس و گلەيی دونيا بن و پاداشت و تۆڵەی قيامەت بن وەك حوكمدان بەسەر گوێڕايەڵی خوا بەكاری چاكە، وەبەسەر گوناهو تاواندا بەخراپ و ناشيرينی ، بەم شێوەيە بڵێی گوێڕايەڵی خوا چاكەو بیٚفەرمانی خوا ناشيرينە، ئەم بڕيارانە لەشەرعەوە وەردەگيرێن واتە كە، ناتوانیٚ ئەم حوكمە دەركا ، جگە لە شەرع نەبیٚ پێغەمبەرانی پیٚنێرراون.

(٢)واتە ئەو بڕيارە تەنها لەشەرع وەردەگيریٚ، بەشەرع نەبیٚ بەهيچ شتێك دەرك ناكریٚ و نازانریٚ. (٣)ئەم بەشە سێهەمە بەڕای ئێمەيە، بەلاَم بە پێچەوانەی (معتزلة)وە كە دەڵێن ئەمەيش هەروەك ئەو دوانەكەی تر عەقڵيە ، واتە عەقڵ حوكمی پیٚئەكاو بڕياری لەسەر ئەدا.

(٤)چونكە لەو كارەدا يابەرژەوەندی تيايە ياخود زيان ، دەخۆ حوسن و قوبحی ئەو كارە لای خوايش تابعی بەرژەوەندیو زيانە (٥)ئەگەر لەبەرژەوەندی دابیٚ ئەوە حوسنە ئەگەر ببێتە هۆی زيان ئەوە قوبحە ، ئەی يانی چی عەقڵ حوكمی پیٚئەكا؟ واتە ژيری ئەو (حُسن و قُبح)ە ئەزانیٚ پەی پیٚ ئەبا.

(٦)بەسیٚ پلە: ١-بیٚ ئەوەی بيری لیٚبكاتەوە پەی پیٚئەبا، وەك حوكمدان بەسەر راست گۆيی سود بەخشە درۆكردن زيان بەخشە بیٚ سوودە (٧)ياخود بەهۆی بير لیٚكردنەوەوە پەی بیٚ ئەبات و ئەيزانیٚ وەك حوكمدان بەسەر درۆی سود بەخشدا بەجوانی و راستی زيان بەخشدا بەناشيرينی (٨)ئەمە راستەو خۆ نازانریٚ دەبیٚ بيری لیٚبكاتەوە . وەبە پێچەوانەشەوە ووتراوە ،چونكە درۆ هەرچەندە قازانجيشی هەبیٚ هەر ناشيرينە، راستيش هەرچەندە زيانی هەبیٚ هەر جوان و شيرينە، بەلاَم قسەی پێشەوەی تەنها چاوی لە قازانج و زيانەكە بڕيوە. (٩)شەرع دیٚ دوپاتی ئەو ئيدراكە دەكاتەوە و دەيسەلمێنیٚو پشتگيری دەكا.

لو بإستعانة الشرع فيما خفي على العقل[١] كحُسن صوم آخر يوم من رمضان وقبحِ صوم أول يومِ من شوّال[٢] وقوله كغيره عقليٍّ و شرعي خبر مبتدا محذوف اي كل منهما أو كلاهما[٣] وتركه كغيره المدح والثّواب للعلم بهما من ذكر مقابلهما[٤] الأنسب[٥] كما قال بأصول المعتزلة فإنّ العقاب عندهم لايتخلّفُ[٦] ولايقبلُ الزيادةَ[٧] والثواب يقبلها وإن لم يتخلّف ايضاً[٨]

{وشكر المنعم} اي وهو الثّناء على الله تعالى[٩] إنعامه بالخلق والرِّزق والصّحة وغيرها[١٠] بالقلب بأن يعتقدَ انّهُ تعالى وليُّها[١١] او اللسان بأن يتحدَّثَ بها[١٢] اوغيرهِ كأن يخضع له تعالى[١٣]

---

(١)٣-ياخود شتێك عەقڵ و ژيری پەی پێ نەبرد نايبا ، بەڵام بەهۆی يارمەتی شەرعەوە ئيدراكی ئەكا (٢)وەك چاكی و پيرۆزی كۆتايی رۆژووی كۆتايی رەمەزان وە خراپیو ناشەرعيەتی رۆژوی يەكەمی شەوال ئەمەيان شەرع نەبێ ئيدراكی ناكا(٣)دانەر لە مەتنەكەدا فەرمووييەتی (عقليٍ)و (شرعي) ئەمانە خەبەرن ... بۆ مبتدەئێكی مەحزوف، كە يەكێكە لەم دووانە (كل منهما)يا (كلاهما) (٤)دانەر وەك زانايانی تر لە دەقی مەتنەكەدا(المدح) و (الثواب) ی باس نەكردوە ، چونكە ئەم دووانە دەزانرێن لە رێی باسكردن هاوتاكانيانەوە.

(٥)چونكە كەوترا (الذّم) بەوە (المدح) دەزانرێ ، وەك وتراوە (الثّواب) بەوە (العقاب) دەزانرێ، ئەگەر كەسێك بڵێ بائەم دووانە بووتاەو ئەوانی تری تەرك بكردايە ؟ ئەميش دەڵێ: ئاخر ئەو دووانە شياوو موناسبترن بە (اصول) و قەواعيدی موعتەزيلەوە (٦)وەك دانەر لە (منع الموانع)دا ووتويەتی چونكە تۆڵەی گوناه بەلای ئەوانەوە پشت گوێ ناخرێ هەرئەبێ تۆڵەی تاوان بچەژرێت (٧)وەقەبوڵی تۆڵەی زياديش ناكا (٨)بەڵام پاداشت قەبوڵی زيادە پاداشت ئەكا ، هەرچەندە ئەويش بەهيچ جۆر پشت گوێ ناخرێو هەردەبێ پاداش لەسەر چاكە وەرگرێ.

(٩)شوكری ئەو زاتەی نيعمەت دەبەخشێ، واتە ستايش و هەڵدانی سيفاتی بەرزو بڵندو جوان بەسەر زاتی بەرزی خوای گەورەدا (١٠)لەبەر بەخشينی نيعمەتی دروستبوون و بەخشين و تەندروستیو چەندەهایتر (١١)-بەسێشێوە خوا سوپاس دەكرێ: ١- بەدڵ بەم شێوە بڕوای هەبێ كە خوا خاوەنی ئەم نيعمەتەيە نەك خۆی. (١٢)٢-بەزوبان بەم شێوەيە بڵێ: بەزوبانی. خوا ئەم نيعمەتەی پێبەخشيوم-نەك زيريم وغيرەتم- (١٣)٣-ياخود بەغەيری زوبان بەم شێوە ملكەچی خوابێ بۆ جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی.

{واجبٌ بالشرع لاالعقلِ}[1] فمن لم تبلغه دعوة نبيٍّ لايأثَمُ بتركهِ[2] خلافاً للمعتزلة[3] {ولاحكمَ} موجودٌ {قبل الشرع} اي البعثة لأحدٍ من الرسل[4] نتفاء لازمه حينئذٍ من ترتّبِ الثواب والعقاب من قوله تعالى: ﴿ وما كنّا معذبين حتّى نبعث رسولاً﴾ ولامثيبين[5] فاستغنى عن ذكر الثواب[6] بذكر مقابلهِ من العذابِ الذي هوَ اظهرُ في تحقّقِ معنى التكليفِ[7] وإنتفاء الحكم الذي هو الخطاب السابق[8] بإنتفاء قيدٍ منه وهو التعليق التنجيزيُّ[9] {بل الأمرُ} اي الشأن في وجودِ الحكم{موقوف الى وروده} اي الشرعِ[10]

---

(١)ستایشـی‌زاتی‌نیعمەت بـەخش بەحوکمی‌شـەرع واجـب وپێویسـتە،نـەك بەحوکمی‌عەقڵ. (٢)چونکە ئەگەر بەعەقڵ بیٚ وەك ئەوە وایە پیاوێك بەپاشا بڵـێ: سوپاست ئەکەم لەسەر بەخشینی ئەو فلسە ئەمە زەممە مەدح نیە، هەموو بوونەوەر لەبەردەم خوادا وەکو فلسێك وایە، کەوابوو سوپاس بەشەرع واجب دەبێ نـەك بەعەقڵ کەسێ ئەگەر بانگەوازی پێغەمبەرێکی پێ‌نەگەیشتبێ تاوانبار نابێ بەنەکـردنی سوپاسی خوا. (٣)-لای مەزهەبی ئێمە- بە پێچەوانەی لای موعتەزیلەکان.

(٤)لای ئەوان هەر واجبە، هیچ حوکم و بریارێك نیە بۆ کاری ئادەمی پێش شەرعی خوا، واتە پێش ناردنی پەیام بۆ یەکێك لە پێغەمبەران (٥)لەبەر نەبوونی لازمەکەی کە لازمیش نەبوو مەلزومیش نیە، لازمەکەش چیە؟ کە نەبوونی پاداشت و تۆڵەیە بەچی نەفی کراون؟ ﴿ وما کنّا معذّبین﴾..الخ ئێمـە تۆڵـەو سـزای کـەس نـادەین هـەتا پێغەمبەری بۆ دەنێرین (٦)لە ئایەتەکەدا باسی پاداش نەکراوە (٧)بەهۆی باسـکردنی هاوتاکەیەوە کە تۆڵەیە، لەوێشدا واتای تەکلیف و باری گرانی رامکردنـی نـەفس بۆ خوا بەدی دەکرێ.

(٨)-جا چۆن دەبێ بڵێ: حوکم لەپێش شەرعەوە نیە، ئەی حوم کـەلامی ئـەزەلی نەبووە؟ کەوابوو حوکم هەر لە ئەزەلەوە هەیە ؟ ئەمیش دەڵـێ: ئێـمە کـە ئـەڵێین: حوکم نیە کە ئەویش بریتی بو لە خیتابی ئەزەلی (٩)ناڵـێین هەموو حوکم نیە بـەڵکو بەهۆی نەبـوونی تاکە قەیدێکەوە ئەڵێن حوکم نیـە، ئـەویش بریتیـە لـە تەعەلوقـە تەنجیزیەکە کەنیە. (١٠)لەبەر ئەوەی جێـیـەك نیە حوکمە کە تەعەلوقی پێوە بەسێ، حوکـم کـاتێك حوکمـە کەشـتێك هـەبێ حوکمەکـە رووی تـێ‌کا، حوکـتمی ئـەزەلی حوکمی(بالقوة) یە حوکمی (بالفعل) نیە، لـەبارەی بوونـی حـوکمەوە لـە هەمـوو شتێکدا – ئەمە حەلاڵە ئـەوە حـەرامـە- وەسـتـێنراوە هـەتا شەرع و رێبـازی خوا دێ.

اشار بهذا كما قال الى انّه مراد من عبَّرَ منّا في الأفعال قبل البعثةِ بالوقف[١] فليس مخالفاً لمن نفى منّا الحكم فيها[٢] وبل هنا لنتقال من غرضٍ الى آخر[٣] وإن اشتمل على الأوّلِ[٤] إذ توقّف الحكم على الشرع مشتملٌ على إنتفائه قبلَهُ ووجوده بعدهُ[٥]

{وحكمتِ المعتزلةُ العقلَ}[٦] في الأفعال قبل البعثة فما قضى به شيئ[٧] منها ضروريٍ كالتنفس في الهواءِ[٨] او إختياريٍ لخصوصه[٩] بأن ادرك فيه مصلحةً او مفسدةً او إنتفاءهما[١٠] فأمر قضائه فيهِ ظاهرٌ[١١] وهو انّ الضّروري مقطوعٌ بإباحتهِ[١٢] والإختياري لخصوصه ينقسم الى الأقسام الخمسة[١٣] الحرام وغيره لأنّه إن اشتمل على مفسدة فعله فحرامٌ[١٤]

---

(١)دانەر بەوشەی (موقوف) ئاماژەی كرد بۆ مەبەستی هەندێ لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت كە تەعبیریان داوەتەوە بەوەستان و بڕیاردەرنەكردن بەرامبەر بەهەموو كارێك پێش ناردنی پەیامدا بكرێ و كرابێ. (٢)كەوابوو ئەم قسەیە پێچەوانەو دژ نیە ەوانە لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت كە نەفی حوكمیان كردوە لەبارەی ؟ ڕداری پێش دابەزینی پەیامدا (٣)وشەی(بل) لێرەدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوكمی بەردەمی خۆی نیە ، بەڵكو بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستێكەوە بۆ مەبەستێكی‌تر (٤)هەرچەندە مەبەستی دووەم یەكەمیشی تیادابێ (٥)چونكە كە دەوترێ حوكم و بڕیاردان دەوەستێنرێ هەتا پەیام دادەبەزێنرێ ، ئەم ڕشتە دوو شت ئەگرێتە خۆ:١-نەبوونی حوكم پێش شەرع. ٢-بوونی حوكم دوای دابەزینی حوكم .

(٦)موعتەزیلە حوكمیان داوەتە پاڵ عەقڵ واتە ژیری ئیدراكی حوكم دەكا . لە هەموو كارو كردارێكی ئادەمیزاد دا پێش نارنی پێغەمبەر (٧)جا چۆن عەقڵ حوكم ئەكا ؟ دەڵێ هەر حوكمێك ژیری پەی پێ‌ببا لەهەر كارێكدا (٨)هەندێ لەو كردارانە پێویستەو بەڵگە نەویستە وەك هەناسەدان لەناو هەوادا (٩)یاخود ئەو كردارە ئارەزوییە چونكە ئەو كردارە تایبەتمەندە بەشتێكەوە گشتگیر نیە (١٠)بەم شێوەیە عەقڵ و ژیری پەی بەرێت بەو كارە ئایا بەرژەوەندی تیایە یاخود زیانی هەیە یاهیچ كامیانی نیە (١١)ئەو حوكم و بڕیاری عەقڵە لەو شتە زەروریە یاخود ئارەزوییە (إختیاري) شتێكی روون و ئاشكرایە (١٢)ئەویش ئەوەیە ئەویان زەروریە ژیان بێ ئەو نابێ. ئەوە بێگومان لەحەلاڵ بونیا گفتوگۆ ناكرێ تیایدا. (١٣)ئەویشیان ئیختیاریە چونكە تایبەتمەندی كارە ئیختیاریەكەیەو دەكرێتە پێنج بەشەوە:

(١٤)١-یاحەرامە یان حەرام نیە. چونكە ئەو فیعل و كردارە ئەنجام دانەكەی زیان بەخش بوو ئەوە حەرامە.

كالظلم او تركهُ فواجبٌ كالعدلِ[1] او على مصلحةٍ فعلهُ فمندوبٌ كالإحسانِ[2] او تركهُ فمكروهٌ[3] وإن لم يشتمل على مصلحةٍ او مفسدةٍ فمباحٌ[4] {فإن لم يقضِ} العقلُ في بعضِ منها[5] لخصوصه[6] بأن لم يدرك شيئاً مما تقدّم[7] كأكلِ الفاكهةِ[8] فاختلف في قضائه فيهِ لعموم دليله[9] على اقوال ذكرها بقوله[10] {فثالثها لهم الوقف عن الحظرِ والإباحةِ} اي لايدري انّهُ محظورٌ او مباحٌ[11] مع انّهُ لايخلو عن واحدٍ منهما[12] لأنّهُ إمّا ممنوعٌ منه فمحظورٌ اولا فمباحٌ[13] وهما القولان المطويان[14] دليل الحظر أن الفعل تصرُّفٌ في ملك الله بغير إذنه[15] إذ العالَمُ أعيانهُ ومنافعهُ ملك لله تعالى[16] ودليل الإباحة انّ الله تعالى خلق العبد وما ينتفع بهِ فلو لم يُبِح له لكان خلقهما عبثاً اي خالياً من الحكمة[17]

---

(١)وەك ستەم ٢-یاخود نەكردنەكەی زیان بەخش بێ ئەوە واجبە ، وەك دادپەروەری. (٢) ٣-یاخود كردنەكەی بەرژەوەندی تیا بوو ئەوە مەندوبە، وەك ئیحسان و چاكە كردن . (٣)٤- یاخود نەكردنەكەی بەرژەوەندی تیادابێ ئەویش مەكروهە . (٤)٥-یاخود ئەو كارە نە بەرژەوەندی تیادایە نە زیان ئەویش موباحە.

(٥)ئەگەر عەقڵ دەركی هەندێ لە ئەفعال و كرداری پێش هاتنی پێغەمبەر نەكرد (٦)لەبەر تایبەتمەندی ئەو بەشەیە (٧)بەم شێوە دەركی هیچ حوكمێ لەوانەی پێشوو دەرك نەكرد ئایا حەرامە یاخود واجبە (٨)وەك حوكمی میوە خواردن (٩)ئەوە موعتەزیلە لەنێوان خۆیاندا رای جیاوازیان هەیە ئایا حوكمی عەقڵ لە هەندێ دا بەخسوسیەتی خۆی حوكمی بەسەردا نەكرد كامیانە؟ بۆ ئیختیلافیان هەیە چونكە بەڵگەی حوكم پێكراوەكە عمومیە (١٠)سێ جۆرە رای تیادا هەیە (١١)١- دەڵێ حەرامە ٢-دەڵێ حەڵاڵە دانەر هەر سێیانی بەم رستە گەیاند وتی: سێهەمی ئەو قەولانە كە هەموویان هی موعتەزیلە خۆیانە، وەستانە لە حوكم داندا نەدەڵێ حەرامە نەدەڵێ حەڵاڵە واتە ئەزانێ یەكێكیانە بەڵام نازانێ كامیانە (١٢)لەگەڵ ئەوەشدا خاڵی نیە لەیەكێ لەو دوو حوكمە (١٣)چونكە یا قەدەغەكراوە ئەوەحەرامە، یا قەدەغەكراو نیە ئەوە موباحە (١٤)ئەو دوانەش محظور و موباح دوو قەولە پێچراوەكەیە، سێهەمیشیان وەقف بوو. ئەم سێ قەولە هەریەكە بەڵگەیێكی هەیە.

(١٥)ئەم سێ قەولە هەریەك بەڵگەییەكی هەیە: ١- بەڵگەی حەرام بوونی ئەوەیە ئەو كارە ئاڵوگۆڕكردنە لەموڵكی خوادا بێ‌ئەوەی خوا رەزامەندی نواند بێ (١٦)چونكە جیهان ئەوەی دەبینرێ و ئەو سودەی دەیبەخشێ هەموویان موڵكی خوان (١٧)دەخۆ تەسەروف لە موڵكی كەسی تردا بەبێ ئیزن دروست نیە ٢- بەڵگەی حەڵاڵ بوونی

ووجهُ الوقفِ عنهما تعارض دليلهما[1] واشار بقوله لهم اي للمعتزلة الى مانقله عن القاضي ابي بكر الباقلاني من انّ قول بعض فقهائنا أي كإبن ابي هُرَيرة بالحظرِ و بعضهم بالإباحةِ في الأفعال قبل الشرعِ[2] إنّما هو لغفلتهم عن تشعُّبِ ذلك عن اصول المعتزلة[3] للعلم بأنّهم ما إتّبعوا مقاصدهم وانّ قول بعض ائمّتنا اي كالأشعري فيها الوقف[4] مراده به نفي الحكمِ فيها اي كما تقدّمَ[5]

والصّواب إمتناع تكليف الغافلِ والملجإ}[6] امّا الأول وهو من لايدري كالنائم والساهي[7] فلأنّ مقتضى التكليفِ بالشيئِ، الإتيان به إمتثالاً[8] وذلك يتوقّف على العلمِ بالتكليف به[9] والغافل لايعلم فيمتنع تكليفهُ[10]

---

ئەوەیە خوای گەورە ئادەمیزادی دروست کردوە ئەوەش کە سوودی لێوەرگری ئەگەر بۆی حەڵاڵ نەکردایە دروست بوونی هەردووکیان بێسوودو بێهودە ئەبوو.

(١)٢-بەڵگەی وەستانی قەولی سێیەم بەگژاچونی بەڵگەی هەردوو قەولە پێشوەکەیە. (٢)دانەر بەوشەی (لهم) ئاماژەی کرد بۆ ئەوەی لە قازی ئەبوبەکری باقلانیەوە نەقڵی‌کردووە. هەندێ لەزانایانی ئەهلی سوونیش وەك ئیبن (إبن أبي هريرة) بەحەرامیان زانیوە وەهەندێکیشیان بەحەڵاڵیان زانیوە ئەمەش لە هەموو کردارێکە پێش هاتنی شەرع (٣)ئەمەیان کە وتوە نیشانەی قەبوڵکردنی ئوسولی موعتەزیلە نیە، بەڵکووئەوەیان کە وتووە بێئاگابوون لەوەی ئەم قسەیە کە کردویانە موعتەزیلە لە (أصول) وقواعیدی تایبەتی خۆیانە (٤)چونکە ئێمە دەزانین ئەو زانایانەی ئەهلی سوننەت شوێن کەوتوی مەقاصیدو(اصول)ی موعتەزیلە نین. (إثبات الحكم قبل البعثة)وە هەندێ زانایانی زەمان وەك ئەشعەری کە ئەوانیش هەر وەقف ئەکەن (٥)وەقفی ئەمان لەگەڵ وەقفی ئەوان جیاوازە، موعتەزیلە کە وەقف ئەکەن ئەڵێن: حوکم هەیە بەڵام نازانین کامیانە، ئەشعەری‌و هاوبیرانی وەقف ئەکەن . بەڵام مەبەستیان نەفی حوکمە لە ئەفعالی پێش بعسەدا ئەڵێن نازانین هەیە یا نیە ، بەڵام موعتەزیلە ئەڵێن هەیە بەڵام نازانین کامەیە.

(٦)قسەی راست ئەوەیە ئینسانی بێئاگاو بێدەسەڵات تەکلیفیان لەسەر نیە (٧)چونکە یەکەمیان کەسێکە نەزان و بێخەبەرە، وەك خەوتو و بەسەهوا چوو (٨)داخوازی تەکلیف کردن بەشتێك بریتیە لە کردنی ئەو شتە لەبەر جێبەجێکردنی داخوازیەکە (٩)دەخۆ ئەوەش دەوەستێ هەتا دەزانێ داخوازی ئەو ئیشەی لێکراوە ، وەك ئەرك.

(١٠)دەخۆ مرۆڤی بێخەبەریش ئەوە نازانێ کەوابوو قەدەغەیە تەکلیفی لێبکرێ.

وإن وجب عليه بعد يقظتهِ ضمان ما أتلفه من المال [1] وقضاء ما فاتهُ من الصلاةِ في زمان غفلتهِ لوجودِ سببهما [2] وأمّا الثاني وهو من يدري ولامندوحةَ لهُ عمّا أُلجئَ اليه [3] كالملقى من شاهقٍ على شخصٍ يقتلهُ لامندوحة له عن الوقوع عليه القاتل له [4] فإمتناع تكليفهِ بالمجأ اليهِ أو بنقيضهِ لعدم قدرتهِ على ذلك [5] لأنّ الملجأ اليه واجب الوقوعِ ونقيضهُ ممتنعُ الوقوعِ ولاقدرة على واحدٍ من الواجب والممتنع [6]

وقيل بجواز تكليف الغافل والملجأ [7] بناءٍ على جواز التكليف بما لايُطاق [8] كحمل الواحد الصخرة العظيمة [9] وردَّ بأنّ الفائدة من التكليف بما لايُطاق من الإختيار هل يأخذ في المقدّمات منتفيةٌ في تكليف الغافل والملجأ [10] والى حكاية هذا وردِّهِ اشار المصنِّفُ بتعبيرهِ بالصّواب [11]

---

(١)هەرچەندە واجبە لەسەری دوای نەمانی بێئاگاییەکەی زەمانی ئەو ماڵەی لەناوی بردووە.(٢)وەقەزاکردنەوەی ئەو نوێژەی لەدەست چووە لەکاتی بێئاگاییەکەدا لەبەر بوونی سەبەب و هۆکارەکانیان.

(٣)بەڵام دووەم بریتیە لە کەسێك کە ئەزانێ چی رو ئەدا بەڵام رزگاربوونی نیە لەوەی کە دەکەوێ بەسەریدا (٤)وەك کەسێك بەشاخێکی بەرزەوە بەربدرێتەوە بەسەر کەسێکی تردا ، دەزانێ‌دەیکوژێ هیچ تواناو خۆ رزگارکردنی نیە لەوەی کە نەکەوێ بەسەریدا، دەشزانێ ئەو کەوتن بەسەریدا بکوژە بۆ کابرا (٥)تەکلیف خستنە سەر کابرای توڕدراو چ بە کوشتنی یاخود بە نەکوشتنی ، لەبەر توانا نەبوونی لەسەر کردن و نەکردنی ئەو شتە (٦)چونکە کەوتنی بەسەریدا هەردەبێ‌ببێ، بەڵام نەکەوتن بەسەریدا هەرگیز نابێ، دەخۆ نەواجب نە مومتەنیع لەتوانای کەسدا نیە، چونکە حەتمەن هەر دەبێ بێتە دی.

(٧)ووتراویشە تەکلیفی بێئاگاو بێ دەسەڵات دروستە (٨)چونکە بەقیاس لەسەر دروستی ئەرك خستنە سەرکەسێ بەشتێ لە توانایدا نەبێ (٩)وەك ئەرك خستنەسەر تاکە کەسێ بە هەڵگرتنی تاشە بەردێکی گەورە ئەمە مەبەست کردنی نیە بەڵکو مەبەست تاقیکردنەوەیەتی ئایا خۆی بەبەندە ئەزانێ؟ (١٠)بەرپەرچی ئەو قەولە دراوەتەوە کە سودی ئەرك خستنەسەر کەسێ بەشتێ لەتوانایدا نەبێ وەك تاقیکردنەوەی، ئایا دەست ئەکا بە ئەنجامدانی پێشەکیەکانی ئەو کارە ، ئەم پێشەکیانە نین لەتەکلیفی بێخەبەر و بێدەسەڵات دا

(١١)دانەر بەوشەی (الصواب) واتە قسەی راست ئامارەی کرد بۆ قەولە لەبەر پەرچدانەوەکەشی چونکە موخالفی صەواب هەڵەیە.

{وكذا المكرَه} وهو من لامندوحة لهُ عمّا اكره عليه إلاّ بالصبر على ما اكره به[1] يمتنع تكليفهُ بالمكره عليهِ او بنقيضه{على الصحيح}[2] لعدم قدرته على إمتثال ذلك[3] فإنّ الفعل بالإكراه لايحصلُ به الإمتثال[4] ولايمكن الإتيان معه بنقيضه[5] {ولو}كان مُكرهاً {على القتلِ}[6] لمكافئه[7] فإنَهُ يمتنع تكليفُهُ حالة القتل للإكراه[8] بتركهِ لعدم قدرتهِ عليه[9] {واثم القاتل}[10] الذي هو مجمع عليه[11] {لإيثاره نفسَه} بالبقاء على مكافئه[12] الذي خيره بينهما المكره[13] بقوله اقتل هذا و إلا قتلتك[14] فيأثم بالقتل من جهة الإيثار دون الإكراه[15] وقيلَ يجوز تكلف المُكرَه بما اكره عليه او بنقيضهِ لقدرتهِ علة إمتثال ذلك بأن يأتي بالمكره عليه لداعي الشرعِ[16] كمن اكُره على اداء الزكاةِ فنواها عند اخذها منه[17]

---

(١)هەروەها غەڵەتە تەكليف كردنی (مكرَه) ئەويش بەكەسێ ئەڵێن رزگار بوونی نەبێ لەوەی زۆری لەسەركراوە جگە بەخۆ راگرتن نەبێ لەسەر ئەو هەڕەشانەی لێی كراون. (٢)قەدەغەيە ئەو موكرەهە موكەلەف بێت ج بەكردنی زۆر لەسەر كراوەكە يانەكردنی ئەمەش قسەی راست و رەوانە (٣)چونكە توانای نيە ئەو ئيشە بكا لەبەر خاتری گوێ رايەڵی ئەو تەكليفە نيە بەڵكو لەبەر خاتری زۆرو ستەمەكەيە (٤)چونكە ئيشێك لەبەر خاتری زۆر ئەنجام بدرێ ئەوە گوێڕايەڵی پێ‌ئەنجام نابێ (٥)خۆگونجاو نيە لەگەڵ كردنی ئەو ئيشەدا نەكردنيشی ئەنجام بدا (٦)- دوو شتی دژن كۆنابنەوە- هەرچەندە زۆريشی لێكرابێ بۆ كوشتنی كەسێك (٧)چونكە كوژراوەكە هاوشانی ئەمە لەڕێزو حورمەتدا (٨)چونكە قەدەغەيە ئەم زۆر لێكراوە تەكليفی لێبكەی (٩)-لەكاتی كوشتنەكەدا چونكە زۆر لێكراوە- بەكوشتنەكەی چونكە توانای بەسەردا نيە. (١٠)بكوژ كە گوناهبار ئەبێ (١١)بەرای هەموو زانايان.

(١٢)چونكە مانەوەی خۆی پێشخستوە بەسەر بەرامبەرەكەيدا (١٣)كە ستەم كارەكە سەرپشكی كردوە لەنێوان دوو شتدا (١٤)بەم جۆر دەڵێ ئەمە بكوژە ئەگەر نەيكوژی ئەتكوژم (١٥)گوناهبار دەبێ كە دەيكوژێ لەڕوی هەڵبژاردنی مانەوی خۆيەوە نەك لەروانگەی زۆر لێكردنەكەوە، لە ئيسارو ئيختيارو هەڵبژاردن دا هەيە، بەلام لە زۆر لێگەری دا نيە. (١٦)وتراويشە دروستە زۆر لێكراو تەكليفی لێبكرێ بەوی دەيسەپێنن بەسەريا ياخود بەدژی ئەو ، چونكە توانای ئەوەی هەيە بەنييەت ئەوە بگێڕێ بەگوێڕايەڵی خوا. (١٧)واتەكاتێ ئيشە زۆر پێكراوەكە ئەنجام ئەدا بڵێ: ئەم كارە لەبەر فەرمانی‌شەرع ئەكەم ، وەك ئەو كەسەی‌زۆری لێ‌ئەكرێ بۆزەكاتدان ئەويش لەكاتی‌وەرگرتندا نييەتی‌زەكاتی لێ‌ئەهێنێ.

او بنقيضه صابراً على ما اكرهَ به[1] و إن لم يكلفه الشارع الصبر عليه كمن اكرهَ على شرب الخمرِ[2] فامتنع منه صابراً على العقوبةِ[3] والقول الأول للمعتزلةِ[4] والثاني للأشاعرةِ[5] ورجع اليهِ المصنفُ آخراً[6] ومن توجيههما يعلم انهُ لاخلاف بينهما[7] وان التحقيق مع الأول فليتأمل.[8]

{ويتعلّق الأمر بالمعدوم تعلُقاً معنوياً}[9] بمعنى انّه إذا وجد بشروط التكيف يكون مأموراً بذلك الأمر النفسي[10] لاتعلُقاً تنجيزياً[11] بأن يكون حالة عدمه مأموراً[12] {خلافاً للمعتزلةِ} في نفيهم التّعلق المعنويّ ايضاً لنفيهم الكلام النفسي[13] والنهي وغيره كالأمر[14]

---

(١)یاخود دژی بەزۆر سەپێنراوەکە قبول ئەکا واتە خۆی رائەگرێ لەبەردەم هەرەشەکەدا. (٢)وەك کەسێ زۆری لێدەکرێ شەراب بخواتەوە.

(٣)ئەویش قبولی نەکاو خۆی رابگرێ لەبەردەم تۆڵەی ستەمکارەکەدا (٤)قەول و رای یەکەم کەلە دەقەکە١٠١دا باسکرا (مکرە ملکف) نیە هی موعتوزیلەیە (٥)قەول و رای دووم واتە تەکلیفی (مکرە) دروستە چونکە بەنیەت دەیگۆرێ هی ئەشعەرییەکانە (٦)بەلأم سەرەنجام دانەر گەڕایەوە بۆ سەر قەولی دووەم (٧)لەبەڵگەی هەردوو لاوە دەزانرێ کەدژایەتی لەنێوان ئەو دوو قەولانەدا نیە ،چونکە هەریەکە پەیوەندی بەجێیکی تایبەتەوەیە قسەی موعتەزیلە بۆ حاڵی موباشەرەیە، ئەوی تریش بۆ پێش موباشەرەی کارەکەیە. (٨)راستیش لەگەڵ قەولی یەکەم دایە، بۆیە ئەم جێیە پێویستی بەبیر کردنەوە هەیە، ئەویش زانینی ئەم راستیەیە : کە تەکلیف لەگەڵ فیعلدا دەبێ نەکگ تەنها لە پێشدا. تەکلیف بەسراوە بەسەلامەتی ئالەت و ئەسبابەوە ، هەروەها تەکلیف بەردەوامە لەکاتی ئەنجامدانی کارەکەدا بەلأم (مناط)ی تەکلیف لای موعتەزیلە قودرەتە.

(٩)هەر لەئەزەلەوە ئەمرو فەرمان پەیوەندە بەو نەبووەی لەمەودوا دێتە بوون بەلأم پەیوەندیەکە مەعنەوی واتە عەقڵی (بالقوة)یە (١٠)بەم مەبەستە کە ئەو نەبووە هەرکاتێ هاتە بوون مەرجەکانی تەکلیفی تیابوو ئەوە فەرمان پێدراو ئەبێ بەو فەرمانە نەفسیە ئەزەلیە (١١)پەیوەندی تەنجیزی مەبەست نیە (١٢)واتە لەکاتی نەبووی و پەیدا نەبونیدا فەرمان پێدراو بێ (١٣)بە پێچەوانەی موعتەزیلە چونکە ئەوان دەڵێن تەعەلوقی مەعنەویش نیە وەك تەعەلوقی تەنجیزی نیە چونکە ئەوان دەڵێن کەلامی نەفسی نیە (١٤)کاتێ کەلام نەبوو سیفەتەکەیش نابێ کە تەقسیم بونیەتی بۆ ئەمرو غەیرە ئەمرو نەهی و غەیری نەهیش وەك ئەمر واتە ئەگەر ئەمر تەعەلوق ببەستێ

وسيأتي تنوع الكلام في الأزل على الأصحِّ الى الأمر وغيره[1] {فإن اقتضى الخطابُ} اي طلب كلام الله النفسيّ {الفعل} من المكلف لشيئ[2] {إقتضاءً جازماً}[3] بأن لم يُجوِّز تركهُ[4] {فإيجابٌ} اي يسمىّ هذا الخطاب إيجاباً[5] {او} إقتضاءً {غير جازمٍ} بأن جوَّز تركهُ[6] {فندبٌ او}[7] اقتضى {الترك} لشيئ إقتضاءً {جازماً}بأن لم يُجوِّز فعلهُ{فتحريمٌ او}[8] إقتضاءً {غير جازمٍ بنهي مخصوصٍ} بالشيئ كالنهي في حديث الصحيحين[9] إذا دخل احدكم المسجدَ فلايجلس حتّى يُصلِّي ركعتين[10] وفي حديث لإبن ماجة وغيره: لاتصلُّوا في أعطان الإبل فإنّها خلقت من الشياطين[11] {فكراهةٌ} اي فالخطاب المدلول عليه بالمخصوص يسمّى كراهةً[12]

---

ئەوە ئەمانیش تەعەلوق ئەبەستن ، ئەگەر تەعەلوق نەبەستێ ئەمانیش تەعەلوق نابەستن. (١)لەمەودوا دێ کە کەلام هەر لەئەزەلدا دابەش دەبێ بۆ ئەمرو غەیری ئەمر . وە نەهی و خەبەرو ئینشاو ئەمانە ، بەم واتایە:- ئەی ئادەمیزاد هەرکات بالغ بوین نوێژ بکە ، عەرەق نەخۆی نەك بەمانای ئەوە ئینسان نەهاتووە بون ئەو عەرەقە نەخوا کە هێشتا ئەویش دروست نەبووە.

(٢)ئەگەر کەلامە نەفسیەکەی خوا داوایکردنی شتێکی لە موکەللەف کرد (٣)بەداخوازیەکی قەتعیو بێگومان (٤)بەمە شێوەیە نەکردنی بەهیچ شێوەیەك ڕەوا نەدرابێ (٥)ئەم ختابە ناودەبرێ بە واجب.

(٦)یاخود داواکردنی کردبوو بەڵام داوایەکی قەتعی نەبوو واتە نەکردنی ڕەوا درابێ (٧)ئەو ختابە ناودەبرێ بە نەدب واتە سوننەت . (٨)یاخود داوای نەکردنی شتێکی لە موکەللەف کردبێ بەداخوازیەکی بێگومان بەم جۆرە بەهیچ شێوەیەك ڕێی کردنی نەدرابێ ئەوە پێی ئەوترێ حەرام (٩)یاخود داخوازیەکی غەیرە قەتعیش بێ داخوازیەکەش بە نەهیەکی تایبەتمەند بەشتێکەوە وەك ئەو نەهیە کە لە فەرموودەی بوخاریو مسلم دا هاتووە. (١٠)یاخود داخوازێکی غەیرە قەتعی بێ، داخوازیەکەش بەنەهیەکی تایبەتمەند بەشتێکەوە وەك ئەم نەهیەو قەدەغەیە لەم فەرمودەیەدا هاتووە و بوخاری و موسلم گێڕاویانەتەوە فەرمویەتی: کاتێ یەکێکتان ئەچێتە مزگەوت بادانەنیشێ تا دورکات نوێژ ئەکا (١١)وە لە فەرمودەیەکی تردا (إبن ماجة) و بێجگە لە ئەویش گێڕاویانەتەوە ، فەرمویەتی: نوێژ نەکەن لە مۆڵگای وشتردا چونکە وشتر سروشتی وەك سروشتی شەیتان وایە (١٢)ئەوە کەراهەتە ، واتە ئەو خیتابەی کە دەلالەتی لەسەر کراوە بەنەهیەکی تایبەت ئەوە پێی ئەوترێ کەراهەت ، کەوابوو ئەبێ بۆ هەموو کەراهەتێ نەهیەکی تایبەتی هەبێ ، خۆ هەنـــدێ کەراهەت هەیە دەلیل و

ولايخرج عن المخصوص دليل المكروه إجماعاً او قياساً لأنَهُ في الحقيقة مُستَنَدُ الإجماعِ او دليلُ المقيسِ عليهِ وذلكَ من المخصوص[1] {او بغير المخصوصِ} بالشيئ[2] وهوَ النهي عن ترك المندوباتِ[3] المُستفادِ من أوامرها فإنّ الأمر بالشيئ يفيدُ النهي عن تركه[4] {فخلافُ الأولى} اي فالخطاب المدلول عليه بغير المخصوص يسمّى خلافَ الأولى كما يُسمّى متعلَّقهُ بذلك فعلاً كانَ[5] كفطر مسافر لايتضرر بالصوم[6] كما سيأتي او تركاً كانَ كتركِ صلاةِ الضحى[7]

والفرق بينَ قسمَي المخصوصِ و غيرهِ أنّ الطلبَ في المطلوب بالمخصوصِ اشدُّ منهَ في المطلوبِ بغير المخصوصِ[8] فالإختلاف في شيئٍ أمكروهٌ ام خلافُ الأولى اختلافٌ في وجودِ المخصوصِ فيه[9] كصومِ يوم عرفةَ للحاجّ[10] خلافُ الأولى[11]

---

بەڵگەیان ئیجماع و قیاسە؟ (١)مەکروهێك دەلیلەکەی ئیجماع بێ یا قیاس لە نەهی تایبەت ناچێتە دەرەوە، چونکە لەحەقیقەتدا هەر ئەونەهیە تایبەتە بەڵگەی ئیجماع و(مقیس علیە) ەکەیشە کە وابوو ئەویش هەر لەتایبەتەکەیە.

(٢)یاخود داخوازی نەکردنەکەی بەشێوازێکی تایبەت نەبێ – بەڵکو عام و گشتی بێ- کە ئەویش بریتیە (٣)غەیرە تایبەت (المخصوص)قەدەغەکردنە لە مندوبات.

(٤)– بۆ مەندوبەکان قەدەغەیان تیایە- بڵێ نەهیەکە لەئەمرەکەیان وەرئەگیرێ، کە فەرمان بەکردنیانە چونکە فەرمان کردن بەشتێ نەهی و قەدەغە لەنەکردنەکەی ئەگەیەنێ (٥)واتە ئەو خیتابە غەیرە مەخسوسە دەلالەتی لەسەر ئەکا و ناودەنرێ بە (خلاف الأولى) –پێچەوانەی چاکتر– وەك موتەعەلەقەکەشی هەر بە(خلاف الأولى) ناودەبرێ خیتاب ئەگەر نەهی بووپێ ی ئەوترێ (تحریم) بە فیعلەکە ئەوترێ (حرام) ئەگەر ئەمر بوو پێ ی ئەوترێ ئیجاب فیعلەکەش بە(واجب) ناو دەبرێ.

(٦)ئەو (خلاف الأولى) کردن بێ وەك رۆژووی کەسێکی سەفەری رۆژوو گرتن زیانی پێ نەگەیەنێ شکاندنی ئەو رۆژوویە (خلاف الأولى) (٧)یاخود ئەو (خلاف الأولى) نەکردن بێ وەك نەکردنی نوێژی چێشتنگاو.

(٨)جیاوازی چیە لەنێوان(المخصوصِ وغير المخصوصِ)دا؟داخوازی لە(مطلوب)ی مەخسوس دا توندو بەهێزترو رەچاوگیراوترە لەداخوازیکە لە(غیر مطلوب)دایە واتە مەتلوبی غەیرە مەخسوس (٩)رای جیاوازی زانایان لە حوکمی شتێکدا دەڵێن: (خلاف الأولى)یە هەندێك دەڵێن(مکروە)ە ئەوە چونکە ئیختلافیان لە مەخسوسەکەیدا هەیە (١٠)وەك حوکمی رۆژوی رۆژی عەرەفە بۆ حاجی (١١)هەندێك ئەڵێن: (خلاف الأولى)یە.

وقيل مكروهٌ لحديث ابي داواد و غيره انَّهُ ﷺ نهى عن صوم يوم عرفةَ بعرفةَ * واجيبَ بضعفه عند اهل الحديث[١] وقسمُ خلافُ الأولى زاده المصنِّفُ على الأصوليين[٢] اخذاً من متأخِّري الفقهاءِ حيثُ قابلوا المكروه بخلافُ الأولى في مسائلَ عديدةٍ[٣] وفرّقوا بينهما ومنهم إمام الحرمين في النهاية[٤] بالنهي المقصود وغير المقصودِ[٥] و هو المُستفادُ من الأمرِ[٦]

وعدل المصنِّفُ الى المخصوصِ وغير المخصوصِ أي العامِّ[٧] نظراً الى جميع الأوامر الندبية[٨] وامّا المتقدِّمون فيطلقون المكروه على ذي النَّهي المخصوص و غير المخصوصِ[٩] وقدْ يقولون في الأول مكروهٌ كراهةً شديدةً[١٠] كما يُقال في قسم المندوبِ سنّة مؤكّدة[١١]

---

(١)هەندێکیش ئەڵێن (مکروه)ە لەبر حەدیسی (ابوداودوغیره) ریوایەتیان کردووە پێغەمبەرﷺ :ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفەی قەدەغە کردوە لە حاجیەکان ئەمیش نەهی (مخصوص)ە کەوابوو مەکروو... بەڵام وەڵامی ئەوانەی بە(خلاف الأولى)ی ئەزانن وتویانە وەڵامیئەم فەرموودەیە لایزانایان فەرمودەیەکیپلە لاوازە بۆیە مەکروە نیە.

(٢)لای زانایانی ئوسولی پێنج حوکم هەیە ، بەڵام دانەر بەشێکی شەشەمی بەناوی (خلاف الأولى )وە زیادکردوە ، لە کوێی هێناوە؟ (٣)لە زانایانی فقهی چەرخی دوایی وەری گرتووە چونکە ١- ئەوان لەبەرامبەر مەکروهەوە (خلاف الأولى )یان داناوە لە چەندەها مەسئەلەدا (٤)٢-وە جیاوازیشیان کردون یەکێ لەو زانایانە (إمام الحرمين)ە بەم شێوەیە فەرقیان کردون (٥)داوای نەکردنی کرابێ بەنەهی مەقسوود، یاخود داوای نەکردنی کرابێ بەنەهی غەیرە مەقسوود (٦)نەهی غەیرە مەقسوود لەچیوەرگیراوە؟ لەئەمر بەکردنەکەی وەرگیراوە چونکە ئەمە نەهیە لە نەکردنی.

(٧)ئەی بۆ دانەریش هەر (مقصود و غير مقصود)ی نەووت؟ دانەر لە مەقسوود و غەیرە مەقسوود لای دا بۆ مەخصوص و غەیرە مەخصوصی بەواتای گشت گیر بۆ گشتگیر گشتیەکە؟ (٨)چونکە سەرنج و تەماشای ئەو هەموو ئەمرانە دەکرێ کە بۆ نەدب و سوننەتن.

(٩)بەڵام زانایانی فیقهی چەرخی پێشوو ، وشەی مەکروهیان بریوە بەسەر خاوەن نەهیەکی مەقسودا و غەیرە مەقسودا (١٠)جاری واش هەیە ئەڵێن یەکەمیان (مکروهٌ كراهةً شديدة) واتە کەراهەتێکی زۆر توندوتۆڵ (١١)وەك لەبەشی مەندوبا سوننەتی مۆکدە هەیە.

وعلى هذهِ الذي هو مبنى الأُصوليين يُقالُ او غيرَ جازمٍ فكراهةً. {أو} إقتضى الخطابُ {التخيير} بين فعل الشيئِ و تركه{فإباحةٌ}[1] ذكرُ التخيير سهوٌ إذْ لاإختيار في الإباحة[2] والصّوابُ او خيَّرَ كما في المنهاج عطف على إقتضى[3] وقابل الفعل بالترك نظراً للفرقِ[4] وإلاّ فالترك المُقتضَى في الحقيقةِ فعلٌ هو الكفُّ كما سيأتي[5] انّهُ لاتكليفَ إلاّ بفعلٍ وإنّهُ في النّهي الكفُّ[6]

{وإن ورد} الخطابُ النفسيّ بكونِ الشيئِ {سبباً وشرطاً ومانِعاً وصحيحاً و فاسداً}[7] الواو للتقسيم وهي فيه أجود من أو كما قالهُ إبن مالك[8]

---

(١)لەسەر ئەم بنەڕەتە زانایانی (أصول) بڕیویانە ووتراوە ئەگەر داخوازی نەکردنەکە غەیرە جازم بوو ئەوە کەراهەتە هەردووکیان ئەگرێتەوە، یاخود ئەگەر کەلامە ئەزەلیەکە داوای تەخییری کرد – واتە موکەلەفی سەرپشك کرد –کردن و نەکردنی ئەو شتەدا پێی دەوترێ (إباحة) فیعلەکەیش (مباح)ە.

(٢)باسی(التخییر) لەم رستەیەدا سەهوەو بێئاگاییە ، چونکە لە (إباحة) ،اتە سەرپشکی داخوازی نیە (٣)قسەی راست ئەوە بوو بوترایە بەو کەلام و ختابە (أو خیَّرَ) مانای سەرپشکی ئەگەیەنێ، وەك لە کتێبی (المنهاج بیضاوي) دا ووتراوە: وشەی (خیَّرَ) عەتفە لەسەر (إقتضی) چونکە وشەی ئەو بەحەرفی عەتف دانراوە.

(٤)دانەر ئەنجام نەدانی کای بەرامبەر کارەوە داناوە ، چونکە تەماشای عورفی کردوە (٥)ئەگەر لەبەر عورف نەبێ ئەو تەرکەی کە داخوازی کەلامە ئەزەلیەکەیە لەحەقیقەتدا فیعلە، کە ئەویش بریتیە لەوازهێنان کەلەمەودوا باس دەکرێت إنشاءالله.

(٦)ئاشکرایە تەکلیفی بێ فیعل و کردار نیە فیعلیش لە نەهیدا بریتیە لەوازهێنان لە فیعلە حەرامەکە.

(٧)ئەگەر کەلامە نەفسیە ئەزەلیەکە شتێکی کرد بە هۆو سەبەب بۆ شتێکیتر –وەك: زیناکردن بۆ داری حەدد یارەجم– یا شتێکی کرد بە مەرج بۆ شتێکیتر –وەك: دەست نوێژ بۆ نوێژکردن– یا کردی بە رێگرو مانع بۆ شتێکیتر –وەك حەیز رێگری نوێژە– یاشتێکی بە صەحصیح دانا –وەك عەقدێك کە هەموو مەرجەکانی تیابێ– یا شتێکی بەفاسید و بێنرخ دانا –وەك عەقدێك کە هەندێ مەرجی تیانەبێ– ئەم کەلامە ئەزەلییە پێی ئەڵێن: {فوضعٌ}واتە: (خطاب الوضع) (٨)ئەو واوە بۆ دابەشکردنی (خطاب الوضع) ە بۆ چەند بەشەی باسکرا (أو)یش بۆ دابەشکردنە بەلام واو شیاوترە تا (أو) وەك ابن مالیك ووتویەتی.

وحذف ما قدّرتُهُ كما عبَّرَ بهِ في المختصرِ اي كون الشيئِ للعلم بهِ معنىً مع رعاية لإختصارِ[١] ووصف النفسيِّ بالورودِ مجاز كوصف اللفظي به الشائع[٢] والشيئُ يتناول فعل المكلّفِ وغيرَهُ فعله[٣] كالزنّا سبباً لوجوب الحدّ[٤] والزوال سبباً لوجوب الظهر[٥] وإتلاف الصبيّ مثلاً سبباً لوجوب الضمانِ في مالهِ و اداءِ الوليِّ منه[٦] {فوضع}[٧] اي فهذا الخطاب يسمّى خطاب وضعٍ ايضاً[٨] لأنّ متعلّقَهُ بوضع الله اي بجعله[٩] كما يُسمّى الخطابُ المُقتَضى[١٠] او المُخيَّرُ[١١] الذي هو الحكمُ المتعارفُ[١٢] كما تقدَّم[١٣] خطابَ تكليفٍ لما تقدَّمَ[١٤]

---

(١)چونكە دابەشكردن بە (واو) ئامازەیە بەوە بەسەر دابەشكراوەكان چون یەك هاوبەشن لەدابەشكراوەكەیدا. دانەر ئەوەی من دیاریم كردووە ئەو لای بردوە نەی وتوە – بۆیە ئەویشم دیاری كردوە ، دانەر خۆی لە كتێبی (المختصر) تەعبیری پێداوەتەوە (ككون الشیئِ) یە چونكە خیتابەكە خۆی سەبەب و شەرتی ئەوان نیە بەڵكو شتێكی كردوە ٠ ە(سبب) و (شرط): ١–حەزفەكەش هەموو كەس پێی دەزانێ چونكە بەوە ماناكەی راست دەبێتەوە. ٢– لەگەڵ چاودێری كورتكردنەوەی دارشتنەكە. (٢)ورود بۆ عاقڵ ئەبێ خۆ كەلامی نەفسی سیفەتە ئیتر چۆن دروستە كەلامی نەفسی ببێ بە فاعیل بۆ ورود وەسفكردنی كەلامی نەفسی بە (ورود) مەجازە وەك چۆن كەلامی لەفزی وەسفدار ئەكرێ بە (ورود)، ئەمەش وەسفێكی شائیع و مەشهورە.

(٣)–مەجازی غەیرە مەشهور دروست نیە لە پێناسەدا هەبێ– شتەكە گشتگیرە بۆ شتێك كە فیعلی موكەللەف بێ یاخود فیعلی غەیرە موكەللەف بێ (٤)وەك زینا هۆكارە بۆ واجب بوونی لێدانی حەددئەمە فیعلی موكەللەفە.

(٥)یاوەكو تێپەربوونی رۆژ بەناوەراستی ئاسمان ئەوە هۆكارە بۆ واجب بوونی نوێژی نیوەرۆ ئەمە فیعلە موكەللەف نیە (٦)ئەگەر منالێك شتێك لەناوبەرێ ئەبێتە هۆی واجب بوونی بژاردنەوەی ئەو فەوتاوە لەماڵ و دارایی منالەكە، سەرپەرشتیارەكەی هەر لەماڵی منالەكە جێبەجێ بكا (٧)ئەم خیتابە ناوئەبرێ بە (وضع) (٨)هەروەها پێشی ئەوترێ خیتابە وەزع (٩)چونكە موتەعەللەقی خیتابەكە خوا داینـاوە كردەی خۆیەتی (١٠)هەروەك ئەو خیتابە پێشی ئەوترێ خیتابی داخوازی (١١)– بەهەر چوار جۆرەكەیەوە– یاخود داخوازێكە موكەللەف سەرپشك ئەكا (١٢)كە بریتیە لە حوكمی پێناسراوەكە (متعارف) (١٣)وەك لەپێشەوە باس كرا (١٤)ئەم خیتابە ناودەبرێ –بەخیتابی تەكلیفی لەبەر ئەوەی كە ووترا –.

{وقد عرفت حدودها} اي حدود المذكورات من أقسام خطاب التكليف ومن خطاب الوضع[١] فحدُّ الإيجاب الخطابُ المقتضى للفعلِ إقتضاءً جازِماً[٢] وعلى هذا القياس[٣] وسيأتي حدود السببِ وغيرِهِ من أقسام متعلّقِ خطابِ الوضع[٤]

وكذا حدّ الحدِّ بالجامع المانع[٥] الدافع للإعتراض بأنّ ما عُرِفَ رسومٌ لاحدود[٦] لأنّ المميز فيها خارجٌ عن الماهيّةِ نعم يختصرُ فيقال الإيجابُ إقتضاءُ الفعلِ الجازم[٧] وعلى هذا القياس[٨] وسيأتي حدُّ الأمرِ بإقتضاء الفعلِ[٩] والنهي بإقتضاء الكفّ[١٠] كما يحدّان بالفعل المقتضى للفعلِ والكفّ[١١] فالمعبّر هنا بما عدا الإباحةِ هو المعبَّرُ عنهُ فيما سيأتي بالأمرِ و النهي[١٢]

---

(١)چونكە عەلاقەو پەيوەندی بەفيعلی موكەللەفەوە هەيە لێرە تەعەلوقی بە فيعلی موكەللەفەوە هەيە ، ئەيكا بە سەبەب و شەرت و... تادوايی، بێگومان تۆ ئەبێ پێناسەی باسكراوەكانت زانيبێت واتە هەموو بەشەكانی خيتاب تەكليف و خيتاب (الوضع) (٢)بەم شێوە پێناسەی ئيجاب بريتيە لە كەلامێكی ئەزەلی داخوازيكەر بێت بۆ ئەنجامدانی كارێك بە داخوازيێكی بێگومان و حەتمی (٣)هەر لەسەر ئەم شێوەيە پێناسەی ئەوانی تريش (٤)لەمەودوا دێ پێناسەی سەبەب و ئەوانی تر لە هەموو ئەو بەشانەی پەيوەندييان هەيە بە خيتابی وەزعەوە.

(٥)هەروەها پێناسەی حەدييش دێ نەك بە زاتيات بەڵكو (حدّ) واتە پێناسە ئەبێ (جامع) بێ واتە كۆكەرەوەی هەموو تاكەكانی بێ . هەروەها (مانع)يش بێ واتە نەيەڵێ بێگانە بێتە ناو پێناسەكەوە. (٦)ئەو پێناسە ئەو رەخنەيەش لەسەر دانەر دەسرێتەوە كە دەڵێ ئەوەی زانرا رەسم بوو نەك حەدد- ئێمە حەددی عيلمی (منطق)مان مەبەست نيە (٧)چونكە (ممين)و جياكەرەوە لە هەموو بەشەكاندا -كە (إقتضاء)ی (جازم) و(غير جازم)-داخلی كەلامە ئەزەليە نەفسيە كە نەبوون، چونكە خيتاب بەخودی كەلامە ئەزەليەكە ئەڵێن، ئەميش وتی: حەددەكە (جامع و مانع )ە ئيتر بە زاتيات بێ يا نە ، جا بۆ حدود كورت دەكرێتەوە؟ بەڵێ لەوەش كورتر دەكرێتەوە، بۆ وێنە دەوترێ : ئيجاب بريتيە لە داخوازی بێ گومانی كردنی كارێك.

(٨)هەروەها پێناسەكانی تريش لەسەر ئەم شێوە (٩)هەروەها لەمەودوا دێ پێناسەی ئەمريش دەكرێ بە داخوازی ئەنجامدانی كارێك (١٠)نەهيش پێناسە ئەكرێ بە داخوازی نەكردنی كارێك (١١)وەك هەردوكيان پێناسە دەكرێن بە : قەولێك كە داخوازی كردنی كارێكە ياخود نەكردنيەتی (١٢)ئەوەی لێرەدا شيكراوەتەوە لەباسی خيتابی تەكليفدا جگە لە(إباحة)كەوجوب و نەدب و حورمەت و كەراهيەتە،هەر عەينی

نظراً هنا الى انَّهُ حكمٌ[١] وهناك الى انَّهُ كلامٌ[٢]

{والفرض و الواجب مترادفان} اي إسمانِ لمعنىً واحد[٣] وهو كما عُلِمَ من حدِّ الإيجابِ الفعلُ المطلوبُ طلباً جازماً[٤] {خلافاً لأبي حنيفة} في نفيهِ ترادفهما[٥] حيث قال هذا الفعل إن ثبت بدليلٍ قطعيٍ فهو الفرضُ كقراءةِ القرآنِ في الصلاةِ الثابتةِ بقولهِ تعالى: ﴿فاقرؤا ماتيسّر من القرآن﴾[٦] او بدليلٍ ظنيٍ كخبر الواحدِ فهو الواجبُ كقراءةِ الفاتحةِ في الصلاةِ الثابتةِ بحديثِ الصحيحينِ (لاصلاةَ لمن لم يَقرا بفاتحة الكتاب)[٧] فيأثمُ بتركها ولاتفسد به الصلاة بخلاف ترك القراءة[٨] {وهو} اي الخلافُ {لفظيٌّ} اي عائدٌ الى اللفظ والتّسمية[٩] إذحاصلهُ انّ ما ثبت بقطعيّ كما يسّمى فرضاً هل يُسمَّى واجباً[١٠] وما ثبت بظنيّ كما يسّمى واجباً هل يُسمَّى فرضاً[١١] فعندهُ لا[١٢] اخذاً من للفرض من فرض الشيئَ بمعنى حزّهُ اي قطع بعضَهُ[١٣]

---

ئەوە لەمەودوا تەعبیری لێ ئەدرێتەوە بە ئەمرو نەهی (١)ئەمرەکە بۆ (وجوب و ندب) نەهیەکەش بۆ (حرمة و کراهیة)، جا بۆچی ئاوا ئەیان گۆڕێ لەهەر جێگایەك ناوێکیان لێ ئەنێ؟ چونکە لێرە تەماشای ئەوە کراوە باسەکە باسی حوکمە، حوکمیش (واجب و ندب)ە (٢)لەوێش باسەکە باسی کەلامە کەلامیش یا ئەمرە یا نەهی.

(٣)فەرزو واجب دوو ناون بۆ یەك مانا (٤)ئەو مانایەش ئەوەیە کەزانرا لە تاریفی ئیجابدا، بریتیە لەوکارەی داواکردنی کراوە بە داخوازییەکی حەتمی (٥)بەپێچەوانەی ئەبوحەنیفە کە نەفی ئەوە ئەکا یەك مانایان هەبێ (٦)کەوتویەتی هەرکارێك بەبەڵگەیقەتعی سەلمێنرابێ وەك قورئان ئەوەفەرزە وەك خوێندنی قورئان لەنوێژدا کەبەم ئایەتەسابت بووە﴿ فاقرؤاماتیسّرمن القرآن﴾ (٧)بەلاّم ئەگەر بە بەڵگەیەکی (ظنّي) سەلمێنرا وەك فەرموودەیەك کە لە پلەی خەبەری تاکدا بێت (خبر الواحد) ئەوە واجبە، وەك خوێندنی فاتحە لە نوێژدا کە سەلمێنراوە بە فەرموودەیەك کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە فەرمویەتی: پاداشی نوێژ نیە بۆ کەسێك کە سورەتی فاتیحەی تیا نەخوێندبێ (٨)کە وابوو بە نەخوێندنی سورەتی فاتیحە گوناهبار ئەبێ نوێژەکەی پێ بەتاڵ نابێ بەلاّم نەخوێندنی قورئان لە نوێژدا نوێژەکەی پێ بەتاڵ ئەبێ (٩)ئەو جیاوازیەی نێوان ئێمەو حەنەفیەکان جیاوازیەکی لەفزو ناونانە نەك ناوەڕۆك و مانایە (١٠)چونکە ئەوەی لەو قسانەی پێشوو پەیدا ئەبێ ، ئەمەیە: ئەوەی بە بەڵگەی بێگومان سەلماوبێ وەناو ئەبرێ بەفەرز ئایا بە واجبیش ناودەبرێ ؟ (١١)ئەوەش بەبەڵگەی گوماناوی بسەلمێ وەك ناوئەبرێ بە واجب ئایا ناویش ئەبرێ بەفەرز؟ (١٢)ئەوەلای ئەبوحەنیفە نەخێر ناونابرێ (١٣)چونکەوشەی(فرض) لە(فرض الشيئ)

والواجب من وجب الشيئ وجبةً سقط [١] وما ثبت بظنيّ ساقط من قسم المعلوم [٢] وعندنا نَعم [٣] اخذاً من فرض الشيئ قدّرهُ ووجب الشيئ وجوباً ثبت [٤] وكلٌ من المقدّر والثابت اعمّ من ان يَثبَتَ بقطعيّ او ظنيّ [٥] وماخذنا اكثر إستعمالاً [٦]

وما تقدّم من انّ ترك الفاتحة من الصلاةِ لايُفسدها عندَهُ اي دوننا لايضرّ في انّ الخلاف لفظيّ [٧] لأنَهُ أمرٌ فقهيّ لامدخل له في التّسميةِ التي الكلام فيها [٨] {والمندوبُ والمستحبُّ والتطوعُ والسنَّةُ مترادفةٌ} اي اسماءٌ لمعنىً واحدٍ [٩] وهو كما علم من حدّ الندبِ الفعلُ المطلوب طلباً غير جازم [١٠] {خلافاً لبعض اصحابنا} اي القاضي حسين وغيره في نفيهم ترادفها [١١] حيثُ قالوا هذا الفعلُ إن واظَب عليه النبيّ ﷺ فهو السنّة او لم يواظب عليه كأن فعلهُ مرةً او مرتين فهو المستحبُّ او لم يفعلهُ وهو ماينشئهُ الإنسانُ باختياره من الأوراد فهو التّطوعُ [١٢]

---

الشيئ) وەرگرتووە كەبە واتای برینی هەندێكی شتێكە (١)وشەی واجبیش لە (وجب الشيئ) وەرگرتووە كە بەواتای برینی شتێكە بەتەواوی (٢)دەخۆ ئەوەش بەبەڵگەی گومانـاوی سەلماوبێ لەبەشی (معلوم) ئەكەوێت چونكە (معلوم) نیە (مظنون)و گوماناویە. (٣)بەلاّم لای ئێمە وەك فەرزی پێ ئەڵێن واجبیشی پێ‌ئەڵێن (٤)چونكە وشەی (فرض) مان لەوشەی (فرض الشيئ) كە بەواتای ئەندازەكردن و بەسەردانی شتێكە لەسەر كەسێ وە ووتراوە(وجب الشيئ وجوباً)بەواتای ثابت بوون هاتووە (٥)هەریەكە لە (مقدّر) (ثابت) چ بەڵگەی قەتعی یا ظنی بن هەر پێیان ئەڵێن: (مُقدّر و ثابت). (٦)جا بۆچی ئێمە وەك ئەوان نین یا ئەوان وەك ئێمە نین فەرقمان چیە؟ ئەوسەرچاوەی ئێمە (فرض)و(واجب)مان لێوەرگرتووە زۆرتر بەكاردێ.

(٧)جا كە نیزاع و بۆچوونەكە پەیوەندی بەلەفزو ووتنەوە هەیە ، بۆچی كەسێ سورەتی فاتیحە نەخوێنێ لای ئێمە نوێژەكەی بەتاڵە؟ ئەوەی رابوورد كەنەخوێندنی فاتیحە لە نوێژدا نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە لای حەنەفیەكان نابێتە هۆیەك زیان لەوە بدا كە نیزاعەكە لەفزیە (٨)چونكە ئەو بابەت و فەرمانە بووتە بابەتێكی (فقهي) نەك (اصولي) بەهیچ شێوەیەك ناچێتە ناو ئەو بابەتەی ئێمە گفتو گۆی لێ‌ئەكەین ئەویش ناونانی بابەتەكانە (٩)ئەمانە هەموو یەك مانایان هەیە (١٠)ئەویش وەك لەپێناسەی نەدبەوە زانراوە ئەوەیە كارێكە داوای ئەنجامدانی كراوە بە داخوازیەكی غەیرە جازم (١١)بەپێچەوانەی هەندێك لە یاوەرانی خۆمان وەك قازی حسین كەسانی‌تر كە ئەڵێن: ئەوانە یەك ماناو یەك پێناسەیان نیە (١٢)بەڵكوو ئەوان ووتویانە ئەم كارە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بەردەوام كردویەتی ئەوە (سنّة) ئەگەر بەردەوام نەیكردوە بەڵكو جارێك

ولم يتعرضوا للمندوبِ لعمومه للأقسام الثلاثة بلا شك[1] {وهو} اي الخلاف لفظيّ} اي عائدٌ الى اللفظ والتسمية[2] إذ حاصلهُ انّ كلاً من الأقسام الثلاثة كما يُسمَّى باسم من الأسماء الثلاثة كما ذُكر هل يُسمّى بغيره منها فقال البعضُ :لا[3] إذ السنة الطريقةُ والعادةُ والمستحبُّ المحبوبُ والتطوعُ والزيادةُ[4] والأكثر نعم ويصدُقُ على كلٍ من الأقسام الثلاثة انَهُ طريقةٌ و عادةٌ في الدين و محبوبٌ للشارع بطلبه و زائدٌ على الواجبِ[5]

{ولايجبُ} المندوبُ {بالشروعِ} فيه اي لايجبُ إتمامُهُ اي إنّ المندوب يجوز تركهُ و ترك إتمامه المبطل لما فعلَ منهُ تركٌ لهُ[6] {خلافاً لأبي حنيفة} في قولهِ بوجوبِ إتمامهِ لقوله تعالى: ﴿ ولاتبطلوا أعمالكم ﴾[7]

---

يان دووجار كردويەتی ئەوە (مستحبَ)ە يا پێغەمبەرﷺ هەر نەیكردوە موسوڵمانان خۆیان دایان هێناوە لەرێگەی (قاعدة) شەرعیەكانەوە وەك خوێندنی ویردو ئەوراد ئەوە (تطوع)ە (١)ئەم كۆمەڵە باسی (مندوب)یان نەكردوە چونكە (مندوب)وشەیەكی گشتگیرە بۆ هەرسیّ بەشەكە بێگومان.

(٢)ئەو جیاوازیە جیاوازیەكی سەرزارەكییو ناونانە (٣)چونكە پاڵفتەی ئەم جیاوازیە ئەمەیە هەریەكە لەو سیّبەشە وەك بەناوێك لەوسیّ ناوانە ناودەبریّ بەناوەكانی تریش ئایا ناودەبریّ ؟ (٤)چونكە مانا زوبانەوانیەكەیان جیایەسوننەت بەمانا رێگەوخووە، موستەحەب بەمانای خۆشەویستیە، تەتەوع بەمانای زیادەیە، كەوابوولەیەك جیان. (٥)بەلاّم زۆربەی زانایان ووتویانە بەلیّ هەرسیّ ناوەكە بەسەر واتای یەكتردا دەبریّ، چونكە هەرسیانیان ریّی دیندارین و نەریتی پێغەمبەر ﷺ بوون و هەر سیانیان پەسەندو خۆشەویستی خوان و داوای كردنی كردون وەهەر سیانیان زیادەیەكن لەدوای ئەنجامدانی واجب ئەكرێن ، بۆیە تەتەوعن.

(٦)بەدەستكردن بەئەنجامدانی مەندوب واجب نابیّ ئەو مەندوبە تەواو بكریّ واتە ئەتوانریّ دەستی لیّ هەڵبگیریّ چونكە مەندوب، دروستە هەر نەكریّ، تەواو نەكردنی ئەو مەندوبە كە ئەبێتە هۆی بەتاڵ كردنەوەی ئەو بەشەی لیّی كراوەو نەكردنی مەندوبەكەیە. (٧)–یەك ركات نوێژی سوننەت ئەكا وازی لیّ ئەهێنیّ ، ئەو وازهێنانە ئەبێتە هۆی بەتاڵ كردنەوەی ئەو ركاتەی كردویەتی– ئەمەش بە پێچەوانەی رای (ئەبو حنیفە)وە كەفەرمویەتی: بە چوونە ناو سوننەتەوە واجب ئەبیّ تەواوكردنی نابیّ وازی لیّبهێنریّ چونكە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ولاتبطلوا أعمالكم﴾ واتە كردارەكانتان بەتاڵ مەكەنەوە.

**حتّى يجب بترك الصّلاة والصّوم منه قضاؤهما[1] وعورض في الصّوم بحديث : (الصائم المتطوعُ أمير نفسه إن شاء صام وإن شاء أفطر)[2] رواه الترمذي وغيره وقال الحاكم صحيح الإسناد ويقاسُ على الصوم الصلاةُ[3] فلا تتناولهما الأعمال في الآية جمعاً بين الأدلة[4] {وَ وجوبُ إتمام الحجِّ} المندوبِ {لأنّ نَفلهُ}اي الحجّ {كفرضه نيةً}[5] فإنّها في كلٍ منهما قصد الدخولِ الحجِّ. اي التلبّسِ به[6] {وكفّارةً} فإنّها تجب في كلّ منهما بالجماع المفسدِ لهُ[7] {وغيرهما} اي غير النيّةِ و الكفّارة كإنتفاء الخروج بالفساد[8] فإنّ كلاً منهما لايحصل الخروج منه بفساده بل يَجبُ المُضيّ فيه بعدَ فساده[9]**

(١)نەك هەر ئەمە بەڵكو ئەگەر ركاتێ نوێژی سوننەتی كردو وازی لێهێنا یاخود چەند سەعاتێ رۆژوی سوننەتی گرت و وازی لێهێناو شكاندی واجبە قەزایان بكاتەوە. (٢)لەرۆژوی سوننەت دا نەیاری رای (ئەبوحنیفە) كراوە بە فەرموودەی: (الصائم المتطوعُ أمير نفسه إن شاء صام وإن شاء أفطر) رۆژوگری رۆژوی سوننەت ئازادە كارەكە بەدەستی خۆیەتی ، ئەگەر ویستی رۆژوەكەی تەواو بكا یا بیشكێنێ (٣)-ئەم فەرمودەیە بۆ رۆژووی سوننەتە- نوێژی سوننەتیش بەهەمان شێوە قیاس دەكرێت لەسەر رۆژوو (٤)كە وابوو بەڵگەی (ئەبوحنیفە) كە وشەی (الأعمال) بوو لە ئایەتەكەدا رۆژووی سوننەت و نوێژی سوننەت ناگرێتەوە بەم شێوەیە هەردوو بەڵگەكە كۆدەكرێتەوەو دژ بەیەك نابن.

(٥)حەجی مەندوب بۆیە واجبە تەواو بكرێ ، چونكە حەجی مەندوب و حەجی واجب وەك یەك وان لە سێ شتدا: أ-هەردووكیان یەك نیەتیان هەیە، (٦)چونكە نیەت لە هەردووكیانا، بریتیە لەمەبەستی چونە ناو كردارەكانی حەجەوە، (الدخول) بەواتای لیباسی ئیحرام لەبەر كرێ و یاساكانی حەج ئەنجام بدرێ، نەك وشەی (الدخول) بەواتا حەقیقەتەكەی راڤە بكرێ ئەم مانایە لێرەدا مەجازیە (٧)ب-لەكەفارەتا هەردووكیان چون یەكن، چونكە هەر كامیان بەهۆی جیماعێكەوە كە بەتاڵكەرەوەی حەج بێ كەفارەتیان تیا واجبە (٨)ج-لەیەك چوەكانی حەجی فەرزو سوننەت بێجگە لەودووانە كە نیەت و كەفارەتە . دەر نەچونە لەحەج بەهۆی شتێكەوە كە حەج بەتاڵ بكاتەوە (٩)-لە نوێژدا ئەگەر شتێكی نەگونجاو ئەنجام بدرێت ، ئەبێ واز لەنوێژەكە بهێنرێ بەلاّم لە حەجدا ئەبێ هەر لەسەری بەردەوام بین – چونكە هەر یەكە لە حەجی فەرزو سوننەت وازیان لێ ناهێنرێو چوونە دەرەوە لێیان قەدەغەیە بەهۆی نەكردنی مەرجێك و پایەیەك، بەڵكو واجبە بەردەوام بوون لە ئەنجامدانی

والعمرةُ كالحجِّ فيما ذُكر[١] وغيرهما ليس نفلُهُ وفرضُهُ سواء فيما ذُكر[٢] فالنيّةُ في نفل الصّلاةِ والصومِ غيرها في فرضهما[٣] والكفّارة في فرض الصّوم بشرطه دون نفله و دون الصّلاةِ مطلقاً[٤] و بفساد الصّلاة يحصلُ الخروجُ منهما مطلقاً[٥] ففارق الحجَّ والعمرة غيرهما من باقي المَندوبِ في وجوبِ إتمامِها لمشابَهتِهما لِفرضهما فيما تقدّمَ[٦]

{والسّببُ ما يضافُ الحكمُ اليه} كذا في المستصفى[٧] زاد المصنِّف لبيانِ جهةِ الإضافَةِ قوله {للتعلُّقِ} اي لتَعلُّقِ الحُكم {بهِ من حيث إنّهُ معرِّفٌ للحكم او غيره}[٨] اي غير معرِّفٍ لهُ اي مؤثر فيه بذاته[٩] او بإذنِ الله تعالى[١٠] او باعثٌ عليه[١١]

---

پاشماوەیان هەرچەندە حەجەکەیش دروست نیە. (١)لەوەی کە باسکرا عومرەیش حوکم و بڕیاری حەجی هەیە (٢)ئەوی فەرزو سوننەتی عیبادەتەکانی تر وەك یەك نین ؛ ئەمیش وەلام ئەداتەوە دەڵێ: ئەخێر جگە لە حەج فەرزو سوننەتی هیچ عیبادەتێکی‌تر وەك یەك نین لەوەی باسکرا (٣)بۆ نمونە ئەو نییەتە لە نوێژو ڕۆژوی سوننەتدا دەهێنرێ ئەو نیەتە نیە بۆ نوێژ و ڕۆژوی فەرز ئەهێنرێ.

(٤)کەفارەت واجب ئەبێ لەڕۆژوی فەرزا ئەگەر بە جیماع بیشکێنی وە لە مانگی رەمەزانیشا بێ، بەلام ڕۆژوی سوننەت کەفارەتی نیە ، وە کەفارەت لە نوێژی فەرزو سوننەتا هەر نیە (٥)-نوێژ یا ڕۆژو فەرزبن یاسوننەت-ئەگەر کارێکی پێچەوانەی یاسایان تیا کرا ئەوە دەرچون لێیان پەیدا ئەبێ واتە وازیان لێ‌ئەهێنرێ چونکە دوای هەڵەکە هەرچی بکرێ بەتاڵە، بەلام حەج وانیە باهەڵەیەکی هەڵوەشێنەری تیابکرێ ئەبێ بەردەوام ئەنجام بدرێت (٦)کە وابوو حەج و عەمرە لە مەندوباتەکانی تر جیاکردوە بەوە حەجی مەندوب و عەمرەی مەندوب واجبە تەواوکردنیان ئەگەر دەستیان پێکرا. چونکە حەج و عەمرەی مەندوب وەکو فەرزەکانیان وایە لەو بڕیارانەدا کە باسکرا.

(٧)سەبەب کەیەکێکە لە (خطاب الوضع) بریتیە لەوەی نیسبەتی حوکمەکەی بدرێتە لای، لە کتێبی (المستصفى)وەها پێناسەکراوە. (٨)بەلام دانەر بۆ رونکردنەوەی هۆی نیسبەتەکە ئەمەی زیاد کردوە، دەڵێ (للتعلّق..الخ) چونکە حوکمەکە کە موسەببەکەیە بەستراوە بە سەبەبەکەیەوە: باران بەسراوە بە هەورەوە چونکە نیشانەی بارانە: أ- لەو بارەوە کە سەبەب نیشانەی حوکمەکەیە یا نیشانەی نیە (٩)ب-سەبەبەکە خودی خۆی تەئسیر لە موسەبەب حوکمەکەدا ئەکا (١٠)ج-یا خود سەربەخۆ تەئسیری تیا ناکا بەڵکو بەهۆی فەرمانی خواوە ئەبێ (١١)د-یاسەبەبەکە تەنها هۆیە بۆ موسەبەب و حوکمەکە واتە بۆ کردنەکەی.

الأقوال الآتية في معنى العلّةِ اي حيثما اطلقت على شيئٍ معزواً اولُها لأهلِ الحقّ تعرّضَ لها هنا تنبيهاً على انّ المعبّرة عنهُ هنا بالسببِ هوَ المعبّرُ عنهُ في القياسِ بالعلّةِ كالزنا علّة لوجوبِ الجلدِ والزوالِ لوجوبِ الظهرِ والإسكارِ لحرمة الخمرِ(١)

وإضافَةُ الأحكامِ إليها كما يُقالُ يجبُ الجلدُ على الزّنا والظهرُ بالزّوالِ وتحرمُ الخمرُ للإسكارِ(٢) ومنْ قالَ: لايُسمّى الزوال و نحوَهُ منَ السّببِ الوقتيّ علّةً(٣) نظَرَ الى إشتراط المُناسبةِ في العلّةِ(٤) وسيأتي انّها لاتشترَطُ(٥) بناءً على انّها بمعنى المعرَّف الذي هوَ الحقّ(٦) وما عرَّف المصنّف بهِ السببَ هنا مبيِّنٌ لخاصّتهِ(٧) وما عرفَهُ بهِ في شرحِ المُختصرْ كالآمدي من الوصفِ الظاهرِ المُنضبِط المعرِّف للحكمِ مبيِّنٌ لمفهومه(٨)

(١)واتە هەرکات عیلەت بڕا بەسەر شتێکدا (لە نوسینی زانایانی شەرعدا ، نەك فەیلەسوفەکاندا چونکە لای ئەوان هەر مۆثرە) ئەو چوار قەولەش لەمانای مەبەستیعیللەت دا دێن -واتە سەبەب و عیللەت یەك مانایان هەیە- خاوەنی ئەم چوار قەولەکێن؟

(٢)جاتۆ وتت ئەمانە ئەبنە هۆ بۆ حوکمەکە، ئایا واجب بوونی جەڵدەکە ئەدرێتە پاڵ زینا؟ نیسبەت دانی ئەحکامەکان بۆ لای هۆکارەکانە وەك دەوترێ: جەڵد واجب دەبێ بەهۆی زیناوە، نیوەڕۆ بەهۆی زەواڵەوە ، عەرەق حەرام دەبێ بەهۆی سەرخۆشکردنەوەوە. (٣)کەسانێك زەوال و ئەوەی وەك ئەو بە عیلەت دانانێن کەسەبەبی کاتین. (٤)ئەوە بیریان لەوە کردۆتەوە موناسەبە لەنێوان علەت و معلولدا مەرجە. (٥)لەمەودوا دێ موناسەبە لەنێوانیاندا مەرج نیە. (٦)چونکە بۆیی وتوویانە مەرج نیەئەم قەولە دروست کراوە لەسەر ئەو بۆچوونە راستەی ئەهلی حەق کە فەرمویانە: عیلە و سەبەب بەواتای معرف نیشانەن نەك مۆثرو ئەوانیتر ، دانەر تەعریفی سەبەبی وەك تەعریفی سەبەب نیە لە(شرح المختصر)دا بۆ؟

(٧)دانەر لێرەدا پێناسەی سەبەبی کرد بەشێوازێك کەخاصەو تایبەتمەندی سەبەب و رونکاتەوە بەڵام (٨)ئەو تەعریفەی لە شەرحدا کردویەتی وەك چاوی لەئامێدی کردووە ، وتویەتی: سەبەب ئەبێ وەصفێ بێ ظاهیر بێ نەك مخفی -واتە دەرکەوێ- وەئەبێ رێك و پێك بێ و ضبط بکرێ -نەك هەندێ بیزانن و هەندێ نەیزانن- وەئەبێ نیشانەی سەبەب و حوکمەکەش بێ ئەو پێناسە رونکەرەوەی مەفهوم و ماهیەتی سەبەبە، کەوابوو مەبەستەکان جیابوون بۆیە پێناسەکان جیان، لەوێ بۆخاصیەت بووە لێرە بۆ ماهیەتە، ئەی بۆ قەیدی دوایی تێکرد وتی: معرف بێ؟

وبقيد الأخيرِ للإحترازِ عنِ المانعِ[١] ولم يقيِّدِ الوصفَ بالوجوديِّ كما في المانعِ لأنَّ العلَّةَ قدْ تكونُ عدميةً كما سياتي[٢] {والشرطُ يأتي} في مبحَثِ المخصِّص [٣] اخَّرَهُ الى هناك لأنَّ[٤] اللغويَ من اقسامه مخصِّصٌ كما في : اكرِمْ ربيعَةَ إنْ جاؤوا اي الجائينَ منهُمْ[٥] ومسائلُهُ الآتيَةُ منَ الإتِّصالِ وغيرِهِ لامحلَّ لذكرِها إلاَّ هناك[٦] ثمَّ الشرعيُّ المناسبُ هنا كالطهارَةِ للصلوةِ و الإحصانِ لوجوبِ الرَّجمِ[٧]

{والمانعُ} المرادُ عندَ الإطلاقِ وهوَ مانعُ الحكمِ[٨] {الوصفُ الوجوديُّ الظاهرُ المنضبِطُ المعرِفُ نقيضَ الحكمِ} اي حكمِ السبَبِ[٩] {كالأبوَّةِ في} بابِ {القصاصِ} وهي كونُ القاتِلِ أبا القتيلِ فإنَّها مانعَةٌ من وجوبِ القصاصِ. والمسبِّبُ عنِ لقتل لحكمَةٍ[١٠]

---

(١)لكاندنی وشەی ئەخیری پێناسەکە پێیەوە بۆ ئەوەیە کە مانعئەویش یەکێکە لە(خطابُ الوضع) بپواتە دەرەوە، چونکە سەبەب بۆ وجودی حوکمە، بەلآم مانع بۆ نقیضیەتی، بۆچی وتی: الوصفُ الظاهري؟ نەی وت: وجودی؟ (٢)دانەر نەیوت: سەبەب ئەبێ وەصفێکی وجودی بێ وەك: لە (المانع) دا وتویەتی: چونکە جاری واهەیە عەدەمیە وەك لەمەودوا دێت –وەك کاری شێت دروست نیە لەبەر نەبوونی عەقڵ –ئەگەر الوجودی لەپێناسەکەدا هەبوایە ئەم عیلەتە عەدەمیانە نەئەچوونە دەر ومبەر نەئەکەوتن.

(٣)یەکێکیتر لە(خطابُ الوضع) شەرطە کەلەباسی المخصص دا دێت و لێرەدا باسی ناکرێ، (٤)دانەر باسی شەرطی دواخست بۆ باسی مخصص چونکە ٥)شەرطی لوغەوی هەندێ بەش ی مخصصە ، وەك ئەڵێ: رێز لە هۆزی رەبیعە بگرە هەموویان نا تەنها ئەوانەی هاتوون. (٦)دووەم هۆ ئەو هەموو مەسائیلەی کە ـێت و باسی دەکرێ وەك: شەرطی متصل و شەرطی غەیرە متصل جێی باسکردنیان تەنها لەوێیە لەباسی مخصصدا نەك لێرە. (٧)پاشان شەرطە شەرعیەکە گونجاوە لەگەڵ باسی ئێرەدا ئەوەن هەموو پاکییەك کەمەرجی ئانجامدانی نوێژە، وەك: إحصان –جیماعی شەرعی– مەرجە بۆ واجب بوونی رەجم. (٨)سێهەم لە خطاب الوضع) مانعە، مانعێك مەبەستە لەکاتی وتنی مانعدا، کەمانعی حوکمی بێسەبەبە، نەك مانعی سەبەب و غیللەت، ئەو مانعە بریتیە لە: (٩)وەصفێك ئەبێ وجودی بێ نەك عەدەمی ، ئەبێ ظاهیری و ئاشکرابێ نەك مخفی، ، ئەبێ رێك وپێك لەهەموو ئەفرادەکانیا هەبێ، وەئەبێ نیشانەی دژی حوکمی سەبەب بێ.

(١٠)مانع وەك باوکایەتی لەمەسەلەی کوشتنەوەدا،باوکایەتیەك مانعە کە بکوژەکە

وهـي انّ الأبَ كـانَ سـبباً في وجـودِ إبنِـهِ فلايكـونُ الإبـنُ سـبباً في عدَمِـهِ[1] واطـلاقُ الوجوديِّ على الأبوّةِ التي هي امرٌ إضافيٌ صحيحٌ عندَ الفقهاءِ وغيرِهِم[2] نظراً الى انّها ليسَتْ عدَمَ شيئٍ[3] وإنْ قالَ المتكلّمون الإضافيات امور إعتباريّةٌ لاوجوديّةٌ كما سيأتي تصحيحُهُ في اواخِرِ الكتابِ[4] امّا مـانعُ السَّبَبِ والعلّةِ ولا يذكَرُ إلاّ مقيَّداً بأحدِهمـا فسيأتي في مبحثِ العلّةِ[5] {والصحّةُ} من حيثُ هيَ الشاملةُ لصحّةِ العبـادةِ وصحّـةِ العقدِ[6] {موافقَةُ} الفعلِ {ذي الوجهينِ} وقوعاً {الشرعَ}[7] والوجهان موافقةُ الشرعِ و مخالفتُه[8]

---

باوکی کوژراوەکەبێ ئەوە ئەبێتە مـانع لەو اجب بوونی تۆڵە سەندنەوەی کوژراوەکە کەپەیدا بووە لەکوشتنەوە بـۆیە ئەبێتە مانع لەبـەر خـاڵێکی زۆر بـەجێ (١)ئـەویش بریتیە لەوەی باوکەکە هۆی بوونی کوڕەکە بووە، دەنابێ کوڕەکە ببێتە هۆی نەمانی باوکەکەی ، دەخۆ مانع ئەبێ وەصفێکی وجودی بێ، باوکایەتی وەصفێکی ئیضافیە، مەقولەی ئیضافیش لای متکلمین نیە، بەشتێکی ئیعتباری دائەنێن؟ ئەمیش دەڵێ: (٢)دابڕینی وجودی بەسەر باوکایەتیدا کەشتێکی ئیضافی و نیسبیە لەنێوان باوك و کوڕدا، ئەم دابڕینە شتێکی صەحیحە بەلای فقهاو غەیری فقهاوە، ئەم وجودیەی ئێرە بەمانای وجودی شمول نیە، وجودی یانی عدم داخلی مەفهومی نەبێ، (ابوة: کونُ الحیوانِ خـلقَ منـهُ حیـوانٌ آخـر) وەکـو:(عــمی) نیـە بـەمانا (عـدم البصـر) بـێ. (٣)چونـکە تەماشـای ئـەوە دەکرێـت کـە (ابـوة عـدم الشیـئ) نیـە بـەڵکو شیـئ ، وجودیش ئەوەیە عدم شیئ نـەبێ، کەوابـوو ابوە وجودیە.

(٤)هەرچەند متکلمون وتوویانە: هەرچی شتی ئیضافی هەیە هەموویان ئیعتبارین، -واتە وجودی مەحمولیان نیە- وجودی نین . بەڵا وجودیەك حەملی وجودیـان بکەیتە سەر، نەك وجودیەك عدم داخلی مەفهومیان-بێ، بەم مانایە وجودین، وەك لەمەودوا دێت، راستکردنەوەی ئەوە لەکۆتایی کتێبەکەدا دێت (٥)وتمان هەرکات وترا مانع ئەوە بەبێ ئیضافە ئەوە مانع الحکم مەبەستە، بەڵام مانع السبب یا مانع العلە بەبێ ئیضافە بۆ لای یەکێ لەو دووانە ناوترێ، باسی ئەو مانع السبب و العلـە لەباسی علەتدا ئەکرێ.

(٦)یـەکێکی‌تر لـە (خطـاب الوضـع) صحەتـە، صحـەتیش وشـەیەکی گشـتگیرە بـۆ عیبـادەتیش و بـۆ عـەقدیش بریتیـە لـە: (٧)موافەقـە کردنـی کـارێکی دووڕوو لەئەنجامدانیدا بۆ شـەرع (٨)کەئـەڵێن: کـارێکی دووڕوو مەبەسـت بـەو دووڕووە یەکەمیان دیوی موافـتەقەی شەرعەکەیـەتی، دووەمیان: دیوی مـوخالەفەی شەرعە.

اي العقل الذي يقَعُ تارةً موافقاً للشرع لإستجماعهِ مايعتَبَرُ فيهِ شرعاً وتارةً مخالفاً لإنتفاء ذلكَ[١] عبادةً كانَ كالصلوةِ او عقداً كانَ كالبيعِ[٢]

الصحَّةُ موافقَةُ الشرعِ[٣] بخلافِ مالا يقَعُ إلاّ موافقاً للشرعِ كمعرفَةِ اللهِ إذ لو وقعَتْ مخالَفةً لهُ ايضاً كانَ الواقعُ جهلاً لا معرفَةً[٤] فإنْ كانَ موافقتُهُ الشرعَ ليسَتْ من مسمّى الصحَةِ فلا يسمّى صحيحاً[٥] فصحّةُ العبادَةِ أخذاً من ذكرِ موافقةِ العبادَةِ ذاتِ الوجهَينِ وقوعاً الشرعَ وإن لم تسقُط القضاءَ[٦]

{وقيلَ} الصِّحَةُ {في العبادةِ إسقاطُ القضاءِ} اي إغناؤها عنهُ بمعنى ان لايحتاجَ الى فعلها ثانياً[٧] فمنْ وافقَ من عبادةٍ ذاتِ الوجهينَ الشرعَ ولمْ يسقط القضاء كصلوةِ منْ ظنَّ انّهُ متطهرٌ ثمَّ تبيَّنَ لهُ حدثُهُ يسمَّى صحيحاً على الأوَّلِ دونَ الثّاني.[٨]

---

(١)واتە ئەو کارەی جاری واهەیە ئەنجام ئەدریٚ موافقی شەرعە، چونکە ئەوەی شەرع ئیعتباری پیٚ بکا بۆ ئەنجامدانی تیا کۆکراوەتەوە ، وەجاری واش هەیە موخالفی شەرعە، چونکە ئەو شەرط و رکن و ئەسبابانەی شەرع دیاری کردوون تیایدا نیە، ئیتر ئەو فیعلە. (٢)کەیفی خۆیەتی عیبادەت بیٚ وەکو: نویٚژ، یاخود عەقد بیٚ وەکو: کرین و فرۆشتن.

(٣)ئەو صحەتەی مەبەستە ئەنجامدانیئەوکارە موافقەی شەرع بیٚ. (٤)بەپیٚچەوانەی ئەوەی تەنها یەك دیوی هەیە بەموافقەی شەرع نەبیٚ نابیٚ، وەك ناسینی خوا چونکە ئەگەر بە موخالەفەی شەرعیش واقعە کەجەهل و نەزانینی پیٚ ئەوتریٚ نەك مەعریفە، وەك نویٚژ نیە ئەگەر هەموو مەرجەکانی تیادا بوو ئەوە پیٚی ئەلیٚن: نویٚژیٚکی صەحیحە . ئەگەر تیایدا نەبوو پیٚی ئەلیٚن: نویٚژیٚکی غەیرە صەحیح. (٥)چونکە موافقەی شتی یەك روو بۆ شەرع لەوانەنیە کەصحەتی پیٚبوتریٚ ، کەوابوو کارکەش بەصەحیح ناونابریٚ.(٦)کەوابوو پیٚناسەیعیبادەتی صەحیح کەوەرگیرابیٚ لەوەیباسکرا ئەمەیە، کە بریتیە لە موافقەی عیبادەتیٚکی دوو روو بۆ شەرع لەکاتی ئەنجامدانیدا ، هەرچەند کردنەوەکەشی لەکۆڵ نەخا وەك نویٚژیٚك کەبەگومانی خۆی دەست نویٚژی هەیە هەرکات بیریکەوتەوە ئەبیٚ بیکاتەوە،هەرچەند پیٚشوەکەشی بەصەحیح ناوبراوە.

(٧)وتراویشە عیبادەتی صەحیح بریتیە لەوەی کردنەوەی لەکۆڵ بخا، واتە: ئەو عیبادەتە بیٚ ئیحتیاجی بکا لەکردنەوەی بەکورتی پیٚویستی بەکردنەوەی نەبیٚ جاریٚکیتر. (٨)کەوابوو هەرشتیٚك موافقەی شەرع بیٚ لە عیبادەتی دوو دیوو قەزایشی لەکۆڵ نەخا، وەك نویٚژی کەسیٚك واگومان بادەست نویٚژی هەیە پاشان بیٚدەست نویٚژیخۆی بۆ دەرکەویٚ، ئەم نویٚژە لای قەولی یەکەم صەحیحە نەك لای قەولیدووەم.

{وبصحَّةِ العقدِ} التي هي اخذاً مما تقدَّمَ موافقتُهُ الشّرعَ {ترتُّبُ اثرِهِ} اي اثرُ العقدِ فيهِ[١] وهو ماشرعَ العقدُ لهُ كحلِّ الإنتفاعِ في البيعِ والإستمتاعِ في النِّكاحِ[٢] فالصحَّةُ منشأ الترتُّبِ لانفسهُ[٣] قال المصنِّف: بمعنى انَّهُ حيثُما وجدَ فهو ناشئٌ عنها، لابمعنى انَّها حيثُما وجدَتْ نشأ عنها[٤] حتَّى يردَ البيعُ قبلَ إنقضاءِ الخيارِ فإنَّه صحيحٌ ولمْ يترتَّبْ عليهِ اثرهُ[٥] وتوقفُ الترتُّبِ على إنتفاءِ الخيارِ المانعِ منهُ لايقدَحُ في كونِ الصِّحَةِ منشأ الترتُّبِ[٦] كما لايقدَحُ في سببيَّتِهِ ملك النِّصابِ لوجوبِ الزَّكاةِ توقفهُ على حولانِ الحولِ[٧] وقدِّمَ الخبَرُ على المُبتدا ليتأتَّى لهُ الإقتصار فيما يليها[٨] وعندَ التقديمِ غيرِ الضميرِ بالظاهرو العكسِ ليتقدَّمَ مرجع الضمير عليهِ[٩]

---

(١)بەهۆی صیحەتی عەقدەوە کەوەردەگیرێ لەوەی پێشوو بریتیەلە: هاوتەریبی عەقدەکە بۆ شەرع، شوێنەواری عەقدەکە دێ بەشوێنیاو دروست دەبێ.
(٢)شوێنەوارەکەشی بریتیە لەو شتەی عەقدەکەی بۆکراوە، وەك حەلاڵی سود وەرگرتن لە کڕین و فرۆشتندا، یاحەلاڵی لەزەت وەرگرتن لەنیکاحدا. (٣)کەوابوو صحەت سەرچاوەی تەرەتوبی ئاثارە نەك خودی تەرەتوبەکەیە وەك کما قیل وتراوە.
(٤)دانەر دەڵێ: هەرکات تەرەتوبی ئاثار بوو ئەوە لەصحەتەوە دروست بووە، نەك بەو مانایە هەرکات صیحەت بووتەرەتوب لەو صحەتەوە دروست دەبێ. (٥)تا بەخرابە بێتە سەرمان کڕین و فرۆشتنی پێش تەواو بوونی ماوەی خیار ، ئەوە ئەو مامەڵە صەحیحە، بەلاّم تەرەتوبی شوێنەواری عەقدەکەی نایەتە سەر، کەحەلاّلی سود وەرگرتنە سەنراوەکەیە، کەسێ دەڵێ: کەوابوو صحەت سەرچاوەی تەرەتب نەبووە، ئیتر بۆ صحەت بە سەرچاوە حیساب کراوە؟
(٦)وەستانی تەرەتب لەسەر تەواوبوونی خیارێك کەنایەڵێ ئەو تەرەتوبە بێ، ئەوە زیان لەوە نادات کە صحەت سەرچاوەی تەرەتوبە، واتە هۆی تەرەتوبەکە هاتووەتە دی کەصحەتە، بەلاّم مانعێك هەیە کە خیارە، وەك نوێژ بەزەوال واجب دەبێ بەلاّم حەیض مانعە لەکردنی. (٧)وەك: وەستاندنی ئەنجامدانی زەکات بەسراوە بەچەرخەی چوار وەرزەوە ئەمە زیان ناگەیەنێ بەهۆکاری واجب بوونی زەکات کە مالکیەتی نصابە، چل سەر مەڕ سەبەبە بۆ زەکات، بەلاّم مەرجەکەی چەرخەی چواروەرزەیەو (٨)خەبەرەکەی خستە پێش موبتەداکە بۆ ئەوەی بتوانێ ئەوەی دێ بەدوایاندا بەکورتی داپڕێژێ ، والأصل: (وترتُّبُ اثرِ العقدِ بصحَّتِهِ). (٩)کاتێ پێش وپاش کراوە بە موبتەداو خەبەر ئیسمی ظاهیر لەجێی ضەمیر دانراوە و پێچەوانەکەشی بۆ ئەوەی جێ ضەمیرەکە لە پێشەوە بێ.

{و}بصحَّةِ {العبادةِ} على القولِ الرَّاجحِ في معناها {اجزائُها اي كفايتُها في سقوطِ التَّعبُّدِ} اي الطلَبِ وإنْ لم يسقُطِ القضاءُ[١] {وقيلَ إجزائُها اسقاطُ القضاءِ} كصحَّتِها على القولِ المرجوحِ[٢] فالصحَّةُ منشأُ الإجزاءِ على القولِ الراجحِ فيهما[٣] ومرادفَةٌ لهُ على القولِ المرجوحِ فيهما[٤]

{ويختصُّ الإجزاءُ بالمطلوبِ} من واجبٍ و مندوبٍ اي بالعبادةِ لايتجاوزُها الى العقدِ المُشارِكِ لها في الصحَّةِ[٥] {وقيلَ} يختص {بالواجبِ} لايتجاوَزُهُ الى المندوبِ كالعقدِ[٦] والمعنى أنَّ الإجزاءَ لايتَّصفُ بهِ العقدُ و تتَّصفُ بهِ العبادَةُ الواجبَةُ و المندوبَةُ[٧] وقيلَ الواجبَةُ فقط[٨] ومنشأُ الخلافِ حديثُ ابنِ ماجةَ وغيرِهِ مثلاً[٩] واربعٌ لاتجزئُ في الاضاحي فاستعملَ الإجزاءَ في الأضحيَةِ وهي مندوبَةٌ عندَناو واجبَةٌ عندَ غيرِنا كأبي حنيفَةَ[١٠]

---

(١)بەهۆی صحەتی عیبادەتەوە -صحەتی بەواتای قەولی راجیح کە بریتی بوو لە موافقەی شەرع بیّ- ئە. عیبادەتە مجزیەو کیفایەتە ئەبێتە هۆی عیبادەت لەکۆڵ کەوتنەوەکەی، واتە ئیتر داوای کردنی جارێکیتر لێناکرێ، هەرچەند گەڕانەوەشی ـەکۆڵ ناخا. (٢)وتراویشە عیبادەتی مجزی ئەوەیە عیبادەتی لەکۆڵ بخا، وەك: صحەت لەسەر قەولی مەرجوح بەمانا (إجزاء) و کیفایەتە هەرچەند قەزایشی لەکۆڵ نەخا. (٣)کەوابوو صحەت سەرچاوەی کافی بوونە چ لە (إجزاء)دا و چ لە صحەتدا ، ـەسەر قەولیراجیح. (٤)لەسەر قەولی مەرجوح صحەت مرادف و هاومانای(إجزاء)ەکەیە بەمانای قەزا لەکۆڵ کەوتنە، صحەت و (إجزاء)ش هەردووکیان.

(٥)(إجزاء)تایبەت دەکرێ بەشتێکەوە داوای کردنی کرابێ، ئەوەش تەنها واجب و مەندوبە، نەك حەرام و کەراهەتە، واتە تایبەتە بەعیبادەتەوە، بۆ عەقد بەکارناهێنرێ، -ناوترێ مامەڵەیەکی مجزی- هەرچەند هەردووکیان صحەتیان بۆ بەکاردێ، واتە نەوترێ: عیبادەتی صەحیح و مامەڵەی صەحیح. (٦)وتراویشە: (إجزاء) هەر تایبەتە بە واجبەوە و لێی جیانابێتەوە بڕواتە سەر مەندب وەك ناچێتە سەر عەقد و مامەڵە.

٧)کورتەی ماناکەی لەسەر قەولی یەکەم ئەمەیە: عەقد (إجزاء)ی بۆ بەکارناهێنرێ، بەڵام عیبادەت واجبی یا مەندوبی (إجزاء)ی بۆ بەکاردێ. (٨)وتراویشە: (إجزاء)تەنها بۆ عیبادەتی واجب بەکاردێ. (٩)سەرچاوەی دروست بوونی جیاوازی زانایانی ـصول لەبەکارهێنانی (إجزاء)دا فەرموودەیەکە ئیبن ماجەو غەیری ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە بۆ وێنە.. (١٠)چوارشت بۆ قوربانی ناشێن پێغەمبەر ﷺ لێرەدا وشەی: (إجزاء)ی بەکارهێناوە بۆ قوربانی بەکارهێناوە، قوربانیش لای ئێمە مەندوبە

ومنْ استعمالهِ في الواجبِ إتفاقاً حديثُ الدّارقطني وغيرِهِ:(لا تجزئُ صلاةٌ لايقرأُ الرجُلُ فيها بأمِّ القرآنِ)[1]

{ويُقابِلُها} اي الصحَّة {البُطلان}[2] فهوَ مخالَفةُ الفعل ذي الوجهَين وقوعاً الشرعَ[3] وقيلَ في العبادَةِ عدَمُ إسقاطِها القضاءَ[4] {وهوَ} اي البطلان الذي علِمَ انَّهُ مخالفَةُ ذي الوجهين الشرعَ {الفساد} ايضاً[5] فلكلٌ منهما مخالَفةُ ماذُكرَ الشرعَ[6] {خلافاً لأبي حنيفَة} في قولِهِ: في مخالَفةُ ماذُكرَ للشرع بأن كانَ منهيَّاً عنهُ[7] إن كانَت لكونِ النّهي عنهُ لأصله فهي البُطلانِ، كما في الصلوةِ بدونِ بعضِ الشروطِ او الأركانِ و كما في بيعِ الملاقيحِ وهي ما في البطونِ منَ الأجنَّةِ لإنعدام ركنٍ منَ البيعِ[8] او لوصفِهِ فهي الفسادُ كما في صومِ يومِ النَّحرِ للإعتراضِ بصومِهِ عنْ ضيافَةِ اللهِ للناسِ للحومِ الأضاحي التي شرعها فيه[9]

---

بەلای غەیری ئیمەوە واجبە وەك: رای ئەبو حەنیفە. (١)هۆیەکیتر بۆ جیاوازی بەکارهێنانی (إجزاء)یە، لە واجبدا بەلای هەموو لایەك وەك ئەو فەرموودەیەی دارقطنی و غەیری ئەویش ریوایەتی دەکەن، دەفەرموێ: نوێژێ نوێژگەرەکەی فاتیحە تیایدا نەخوێنێ مجزی و کافی نیە، لای ئێمە فەرضیشەو واجبیشە، لای غەیری ئێمەش واجبەو بەس.

(٢)بطلان دژی صحەتە کەوابوو (٣)بطلان یانی موخالەفەی کارێکی دوو دیودار بۆ شەرع لەلایەن وقوع و ئەنجام دانەوە. (٤)وتراویشە: بطلان لە عیبادەتدا بەمانای قەزا کردنەوەی لەکۆڵ نەکەوتبێ. (٥)جا ئەو بطلانە پێناسەکەی زانرا -کەموخالەفەی وەصفێکی دوو دیودارە بۆ شەرع لەکاتی ئەنجام دانیدا-هەروەك پێی دەڵێن: بطلان پێشی دەڵێن: فەساد.

(٦)کەوابوو فەسادو بطلان هاومانان هەردووکیان بەسەرپێچی شەرع دەڵێن لە کارێکدا (٧)بەپێچەوانەی ئەبو حەنیفەوە کە دەفەرموێ: ئەو کارە کاتێ پێیدەوترێ: سەرپێچی شەرع کەنەهی لێکرابێ-نەهیش لەبەر دوو هۆیە- (٨)ا-ئەگەر ئەو فیعلە نەهی لێکراوە لەبەر ئەصلی خۆی بێ ئەوە ئەو موخالەفەیە پێی دەوترێ: بطلان وەك: نوێژێك هەندێك مەرجی یاروکنی نەبێ، یاوەك فرۆشتنی بێچوو، ئەو بێچوانەی هێشتا لەدایك نەبوونو ئەمیش روکنێك لەبەیعەکە نیە کەفرۆشراوەکەیە. (٩)یاخود ئەو کارە کەنهی لێکراوە لەبەر خودی خۆی نیە، بەڵکو لەبەر وەصفێك لە وەصفەکانیەتی ئەوە پێی ئەوترێ فەساد، وەك رۆژوی رۆژی جەژنی قوربان ئەبێتە هۆی پشت تێکردن و وەرنەگرتنی میوانداریخوا بۆ خەڵك بەگۆشتی قوربانیکەلەو رۆژەدا فەرمانیپێدراوە.

وكما في بيعِ الدِّرهَمِ بالدرهمينِ لإشتمالهِ على الزِّيادةِ فيأثمُ بهِ ويفيدُ بالقبضِ الملكَ خبيثٌ[1] ولو نذرَ صومَ يومِ النَّحرِ صحَّ نذرُهُ ولأنَّ المعصيةَ في فعلهِ دونَ نذرِهِ ويؤمَرُ بفطرِهِ و قضائِهِ ليتخلَّصَ عنِ المعصيةِ ويفي بالنذرِ[2] وأمَّا الباطلُ فلا يعتدُّ بهِ[3] وفاتَ لمصنِّف انْ يقولَ: والخلافُ لفظيٌّ كما قالَ: في الفرضِ والواجبِ[4] إذْ حاصلُهُ أنَّ مخالَفَةَ ذي الوجهينِ للشرعِ بالنهي عنهُ لإصلهِ كما تسمَّى بطلاناً هلْ يسمَّى فساداً[5] او لوصفهِ كما تسمَّى فساداً هلْ تسمَّى بطلاناً[6] فعندَهُ لا و عندَنا نعم[7]

{والأداءُ فعل بعضٍ وقيلَ: كلّ ما دخَلَ وقتُهُ قبلَ خروجِهِ} واجباً كانَ او مندوباً[8] وقولُهُ فعلَ بعضٍ يعني معَ فعلِ البعضِ الآخَرِ في الوقتِ أيضاً صلاةً كانَ او صوماً او بعدَهُ في الصلاةِ لكن بشرطِ ان يكونَ المفعولُ فيهِ منها ركعةً[9] كما هوَ معلومٌ من محلِّهِ[10] لحديثِ الصحيحَينِ: (منْ ادركَ ركعةً فقدْ ادركَ الصلاةَ)[11]

---

١)وەك فرۆشتنی درهەمێك بەدوو درهەم ئەمە نەهی لێكراوە ، چونكە ئەم مامەڵەی ـ ەی تیادایە دەی بەم مامەڵە گوناهبار ئەبێ، بەڵام بە وەرگرتنەكەی ئەبێتە خاوەنی ـ ڵێكی حەرام. (٢)ئەگەر لەسەر خۆی نەزر كرد گرتنی رۆژوی یەكەم رۆژی جەژنی قوربان ئەو نەزرە صەحیحە، چونكە گوناهەكە لەئەنجامدانی نەزرەكەدایە، نەك ـەخودی نەزرەكەدا، فەرمانی پێئەدرێ بەشكاندنی بۆ ئەوەی لە گوناهەكەی رزگاری ـێ. و فەرمانیشی پێئەدرێ بەگرتنەوەی بۆ ئەوەی وەفا بە نەزرەكە بكا ئەمە بەلای ـەبو حەنیفەوە. (٣)بەڵام باطل ئیعتباری پێناكرێ. (٤)دانەر لە دەستی چوو بڵێ: ئەم جیاوازیە جیاوازیەكی زارەكیە و بەس ، وەك لەباسی فەرض و واجبدا ووتی : چونكە كورتەی ئەم جیاوازیە ئەمەیە موخالەفەی كارێكی دوودیوو بۆ شەرع ، بۆیە مخالفە چونكە نەهی لێكراوە لەبەر خودی كارەكەیە وەك بەڕای هەموان ناو ئەبرێ بە ـطلان ئایا ناوئەبرێ بە فەساد؟ (٦)یاخود نەهی لێكراوە لەبەر وەصفێكی فیعلەكەیە ـەت بەڕای هەموان ناوئەبرێ بە فەساد ئایا ناوئەبرێ بە بطلان؟ (٧)لای ئەبو حەنیفە ـەخێر ناونابرێ، بەڵام لای ئێمە بەڵێ ناوئەبرێ ،

٨)ئەداء بەئەنجامدانی هەندێ -وتراویشە- هەموو ئەو عیبادەتەی كاتەكەی ـەتووەو پێش دەرچوونی، ئەو عیبادەتە واجب یاخود مەندوب بێ. (٩)كە ئەڵێ: كرننی هەندێكی بەواتای هەندێكیتری ا-ئەویش لەوكاتانەدا بكرێ وەك نوێژو رۆژو ـ-یاخود دوای كاتەكەی خۆیەوە بكرێ ئەویش تەنها وەكو نوێژ -نەك رۆژو- بەڵام ـەمەرجی ئەوەی ئەكرێ لە كاتی خۆیدا لەنوێژەكە ركاتێ بێ. (١٠)وەك لەجێی خۆیدا ـزانرێ. (١١)لەبەر ئەو فەرموودەیە بوخاریو موسلیم ریوایەتیان كردووە دەفەرموێ:

وقولُهُ بعض بلا تنوين لإضافته إلى مثلِه ما اُضيفَ إليه المعطوفُ[١] حذفَ اقتصاراً[٢] كقولِهم نصف و ربع درهمٍ[٣] وكذا قولهم في تعريفِ القضاءِ [٤]

{والمؤدى مافعلَ} منْ كلِّ العبادَةِ في وقتِها على القولينِ او فيه وبعدَه على الأوّلِ[٥] {والوقتُ} مافعلَ كلُّهُ فيهِ وبعدَهُ اداءً اي للمؤدي[٦] {الزمانُ المقدَّرُ لهُ شرعاً مطلقاً}[٧] اي موسعاً كزمانِ الصلواتِ الخمسِ وسننها والضحى و العيدِ[٨] فما لمْ يقدَّر لهُ زمانٌ في الشرعِ كالنفلِ والنذرِ المطلقتينِ[٩] وغيرهما وإن كانَ فوريّاً كالإيمانِ[١٠] لايسمّى فعلهُ اداءً ولا قضاءً[١١] {القضاءُ فعلُ كلٍّ وقيلَ بعضِ ماخرجَ وقتُ ادائه} منَ الزّمانِ المذكورِ معَ فعلِ بعضه الآخرِ بعدَ الآخرِ بعدَ خروجِ الوقت أيضاً صلاةً كانَ او صوماً[١٢]

---

هەرکەس بگا بەرکاتێ نوێژا ئەوە بەهەمووی گەیشتووە. (١)لەمەتنەکەدا بعض بەبێ تەنوین ئەخوێنرایەوە، چونکە ئیضافەکراوە بۆ ئەو(مضاف الیـه)ی معطوفەکەیبۆ ئیضافەکراوە. (٢)لەبەر کورتـی دارشتنەکە لابـراوە. (٣)وەك عـەرەب دەڵێـن: نیـوەو چارەکی درهـەمێك مضـاف الیه نصفەکە لابـراوە. (٤)هـەروەها لەپێناسـەی قەزاشـدا مضاف الیه کل لابراوە.

(٥)مۆدی بەوە دەڵێن کەکراوە، ئیتر هەموو عیبادەتەکانی لەکاتی خۆیدا کرابێ وەك هـەردوو قەول وتیان: یاخود هـەندێکی لـەکاتی خۆیـدا کرابـێ و هەندێکیشـی دوای کاتەکەی کرابێ، وەك قەولی یەکەم دەڵیچ. (٦)کاتی ئەو عیبادەتەی هەمووی تیاکرابێ پێـی ئەڵێن ئەدا ، یاخود هـەندێکی لـەکاتی خۆیـدا کرابـێ و هەندەکەیتریشـی دوای کاتەکەی کرابێ ئەویش ئەدایە، واتە کارە جێبەجێکراوەکە بریتیە لە (٧)لـەو کـات و زەمانەی شەرع بۆی دیاری کردووە بە مطلقی.

(٨)واتە دوو زەمانمان هەیە:أ-موسع، کەئەندازەی ئەنجامدانی عیبادەتەکە زیـاترو فراوانترە، وەك کاتی پێنج فەرزەی نوێژەکان و سوننەتەکانیان و چێشـتەنگاو نوێـژی جەژن. ب-مضیق ، واتە: ئەوەندەیە واجبەکەی تیا ئەنجام بدرێ نەکـەم نـەزیاتر، وەك کاتی رۆژوی رەمەزان و رۆژانی سپی-مەبەست شەوانی سپیە ١٣و ١٤ و١٥-.

(٩)ئەو عیبادەتەی شەرع زەمانی بۆ دیاری نـەکردووە ، وەك نـەفلو نـەزری مطلـق و (١٠)جگە لەوانەش هەرچەندە تەکلیفەکـەش فـەرزی بـێ وەك ئیمانهێنانی کـافر و بـالغ کـە زەمانیـان بـۆ دیـاری نـەکراوە (١١)ئـەو عیبادەتـەی زەمـانی بـۆ دیـاری نـەکراوە کردنەکەی نەئەدای پێئەوترێ نە قضاء. هەرچەند کردنەکەی بەبێ زەمان ناکرێ.

(١٢)قضاء بە ئەنجامدانی عیبادەتێك دەڵێن: هـەمووی یـاخود هـەندێکی لـەدەرەوەی کاتەکەی خۆیدا کرابێ، ئەوی تریشی هەر لەدەرەوەی کاتـــەکەیدا کرابێ ئیـتر نوێژە

والحديثُ المتقدِّمُ فيها فيمنْ زالَ عذرهُ كالجنونِ وقدْ بقيَ منَ الوقتِ مايسعُ ركعةً فتجبُ عليهِ الصلاةُ[1] ولو قالَ وقتُهُ كما قالَ في الأداءِ كفى[2] {استدراكاً} بذلكَ بذلكَ الفعلِ {لما} اي لشيئٍ {سبقَ لهُ مقتضٍ للفعلِ} اي لأنْ يفعَلَ[3] وجوباً اوندباً[4] فإنَ الصلوة المندوبَةَ تقضىَ في الأظهرِ[5] ويُقاسُ عليها الصومُ المندوبُ[6] فقولُهُ مقتضٍ احسنُ من قولِ إبنِ حاجب وغيره وجوب[7] لكنْ لو قالَ لما سبقَ لفعلِه مقتضٍ كانَ أوضحَ واخصرَ[8] {مطلقاً} اي منَ المستدرَكِ[9] كما في قضاءِ الصلوةِ المتروكةِ بلا عذر[10] او منْ غيرِهِ كما في قضاءِ النائمِ الصلاةَ و الحائضِ الصومَ فإنَّهُ سبقَ مقتضىً لفعلِ الصلوةِ والصومِ من غيرِ النائمِ والحائضِ لامنهما[11]

---

ياخود رۆژوە، ياخود پێش دەرچوونی کاتەکەی هەندێکی کرابێ وەك نوێژ ، هەرچەند ئەندازەی کراوەکەش رکاتێکیش بێ یا زیاتر، جا خۆ فەرموودەکە وای گەیاند ئەگەر یەك رکات فریا بکەوێ ئەوە بەئەدا حیساب دەکرێ. (١)ئەو فەرموودەی پێشوو لەبارەی نوێژێکەوەیە نوێژگەرەکە لەبەر عوزرێك نەیکردبێ وەك شێتیەتی وحەیض ، بەلاّم عوزرەکەی نامێنێ بەئەندازەی کردنی یەك رکات ماوەی مابێ، ئەوە واجبە لەسەری ئەو نوێژە بکات. (٢)ئەگەر دانەر وشەی ئەدای لەپێناسەی قەزادا نەوتایە ، وەك لە پێناسەی ئەدادا نەیهێناوە بەس بوو بەجێبوو. (٣)بەوقەزاکردنەوە تۆلەو جوبرانی ئەوشتە ئەکاتەوە کە داخوازی کەری کردنەکەی تێپەری کردووە.

٤)ئەوەی قەزا ئەکرێتەوە واجبە یامەندوبە، چونیەکە، بۆ مەندوب قەزا ئەکرێتەوە؟ بەڵێ. (٥)نوێژی سوننەت قەزا ئەکرێتەوە بەلای اظهرەوە (٦)قەزاکردنەوەی رۆژوی سوننەتیش قیاس ئەکرێتە سەر نوێژ.

(٧)لە پێناسەکەدا دانەر وتی (مقتضی) داخوازیکەر ، ئەمە جوانترە لەوجوب، کە ئیبن الحاجب و غەیری ئەویش لەباتی (مقتضی) وجوبیان وتووە. (٨)بەلاّم ئەگەر ئەم دارشتنەی بوتایە لەوەی دانەر رونترو کورتتر دەبوو. (٩)حاڵە کەونی (مقتضی) یەکە وابێ مطلقا بێ، واتە داخوازی فیعلەکە بێ لەخودی مستدرك وەك (١٠)کردنەوەی نوێژێکی فەوتاو بەبێ عوزر، دخولی وەقت داخوازیکردنی نوێژە، تۆ بەعەمدی نایکەیت، ئێستە بەقەزا ئەیکەیتەوە ئیستدراکی شتێ ئەکەیتەوە مقتضی کردنەوەکەش لە خودی تۆیە، چونکە بەعەمد چواندوتە. (١١)یاخود داخوازیکەرەکە نە خودی مستدرەکەکە نیە، بەڵکو لەغەیری ئەوە وەك: خەوتوو قەزای نوێژ ئەکاتەوە، یاحەیزدار رۆژوی قەرز بگرێتەوە، چونکە داخوازیکەری کردنی نوێژو رۆژوو لەغەیری خەوتوو حەیزدار تێپەری کردووە، بەلاّم لەو دووانەی داوانەکردووە.

وإنْ انعقدَ سبَبُ الوجوبِ او الندبِ في حقِّهما[١] لوجوبِ القضاءِ عليهما[٢] او ندبه لهما[٢] وخرَجَ بقيدِ الإستدراكِ إعادَةُ الصَّلاةِ المؤداةِ في الوقتِ بعدَهُ في جماعَةٍ مثلاً[٣] ولمَّا أطلقَ البعضُ في تعريفِ الأداءِ للعلمِ بقيدِهِ لمتقدِّمٍ[٤] واقتصرَ على الكلِّ في القضاءِ[٥] فيضمُّ إليهِ ماخرجَ بالقيدِ منْ أنّ الفعلَ اقلُّ منَ الرّكعَةِ في الوقتِ و الباقي بعدَهُ قضاءٌ[٦] والفرقُ بينَ هذا وبينَ ذي الرَّكعَةِ انَّها تشتمِلُ على معظَمِ افعالِ الصلاةِ، إذْ معظَمُ الباقي كالتكريرِ لها فجعَلَ مابعدَ الوقتِ تابعاً لها بخلافِ مادونهما[٧]

{والمقضيُّ المفعولُ} من كلِّ العبادَةِ بعدَ خروجِ وقتِها على القولينِ او قبلَهُ و بعدَهُ على الثّاني[٨] وإنَّما عرف المفعول والمصدرَ المستغني بأحدِهما[٩]

---

(١)هەرچەند سەبەبی وجوب ونەدب -کە دخولی وەقتە- لەحەقی ئەوانیشدا پەیدا بووە-بەڵام سەبەبی ئەداء نا- (٢)چونکە واجبە قەزا لەسەر هەردوکیان، یاخود نەدبە بۆ هەردوکیان. (٣)بەوشەی ئیستدراك کردنەوەی نوێژێك، کراوە هەر لەکاتی دیاریکراودا بەڵام بەجەماعەت ئەیکاتەوە ، ئەمە ئیستدراك نیە، تا بەقضاء ناو نەبرێ ، بەڵکو ئیعادەیە. (٤) دانەر لە پێناسەی ئەدادا وشەی بعضی وت، دیاری نەئەکرد کەئەبێ لەرکاتێ کەمتر نەبێ، چونکە ئەو ئەندازە دەزانرێ ، وەك لە ئەدادا بعض دیاری نەکراوە، (٥)لەقەزاشدا دەڵێ: ئەوەیە بەتەواوەتی لەدەرەوی کاتی دیاریکراودا بێت. (٦)ئەوەی بەقەیدەکە دەرچوو ئەلکێنرێ بەکوللەکەوە ، کەکردنی کەمتر لە رکاتێ لە کاتی خۆیداو ئەوی‌تری لەدوای کاتەکەیەوە بکرێ ، ئەمیش هەر قەزایە.

(٧)بۆ ئەم قەزایەو ئەو ئەدایە؟ جیاوازی لەنێوانیاندا ئەوەیان یەك رکاتی کراوە گشتگیرە بۆ زۆربەی افعال و اقوال نوێژ، چونکە زۆربەی ئەوەی ماوە دووبارەکردنەوەی رکاتی یەکەمە، لەبەر ئەوە ئەو عیبادەتەش دوای کاتەکە ئەکرێ هەر تابعی ئەو رکاتەیە کەلەکاتی خۆیدا کراوە، بەڵام ئەگەر کەمتر بوو لەرکاتێ جیاوازە لەمە.

(٨)تەعریفی ئەداو مۆدی کرا ئەبێ تەعریفی (مقتضی)ش بکرێ، دوای تەعریفی قضاء ، (مقضی) بەو عیبادەتە دەڵێن: کەکراوەتەوە هەمووی دوای تەواو بوونی کاتەکەی‌و بەرای هەردوو قەولەکە، یاخود هەندێکی پێش دەرچوونی کاتەکە کراوە ئەوی تریش دوای دەرچوونی کاتەکە ئەنجام دراوە ، بەلای قەولی دوهەمینەوە. قاعیدەیە هەرکات مانای مەصدەر زانرا ئیتر ئەوەی لێی دروست دەکرێ ماناکەی ئاشکرایە ، بۆ لێرە هەردوکیانی تەعریف کردووە؟ (٩)بۆیە تەعریفی مەصدەرو مەفعولی کردووە لەگەڵ ئەوەش بەیەکێکیان ئەویتریان ئەزانرا.

قائلاً في المؤدّى مافُعلَ الذي صدرَ بهِ إبنُ الحاجب تعريفَ الأداءِ والقضاءِ والإعادة[١] قالَ إشارةً الى الإعتراضِ عليهِ في ذلكَ[٢] اي المحوجِ لتصحيحِهِ الى تأويل المصدرِ بالمفعولِ إطلاقهِ عليهِ شائعاً[٣] وعدَلَ في المقضي عمّا فُعلَ الى المفعول[٤] قالَ: لأنَّهُ أخصَرُ منهُ اي بكلمةٍ[٥] إذ لامُ التعريفِ كالجُزءِ من مدلولِها فلا تعدُّ فيهِ كلمةً[٦] وزاد مسألةُ البعضِ على الأصوليين في تعريفِ الأداءِ والقضاءِ[٧] جرياً على ظاهرِ كلام الفُقهاءِ[٨] الواصفينَ لذاتِ الرَّكعَةِ في الوقتِ بهما[٩] وإنْ كانَ وصفُهما بهما في التَّحقيقِ الملحوظ للأصوليّين بتبعيَّةِ مابعدَ الوقتِ كما فيهِ والعكس[١٠]

---

(١)چونکە حاڵە کەونی وایە لەتەعریفی مؤدی دا وتوویەتی: (مؤدّی مافعل)یە کە ئیبن حاجب لەتەعریفی (أداء و قضاء إعادة) دا ئیسم مەفعولەکەی پێش خستووە مـافُعِلَ)ی بۆ مەصدەرەکان وتووە، واتە: أ-ئەبوایە هەردووکت نەوتایە. ب-بۆ مەخالەفەی ئیبن حاجب دەکەی؟ ئەو لەتەعریفی مەصدەرەکاندا (مافُعِلَ)ی وتووە ، تۆ لەتەعریفی مؤدّی دەڵێی: (مافُعِلَ)؟ (٢)دەڵێ:بۆیە وام وتووە ئەوە ئیشارەیە بۆ رەخنەیەك لەسەر ئیبن حاجب لەو پێناسەیەیدا کە (مافُعِلَ) بۆ مەصدەر داناوە.

٣)(مافُعِلَ)ەکەی ئیبن حاجبی ئیحتیاج کردوە بۆ راست کردنەوەی کە بڵێین: مەصدەرەکان بەمانا مەفعولن ، هەرچەند وتنی مەصدەر بەمانای مەفعول لە گفتوگۆی عەرەبدا زۆر بڵاوە.

(٤)ئەی بۆ لەتەعریفی (المقتضی)دا نەی وت: (مافُعِلَ) لێی لاداو وتی: (المقضيُّ المفعولُ) (٥)دەڵێ: بەئەندازەی یەك کەلیمە لەو کورتترە، جاخۆ (المفعول)یش دوو کەلیمەیە کوا کورتترە؟ (٦)چونکە لامی تەعریف کە چووە سەر کەلیمەیەك وەك حەرفێکی ئەو کەلیمە وایە، لەبەر ئەوە بەکەلیمەیەکی سەربەخۆ حیسابە ناکرێ.

(٧)دانەر لە پێناسەی (أداء و قضاء)دا مەسەلەی بعضی لەسەر زانایانی ئوصول زیاد کردووەو ئەوان (کل)یان وتووە بۆ وای کردووە؟ (٨)لەسەر ظاهیری گفتوگۆی زۆربەی زانایانی فقه رۆیشتووە، کە ئەو زانایانە...

(٩)ئەو نوێژەی یەك رکاتی لەکاتی خۆیدا کرابێ وەصفیان کردووە بەقەزاش و بەئەداش حەقیقەتەن. (١٠)هەرچەند وەصف کردنی ئەو رکاتە بەقەزاش و بەئەداش کرابێ بەهۆی ئەوەیە کە ئەوەی لەدەرەوەی کاتەکەیدا کرابێ حوکمی ئەوەی هەیە لەکاتەکەدا کرابێ، وەبەپێچەوانەشەوە ئەوەی لەکاتەکەدا کرابێ حوکمی ئەوەی هەیە لەکاتی خۆیدا نەکرابێ، ئەمەش لە لێکۆڵینەوەی ئوصولیەکاندا تێبینی کراوە، بەڵام مەجازەن.

وبعضُ الفقهاءِ حقَّقَ فوصفَ ما في الوقتِ منها بالأداءِ و مابعدَهُ بالقضاءِ[1] ولمْ يبالَ بتبعيضِ العبادَةِ في الوصفِ بذلكَ الذي فرَّ منهُ غيرُهُ[2] وعلى هذا والقضاءِ يأثمُ المصلّي بالتأخيرِ[3] وكذا على الأداءِ نظراً للتحقيقِ[4] وقيلَ: لا الظاهرُ المستنَدُ إلى الحديثِ[5]

{والإعادَةُ فعلُهُ} اي فعلُ الشيئِ ثانياً {في وقتِ الأداءِ} لهُ[6] {قيلَ: لخلَلٍ} في فعلِهِ اولاً من فواتِ شرطٍ او ركنٍ[7] كالصّلاةِ النجاسَةِ او بدونِ الفاتحَةِ سهواً[8] {وقيلَ: لعذرٍ} من خلَلٍ في فعلِهِ اولاً او حصولُ فضيلَةٍ لم تكنْ في فعلِهِ اولاً[9] {فالصّلاةُ المكرَّرَةُ} وهي في الأصلِ المفعولَةُ في وقتِ الأداءِ في جماعَةٍ بعدَ الإنفرادِ من غيرِ خللٍ {مُعادَةٌ} على الثّاني[10]

---

(١)هەندێ لەزانایانی فقهیش لێکۆڵینەوەیان لێکردووە، سەرەنجام ئەو ئەندازە نوێژە لەکاتی خۆیدا کرابێ پێی ئەوترێ: ئەداء، ئەوەش لە دوای کاتەکەی خۆیەوە دەکرێ ناوئەبرێ بە قضاء، (٢)ئەو زانایانە گوێیان بەوەنەداوە یەك نوێژ وەصف داربکرێ بەئەداش و بەقەزاش، واتە هەندێکی بەو هەندێکی بەم ناوئەبرێ، زانایانیتر لەمە رایان کردوە بۆیە هەندێکیان هەر بە قەزای ناوبردووە هەندێکیشیان هەر بەئەدا. (٣)لەسەر رای ئەم زانایانە –واتە ئەوانەی یەك نوێژ بەئەداو بەقەزاش ناودەبەن – وەلەسەر رای ئەو زانایانەی ئەڵێن: هەر قەزایە ئەو نوێژگەرە بەهۆی دواخستنی نوێژەکەیەوە گوناهبار ئەبێ. (٤)هەروەها گوناهبار ئەبێ لەسەر قەولی ئەوانەی کەبەئەدای ناودەبەن–واتە مابعد الوقت، تابعی وەقتەکە ئەکا– چونکە ئەوان چاو لە حەقیقەتەکەی ئەکەن نەك لەظاهیرەکەی. (٥)وتراویشە: نەخێر گوناهبار ئەبێ چونکە ئەمانە تەواشای ظاهیر دەکەن، کە پێشیش ئەدا بەفەرموودەکەوە، کەفریای یەك رکات بکەوێ بە ئەدا حیساب دەکرێ.

(٦)إعادە بەکردنەوەی نوێژە کراوەکە ئەوترێ دووبارە، هەر لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا خودی ئەو نوێژە بکرێتەوە. (٧)وتراویشە: هۆی کردنەوەی بوونی نوقصانیەکە لەکردنی یەکەمیدا ئیتر مەرجی فەوتابێ یاروکنی. (٨)وەك نوێژێك بەپیسیەوە کرابێ–ئەمە مەرجی فەوتاوە– یاخود نوێژێك بەسەهوو فاتیحەی تیا نەخوێنرابێ، –ئەمەیانروکنی فەوتاوە– ئەم نوێژانە ئەبێ بکریتەوە. (٩)وتراویشە: بۆیە ئەکرێتەوە لەبەر خاتری عوزرێك: ا–وەك بوونی نوقصانیەك لەکردنی جاری یەکەمیدا، ب–یاخود بۆ پەیداکردنی زیادە پاداشتێکە کە لەیەکەم جاردا دەستی نەکەوتووە. (١٠)کەوابوو نوێژێك دوو جار کرابێ جاری دووەمی بەجەماعەت کرابێ

لحصولِ فضيلَةِ الجماعَةِ دونَ الأوّلِ لإنتفاءِ الخلَلِ[1] والاولى هو المشهورُ الذي جزمَ بهِ الإمامُ الرّازي وغيره ورجَّحهُ إبنُ الحاجب[2] وإنّما عبَّرَ المصنِّف بقيلَ نظراً لإستعمالِ الفقهاءِ الأوفقِ لهُ الثّاني[3] ولمْ يرجِّحِ الثّاني[4] لتردّدِهِ في شمولِهِ لأحَدِ قسمي ما اطلقوا عليهِ الإعادةَ[5] منْ فعل الصّلاةَ في وقتِ الأداءِ في جماعَةٍ بعدَ اخرى الذي هوَ مستحبٌّ على الصحيحِ[6] استوتِ الجماعتانِ أم زادت الثّانيَةُ بفضيلَةٍ[7] منْ كونِ الإمامِ اعلمَ ولورَعَ أو أو الجمعُ اكثَرَ او المكانُ اشرَفَ[8] فقسمٌ استوتها بحسبِ الظّاهرِ[9] المحتملِ لإشتمالِهِ الثانيَةَ فيهِ على فضيلَةٍ هي حكمَةُ الإستحبابِ[10] وإنْ لم يطّلعْ عليها[11] قدْ يقالُ: يعتبَرُ إحتمالُهُ فيتناولهُ التعريفُ[12]

---

لەکاتی خۆیدا دوای ئەوە بەتەنها خۆی ئەنجامیداوە وەهیچ نوقصانیەکە تیانەبووە ئەم نوێژە لەسەر قەولی دووەم پێی ئەوترێ: (معادة) دوبارەکراوە. (١)چونکە کردنەوەکەی تەنها بۆ وەدەستخستنی پاداشتی جەماعەتە، کەلە نوێژی یەکەمدا دەستی نەکەوتووە ، لەگەڵ ئەوەش هیچ نوقصانیەکی نەبووە. (٢)قەولی یەکەم مەشهورێکی وایە ئیمام رازیو غەیری ئەویش دانیان پیاناوە و (إبن الحاجب)یش تەرجیح و تفضیلی داوە. (٣)ئەی دانەر بۆ بە (قیل) ناوی بردووە خۆ (قیل) مەرجوحە؟ چونکە ئەوتێبینی و چاوی لە ئیستیعمالی زانایانی شەرع کردووە کە قەولی دووەم لەگەڵ ئەواندا گونجاوترە. جا کەوایە بۆ دووەمت بە(قیل) دانا؟ (٤)تەرجیح و تفضیلی قەولی دووەمیشی نەداوە هەر بە(قیل) وتویەتی. (٥)چونکە گومانی هەیە ئایا قەولی دووەم گشتگیرە بۆ یەکێ لەو دوبەشی ئەو عیبادەتەی کەناوی ئیعادەیان بەسەردا بڕیوە ئەو یەکەش بریتیە لە: (٦)لەکردنەوەی نوێژەکە بەجەماعەت وەك یەکەمی هەر بەجەماعەت کردووە، کە ئەو کردنەوە لەسەر قەولی صەحیح سوننەتێکە شایستەی خۆشویستنە ئیتر کەیفی خۆیەتی. (٧)هەردوکیان چون یەکبن یاخود دووەمیان یەك پلە لەو زیاتر بێ، ئەویش وەك:

(٨)ئیمامی هەردووکیان زاناترو وارع تر بێ، یاخود ژمارەی دووەمیان زیاتر بێ، یاخود جێگەکەی بەڕێزتر بێ. (٩)ئەم بەشەیان کەهەردووکیان یەکسانن ئەوە بەگوێرەی ظاهیرو دەرکەوتنە کە (١٠)ئیحتمالی هەیە جەماعەتی دووەم لەو دوو جەماعەتە یەکسانەدا پلەیەکی زیادی هەبێ کەلەیەکەمدا نەبێ، کەئەویش بریتیە:لەهۆی ئیستحبابیەکەی (١١)هەرچەند حیکمەتەکەشی نەزانرێ (١٢)ئەگەر بوترێ:ئیحتیمال ئیعتباری پێئەکرێ، ئەوە پێناسەی ئیعادە ئەم جەماعەتەش دەگرێتەوە.

وقدْ يقالُ: لا فلا[١] ويكونُ التعريف الشاملُ حينئذٍ فعلُ العبادَةِ في وقتِ ادائِها ثانياً لعذرٍ او غيرِه[٢] ثمَّ ظاهرُ كلام المصنِّف انَّ الإعادَةَ قسمٌ منَ الأداءِ[٣] وهوَ كما قالَ مصطلَحُ الأكثرين، قيلَ إنَّها قسيمٌ لهُ[٤] كما قالَ في المنهاجِ: العبادَةُ إنْ وقعتْ في وقتِها المعيَّنِ ولم تسبِق بأداءٍ مختلّ فأداءٌ وإلاّ فإعادَةٌ[٥]

{والحكمُ الشرعيُّ} اي المأخوذُ منَ الشّرعِ[٦] {إنْ تغيَّرَ} من حيثُ تعلُّقه[٧] من صعوبةٍ لهُ على المكلّفِ {الى سهولَةٍ}[٨] كانَ تغيُّرُ الحرمَةِ للفعلِ او الترك الى الحلّ لهُ[٩] {لعذرٍ مع قيامِ السَّبَبِ للحكمِ الأصليّ}[١٠] المتخلِّفِ عنهُ لعذرٍ {فرخصةٌ}[١١] اي فالحكمُ المتغيّرُ اليه السهلُ المذكر يسمّى رخصةً[١٢] وهي لغةً السهولَةُ[١٣] {كأكلِ الميتَةِ} للمضطرِّ[١٤]

(١)ئەگەر بوترێ ئیحتیمال ئیعتباری پێناکرێ ئەوە ئەم تەعریفە نایگرێتەوە.

(٢)پێناسەیەکی گشتگیر بکرێ بۆ ئیعادە لەم کاتەدا ئەمەیە: دووبارەکردنەوەی عیبادەتێکە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، ئیتر کردنەوەکەی لەبەر عوزر بێ یاخود لەبەر عوزر نەبێ. (٣)پاشان لەقسەی دانەر وادەردەکەوێ ئیعادە بەشێکە لەئەدا.

(٤)ئەمەش دانەر لە(منع الموانع)دا وتویەتی ئیصطلاحی زۆربەی زانایانە.(٥)وەك بەیضاوی لە منهاجدا وتوویەتی: عیبادەت ئەگەر لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا کرا، وەپێشتر بەنوقصانی نەکرابوو، ئەوە ئەدایە، وە ئەگەر پێشتر بەنوقصانی کرا بوو، ئێستە کە ئەکرێتەوە ئیعادەی پێئەڵێن.

(٦)ئەو حوکمەی کەلەشەرع وەرئەگیرێ. (٧)ئەگەر بگۆڕێ –جاحوکمی شەرعی خوا چۆن ئەگۆڕێ؟– (من حيثُ تعلُّقِه) لەلایەن تەعەلوقە تەنجیزیەکەیەوە گۆڕا، چونکە ئەزەلیەکە هەر ناگۆڕێ جاچۆن بگۆڕێ. (٨)لەقورسی وگرانیەوە بگۆڕێ بۆ ئاسان لەسەر موکەلەفەکە. (٩)وەك ئەو حوکمە بگۆڕێ لە حەرام بوونەوە بۆ حەلاڵ بوونی کردنی –وەك خواردنی مردارەوە بوو لەکاتی زەرورەتدا– یاخود نەکردنی حەرام بگۆڕێ بەحەلاڵ وە ڕۆژوو نەگرتنی لەبەر عوزرێك، هەر لەخۆیەوە ناگۆڕێ ئەبێ، (١٠)ئەو گۆڕانە لەبەر عوزرێ ئەبێ لەگەڵ ئەوەش بەڵگەی حوکمە ئەصلیەکە هەرمابێ. (١١)حوکمێکی‌تر لە جێیدا دانرابێ لەبەر مانعێك، جا ئەو حوکمە دانراوە لەجێی ئەودا پێی ئەوترێ:(الرخصة) روخصەت. (١٢)واتە ئەو حوکمە تازەگۆڕاوە لەجێی حوکمێکی تردا دانراوە، کە باس کرا بەنیسبەتی ئەوەوە ئاسانە ناوئەبرێ بە رخصە. (١٣)روخصەتیش لەزاراوەی عەرەبیدا بە ئاسانکاری ئەوترێ.

(١٤)وەك واجب بوونی خواردنی مردارەوە بوو بۆ کەسێکی پێگیراوو.

{والقصر} الذي هو تركُ الإتمامِ للمسافرِ[1] {والسَّلَمُ} الذي هوَ بيعُ موصوفٍ في الذمّة[2] {وفطرُ مسافرٍ} في رمضان {لايجهَدُهُ الصَّومُ} بفتحِ الياءِ وضمِّها اي لايشقُّ عليه مشقّةً قويّةً[3] {واجباً} اي كأكلِ الميتةِ وقيلَ: مباح[4] {ومندوباً} اي الفطر لكنْ في سفرٍ يبلغُ ثلاثةَ ايّامٍ فصاعداً كما هوَ معلومٌ في محلّه[5] فإنْ لم يبلغها فالإتمامُ اولى[6] خروجاً من قولِ ابي حنيفةَ بوجوبِهِ[7] ومن قالَ القصرُ مكروهٌ كالماوردي لرادَ مكروهٌ كراهةً غيرَ شديدةٍ وهوَ بمعنى خلافُ الأولى[8] {ومباحاً} اي السَّلم[9] {وخلافُ الأولى} في فطرُ مسافرٍ لايجهَدُهُ الصوم فإن جهدَهُ فالفطرُ اولى[10] واتي بهذهِ الأحوالِ لبيانِ اقسام الرّخصةِ[11] يعني الرُّخصة كحلِّ المذكوراتِ من وجوبٍ وندبٍ و إباحةٍ وخلافُ الأولى[12]

---

(١)نوێــژ كــورت كردنــەوە بــۆ مســافر (٢)وەك: ســەلەم كــردن كەشــتی نــەبینراوە و ناونیشـانت بـۆ هـەڵدراوە ، خاوەنەكـەی ئـەو وەصفانــە ئەگرێتــە ئەســتۆی خــۆی. (٣)وەك رۆژو نەگرتنی مسافر لە رەمەزاندا، كە رۆژوەكە لەسەری گران نەبێ، یاخود باری گرانی بۆ پەیدا نەكا. (٤)ئیتر ئەو روخصەتە واجب بێ وەك: خواردنی مردارەوە بوو، وەوتراویشە: مەباحە، نەك واجب. (٥)یاخود مەندوب بێ وەك: رۆژو نەگرتن بەڵام لەسەفەرێكدا كەسێ رۆژ زیاتر بێ وەك لەجێی خۆیدا ئەزانرێ. (٦)ئەگەر سەفەرەكە سێ رۆژی نەبێ چاكتر وایە نوێژەكە بەتەواوی بكرێ. (٧)بۆ ئەوەی دەرچین لە رای ئەبو حەنیفە كە دەڵێ: واجبە، هەر ئەبێ نوێژەكە بەتەواوی بكرێ. (٨)ئەوەش وتوویەتی: كورت كردنەوە كەراهەتی هەیە، وەك: ماوردی مەبەستی كەراهەتێكی زۆر توندو تۆڵ نیە، كە ئەویش (خلافُ الأولى)یە پێچەوانەی چاكترو نزیكترە.

(٩)یاخود ئەو روخصەتە مباحە وەك سەلەم. (١٠)یاخود(خلاف الأولى)یە –واتە پێچەوانەی چاكتر و نزیكترە– وەك: رۆژو شكاندنی مسافر كە رۆژوەكەی گران نەبێ لەسەری، خۆ ئەگەر گران بوو لەسەری ئەوە شكاندنی چاكترو نزیكترە لەرۆحی دینەوە، ئەی باشە خۆ نەبێ باسی هەر حاڵ متنقله بكرێ نەك باسی حاڵێك كە قەت لێی جیانابێتەوە،وەك مردارەوە بوو واجبە بخورێ، ئەمە واجبیەتی قەت لێی جیانابێتەوە، وەك مەندوبیەت لە قەصر جیانابێتەوە. بۆ وای كرد؟ (١١)ئەوە بۆیە ئەو هەموو حاڵە لازمانەی هێنا بۆ رونكردنەوەیە كەئەوسا بزانە روخصەت ئەوەندە بەشی لێوە لازم دێت وبۆ دروست ئەبێ. (١٢)مەبەستی دانەر ئەوەیە بڵێ: روخصەت وەك حوكمی حەڵاڵی ئەوانەی باسكران ، كەهەیانە واجبەو هەیانە نەدبەو هەشیانە نیباحەیە، وەك هەیانە (خلاف الأولى)یە.

وحكمها الأصلى الحرمةُ[1] واسـبابُ الخبـثِ في الميتَـةِ[2] ودخـولُ وقـتي الصّـلاةِ و الصومِ في القصرِ والفطرِ لأنَهُ سببٌ لوجوبِ الصلاةِ تامّةً و الصومِ[3]

والغَررُ في السّلمِ وهـي قائمـةٌ حـالَ الحـلِّ[4] واعـذارِهِ[5] والإضطـرارُ و مشـقّةُ السـفَرِ والحاجَةُ الى ثمَنِ الغلاّتِ قبلَ إدراكِها[6] وسهولَةُ الوجوبِ في اكـلِ الميتضـةِ لموافقتـهِ لغرضِ النفسِ في بقائِها[7] وقيَل: إنّهُ عزيمةٌ لصعوبتهِ من حيـثُ انّـهُ وجـوبٌ[8] ومـنَ الرّخصَةِ إباحَةُ تركِ الجماعَةِ في الصّلاةِ لمرضٍ او نحوهِ[9] وحكمُهُ الأصلـي الكراهـةُ الصعبَةُ بالنسبَةِ الى الإباحَةِ[10] وسببُها قائمٌ حالَ الإباحَةِ[11] وهوَ الإنفرادُ فيما يطلَبُ فيهِ الإجتماعُ من شعائرِ الإسلامِ[12] {وإلاَّ} اي وإنْ لم يتغيَّر الحكمُ كمـا ذُكِـرَ بـأن لم يتغيَّرْ أصلاً كوجوبِ الصّلواتِ الخمسِ[13]

---

(١)ئەمانـە حوكمـە ئەصليەكـەيان حورمەتـە بـە روخصـەت گـۆڕاوە. (٢)هـۆی حورمەتیشیان ئەوەیە لە مردارەوە بوودا پیسە. (٣)لەنوێژو ڕۆژودا لەوەدرا بـەكورت كراوی‌و لەوەدا بەشكاوی كاتەكەیان هاتووە ، هاتنی كاتەكەیان سەبەبی كردنی نوێژە بەتـەواوی وگرتنـی ڕۆژوە، حەرامـە بەتـەواوی نـەیكریْ و ئـەمیش نـەگیریْ، بـەلاّم روخصـەت حوكمەكە نەگۆڕیْ. (٤)لەسەلەمیشدا زیان هەیە لەكاتی حەلاڵ بونیشیدا ئەو زیانە هەیە. (٥)عوزرەكانی حەلاڵ بوونە ئەمانەن: (٦)ناچاری و سەختی سـەفەر و پێویستی بەقیمەتی بەروبوم پێش پێگەیشتنیان ؛ تۆ وتت: روخصەت بەرەوو ئاسان چوونە كەچی ئێستە هەندیْ روخصەتی واجب كرد، واجب تەكلیفە كوا لە تـەكلیفدا ئاسانی‌هەیە؟ (٧)بـەجیْهێنانی واجبـی خواردنـی مـردارەوە بـوو ئاسـانە، چونكـە داخوازی ویستی نەفسە، كە هەموو كات ئاواتی لەمانەوەیدایە. (٨)وتراویشە: ئەوە عەزیمەیە نەك روخصـەت چونكـە سـەختی‌و گرانـی تێدایـە، لـەو لایەنـەوە كەواجبـە خواردنی دەخۆ واجبیش مەشەقەتی هەیە. (٩)هەندێكە لـە روخصـەت حەلاڵ كردنی نوێـژ بەجەماعـەت لەبـەر نەخۆشـی یـاخود هاووێنـەی ئـەو. (١٠)حوكمـی ئـەصلی نەكردنی‌جەماعەت قورسترین كەراهەتە، بەنیسبەت ئیباحەوە، هەتا ئەگەر جەماعەت سونەتی مۆكەدەیە نەك فەرزی كیفایە ئەم وێنە بۆ گۆڕانی حوكمە لـە كەراهەتـەوە بـۆ ئیباحە ئەوی پێشەوەش لە حورمەتەوە بۆ وجوب.

(١١)سەبەبی كەراهەتەكە لەكاتی حەلاڵبوونەكەیدا هەر هەیـە. (١٢)كەبریتیـە لـەتاك بوونـەوە و جیابوونـەوە لەخـەڵك لەشـتێكدا، كەدەسـتە جـەمعی تیـادا داواكـراوە ، لەئـەنجامدانی دروشمـەكانی ئیسـلامدا (١٣)ئەگـەر حوكمەكـە نـەگۆڕا بـەو شـێوەی كەباسكرا ، بەم شێوە كەهەر ئەصلەن گۆڕاندنی بەسەردا نەهاتبوو، وەك واجب بوونی

لو تغيَّرَ الى صعوبَةٍ كحرمَةِ الإصطيادِ بالإحرامِ بعدَ إباحتهِ قبلَهُ[1] او الى سهولَةٍ لالعـذرِ كحلِّ تركِ الوضوءِ لصلاةٍ ثانيَة مثلاً لمنْ لم يحدث بعدَ حرمَتِـهِ بمعنـى انَّـهُ خـلافُ لأولى[2] او لعذرِهِ لامعَ قيامِ السَّبَبِ للحكمِ الأصليِّ كإباحَةِ تركِ ثباتِ الواحدِ مثلاً منَ لمسلمين للعشرَةِ منَ الكفّارِ في القتالِ بعدَ حرمَتِـهِ[3] وسبَبُها قلَّةُ المسلمين ولمْ تبـقَ حالَةُ الإباحَةِ لكثرَتهم حينئذٍ[4] وعذرُها مشقَّةُ الثّباتِ المذكورِ لمّا كثروا[5]

{فعزيمةٌ} اي فالحكمُ غيرُ المتغيِّرِ او المتغيِّرُ اليه الصعبُ او السهلُ المذكورُ يسمّى عزيمَةً[6] وهي لغةً القصدُ المصمّمُ[7] لأنَّهُ عزمَ امرَهُ اي قطعَ و حتَمَ صعبٌ على المكلَّفِ و سهلٌ[8]

---

پێنج فەرزەی نوێژە یاخود گۆڕان هەبوو بەڵام، (١)بۆ ئاسان نەبوو بەڵکو سەختتر، وەك: حەرام بوونی راوکردن بەهۆی ئیحرام پۆشینەوە دوای حەڵاڵ بوونی راو پێش ئیحرام. (٢)یاخود گۆڕانکاریەکە بۆ ئاسان بێ بەڵام نەك بەهۆی عوزرەوە بێ ، وەك: حەڵاڵبوونی دەست نوێژ نەگرتن بۆ نوێژی دووەم ئەمەش بۆ کەسێ دەست نوێژی نەشکابێ، ئەم حەڵاڵبوونە دوای ئەوە بووە کە حەرام بووە دەست نوێژ نەگرتنەوە بۆ نوێژی دووەم و سێیەم و هتد. بەڵام دەست نوێژ نەگرتنەوە (خلافُ الأولى)یە واتە: پێچەوانەی چاکترو نزیکترە.

(٣)یاخود بگۆڕێ بۆ ئاسان لەبەر عوزرێك، بەڵام سەبەبی حوکمە ئەصلیەکە هەرماوە، وەك: حەڵاڵی خۆڕانەگری یەك موسوڵمان لەبەرامبەر دەکافرەوە لەجەنگدا، ئەم ئیباحەیە دوای حورمەتی بووە، -وەختی خۆی ئەبوایە یەك موسوڵمان خۆڕاگر بوایە لەبەرامبەر دەیان-. (٤)سەبەبی حورمەتەکە کەمی ژمارەی موسوڵمانان بووە لەکاتی حەڵاڵ بوونیدا، هۆکەی نەما، چونکە لەم کاتەدا موسوڵمانان زۆر بوون، (٥)عوزری ئیباحەکەش قورسیو گرانی ئەو خۆڕاگریە بوو، لەکاتێکدا کە موسوڵمانان زۆر بوون. (٦)واتە: حوکمی نەگۆڕاو -وەك: وجوبی نوێژ- یاخود بۆ گۆڕاوەکە سەخت بێ، -وەك: راوی دوای ئیحرام- یاخود بۆ گۆڕاوەکە ئەو ئاسانە بێ کەباسی کرا، -واتە: بەو تەفصیلەی پێشوو- ئەو حوکمە پێی ئەوترێ: عەزیمە.

(٧)ئەویش لە زاراوەی عەرەبیدا بریتیە لە:نیازو قەصدێکی تەصمیم لەسەرکراو. (٨)چونکە ئەو ناوبراوە بەعەزیمە نیازێکی بێگومان لێکراوە و حەتمیەتی‌ئەنجامدراویشی کراوە، ئیتر کەیفی خۆیەتی گران بێ لەسەر مکلف یاخود ئاسان بێ.

وأوردَ على التعريفيْنِ وجوبُ تركِ الصّلاةِ والصّومِ على الحائضِ فإنّهُ عزيمةٌ ويصدُقُ عليهِ تعريفُ الرّخصَةِ[1] ويُجابُ بمنعِ الصّدقِ فإنّ الحيضَ الذي هوَ عذرٌ في التركِ مانعٌ منَ الفعلِ ومن مانعيَّتِهِ نشأ وجوبُ التّركِ[2] وتقسيمُ المصنِّف كالبيضاوي وغيرِهِ الحكمَ الى الرّخصَةِ والعزيمَةِ اقرَبُ الى اللغَةِ من تقسيمِ الإمامِ الرّازي وغيرِه الفعلَ الذي هوَ الحكمُ اليهما[3]

{والدليلُ ما} اي شيئٌ {يمكنُ التوصُّلُ} اي الوصولُ بكلفَةٍ {بصحيحِ النّظَرِ فيهِ الى مطلوبٍ خبري}[4] بأن يكونَ النظَرُ فيهِ منَ الجهَةِ اللتي من شأنها ان ينتقلَ الذّهنُ بها الى ذلكَ المطلوبِ المسمّاة وجهُ الدّلالَةِ[5] ومعنى الوصولِ اليهِ بما ذُكرَ علمُهُ او ظنُّهُ"[6]

---

(١)رەخنەیەك لەسەر هەردوو پێناسەكە گیراوە كەبریتیە لە : نەكردنی نوێژو رۆژو واجبە لەسەر حەیزدار، لەبەر ئەوەی واجبە نەكردنەكەی ئەوە عەزیمەیە لەواقعدا لەكاتێكیشدا پێناسەی روخصەتی بەسەردا ئەبڕێ نەك عەزیمە كەوابوو نەتەعریفی عەزیمە جامعە نەتەعریفی روخصە مانعە. (٢)وەڵامی ئەو رەخنە دەدرێتەوە كە پێناسەی روخصەت حەیز ناگرێتەوە، چونكە ئەو حەیزەی كە عوزرە بۆ نەكردنی نوێژو رۆژو هەر خودی ئەویش مانعیشە لەكردنەكەیان ، لەمانعیەتی حەیزەكەوە واجب بوونی نەكردنەكە دروست بووە، نەك لەجەنبەی عوزریەتەكەوە پەیدا بووە خۆ ئێمەش وتومانە ئەبێ لەجەنبەی عوزریەتەوە پەیدا بێ. (٣)دانەر چاوی لە بیضاوی و غیری بیضاوی كردووە لە دابەش كردنی حوكم بۆ روخصەت و بۆ عەزیمە، چونكە ئەمە نزیكترە لەمانا زاراوەییەكەی روخصەت و عەزیمە، ئەمە نزیكترە تا دابەش كردنی فیعل و كار بۆ روخصەت و عەزیمە، ئەو كارە مەبەستە كە حوكمەكە تەعەلوقی پێوە ئەبەستێ، ئەم دابەش كردنەیان لەلایەن ئیمامی رازیەوە كراوە وە چەند زانایەكی تریش.

(٤)بەڵگەی ئوصولی: شتێكە بەئەزیەت و ئازارێكی زۆری بیر لەوانەیە بگەی، بەخوازراوێكی خەبەری بەهۆی بیركردنەوەی راستەوە لەو شتەدا. (٥)بەم شێوەیە بیركردنەوەو تێڕوانین لەو شتە تاكەدا ، لەلایەن ئەو جهەتەوە بێ كەبۆی هەیە ذهن و بیری مرۆڤ بگوێزێتەوە ، بەهۆی ئەو جهەتەوە، واتە (حدّی اوسط) بۆ ئەنجامە خوازراوەكە ئەو جهەتە كەهۆی بردنە پێشە ناوئەبرێ بە (وجهُ الدّلالَة) واتە ئەو رێگەی دەستگیرت بێ بۆ ئەنجامی راست و دروست. (٦)مەبەست لەگەیشتن بەمطلوبەكە بەهۆی نەظەری صەحیحەوە كە عیلمی ناظرەكەیە، ئەگەر بورهان بوو،یاخود گومان و ظەنیناظرەكەیە، ئەگەر غەیریبورهان بێ-واتە:عیلمی پێبگا یاخود ظەنیپێبگا-.

فالنظَرُ هنا الفكرُ لابقَيدِ المؤدّى الى علمٍ أو ظنّ كما سيأتي من حدِّ التكرارِ[١] والفكرُ حركَةُ النَفسِ في المعقولاتِ[٢] وشملَ التعريفُ الدّليلَ القطعيَّ كالعالمِ لوجودِ الصانعِ[٣] والظنيُّ كالنّار لوجودِ الدُخانِ[٤] واقيموا الصلاةَ لوجوبِها[٥] فبالنظَرِ الصحيحِ في هذه الأدلّة اي بحركَةِ النفسِ فيما تعقلُهُ منها ممّا من شأنه ان ينتقلَ بهِ الى تلكَ المطلوباتِ[٦] فالحدوثُ في الأولِ والإحراقِ في الثّاني والأمرُ بالصلوةِ في الثالثِ تصلُ الى تلكَ المطلوباتِ[٧] بان يُرتَّبَ هكذا: العالمُ حادثٌ ، وكلُّ حادثٍ لهُ صانعٌ ، فالعالَمُ لهُ صانعٌ ، النّارُ شيئٌ محرق و كلُّ محرقٍ لهُ دُخان، فالنّارُ لهُ دخان، اقيموا الصلوةَ أمرٌ بالصلوةِ وكلُّ امر بشيئٍ للوجوبِهِ حقيقَةً، فالأمرُ بالصلوةِ لوجوبِها[٨]

---

(١)فەرق چیە لەنێوان نظر و مطلوبی پەروەردگارچونکە نظر لێرەدا بەواتای بیری پەتیە بێ ئەوەی قەیدی ئەوەی پێوە بێ کە مرۆڤ بگەیەنێ بەعیلم یاخود بەظن ، ئەمەش وەك لەمەودوا دێ. بۆیە ئەم جیاوازیە ئەکەین تا خۆمان بپارێزین لەو دووبارەکردنەوە. (٢)فکر واتە جوڵەی نەفسە لەناو ئەو شتەدا کەژیری لێیان تێئەگا ، لەسنوری لێحاڵی بوونی ئەودان، ئەگەر دەلیلەکە مقودبێ دوو حەرەکەی هەیە: أ-وجه الدلالە ئەدۆزینەوە حد الاوسط ب-تەرتیبەکەیەتی بەلام ئەگەر دەلیلەکە (صغر و اصغر بوو اکبرو اوسط)ی هەموو تێدا بوو، هەروەها حەرەکەی دووەمی تێدایە.

(٣)ئەو پێناسەیە گشتگیرە بۆ بەڵگەیە ئەبێ، کە بێ گومان بێ وەك: ئەم بوونەوەرەیە بەڵگەیە بۆ بەدیهێنەرەکەی ئێستە ئەگەر بیر بکەیتەوە لەم بوونەوەرە ، لەلایەن ئەم هەموو یاساو گۆڕانکاریەی دێبەسەریدا ، وبڵێ: ئەم جیهانە (اثر)ە ئەویش بێ(مؤثر) نابێ بێگومان ئەنجامەکەی بوونی پەروەردگاریە، وەهەروەها بەڵگەی گوماناوی ئەگرێتەوە. (٤)وەك ئاگر بەڵگەیەکی گوماناویە بۆ بوونی دوکەڵ، چونکە هەندێ ئاگر هەیە وەك: غاز دوکەڵی نیە. (٥)اقیموا، بۆ ئەمرە ئەمریش بۆ وجوبە ، کەوابوو اقیموا بەڵگەیە بۆ وجوبی نوێژ (٦)کەوابوو بیرو تێبینی راست و رەوان لەم بەڵگانە واتە بەهۆی جوڵەی نەفسەوە، لەوێدا کە لێی تێگەییوە بێگومان بووە لێی، لەو جوڵەی فکرە لە(حدُّ الأوسط)ەکە بۆی هەیە، بەهۆی (اوسط)ەوە بیگەیەنێ بە سەرەنجامە ویستراوەکەدا. (٧)وەك: پەیدا بوون لەیەکەمدا و سوتان لە دووەمداو فەرمان بە نوێژ لە سێهەمدا، بەمانە نەفس ئەگات بەئەنجامەکان.

(٨)بەم شێوەیە رێك بخرێ بوترێ: ئەم جیهانە پەیدا بووەو دروستکراوە ، هەموو شتێکی دروستکراویش ئەبێ دروستکەرێکی هەبێ، کەوابوو ئەم جیهانە دروستکەرێکی هەیە، یاخود ئاگر شتێکیسوتێنەرە هەموو سوتێنەرێکیش دوکەڵی

وقالَ يمكِنُ التوصّلُ دونَ يتوصّلُ لأنَّ الشيئَ يكونُ دليلاً و وإنْ لم ينظر فيهِ النّظَر المتوصّلُ بهِ[١] وقيدَ النظرِ بالصحيحِ لأنَّ الفاسدَ لايمكِنُ التوصلُ بهِ الى المطلوبِ[٢] لإنتفاءِ وجهِ الدّلالَةِ عنهُ[٣] وإنْ ادّى اليهِ بواسطَةِ إعتقادٍ او ظنٍ[٤] كما إذا نظرَ الى العلَمِ من حيثُ البساطَةِ و النّارِ من حيثُ التسخينِ[٥] فإنَّ البساطَةَ والتّسخينَ ليسَ من شانِهما ان ينتقِلَ بهما الى وجودِ الصانعِ[٦] ولكن يؤدّي الى وجودِهما هذان النّظَران ممن اعتقدَ[٧] انّ العالَمَ بسيطٌ وكلُّ بسيطٍ لهُ صانعٌ[٨] وممنْ ظنَّ انَّ كلَّ مسخنٍ لهُ دخانٌ[٩] امّا المطلوبُ غير الخبريِّ وهوَ التصوّري فيتوصَّلُ اليهِ اي يتوصَّلُ بما يسمّى حدّاً بأن يُتصوَّرَ كالحيوانِ الناطِقِ حدّاً للإنسانِ[١٠] وسيأتي حدُّ الحدِّ الشامِلِ لذلكَ ولغيرِهِ[١١] {واختلَفَ ائمّتُنا هل العلمُ} بالمطلوبِ الحاصِلِ عندَهم {عقيبَهُ} اي عقيبَ صحيحِ النظَرِ[١٢]

---

هەیە، کەوابوو ئاگر دوکەڵی هەیە، (اقیموا الصلوة) فەرماندانە بەنوێژ، هەموو فەرماندانێك حەقیقەتەن بۆ وجوب دەبێ، کەوابوو ئەو فەرماندانە بەنوێژ بۆ وجوبیەتی. (١)دانەر وتی: لەپێناسەی بەڵگەدا لەوانەبێ گەیشتن بەئەنجام، بۆ لەوانەی وت باهەر بیوتایە: دەتگەیەنێت بەئەنجام؟ چونکە شتی واهەیەبەڵگەیە بەلاّم بیری لێناکرێتەوە، بەبیرێکی وابەو بەڵگەیە بگا بەئەنجام، یاخود بیری تیا بکرێتەوە بەلاّم بەشێوازێکی نادروست. (٢)دانەر وتی: بیرێکە ئەبێ صەحیح بێ، بۆ صەحیحی پێوەلکان، چونکە بیری کرمۆڵ و فاسید هیچ وەخت نابێ بەهۆ بۆ گەیشتن بەئەنجامی دروست. (٣)چونکە دەستگیرەکە لەو فاسیدەدا فەوتاوە. (٤)هەرچەند بەهۆی باوەڕەوە یاخود گومانی کابراوە بیگەیەنێ بەو سەرەنجامە. (٥)وەك ئەم وێنەیە ئەگەر بیر کرایەوە لەم جیهانە لەڕوی بەساطیەوە نەك لەلایەن دروست بوونیەوە، یاخود لەئاگر لە جنبەی گەرم کردنیەوە.(٦)چونکە بەساطەو گەرم کردن لەتوانایاندانیە بەهۆی ئەوانەوە خاون بیر بگەیەننە ئەنجام. (٧)بەلاّم ئەم دوو بیرە خاوەنەکەیان ئەگەیەنن – بەبوونی صانع و دوکەڵ– کەباوەڕی وایە: (٨)ئەم جیهانە بەسیطەو هەموو بەسیطێکیش دروستکەری هەیە، (٩)یاخود کەسێك باوەڕی وابێ هەموو گەرم کەرێك دوکەڵی هەیە. (١٠)وتمان: ئەتگەیەنێ بەمطلوبی خەبەری، بەلاّم غەیری خەبەری ئەویش بریتیە لەمطلوبی تصوری، تصوریش بە حەد پێی ئەگەی. بەم شێوەیە تصوری (حیوان ناطق) بکەی بەحەد بۆ ئینسان جا جاری واهەیە، بەرەسمیش دەکرێ. (١١)ئاخر لەمەوداو کەپێناسەی حد بکرێ بەشێوەیەك گشتگیر بێ بۆ ئەویش بۆ غەیری ئەویش. (١٢)پێشەوایانی ئیمەی سوننە جیاوازیان هەیە لەنێوان خۆیاندا ،

عادةً عندَ بعضِهم كالأشعري فلا يتخلّفُ إلاّ خرقاً للعادَة كتخلُّفِ الإحراقِ عن مماسَّةِ النّار[1] أو لزوماً عندَ بعضِهم كالإمام الرّازي فلا ينفكُّ أصلاً كوجودِ الجوهَر لوجود العرَضِ[2] {مكتَسَبٌ} للنّاظِرِ[3] فقالَ الجمهور: نعم لحصولِه عن نظَرِه للمكتَسب له[4] وقيل: لا لأنَّ حصولَهُ اضطراريٌ لاقدرَةَ على دفعِه ولا انفكاكَ عنه[5] فلا خلاف إلاّ في التسميَّة[6] وهي بالمُكتسَبِ انسَبُ[7] والظنُّ في قولي الإكتساب و عدَمِه دونَ قولي اللزوم والعادَة[8]

---

ئایا ئەو عیلمەی کەپەیدا ئەبێ دوای گرتنەبەری بیرکردنەوەی راست و رەوان ، ئایا ئەو پەیدا بوونی عیلم بەنەتیجە عادەت وایە، -واتە جاریّ ئەبێ جاریّ نابێ- یاخود هەر لازمە ئەبێ ببێ؟ (١)عادەتەن پەیدا ئەبێ بەلای هەندێکیانەوە وەك: ئەشعەری واتە هەر نەظەری صەحیح هەبێ سەرنجام زۆربەی کات پەیدا ئەبێ ، کەوابوو مەگەر بۆ شکاندنی سنووری عادەت سەرەنجام پەیدانەبێ، وەك: نەبوونی هێزی سوتاندن لەدەست دان بەئاگرەوە، هەر دەستت پێوەدا ،سوتاندن پەیدا دەبێ، مەگەر بۆ شکاندنی عادەت. (٢)یاخود لازمە پەیدا ببێ ئەو مەطلوبە بەلای هەندێکی تریانەوە ، وەك: ئیمامی رازی کەبەلای ئەوەوە عیلم بەمەطلوب قەت جیانابێتەوە لە صەحیحی نەظەر وەك بوونی عەرەضی قەت لە جەوهەر جیانابێتەوە.

(٣)ئایا ئەو عیلمەی کەدوای بیرکردنەوەی بەدەست خاوەنەکەیەتی ئایا سەرەنجامەکەشی هەر هی ئەوە؟ گوللەیەك دەتەقێنی بۆ ئادەمیزادێ، دەتەقاندنەکە بەدەس تۆیە ، بەلاّم مراندن و نەمراندن بەدەست تۆ نیە، (٤)زۆربەی زۆری زانایان وتویانە: بەڵێ کەسبی خاوەنەکەیەتی چونکە پەیدا بوونی عیلم بەوشتە لەبەر کردنەوەیەکی ئەوەوە پەیدا بووە کە خۆی کردویەتی و هی خۆیەتی -واتە مادەم سەبەبەکە کەسبی خۆیەتی سەرەنجامەکەشی هەرهی خۆیەتی-. (٥)وتراویشە پەیدا بوونەکەی ناچاریە ، چونکە توانای دەفعی ینە و بەهیچ شێوەیەك سەرەنجام لەپێشەکیەکانی جیانابێتەوە، بۆیە کەسبی ئەو نیە، (٦)کەوابوو جیاوازی تەنها لەناونانەکەدا هەیە، نەك لەناوەرۆکدا ئەی کامیان شیاوترە. (٧)ناونانی ئەو عیلمەی کەلەدوای بیرکردنەوەوە پەیدا ئەبێ بە مکتسب گونجاوترە، چونکە سەبەب هی ئەوە، نەتیجەش هەرهی ئەوە. (٨)وەك جیاوازی هەیە ئایا ئەو عیلم و ئیکتسابی خاوەنەکەیەتی یا نا؟ ئایا بۆ ظەنیش هەر ئەوە ئیختلافە هەیە. بەڵێ وەك دوو قەول لەبارەی عیلم و هەروەها لەبارەی ظەنیشەوە، بەلاّم ظن وەك عیلم نیە لەو دوو عیلمە نیە لەو دوو قەولەداکە یەکێکیان وتی: عیلم پاش بیرکردنەوە لازمە پەیدا ببێ،

لأنَهُ لاإرتباطَ بينَ الظنِّ بينَ أمرِما(1) بحيثُ يمتنِعُ تخلُّفُهُ عنهُ عقلاً و عادةً(2) فإنَّهُ معَ سببِهِ قدْ يزولُ لعرضٍ(3) كما إذا اخبَرَ بحكمٍ وآخرَ بنقيضِهِ(4) او لظهورِ خلافِ النَّظرِ كما إذا ظنَّ انّ زيداً في الدّارِ لكونِ مركَبِهِ و خدَمِهِ ببابِها ثمّ شوهِدَ خارجَها(5) وأمّا غيرُ ائمّتنا المعتزِلَة قالوا: النَّظرُ يولِدُ العلمَ كتوليدِ حركَةِ اليدِ لحركَةِ المفتاحِ عندَهُمْ(6) وعلى وزانِه يُقالُ: النَّظَرُ الحاصِلُ متولِّدٌ عنِ النَّظَرِ عندهم وإنْ لم يجبُ عنهُ(7) وقولُهُ عقيبَهُ بالياءِ لغةٌ قليلَةٌ جرَتْ على الألسنَةِ والكثيرُ تركُ الياءِ كما ذكرَهُ النووي في تحريرِهِ(8)

{والحدُّ} عندَ الأصوليين: ما يميّزُ الشيئَ عما عداهُ كالمعرِّفِ عند المناطقَةِ ولايميّزُ كذلكَ إلاّ مايخرُجُ عنهُ شيئٌ من افرادِ المحدود ولايدخُلُ فيه شيئٌ من غيرِها.(9)

---

یەكێكیشیان وتی: عادەتەن پەیدا ئەبێ. (١)چونكە هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان ظن و ئەوەی ظن پەیدا ئەكا. (٢)بەشێوەیەك نەگونجاوبێ پەیدا نەبوونی ئەنجامەكە لەدوای حد الأوسط ظنیەكە، چ لەلایەن عەقڵەوە، وەچ لەلایەن عادەتەوە.

(٣)چونكە گومانەكە هەرچەند هۆكەی ماوەتەوە، جاری واش هەیە لەبەر پەیدابوونی هۆیەكی تر دەڕواو نامێنێ. (٤)ئەمەش وەك: ئەوەی عادلێك هەواڵت بداتێ زەید لەماڵتانە، وە عادلێكیتریش بڵێ: زەید لەماڵتان نیە. (٥)یاخود لەبەر پەیدابوونی دەركەوتنی پێچەوانەی گومانەكەیە، وەك ئەوەی ئەگەر گومان بەیت كەزەید لەماڵە، چونكە ئۆتۆمبیل و پاسەوانەكانی لەدەرگادان، بەڵام پاشان زەید لەبەر چاوی خۆی لەبازاڕ دەیبینێ، ئەویان گومان بوو ئەمیان چونكە بەچاوە یەقینە. (٦)بەڵام جگە لەپێشەوایانی ئێمە كەیەكێكیان موعتەزیلەن، هەندێكیان وتویانە: بیركردنەوە عیلم ئەهێنێتە بوون، وەك: دەست جڵاندن ئەبێتە هۆی پەیدا بوونی جوڵەی كلیل لای ئەوان. (٧)هەر لەسەر شێوازی ئەو وتەیە وتراوە: گومانێك كەپەیدائەبێ بۆ خاوەن بیر لەبیركردنەوەكەیەوە پەیدابووە، هەرچەند لەوظنەشەوە صادر نەبووبێ.

(٨)دانەر كەوتی: عقیبَهُ، بەییوە بخوێنرێتەوە زاراوەیەكی كەمە بەسەر زوبانی لەهجەكانی عەرەبەوە، زۆربەی زۆریان ببێ یێ ئەیخوێننەوە ، وەك ئەوەوی باسی كردووە لەپاك نوسینەوەكەی خۆیدا.

(٩)حدّی اصولی و معرّفِ منطقی وەك یەك وان ، هەردوكیان بریتین لەوەی شتێك لەشتەكانیتر جیابكاتەوە، یاخود بەپێناسەیەك دەڵێن: كەشتێك لەشتەكانیتر جیابكاتەوە،كە هیچ شتێك لەئەفرادی پێناسەكراوەكە دەرنەچێو هیچ شتێكیش لە غەیری ئەفرادی ئەو نەیەتە ناو.

والأوّلُ مبيّنٌ لمفهومِ الحدِّ والثاني لخاصَّتِه[1] وهوَ بمعنى قولِ المصنِّف كالقاضي ابي بكر الباقلاني الحدُّ {الجامعُ} لأفرادِ المحدودِ {المانعُ} اي من دخول غيرِها فيه[2] {ويُقالُ} ايضاً الحدُّ {المطردُ} اي الذي كلّما وجدَ وجدَ المحدودُ فلايدخُلُ فيه شيئٌ من غيرِ أفرادِ المحدودِ فيكونُ مانعاً[3] {المنعكسُ} الذي كلّما وجدَ المحدود وجدَ هو فلايخرُجُ عنهُ شيئٌ من افرادِ المحدودِ فيكونُ جامعاً[4] فمؤدّى العبارتين واحدٌ[5] والأولى أوضحُ[6] فتصدُقانِ على الحيوانِ الناطقِ حدّاً للإنسانِ[7] بخلافِ حدِّه بالحيوانِ الكاتبِ بالفعلِ فإنَّهُ غيرُ جامعٍ وغيرُ منعكسٍ.[8] و بالحيوانُ الماشي فإنَّهُ غيرُ مانعٍ وغيرُ مطرِّد[9]

١)پێناسەی یەکەم بۆ حەقیقەت و مەفهومی حەدە، دوەمیشیان بۆ تایبەتی حەدە،

٢ ئەو پێناسەی دووەمە واتای پێناسەکەی دانەرە کەچاوی لە باقلانی کردووەو حلنی: (الحدُّ الجامعُ لأفرادِ المحدودِ المانعُ اي من دخول غيرِها فيه) حدّ واتە: پێناسەیەکی گشتگیرە بۆ هەموو فەردەکانی پێناسەکراوەکە، وەنەیەڵێ مانع بێ دخولی هەموو فەردێکی غەیر.

(٣)-قاعیدەیە هەر شتێك صەحیح بێ ئەبێ عەکسەکەشی صەحیح بێ- وەدووبارە وتراوە: حدّ ئەوەیە طرد و رێکەوتنی هەبێ، لەهەرکاتێکا (حدّ) هەبوو ئەبێ محدودەکەشی هەبێ، کەوابوو هیچ فەردێك لەئەفرادی غەیر نایەتە ناو، بۆیە ئەبێ حەد مانع بێ وەئەبێ عەکسیشی هەبێ،واتە عەکسێکی عورفی و عادەتی، نەك منطقی یاخود عەکسێکی بەواتای لازمی صیلە انتفایە. (٤)واتە ئەو عەکسەی هەرکاتێك پێناسەکراوەکە هەبوو، ئەبێ پێناسەکەی هەبێ، کەوابوو نابێ هیچ فەردێ لەئەفرادی معرفەکە نابێ بچێتەدەر، کەوابوو پێناسەی ئەبێ گشتگیربێ بۆ هەموو فەردەکانی.

٥)ئەوەی کەهەردوو عیبارەتەکە گەیاندیانە یەك ناوەڕۆکن، چ جامع و مانع بێ، یاخود مفردو منعکس بێ، بەڵام ئەوەندە هەیە، (٦)تەعریفی یەکەم رونترو ئاشکراترە بۆیە پێش خراوە. (٧)ئەو دوو پێناسەی حدّ هەردوکیان بەسەر (الحیوان الناطق) دا دەکرێن بە تەعریف بۆ ئینسان.، چونکە جامعە بۆ ئەفرادی مانعیشە بۆ ئەفرادی غەیر، ، وەمطردیشە چونکە هەرکات (الحیوان الناطق) هەبێ ئینسان ئەبێ، وەعەکسیشە چونکە روونە. (٨)بەپێچەوانەی ئەوەوە تەعریفی ئینسان بکەی بە (الحیوانُ الکاتب بالفعل)چونکە جامع نیە بۆ هەموو فەردەکانی ئینسان. وغیر منعکسیشە چونکە هەندێ جار ئینسان دێتەجێ بەڵام کاتب بالفعل نایێتەجێ.

(٩)ئەمەیان غەیرە مانعە چونکە مانگاکەشی بەردەکەوێ، وەغەیرە مطردیشە چونکە هەرکاتێ (الحیوان الماشي)ت وت، هە ئینسان ناگرێتەوە مانگاش دەگرێتەوە.

وتفسيرُ المنعكِسِ المُرادُ بهِ عكسَ المُرادِ بالمطّرِدِ بما ذُكرَ المأخوذِ منَ العضدِ الموافق في إطلاقِ العكسِ عليهِ للعرفِ[١] حيثُ يُقالُ: كلُ إنسانٍ ناطقٌ وبالعكسِ وكلُ إنسانٍ حيوانٌ ولاعكسَ اظهَرُ في المُرادِ اي معنى الجامع من تفسيرِ إبنِ الحاجبِ وغيرِهِ[٢] بأنَّهُ كلّما انتفى الحدُّ إنتفى المحدودُ اللازمُ لذلكَ التفسيرِ[٣] نظراً الى انَّ الإنعكاسَ التلازمُ في الإنتفاءِ كالإطّرادِ التلازمِ في الثّبوتِ[٤]

{والكلامُ} النفسيُّ {في الأزَلِ قيلَ: لايُسمّى خطاباً} حقيقةً لعدَمِ منْ يُخاطَبُ بهِ إذ ذاكَ[٥] وإنّما يسمّى حقيقةً فيما لايزالُ عندَ وجودِ منْ يفهَمُ وإسماعهِ إيّاهُ باللفظِ كالقُرآنِ او بلا لفظٍ كما وقعَ لموسى عليه السلام كما إختارَهُ الغزالي خرقاً للعادَةِ[٦]

---

(١)لێکدانەوەی مانای منعكس -کەمەبەست پێی پێچەوانەی مانای مفردە -بەوەی کەباسکرا- هەرکات معرف بێ تەعریف ئەبێ ، ئەم لێکدانەوەیە لە(العضد) وەرگیراوە، ئەم لێکدانەوەی موافقە بۆ عورف -واتە عەکسی عورفی نەك منطقی- کەعەکسیشی بەسەردا ئەبرێ.

(٢)چونکە ئەوترێ هەموو ئینسانێ ناطقە، وەهەموو ناطقێکیش ئینسانە، یاخود هەموو ئینسانێك حەیوانە، بەڵام عەکسەکەی ناوترێ، واتە عەکسی عورفە وەئیللا هەموو شتێك عەکسی هەیە، ئەوە تەفسیرە، اظهر في المُراد، واتاکەی رونترە،کە مانای جامیعە رونترە لەلێکدانەوەی ئبن الحاجب و غەیری ئەویش، ئەوان وتویانە منعکس.

(٣)ئەوان وتویانە: هەرکات تەعریف نەبوو معرفیش نابێ، کەتەفسیری ئیبن الحاجب لازمی ئەو تەفسیرەکەی ترە. (٤)بۆیە والێکدراوەتەوە چونکە تەماشای ئەوەی کردووە، کە إنعكاس ملازمی في الإنتفايە -واتە هەرکات تەعریفەکە نەبوو معرەفەکەش نابێ- وەك چۆن (إطراد لازمی في الثبوت)ە واتە هەرکات معرەفەکە بوو تەعریفەکەش دەبێ.

(٥)کەلامی نەفسی بەئیعتباری وجودی لەئەزەلدا ، قیلێك وتویەتی: حەقیقەتەن بە مخاطب ناوئەبرێ، چونکە لەبەر نەبوونی ئەوکەسەی قسەی لەگەڵدا ئەکرێ لەوکاتەدا.

(٦)بەلام حەقیقەتەن لە داهاتوو بەخطاب ناوئەبرێ، ئەویش کاتێ کەسێ کەلێی تێبگاو ئەو کەلامە بدەی بەگوێیدا ، ئیتر بەلەفظ وەکو قورئان یاخود بێ لەفظ وەك: گفتوگۆی خوا لەگەڵ موسا علیە السلامدا، ئەمەش بۆ ئەوەیە سنوری عورف و عادەتی بۆ بشکێ. کەهۆی بیرکردنەوەی خەڵکەکەیە، غەزالی ئەمەی هەڵبژاردووە.

وقيلَ سمعَهُ بلفظهِ من جميعِ الجهاتِ على خلافِ ماهوَ العادةُ[1] وعلى كلٍّ فإنَّهُ إختصَّ بأنَّهُ كليمُ اللهِ[2] والأصحُّ أنَّهُ يسَّماهُ حقيقةً بتنزيلِ المعدومِ الذي سيوجَدُ منزِلَةَ لموجودِ[3]

{و}الكلامُ النفسيُّ في الأزَلِ {قيلَ: لايتنوَّعُ} الى امرٍ و نهيٍ و خبَرٍ وغيرِها لعدَمِ منْ تتعلَّقُ بهِ هذه الأشياء إذ ذاك[4] وإنَّما يتنوعَّ إليها فيما لايزالُ عند وجود منْ تتعلَّق به[5] فتكونُ الأنواعُ حادثةً مع عدَمِ المشتَرَكِ بينها.[6] والأصحُّ تنوعُّهُ اليها في الأزَلِ بتنزُّلِ المعدومُ الذي سيوجَدُ منزلَةَ الموجودِ[7] وماذُكرَ من حدوثِ الأنواعِ مع قدَمِ مشترَكٍ بينها يلزَمُهُ محالُ من وجودِ الجنسِ مجرَّداً من انواعه[8]

---

١)قیلێکیش وتویەتی: موسا کەلامەکەی بیستووە بەهۆی لەفظەوە بووە، بەڵام ئەوەندە هەیە لەهەموو لایەکەوە قسەکەی بیستووە، بەپێچەوانەی عادەتی گفتوگۆی خۆمان، کەتەنها لەیەك لاوە قسە ئەبیسین، بۆئەوەیە متکلم لە جهەتو مەکانەوە دووربێ. (٢)گفتوگۆ لەگەڵ موسادا بەلەفظ بووبێ یاخود بێ‌لەفظ موسا تایبەتمەند کراوە کە(کەلیم الله)یە ، واتە هەمیشە گفتوگۆی لەگەڵ خوادا هەبووە. (٣)بەڵام قەولی ڕاست تر ئەوەیە: کەکەلامی ئەزەلی حەقیقەتەن ناوئەبرێ بە خطاب، چونکە ئەو معدومەی کەبێگومان دێتەبوون هەر لەجێی بووندا دانراوە و حیسابی بۆ کراوە.

(٤)کەلامی نەفسی بە ئیعتباری ئەزەلی نەك ئێستەی، قیلێك وتویەتی: قەبوڵی دابەشبوون ناکا، بڵێیت: ئەمەی ئەمرەو ئەوەی نەهیەو ئەویتری خەبەرە و هەروەها چونکە لەو کاتەی ئەزەلدا کەسێك نەبووە ئەمانەی تیا ڕەنگ بداتەوە، ئەی ئەم بەشانە چۆن پەیدا بوون؟ (٥)بەڵکو کاتێ کەلامی نەفسی دابەش دەبێ بۆ ئەمررو نەهی و ئەوانی تر لەداهاتودا ئەکرێ، ئەویش لەکاتی بوونی کەسێکدا کەواتای کەلامەکەی تیا ڕەنگ بداتەوە. (٦)کەوابوو جۆرەکانی کەلام، بوترێ ئەمەی ناوی ئەمرە و ئەوەشی ناوی نەهیە.. هتد ئەم جۆرە ناونانە تازە پەیدابوون و دروست بوون ، لەگەڵ ئەوەش شتێك کە هەموویان موشتەرەك ئەبن تیایدا: (قدم)ی کەلامە نەفسیەکەیە –واتە کەلامەکە خودی خۆی هەر قدیمە نەبوونی بەسەردا نەهاتووە– (٧)بەڵام قەولی ئەصەح و ڕاست ئەوەیە: کەلامی نەفسی دابەش ئەبێ بۆ ئەو هەموو جۆرانە، هەرلە ئەزەلدا چونکە ئەوەی کەلەئەزەلدا مەعدومە بێ‌گوماندێتە وجود، لەبەر ئەوە ئەو مەعدومە حوکمی مەوجودی هەیە، چونکە پەیدا بوونەکە بێگومانە. (٨)جا چۆن جینس هەیەو جۆری نیە؟ ئەوەی کەباسکرا: جۆرەکان نەبوون تازە پەیدابوون و بەڵام موشترکی نێوانیان قەدیمە کەکەلامی نەفسیە ئەم قسەیە مەحاڵی لێوەلازم دێ،کەجینسی‌هەبێ‌و

إلاّ ان يُرادَ انّها انواعٌ إعتباريّةٌ اي عوارض له يجوزُ خلوهُ عنها تحدثُ بحسَبِ التعلُّقات[١] كما انَّ تنوُّعَهُ إليها على الثّاني بحسَبِ التعلُّقاتِ أيضاً[٢] لكونِه صفةً واحدةً كالعلم وغيره منَ الصّفاتِ[٣] فمن حيثُ تعلقِه في الأزَلِ و فيما لايزالُ بشيئٍ على وجهِ الإقتضاءِ لفعلِه يسمّى امراً او لتركِه يسمّى نهياً وعلى هذا القياسِ[٤] وقدَّمَ هاتينِ المسألتينِ المتعلقينِ بالمدلولِ في الجملَةِ على النظَرِ المتعلّقِ بالدليلِ الذي الكلامُ فيه لإستتباعه مايطولُ[٥]

{والنَّظَرُ الفكـرُ} اي حركَةُ النَّفسِ في المعقولاتِ بخلافِ حرَكتِها في المحسوساتِ فتسمّى تخيُّلاً[٦]

---

بێ جۆربێ، جینس ئەگەر ئەنواعی نەبێ کەی جینسە ! (١)مەگەر بوترێ کاکە مەبەست بەو جۆرانە جۆری ئیعتباریە نەك حەقیقی، واتە کەلامە ئەزەلیەکە یەك شتە ئەمانەی بۆ پەیدا ئەبێ بەگوێرەی تعلقاتیان، چونکە کەلامی ئەزەلی دروستە ئەوانەی تیادا هەبێ. (٢)وەك چۆن دابەش بوونی کەلامی ئەزەلی بەسەر ئەو هەموو جۆرەدا لەسەر قەولی ئەصەحەکە هەر بەگوێرەی تەعەلوقاتیانە. (٣)چونکە کەلام یەك صفەتە وەك علم و صیفەتەکانی‌تر وایە. (٤)لەلایەن پەیوەندەی کەلامە ئەزەلیەکەوە شتێکەوە وەلەئەزەل و لەداهاتوودا، ئەگەر داوای کردنی بکا ئەو ئەمرە، یاخود داوای نەکردنی کرد ئەوە ناوئەبرێ بەنەهی، ئەوانی تریش بەم شێوە.

(٥)لەپێشا باسی دەلیل کرا ئەبواەیە نەقهر بەشوێنیا بهاتایە، دیارە بۆ ئەو دوو مەسئەلە پێشی نەظەر خران: أ-ئایا کەلام لەئەزەلدا بە خطاب ناوئەبرێ؟ ب-کەلام ئایا دابەش دەکرێ بۆ ئەمرو نەهی‌و..هتد؟ بۆ پێشی خستن؟ ئەمیش دەڵێ: دانەر ئەو دوو مەسەلەیەی پێش نەظەر خستن کە هەردووکیان پەیوەندن بەمەدلولەکەوە. - کەکەلامە نەفسیەکەو کەلامە لەفظیەکەشی دالە-بەڵام ئەو پەیوەندییە فی الجملەیە، بەینە بەینەیە نەك دایم ، نەظەریش پەیوەندی بەدەلیلەوە هەیە، کەگفتوگۆی ئێمە لەباسی ئەودایە، واتە ئەو دوومەسئەلە پەیوەندن بەمەدلولەوە، مەدلولیش پەیوەندە بە دەلیلەوە، دەلیلیش بابەتی ئێمەیە، مەدلولی دەلیل مطلوبی خەبەریە، مەدلولی کەلامی ئەزەلی موضوع لەکەلامی لەفظیە، بۆیە فی الجملەیە دایم نیە،بۆیە پێشی خستن چونکە باسی نظر داوای باسێکی زۆر دورو درێژ دەکا ، هەموو کات ئەبێ شتی کورت پێش باسی درێژ بێ.

(٦)نظر بەمانای فکرە فکریش جوڵەی نەفسە لەناو مەعنا کولیەکاندا واتە بیرکردنەوە لەپێشەکیەکان، ئەمجا لەوێوە بجوڵێ بەروە ئەنجامەکان، یاخود گەڕانەوە

{المؤدي الى علمٍ او ظنٍّ} بمطلوبٍ خبريّ فيهما أو تصوريّ في العلمِ[1] فخرجَ الفكرُ غيرُ المؤدّي الى ماذُكرَ كـاكثر حديثِ النّفسِ فلايسمّى نظراً[2] وشمَلَ التعريفُ النظرَ الصحيح القطعيّ والظنيّ و الفاسد فإنَّهُ يؤدي الى ماذُكرَ بواسطةِ إعتقادٍ او ظنٍّ كما تقدَّمَ بيانُهُ في تعريفِ الدّليلِ[3] وان كانَ منهم من لايستعملُ التأديةَ إلاّ فيما يؤدي بنفسه[4]

{والإدراكُ} اي وصولُ النّفسِ الى المعنى بتمامهِ من نسبةٍ او غيرها {بلاحكمٍ} معَهُ من إيقاعُ النّسبةِ او انتزاعها {تصورٍ}[5] ويسمّى علماً ايضاً كماعُلم مما تقدَّمَ[6]

---

بەروە پێشەکیەکان و ڕێك خستنیان بۆ دروست بوونی ئەنجام، ئەم جوڵەی بیرو هەستە پێی ئەوترێ: فکر. ئەك جوڵەی نەفس لەمەعنا جوزئیەکاندا بەهۆی هەستەکانەوە، ئەو جوڵەیە پێی ئەوترێ: تخَیّل. (١)ئەو جوڵەیە لە معقولاتدا سەربکێشێ بۆ ئەوەی کەعیلم بەشتێ پەیدا بکەی‌و یاخود ظنّ به شتێ پەیدا بکەی، ئەو شتەی عیلمی یاظنی پێ‌پەیدا ئەکەی مطلوب و داواکراوە، داواکراویش دوو جۆرە: ١-خبریّ ئەمیش دوو بەشە: أ-مطلوبی مەعلوم. ب- مطلوبی مظنون. ٢- تصوّری، ئەم مطلوبەیان تەنها مەعلومە مظنونی نیە.

(٢)کەوابوو فکرێك سەرنەکێشێ بۆ عیلم یا ظنی مطلوب وەك زۆربەی خەیاڵ و چیەی نەفسی ئەوە پێی ناوترێ نظر. (٣)ئەم پێناسەیە گشتگیرە بۆ نظری صەحیح ئیتر بێگومان بێ یاخود گوماناوی، بۆ نظری غەڵەتیش، چونکە ئەمیش بەگوێرەی باوەڕی خاوەنەکەی سەئەکێشێ بۆ عیلم، یابەگوێرەی ظني ئەو ئەیگەیەنێ به مطلوبی ظنی بەلای خۆیەوە، ئەم ڕونکردنەوەیەش لەپێناسەی دەلیلدا تێپەڕی. (٤)هەرچەند لەزانایان هەندێکیان سەرکێشان بەکارناهێنن جگە بۆ دەلیلێ نەبێ بەخودی خۆی نەتیجە بدات، نەك بەعەقیدەو ظنی خاوەن نظر.

(٥)ئیدراك واتە: گەیشتنی نەفسی ناطقە بەو پەڕی ماناو مەبەست، -واتە چوبێتە ئەودیوی شعور- ئیتر ئەو مانایە نیسبەت بێ وەك:زیدٌ قائم، یانیسبەت نەبێ، وەك تەنها موضوع بێ، یا محمول بێ، ئەو گەیشتنە ئەگەر حوکمی لەگەڵدا نەبوو ئەوە تصورە، حوکم چیە؟ حوکم بریتیە لە: بەواقع کردنی نیسبەت -وەك: قیام بۆ زەید هەیە- یاخود دارنینی نیسبەتەکە -وەك: قیام بۆ زەید نیە- ئیقاع و ئینتزاع کاری نەفسی ناطقەن، نەك هی ئیدراك. (٦)ناویش ئەبرێ بە عیلم وەك لەمەوپێش زانرا، کەمطلوبی تصوری تەنها عیلمی هەیە نەك ظنی.

امّا وصولُ النّفسِ الى المعنى لا بِتمامِهِ فيُسمّى شعوراً[١] {وبحكمٍ} يعني والإدراكُ للنسبَةِ وطرفيها مع حكمِ المسبوقِ بالإدراكِ لذلكَ {تصديقٌ}[٢] كإدراكِ الإنسانِ والكاتبِ وكونِ الكاتبِ ثابتاً للإنسانِ و إيقاع انَّ الكاتِبَ ثابتٌ للإنسانِ او إنتزاع ذلكَ اي نفيه في التصديقِ بأنّ الإنسانَ كاتبٌ او انّهُ ليسَ بكاتبِ الصادقِينِ في الجملَةِ[٣] وقيلَ: الحكمُ ادراكُ انَّ النسبَةَ واقعَةٌ او ليستْ بواقعةٍ[٤]

وقالَ بعضُهمْ وهوَ التحقيقُ: والإيقاعُ و الإنتزاعُ و نحوهما كالإيجابِ و السلبِ عباراتٌ[٥] ثمَّ كثيراً ما يطلَقُ التصديقُ على الحكمِ و حدهُ كما قيلَ: ان مسمّاهُ ذلكَ على القولينِ في معنى الحكمِ[٦] ومن هذا الإطلاقِ قولُ المصنِّفِ كغيرِه[٧]

---

(١)بەڵام ئەگەر نەفسی ناطقە گەیشت بەئەنجام و مەبەست بەوپەڕی نەگەی ، ئەوە ناوئەبرێ بەشعورو هەست. (٢)واتە ئیدراك بەنیسبەت هەدوو لاكەی لەگەڵ حوكمێكی پێشینە بۆ ئەو دوو طەرەفە –واتە: ئیدراكی موضوع كرابێ هەرەوەها محمول– ئەمجا نیسبەت ، دوای تەرجیحی ئیقاع یا ئینتزاعی دابێ، ئەو ئیدراكە ىەو حوكمەوە پێی ئەوترێ تەصدیق. (٣)وەك ئیدراكی ئینسان و كاتب و نیسبەتدانی كتابەت بۆ ئینسان واقع بكا، یاخود لێی داڕنێ واتە: ئەمانە بكرێن ئەمجا ئەچێتە ناو تەصدیقەوە، بەم شێوە بڵێ: ئینسان كاتبە یاخود كاتب نیە، فى الجملە هەردووكیان راستن چونكە هەندێ ئینسان هەیە ئەتوانێ بنوسێ، هەندێكیتر نەخوێندەوارە.

(٤)قیلێك وتویەتی: حكم ئیقاع و ئیتنزاع نیە بەڵكو ئیدراكی ئەوە بكا ئەو نیسبەتە واقعە یاخود واقع نیە. (٥)هەندێ زانای تر وتویانە: حوكم لەحەقیقەتدا هەر ئیدراكەو بەس ، جا خۆ ئیقاع فیعلی نەفسی ناطقەیە، هەروەها ئەوانیتریش، ئیتر چۆن دەڵێ: هەر ئیدراكە؟ ئەمیش دەڵێ: ئیقاع و ئیتنزاع و ئیجاب و سەلب ئەمانە عیبارەتن، حەقیقەت نین هەموویان هەر حوكم بەئیدراكی نیسبەتەكە دەزانێ. بەڵام یەكێ بە ئیقاع دەری ئەبڕێ ...هتد (٦)پاشان زۆربەی كات تەصدیق تەنها بەسەر حوكمەدەدا دەبڕێ نەك سیانەكەیتر ، ئیدراكی: ا–موضوع، ب–محمول، ج–نیسبەت، د–حوكم، –وەك قیلێك وتویەتی: ناوەڕۆكی تەصدیق ئەو حوكەیە لەسەر رای ئەو دوو قەولەیە كەباسكران لەوانەی هەندێ تەصدیق بەبەسیط ئەزانن نەك مركب، لەمانای حوكمدا–.

(٧)لەقەبیلی ئیطلاقی تەصدیق تەنهابەسەر حوكمدا قەولی دانەرە وەكو غەیری خۆی كەدەڵێ:(وجازِمُهُ) واتە تەصدیق لەپێشەوە مانای مركبت بۆ لێدایەوە ئێستە ضمیری بەسیطی بۆ ئەبەیتەوە، چونكە ضمیری جازمە ئیسخدامی تیایە ، حوكمیش وایە جاریێ بۆ هەردوكیان جاری واهەیە بۆ یەكێكیان.

{وجازِمُهُ} اي جازِمُ التصديقِ بمعنى الحكم إذ هو المنقسِمُ الي جازمٍ و غيرهِ[١] اي الحكمُ الجازمُ[٢] {الذي لايقبَلُ التغييرَ} بانْ كانَ لموجبٍ من حسّ او عقلٍ او عادةٍ فيكونُ مطابقاً للواقعِ[٣] {علمٌ كالتصديقِ} الذي اي الحكمُ بأنَّ زيداً متحرِّكٌ ممن شاهَدَهُ متحرِّكاً[٤] او انَّ العالَمَ حادثٌ[٥] اوانَّ الجبلَ حجرٌ[٦]

{و}التصديقُ اي الحكمُ الجازمُ {القابلُ} للتغيُّرِ بأنْ لم يكُنْ لموجبٍ طابقَ الواقعَ او لا إذ يتغيَّرُ الأولُ بالتشكيكِ و الثاني به او بالإطلاعِ على مافي نفسِ الأمرِ {إعتقادٌ}[٧] وهو إعتقادٌ {صحيحٌ إن طابقَ} الواقعَ كإعتقادِ المقلدِ انَّ الضحى مندوبٌ[٨] {فاسدٌ إنْ لم يطابِقْ} اي الواقعَ كإعتقادِ الفلاسفةِ انَّ العالم قديمٌ[٩]

---

(١)واتە جازمی تەصدیق، -ضمیرەکە بۆ تەصدیقی بەمانا حوکم دەگەڕێتەوە- چونکە حوکمەکەیە دابەش دەبێ بۆ جازم و غەیرە جازم، بەم شێوەیەی لێ‌دێتەوە:

(٢)واتە: جازمی ئەو حوکمە جازمەی کەقەبوڵی گۆڕان نەکا، کەی قەبوڵی ناکا؟

(٣)کاتێ کەحوکمەکە لەبەر بەڵگەی حیسی بێ -هەر پێنج- یاخود بەڵگەی عەقڵی بێ -گۆڕان و نیظام- یاخود عادەتی بێ -دارنابێ بەئاڵتون-، لەو کاتەدا حوکمەکە مطابقی واقع دەبێ. جائەو حوکمە جازمە عیلمی بەمانا یەقینی پێ ئەوترێ.

(٤)وەك تەصدیقی حوکمدان کەزەید لەجوڵەدایە ، ئەبێ کەسێ ئەم حوکمە بدات کەبەچاوی خۆی جوڵەی زەید ببینێ، یاخود، (٥)ئەم جیهانە پەیدا بووە بەبەڵگەی عەقڵی، یاخود (٦)ئەوشاخە بەردە ، ئەمە عادەت وایە، دەی خوا ئەتوانێ‌بیکا بەئاڵتون.

(٧)تەصدیقێك بەمانای حوکمێك کەجازم بێ‌و قەبوڵی گۆڕان بکا چونکە بەڵگەی نەحیسی نەعەقڵی نەعادەتی نیە، مطابقی واقع بێ‌یان نا، ئەگەر مطابقی بوو بۆ قەبوڵی گۆڕان ئەکا؟ چونکە بەگومان بوو پەیداکردنی ئەگۆڕێ، -موسوڵمان عەقیدەی مطابقی واقع لەگەڵ فاسیدێکدا ئەگەڕێ گومانی بۆ پەیدا ئەکا- دووەمەکەش بەهۆی گومان بۆ دروست کردن ئەبێ و بەهۆی واقع بۆ دەرکەوتنی ئەبێ -لەکاتی غەرغەرەدا هەموو شتێکی بۆ دەردەکەوێ- ئەو حوکمە پێی ئەوترێ ئیعتقاد. (٨)ئەوە باوەڕێکی صەحیحە ئەگەر مطابقی واقع بوو، وەك عەقیدەی مقلد کە نوێژی چەشتنگاو مەندوبە. (٩)یاخود عەقیدەیەکی غەڵەتە ئەگەر مطابقی واقع نەبووە وەك باوەڕی فەیلەسوفەکان کەئەم جیهانە هەربووەو نەبوونی بەسەردا نەهاتووە، ئەمە قەبوڵی‌گۆڕان ئەکا.

{و}التصديقُ اي الحكمُ {غيرُ الجازم} بأن كانَ معَهُ إحتمالُ نقيضِ المحكومِ بهِ من وقوعِ النِّسبَةِ او لا[1] وقوعها {ظنٌّ ووهمٌ وشكٌّ}[2] {لأنّهُ} اي غيرُ الجازمِ {إمّا راجحٌ} لرجحانِ المحكومِ بهِ على نقيضِهِ فالظنُّ[3] {او مرجوحٌ} لمرجوحيَّةِ المحكومِ بهِ لنقيضِهِ فالوهمُ[4] {او مساوٍ} لمساواةِ المحكومِ بهِ من كلٍّ منَ النقيضَينِ على البدَلِ للآخَرِ فالشكُّ[5] فهوَ بخلافِ ماقبلَهُ حكمانِ[6] كما قالَ إمامُ الحرمينِ و الغزالي و غيرهما: الشكُّ إعتقادانِ يتقاوَمُ سببُهما[7]

وقيلَ ليسَ الوهمُ و الشكُّ منَ التصديقِ إذ الوهمُ ملاحظةُ الطرفِ المرجوحِ و الشكُّ التردُّدُ في الوقوعِ و اللاوقوعِ[8] وقالَ بعضُهم وهوَ التحقيقُ فما ازيد مما تقدّم من انَّ العقل يحكم بالمرجوحِ او المساوي عنده ممنوعٌ على هذا[9]

---

(١)واتە حوکمێك کەغەیرە جازم بێ–واتە ئیحتمالی مەرجوحەکەی هەبێ– بەم شێوە لەگەڵ حوکمەکەدا لەوانەیە دژەکەشی هەبێ، ئیتر حوکمەکە سەلماندنی نیسبەتەکە بێ یانەفی ئەونیسبەتە بێ. (٢)چونکە ئەو حوکمە غەیرە جازمە یاظنە یاوەهمە یاشەککە. (٣)چونکە ئەو غەیرە جازمە یاراجیحە واتە چاکترە لەدژەکەی ، چونکە ئەوەی تۆ حوکمت پێکردووە بەهێزترە لەدژەکەی، دەئەو راجیحە ظنە.

(٤)وەئەگەر غەیرە جازمەکە مەرجوح بوو، چونکە ئەوەی حوکمت پێکردووە مەرجوحیەتی هەیە، بۆ نەقیضی حوکمەکەی تۆ دەئەوە وەهمە. (٥)یاخود حوکمە غەیرە جازمەکە یەکسانە ، چونکە ئەوەی تۆ حوکمت پێکردووە یەکسانە بۆ هەریەکێ لەدژەکان،–إیجاب و سلب– بەڵام بەو مانایە کەیەکێکیان بوو ئەویان نەبێ–چونکە وقوع و لاوقوع– کۆنابنەوە ، ئائەوە شەککە. (٦)شەك دوو حوکمی تیایە –بەڵام علی البدل– بەپێچەوانەی دوو پێشینەکەی کەیاراجح بوو یامەرجوح، (٧)وەك ئیمام الحرمین و غەزالی و غەیری ئەوانیش وتویانە:شەك بریتیە لە دوو عەقیدەی کەبەڵگەکانیان بەگژ یەکدا بچن –یەك بڵێ: بارانە چونکە هەورە، ئەویش بڵێ: باران نیە چونکە بایە–.

(٨)هەندێکیش وتویانە وەهم و شەك بەر تەصدیق ناکەون چونکە رەجحانیان تیادا نیە، چونکە وەهم تەنها لای مەرجوح تێبینی ئەکا، شەکیش گومانی هەیە لەحوکم کردن بەیەکێکیان وقوع یا ناوقوع. (٩)هەندێکیان وتویانە: ئەم قیلە قسەی محققی کردووە، چونکە ئەوەی مەبەست بوو لەوەی پێشووی دانەر ئەوەیە کەحوکمی عەقڵ بەمەرجوح و بەشتێك کەیەکسان بێ لەلای ئەوە شتێکی مەمنوعە بەرای ئەم قیلەیدواییە.

{والعلمُ} اي القسمُ المسمَّى بالعلمِ من حيثُ تصوُّرُه بحقيقَتِه بقرينَةِ السياقِ[1] {قالَ الإمام} الرّازي في المحصول: {ضروريٌّ} اي يحصُلُ بمجرَّدِ إلتفاتِ النَّفسِ إليهِ من غيرِ نظَرٍ و اكتساب[2] لأنَّ علمَ كلِّ احدٍ حتَّى من لايتأتَّى منه النظر كالبلَه والصبيانِ بأنَّهُ عالم بأنَّه موجودٌ او ملتذٌّ او متألمٌ ضروريٌّ بجميعِ اجزائِه ومنها تصوّرُ العلمِ بأنَّه موجودٌ او ملتذٌّ او متألمٌ بالحقيقَةِ وهوَ علمٌ تصديقيٌّ خاص فيكونُ تصورٌ مطلَقِ العلمِ التصديقيِّ بالحقيقَةِ ضرورياً و هوَ المدّعي[3] واجيبَ بأنّا لانسلّمُ انَّهُ يتعيَّنُ ان يكونَ من أجزاءِ ذلكَ تصوّرُ العلمِ المذكورِ بالحقيقَةِ بل يكفي تصوّرُهُ بوجهٍ فيكونُ الضروريُّ تصوّرُ مطلقِ العلمِ التصديقي بالوجهِ لا بالحقيقَةِ الذي هوَ محلُّ النِّزاعِ[4]

---

(١)واتە ئەو بەشەی ناوئەبرێ بە عیلم لەبەشەكانی تەصدیقە، نەك مطلقی عیلم بەڵكو عیلمی بەمانا یەقین ئەوە ضەروری و بەدیهیە، ئایا بوجهِ ما بەدیهیە یاخود كنهەكەی؟ لەو لایەوە ئەوە كەمدركی بالكنهە یانی حەقیقەتەكەی بەدیهیە – نەك لەلایەن حصولەكەی چونكە ئەوكات یاضەروریە جاری واهەیە نظری‌یە– بەچیا ئەزانی جەنبەی حەقیقەتی مەبەستە؟ بەقەرینەی هاتنی مەتنەكەو دارشتنیەتی چونكە لەمەوداو دەڵێ: ضەروریە یا نەظەریە ، چونكە(بوجهِ ما) هیچ گومان تێدانیە كە بەدیهیە. (٢)ئیمامی رازی لەكتێبی (المحصول) ی خۆیدا وتویەتی، عیلم ضەروریە واتە تەنها بەیەك لاكردنەوە بەلایدا پەیدا ئەبێ، بێ ئەوەی بیركردنەوەو كەسبی بوێ.

(٣)چونكە عیلم هەموو كەسێ هەتا ئەوانەی كە خاوەنی بیركردنەوە نین، –وەك گێژەكان و مندالان– بەوەی كەئەزانێ خۆی وجودی هەیە یاخود بەگۆشت خواردن لەزەت ئەبا، یاخود بەلێدان ئازاری ئەبێ، دەئەم جۆرە عیلمانە بەهەموو جوزئەكانیەوە بەدیهین و بەڵگەیان ناوێ، هەموو جوزئەكانی یانی هەردوو طەرەف نیسبەت و حوكم چونكە تەصدیق بەلای ئیمامەوە مركبە.

(٤)جاكوا هەموو جوزئەكانی بەدیهین ؟ ئەمیش دەڵێ: ئەوەنیە یەكێك لەو جوزئانە بەدیهیەتی مەحمولە قەضیەی (هو موجودٌ) یاخود (ملتذ)یاخود (متألم)، عیلمیش بەو مەحمولە عیلمێكی تەصدیقی تایبەتیە، دەخۆ بێگومان ئەمە بەدیهیە، كەوابوو مادەم تایبەتیەكە بەدیهیە مطلقەكەش بەدیهیە ، چونكە كە جوزء بەدیهی بوو ئیتر هەموو حوكمی بەدیهی هەیە، ئەوەش داخوازی ئێمەیە. وەڵام دراوەتەوە كە ئێمە ئەوە ناسەلمێنین كە بەدیهیەتی جوزء ببێتە هۆ بۆ بەدیهیەتی قضیەكە هەموو حەقیقەتەن، بەڵام ئەوە ئەسەلمێنین كە قضیە بالوجە بەدیهیە نەك بالحقیقە، كەئەمەشیان جێ كێشەكەمانە.

{ثمَّ قالَ} في المحصولِ ايضاً {هوَ} اي العلمُ {حكمُ الذّهنِ الجازمِ المُطابقُ الموجِبِ} وقد تقدَّمَ شرحُ ذلكَ[1] فحدَّهُ مع قولِهِ انَّهُ ضروريٌّ لكن بعدَ حدِّهِ[2] فثمَّ هنا للترتيبِ الذكري لاالمعنوي[3] {وقيلَ: هوَ ضروريٌّ} فلا يحدُّ إذ لافائدَةَ في حدِّ الضروريَ لحصولِهِ من غيرِ حدٍّ[4]

وصنيعُ الإمامِ لايخالِفُ هذا[5] وإن كانَ سياقُ المصنِّف بخلافِهِ[6] لانَّهُ حدَّهُ اولاً[7] بناءً على قولِ غيرِهِ من الجمهورِ انَّهُ نظريٌّ[8] مع سلامَةِ حدِّهِ عما وردَ على حدودهم الكثيرَةِ[9] ثمَّ قالَ: إنَّه ضروريٌّ إختياراً[10] دلَّ على ذلكَ قولُهُ في المحصل إختلفوا في حدِّ العلمِ وعندي انَّ تصوّرَهُ بديهيٌّ اي ضروريٌّ[11]

---

(١)پاشان ئیمام لە (المحصول)دا وتویەتی: عیلم بریتیە لەحوکمی تەرجیحدانی ذیهن کە ئەبێ جازم بێ و مطابقی بێ، وەموجبی یەکێ لەبەڵگەکان بێ، وشە بەوشە ئەم پێناسەیە لە پێشەوە باسکرا. (٢)دانەری (المحصول)پێناسەی عیلمی کرد لەگەڵ ئەوە وتی: عیلم بەدیهیەو پێناسەی ناوێ، بەڵام دوای تەعریفەکە وتویەتی: بەدیهیە، واتە ئیدعاکە لەپێشەوە نیەو تەعریفەکە لەدواوە بەڵکو تەعریفەکە لەپێشەوەیە ئیدعاکە هالە دواوە. (٣)کەوابوو (ثمّ) بۆ تەرتیبی ذکریە نەك بۆ تەرتیبی مەعنەوەی، تەرتیبی ذکری یانی جارێ باسی ئەمی کردووە ئەمجا ئەو، تەرتیبی مەعنەوەی نیە واتە ئیدعاکە لەپێشەوەبێ و تەعریف لەدواوە. (٤)قیلێك دەڵێ: عیلم ضروریە لەبەر ئەوە تەعریف ناکرێ چونکە هیچ سودێ لە پێناسەی بەدیهیدا نیە، چونکە بەدیهی بەبێ تەعریف دەست دەکەوێ.

(٥)ئیمام کەتەعریفی عیلمی کرد جیاوازی نەکردووە لەگەڵ ئەم قیلەدا، چونکە لەتەعریفەکەیدا مەبەستی حیکایەتی خەڵکە. (٦)هەرچەند رەشکێش کردنی دانەر بۆ وتەکانی ئیمام ملابسی خیلافی ئیمامە وائەگەیەنێ وتویەتی بەدیهیە ئەمجا تەعریفی کردووە. (٧)چونکە ئیمام لە(المحصل)دا لەپێشا تەعریفی کردووە، (٨)کەتەعریفیشی کردووە بینا لەسەر قەولی غەیری خۆی بووە کەجمهوری زانایانە کە عیلم نەظەریە. (٩)ئەم تەعریفانەی ئیمام هیچ رەخنەیەکی نەهاتووەتە سەر ئەو رەخنانەی کە هاتووەنەتە سەر تەعریفە زۆرەکانی زانایان. (١٠)پاشان ئیمام دەڵێ: عیلم ضەرویە کەهەڵبژاردەی خۆیەتی، چۆن ئەزانێ ئەو تەعریفەی کردویەتی هیخۆی نیەو نەقڵی قەولی غەیرە؟ (١١)بەڵگە لەسەر ئەو بۆچونەی ئێمە وتەی ئیمام خۆیەتی لە کتێبی (المحصل) دەڵێ: زانایان رایان جۆربەجۆرە لەپێناسەی عیلمدا، بەڵام بەلای منەوە عیلم بەدیهیەو پێناسە ناکرێ.

نعم قدْ يحدُّ الضروريُّ لإفادةِ العبارةِ عنهُ[١] {وقالَ إمامُ الحرمينِ} هوَ نظريٌّ {عَسر} اي لا يحصُلُ إلاّ بنظَرٍ دقيقٍ لخفائـهِ[٢] {فالرايُ} بسبَبِ عسرِهِ من حيثُ تصوُّرِهِ بحقيقَتِه {الإمساك عن تعريفهِ}[٣] المسبوقُ بذلكَ التصوّرِ العسرِ[٤] صوناً للنفسِ عن مشقّةِ الخوضِ في العسرِ[٥] قالَ كما افصحَ بهِ الغزالي تابعاً لهُ[٦] ويميّزُ عن غيرهِ الملتبِسِ بهِ من اقسامِ الإعتقادِ بأنّهُ إعتقادٌ جازمٌ مطابقٌ ثابتٌ[٧] فليسَ هذا حقيقتَه عندَهما[٨] وظاهرُ ماتقدَّمَ من صنيعِ الإمامِ الرّازي انّهُ حقيقَةٌ عندَهُ[٩] {ثمَّ قالَ المحقّقون: لايتفاوتُ} العلمُ في جزئياتِهِ فليسَ بعضُها وإن كانَ ضرورياً اقوى في الجزمِ من بعضٍ و إن كانَ نظرياً[١٠]

---

(١)بەڵێ کەم جاریٚ ضەروری تەعریف ئەکریٚ بۆ ئەوەی خەڵك فیٚر بکەن، ئەگەر تەعبیرتان لیٚدایەوە ئاوا تەعریفی بکەن. (٢)ئیمام الحرمین وتویەتی: عیلم نەظەریە بەڵام نەظەریەکی مشکل، واتە بەورد بینی نەبیٚ پەیدا نابیٚ چونکە خەفیە. (٣)بەهۆی خەفای (عیلمَ) لەلایەن تصوری کونهەکەیەوە -نەك وجهاً ما- رای من وایە دەست هەڵگرین لەپیٚناسەکردنی، جا باتصورەکەی موشکیلەبیٚ هەر تەعریفی بکە بۆ نایکەی ئاخر؟! (٤)ئەو تەعریفە ئەبیٚ مەسبوق بیٚ بەو تەعریفە گران و سەختە، شت کەتەعریفی بکریٚ ئەبیٚ لەپیٚشدا تصور بکریٚ. (٥)بۆ ئەوەی نەفس بپاریٚزین لەسەر ئیٚشەی چوونە ناو خولانەوەی ناو سەخت و گرانی (٦)ئیمام الحرمین وتویەتی: وەك چۆن بەرەوانی غەزالی ئەم وتەی ئیمامەی تەصریح پیٚکردووە، چونکە شویٚنکەوتەو فەقیٚی ئەوە. (٧)عیلم لەغەیری خۆی جیائەکریٚتەوە، غەیریٚك کەلەبەشەکانی ئیعتقاد بیٚو ئیلتباسی بەعیلمەوە ببیٚ، واتە تەصدیقات وەك: ظنّ و شەك و جەهلی مرکب ...هتد بەچی جیا ئەکریٚتەوە؟ بەوە بڵیٚ: عیلم تەصدیقە، -تصور خارج بوو- جازمە، ظن خارج ئەبیٚ، مطابقە، جەهلی مرکب خارج ئەبیٚ، ثابتە، تەقلید خارج ئەبیٚ.

(٨)تۆ وتت وازبیٚنە لەتەعریفی کەچی ئیٚوەش تەعریفتان کردووە؟ ئەمیش دەڵیٚ: ئەم تەعریفە حەقیقەتی عیلم نیە، بەلای ئیمام الحرمین و غەزالیەوە، بەڵکو رەسمە چونکە لەبەشەکانیتر جیای ئەکاتەوە نەك حەدە. (٩)رەواڵەتی ئەو پیٚناسەی پیٚشەوە لەهەڵسوکەوتی رازیەوە وادەردەکەویٚ و والیٚی حاڵی بووە: کەئەوتەعریفە حەقیقەتی عیلمە بەلای ئیمامی رازییەوە. (١٠)پاشان محققون فەرموویانە: عیلم لە جوزئیاتیدا -من حیثُ الجزم هیچ فەرقیٚکیان نیە- عیلم بەقیامی زەید لەگەڵ عیلم بە فەوتی عەمردا فەرقیان نیە، ئەمیان لەویان بەهیٚزتر نیە. کەوابوو هەندیٚ جوزئیاتی عیلم هەرچەند بەدیهیبن لەجەزمدا بەهیٚزتر نین لەهەندیٚکی تریان هەرچەند نەظەریش بن،

{وإنّما التفاوتُ} فيها {بكثرَةِ المتعلّقاتِ} في بعضِها دونَ بعضٍ كما في العلمِ بثلاثةِ أشياء والعلمُ بشيئينِ بناءً على إتّحادِ العلمِ مع تعـدُّدِ المعلـوم كمـا هـوَ قـولُ بعضِ الأشاعرَةِ قياساً على علمِ اللهِ تعالى[1] والأشعريُّ وكثيرٌ منَ المعتزلَةِ على تعدُّدِ العلم بتعدُّدِ المعلومِ فالعلمُ بهذا الشيئِ غير العلم بذلكَ الشيئ[2] واجيبَ عنِ القياسِ بأنَّهُ خالٍ عنِ الجامعِ وعلى هذا لايُقالُ يتفاوَتُ العلمُ بماذكَرَهُ وقالَ الأكثرون يتفاوَتُ العلمُ في جزئياتِه إذ العلمُ مثلاً بأنَّ الواحدَ نصفُ الإثنينِ اقوى في الجزمِ منَ العلم بأنَّ العالَمَ حادثٌ[3]

---

دەڵێ: (السماءُ فوقنا) لەگەڵ (العالم حادثٌ) دا هیچ فەرقیان نیە لە ئولفەتدا نەبێ، رۆژی دەجار ئاسمان ئەبینی، بەڵام مانگی جارێ بیر لەیاسای بونەوەر ناکەیتەوە لەمەدا فەرقیان هەیە نەك لەزانینەکەدا.

(١)ئەگەر تەفاوت هەیە لەو عیلمانەدا ئەوە لەمتعلقاتیان دایە لەهەندێکیاندا ئەبێ لەهەندێکیتردا نیە، وەك عیلم بەسێشت لەهەموو لاوە، وەعیلم بەدووشت لەولاوە- متعلقی ئەو سیانەو هی ئەو دوانەچونکە تەعریفی ئیسم بەعیلمی ئەکەن، کە عیلم یەك صیفەتە، وەك ئاوێنەیەك هەزارکەسی تیادا ئەبینی ، ئاوێنەیەك ئاوێنە ناگۆڕێ، متعلقەکەی هەرچەندەبێ قەیناکا- ئەمەش لەسەر قەولی ئەوانە دروست کردوە کەدەڵێن: هەرچەندە مەعلوم زۆربێ عیلم هەریەکە -وەك ئاوێنەکە- ئەوەش هەندێ لەئەشعەریەکان رایان وایە بەڵگەشیان قیاسە لەسەر عیلمی خوا ، هەریەکە عیلمی هەیەو مەعلومەکانی هەمووشتێکە. (٢)تۆ وتت: محققەکان وتویانە: (علم من حيثُ الجزم) لەجوزئیاتدا فەرقی نیە هەریەك عیلمە کەچی ئەشعەری و زۆربەی موعتەزیلە لەسەر ئەوەن: عیلم تعددی ئەبێ بەئەندازەی مەعلومەکەی، چەند مەعلوم هەیە ئەوەندە عیلم هەیە،چونکە عیلم بەمانای صورەتە، صورەتی ئەم مەعلومە لەگەڵ صورەتی ئەویتردا جیایە.

(٣)وەڵامی یەکەمیان کە بەڵگەی قیاسە ئەوە قیاسێکە یەکێك لەئەرکانەکانی تیادانیە، ئەویش عیلەتە ئەبێ لە مقيس و مقيس عليه داهەبێ، لەسەر ئەم قەولەی ئەشعەری‌و زۆربەی موعتەزیلە ناوترێ: عیلم بەهۆی متعەلقاتیەوە تەفاوتی ئەبێت، - واتە ئەم قسەی ئەمانە لەگەڵ راکەی محققین کە وتیان: (إنّما التفاوتُ بكثرَةِ المتعلقاتِ)دا جیاوازن- چونکە عیلم کەخۆی تەفاوتی هەیە لەبەرامبەر محققین زۆربەی زانایان وتویانە: جەزم لە جوزئیاتی عیلمدا جیاوازە چونکە عیلم بەوەی کەیەك نیوەی دووە، بەهێزترە لەجەزمی عیلم بەپەیدا بوونی ئەم جیهانە.

وأجيبَ بأنّ التفاوت في ذلك ونحوه ليس من حيثُ الجزم بل من حيثُ غيره كألف النفس بأحد المعلومين دون الآخر[١] {والجهلُ إنتفاءُ العلم بالمقصود} اي مامنْ شأنه ان يقصَدَ ليعلَمَ بأن لمْ يدرَك أصلاً ويسمّى الجهلَ البسيطُ[٢] او ادركَ على خلاف هيئَته في الواقع و يسمّى الجهلُ المركّبُ لأنّهُ جهلُ المدرِك بما في الواقع معَ الجهلِ بأنّهُ جاهلٌ به[٣] كإعتقادِ الفلاسفَة انَّ العالَمَ قديمٌ[٤]

{وقيلَ} الجهلُ {تصوّرُ المعلوم} اي إدراكُ مامنْ شأنه ان يعلَمَ {على خلافِ هيئَته} في الواقع[٥] فالجهلُ البسيطُ على الأوّلِ ليسَ جهلاً على هذا[٦] والقولانِ مأخوذانِ من قصيدةِ إبن مكيّ في العقائد[٧]

---

(١)وەلامی ئەمیش ئەدرێتەوە بەوەی کە تەفاوت لەوەو هاو وێنەکەیاندا لەبارەی جەزمەوە نیە، بەڵکو لەبارەی شتێکیترەوەیە، وەك ئولفەتی نەفس لەبارەی شتێك لەو زانراوانە، کەمتر ئەویتریان –ئێمەش باسمان لەبارەی جەزمەوەیە نەك شتیتر –.
(٢)جەهل و نەزانین بریتیە لەنەزانینی شتی مەقصودو مەبەست، واتە ئەوەی قابیلی زانینە قصدبکریٚ بۆ ئەوەی بزانریٚ، بەلاّم نەیزانی ئەوە جەهلە. نەیزانی یانی چی؟ یانی بەهیچ جۆرێك یدراکی هیچ نەکا، نەمطابق و نە غەیری مطابق ئائەم زانینە ناوئەبریٚ بە جەهلی بەسیط –چونکە یەك تاکە جەهلە– (٣)یاخود دەرك بکریٚ بەلاّم بەپێچەوانەی هەیئەتی نەفس الأمرەکەی دەرکیبکا، –وەك نەزانیٚ بالاّپۆشی هەیە بەلاّم نازانیٚ لە واقعدا واجبە– ئەمەیان ناوئەبریٚ بە جەهلی مرکب. وتێکەڵکراوە چونکە دوو جەهلو نەزانینی تیادایە:ا–مدرکەکە ئەرزی واقعەکەی نەزانیوە کەواجبەکەیە. ب–لەگەڵ ئەوەش مطابقی الواقع نازانیٚ، ناشزانیٚ کەنەزانە کەوابوو دوو جەهلی هەیە بۆیە مرکبە.
(٤)وەك: باوەڕی فەیلەسوفەکان کەوائەزانن ئەم جیهانە هەر بووە، دووجەهلەکەیان: ا–دەرکی عالەمیان نەکردووە بەلاّم بەپێچەوانەی واقیع ، کەپەیدا بوونە نەك هەر بوونە. ب–نازانن کەنەزانن، زیاد لەوەش خۆیان یەکجار بەرۆشنبیر ئەزانن.
(٥)قیلێك وتویەتی: جەهل واتە تەصورو ئیدراکی شتیٚ بکەی کەقابیلی ئەوەبیٚ بزانریٚ، بەلاّم ئەو کەئەیزانیٚ بەپێچەوانەی ئەرزی واقیعەکەیەتی، ئەم تەعریفە تەنها جەهلی مرکب دەگرێتەوە، (٦)کەوابوو جەهلی بەسیط کەیەکەمجار تەعریف کرا بەجەهل و نەزانین حیساب ناکریٚ بەگوێرەی تەعریفی ئەم قیلە. (٧)ئەم دوو پێناسەی جەهل و نەزانینە لەکۆیەڵە هۆنراوەیەکی ئیبن مەکی وەرگیراون لە کتێبی(الصلاحیة) لەعیلمی عەقائیددا، چاکترین کتێبە لەمەدرەسەی ئەشعەریەکاندا.

واستغنى بقولِه إنتفاءَ العلمَ عنِ التقييدِ في قولِ غيرِه عدمُ العلم عمّا من شأنِه العلمُ[١] لإخراجِ الجمادِ والبهيمةَ عنِ الإتصّافِ بالجهلِ[٢] لأنَّ إنتفاءَ العلمِ إنّما يقالُ فيما من شأنِه العلمُ بخلافِ عدَمِ العلمِ[٣] وخرَجَ بقولِه المقصودُ مالايُقصَدُ كأسفَلِ الأرضِ وما فيه فلايسمّى إنتفاءُ العلمِ به جهلاً[٤] فاستعمالُهُ التصوّرَ بمعنى مطلق الإدراكِ خلافَ ماسبقَ صحيحٌ وإنْ كانَ قليلاً[٥] ويقسَمُ حينئذٍ الى تصورٍ ساذجٍ لاحكمَ معَهُ والى تصوّرٍ معهُ حكمٌ وهوَ التصديقُ[٦]

{والسهو الذهولُ} أي الغفلَةُ {عنِ المعلوم} الحاصلِ فيتنبَّهُ لهُ بأدنى تنبُّهٍ[٧] بخلافِ النسيانِ فهو زوالُ المعلومِ فيستانَفُ تحصيلُهُ[٨]

---

(١)دانـــــەر لەتەعريفى جەهلدا وتى: (إنتفاءُ العلم) ئيستغناى كرد لەقەيدێك، (عمّا من شأنِه العلمُ) جەهل نەزانــــيــنــە لـــەلايــەن كەسێكەوە كەقابيلى زانين بـــــێ.

(٢)بۆچى ئەو قەيدەيان پێوە لكاندووە؟ بـــــۆ ئـەوەى دارو بـــەردو ئـاژەڵ دەرچـن لەوەى وەصف بكرێن بەجەهل و نەزانــــــين. (٣)چونكە (إنتفاءُ العـــلــم) تـــەنها بۆ كەسێ ئەوترێ كەقابيلى زانين بێ بەپێچەوانەى (عدم العلم) واتە يەكەم تەنها بۆ زەيدو غــەيـــــرى زەيد ئـــەوتـــرێ، بـەڵام (عـدمُ العلـم) بـۆ زەيـدى نـەزان و دارو بەرديش ئەوترێ.

(٤)دانەر وتى: مەقصود نەزانرێ، بەم وشەيە ئەوەى مەبەستى خەڵكى‌نەبێ چووەتە دەرەوەى پێناسەكە، وەك: نەزانينى زەوى و ئـەوەى لەسكى زەويدايە، كەسـێ ئەمانە نەزانێ ناونابرێ بەنەزان. (٥)جارى واهەيە بەواتاى ئيدراكەو جارى واش هەيە مقابلى تەصديقە، ئێستە لێرە بۆ هەردوكيانە ئايـا ئـەگونجێ؟ ئەميــــش دەڵــــێ: دانـەر لـێرەدا تصـورى بـەكارهێناوە بـەواتاى ئيدراكێـك كـە تـەصوريش و تصــــديقيش دەگرێتەوە، جياوازە لەگەڵ تەصورى پێشتر ، ئەم بەكارهێنانە صەحيحە هەرچـەند زۆر كەميــــشە. (٦)جـا لەو كاتەدا تصـــور دابەش دەبێ بۆ دوو جۆر تصور:

ا-تەصورێكى سادەو خاڵى لەحوكم ب- تەصورێك كە حوكمى لەگەڵدابێ ئەمـەيان تەصديقە.

(٧)ســەهو لـەدواى عيـــلـــمەوە پـەيدا ئـەبێ، واتـە فـەرمان وبێ‌ئاگابـــوون لـــەو فەرمانە كەلەپێشدا هـەبووە، بەئاگاكردنەوەيەكى زۆركەم بێتـەوە يـادى. (٨)جيـاوازە لەگـەڵ نسـياندا، چونكـە ئـەم بريتيـە لەنـەمانى زانراوەكـە شـۆراوەتەوە لەخەزێنـەو حافظەدا ، ئەگەر بتەوى فێربيتەوە ئەبێ لەسەرەتاوە دەست پێ‌بكەيتەوە بەفێربوون و پەيداكرنى.

{مسئلَةٌ: الحسنُ} فعلُ المكلّف {المأذون} فيـهِ {واجباً و مندوباً ومباحاً} الـواو للتقسيم والمنصوباتُ احوالٌ لازمَةٌ للمأذونِ اتى بها لبيانِ اقسام الحُسـنِ[1] {قيلَ وفعلُ غيرِ المكلّف} ايضاً كالصبيِّ والساهي والنائمِ والبهيمَةِ نظراً الى انّ الحُسنَ مالم ينهَ عنه[2]

{والقبيحُ فعل المكلّف} المنهيّ عنهُ {ولو} كانَ منهيّاً عنهُ {بالعموم} اي بعمومِ النّهي المُستفادِ منْ اوامرِ النّدبِ كما تقدَّمَ {فدخلَ} في القبيحِ {خلافُ الأولى} كما دخلَ فيهِ الحرام و المكروه[3] {وقال إمامُ الحرمين: ليس المكروهُ} اي بالمعنى الشامل لخلاف الأولى {قبيحاً} لأنَّهُ لايذمُّ عليه {ولاحُسناً} لأنَّهُ لايسوغُ الثناءَ عليه[4]

(١)حسن بریتیە لە فعلو کاری مکلەفێ کە مۆڵەتی کردنی درابێ، ئیتر ئەو مۆڵەت دراوە واجب بێ یا مەندوب بێ یا موباح بێ، واوەکە بۆ دابەشکردنی مۆڵەت دراوەکەیە سێیئسمی مەنصوبە کە لازمە بۆ مۆڵەت دراوەکە، عادەتیش وایە حاڵی منتقلە باس بکرێ نەك لازمە ئەی بۆ لێرە باسی کردوون بۆیە هێناونی بۆ دیاریکردنی بەشەکانی حسن.

(٢)بەڵام قیلێك وتویەتی: حسن کارێکی مۆڵەت دراوی مکلف و غەیری موکلفیشە ، وەك کاری منداڵ و بەسەهو کارکەرو خەوتوو ئاژەڵ، کاری ئەمانە بۆ بە حسن حیساب ئەکرێ؟ چونکە ئەم قیلە تێبینی ئەمە ئەکا کەکاری حسن ئەمەیە: حسن بەکارێك دەوترێ کەقەدەغە نەکرابێ دەخۆ نەهی قەدەغە روو لەوان ناکا ، کەوابوو بەم تەعریفەی کاری ئەوانیش بەرئەکەوێ.

(٣)قەبیح بریتیە لەوەی مکلف شتێ بکا قەدەغەی لێکرابێ، هەرچەند قەدەغەلێکردنەکەشی بەعموم النهی بێ، واتە صیغەی نەهی تیادا نیە بەلام ئەمر بەکردنی کراوە، ئەمریش بەکرنی شتێ ئەوەی لێوەرئەگیرێ نەهی لەنەکردنی کراوە، ئەم باسەش تێپەڕی کرد کەوابوو (خلاف الأولی) پێناسەی قەبیح ئەیگرێتەوە،چونکە ئەمر بەموقابیلەکەی کراوە بەلام حەرام و مەکروە ئاشکران کە قەبیحن چونکە بەروونی قەدەغەکراون.

(٤)ئیمام الحرمین وتویەتی مەکروە قەبیح و ناشیرین نیە، چونکە ناشیرین لای ئەو ئەوەیە کەزەم نەکرێ لەسەر کردنی و تۆڵەنەدرێ، بەلام ئەم مەکروهە بەمانا عامەکەی (خلاف الأولی)یش ئەگرێتەوە، هەربەلای ئیمامەوە ، وەك قەبیح نیە حسن و جوانیش نیە، چونکە جوان بەلای ئەو ئەوەیە کە : مەدح بکرێ و پاداشتی لەسەر بدرێتەوە.

بخلافِ المباح فإنَّهُ يسوّغُ الثناءَ عليهِ وإنْ لم يؤمَرْ به[1] على أنَّ بعضهم جعلَهُ واسطةً ايضاً[2] نظراً الى انَّ الحُسنَ ما امرَ بالثناءِ عليهِ كما تقدَّمَ في أنَّ الحُسنَ و القُبحَ بمعنى ترتُّبِ المدحِ و الذمِّ شرعيٌّ[3]

{مسئلةٌ: جائزُ الترك} سواءٌ كانَ جائزَ الفعلَ ايضاً ام ممتنعهُ {ليسَ بواجبٍ} وإلاّ لكان ممتنعَ التّركِ وقد فرضَ جائزه[4] {وقالَ اكثرُ الفقهاءِ يجبُ الصّومُ على الحائضِ والمريضِ والمُسافرِ} لقولهِ تعالى:﴿ فمنْ شهِدَ منكُم الشّهرَ فليَصُمْهُ ﴾ وهؤلاءِ شهدوهُ[5] وجوازُ التركِ لهم لعذرِهم أي الحيضِ المانعِ من الفعلِ ايضاً والمرضِ والسفرِ الذينِ يمنعانِ منهُ ولأنَّهُ يجبُ عليهم القضاءُ بقدرِ ما فاتَهم مكان المأتى به بدلاً عنِ الفائت[6]

---

(١)بەڵام مەباح جیاوازە چونکە مەح و ثەنا ئەکریٚ لەسەر کردنی وەهەرچەند فەرمانی بەکردنیشی نەکراوە. (٢)چونکە هەندیٚ لەزانایان مەباحیان لەنێوان حسن و قەبیح داناوە،وەك (خلاف الأولی)نەحسن ،وو نەقەبیح چونکە.. (٣)چاوی لەوە بڕیوە بیری لەوە کردوەتەوە کە: حسن بریتیە لەوەی فەرمان درابیٚ بەستایش کردنی لەسەر کردنەکەی چونکە لەوەو پێش وترا: کە حسن و قبحی بەواتای هاتنی پاداش و تۆڵە بەشوێن کردنیاندا بیٚ، ئەوە حسن و قبحێکی شەرعیە نەك عەقڵی. دەخۆ مەباح لەمانە نیە کەوابوو هالە نێوانیان هەردوکیاندا، واتە نەحسنەو نەقبحە.

(٤)مەسئەلە: ئەوەی کەنەکردنەکەی دروست بیٚ، ئیتر وەختی خۆی کردنەکەی دروست بووبیٚ یاخود قەدەغە بووبیٚ، ئائەو نەکردنە واجب نیە کردنی ، چونکە ئەگەر واجب بیٚ کردنی ئەو کاتە نەکردنەکەی قەدەغەیەو جائز واجب بووە، ئەوەش دوو حوکمی بەیەك دژن دراون بەسەر یەك شتدا، چونکە چۆن یەك شت جائزیشەو واجبیشە؟ (٥)زۆربەی زانایانی فیقە وتویانە: ڕۆژو لەسەر ئافرەتی حەیزدارو نەخۆش و موسافر واجبە، چونکە خوا فەرمویەتی: ئەگەر کەسێکتان شاهیدی مانگی رەمەزان بیٚ، ئەوە واجبە لەسەری ڕۆژوی ئەو رەمەزانە بگریٚ، دەخۆ ئەمانە شاهیدی بوون، کەوابوو واجبە لەسەریان. (٦)ئەی بۆ دروستە نەیگرن؟ چونکە هەموویان مانعیان هەیە:ا-مانعی یەکەمیان حەیزە کەعوزرە بۆ تەرکەکەی و مانعیشە لەکردنەکەی ب و ج-نەخۆشی و سەفەرە، ئەمانە هەردووکیان عوزری تەرکن و بەس ، بەڵام مانع نین لەگرتنی، د-بەڵگەی واجب بوونی ڕۆژو لەسەریان ئەوەیە، چونکە بە ئەندازەیئەو ڕۆژانەی فەوتاون واجبە لەسەریان بەقەزا بەرۆژوبینەوە،چونکە ئەوەی قەزا ئیگرێتەوە بەدەلی فەوتاوەکەیەتی،دەخۆ بەدەل ومبدل منە یەك حوکمیان هەیە.

واجيبَ بأنَّ شهودَ الشهرِ موجبٌ عند انتفاءَ العُذرِ لامطلقاً[1] وبأنَّ وجوبَ القضاءِ إنَّما يتوقَّفُ على سبَبِ الوجوبِ وهوَ هنا شهودُ الشهرِ وقدْ تحقَّقَ لاعلى وجوبِ الأداءِ وإلاَّ لما وجبَ قضاءُ الظُهرِ على منْ نامَ جميعَ وقتِها لعدَمِ تحقُّقِ وجوبِ الأداءِ في حقِّه لغفلَتِه[2] {وقيلَ} يجبُ الصومُ على {المُسافرِ دونهما} اي دونَ الحائضِ والمريضِ لقدرَةِ المسافرِ عليهِ وعجزِ الحائضِ عنهُ شرعاً والمريضُ حسّاً في الجملَةِ[3] {وقالَ الإمام الرّازي} يجبُ {عليه} اي على المُسافرِ دونهما {احدُ الشهرينِ} الحاضرِ او آخرُ بعدَهُ فايّهما اتى به فقد اتى بالواجبِ كما في خصالِ كفارَةِ اليمينِ[4]

{والخلفُ لفظيٌّ} اي راجعٌ الى اللفظِ دونَ المعنى لأنَّ تركَ العموم حالَةَ العذرِ جائزٌ إتفاقاً والقضاءُ بعدَ زوالِه واجبٌ إتفاقاً[5] {وفي كونِ المندوبِ ماموراً بهِ} اي مسمىً بذلكَ حقيقةً {خلاف}[6]

---

(١)وەلاٌمێکیان ئەدرێتەوە بەوە: شهودی مانگەکە واجب کەری ڕۆژوەکەیە کاتێك کە عوزر نەبێ، نەك عوزر هەبێ یانەبێ، (٢)وەلامی دووەم واجب بوونی قەزاکردنەوە تەنها بەسراوە بەسەبەبی وجوبەوە، ئەویش لێرە شهودی مانگەکەیە، کەهاتوەتەدی ، وجوبی قەزا نەبەسراوە بەواجب بوونی ئەداوە. چونکە ئەگەر ببەسرایە بەوجوبی ئەداوە ، ئەوە قەزای نێوەڕۆ واجب نەئەبوو لەسەر کەسێ کەلەهەموو کاتی نیوەڕۆدا خەوتبێ، چونکە وجوبی ئەدا لەحەقی ئەمدا نەهاتووەتە دی، چونکە بێئاگا بووە.

(٣)قیلێك وتویەتی: ڕۆژو تەنها لەسەر مسافر واجبە،ئافرەتی حەیزدارو نەخۆش لەسەری واجب نیە، بەلاٌم حەیزدار شەرعەن توانای نیە بەسەریدا، نەخۆشیش حیسەن توانای نیە بەلاٌم في الجملە، چونکە جارجاریش توانای نیە ئەیشکێنێ. (٤)ئیمامی رازی وتویەتی: واجبە لەسەر مسافر -نەك ئەو دووەکەیتر- یەکێك لەو دوو مانگە -ڕەمەزان یادوای ڕەمەزان- جاهەرکامیان بگرێ ئەوە واجبی بەجێهێناوە ، وەك کەفارەتی سوێن لەو چوارشتە کامیان بکا کەفارەتی لەکۆڵ کەوتووە.

(٥)ئەم جیاوازی زانایانە هەندێکیان دەڵێن: دروستە و هەندێکیش واجب و سەرزارەکیە نەك ناوەڕۆك و مەبەست دا، چونکە نەگرتنی ڕۆژو لەکاتی عوزردا بەڕای هەموویان دروستە وەقەزاش دووی نەمانی عوزرەکە واجبە بەڕای هەموویان سەرجەم. (٦)ئایا مەندوب حەقیقەتەن ناو ئەبرێ بە (مأمورٌ بە) فەرمان پێکراو؟ ئەوە رای جیاوازی تێدایە جیاوازی لەوەدانیە کە(مأمورٌ بە)یە، بەلاٌم لە تەسمیە حەقیقیەکەدایە.

مبنيٌّ على أ مَ رَ حقيقةٌ في الإيجابِ كصيغةِ إفعَلْ فلايسمّى ماموراً و رجّحَهُ الإمامُ الرّازي[١] او في القدرِ المشترَكِ بينَ الإيجابِ والنّدبِ اي طلَبِ الفعلِ فيسمّى ورجّحَهُ الآمدي[٢] امّا كونُهُ ماموراً بهِ بمعنى انَّهُ متعلّق الأمرِ اي صيغَةُ إفعلْ فلا نزاعَ فيهِ سواءٌ قلنا إنّها مجازٌ في النّدبِ ام حقيقةٌ فيهِ كالإيجابِ خلافٌ يأتي[٣] {والأصحُّ ليسَ} المندوبُ {مكلفاً بهِ وكذا المباحُ} اي الأصح ليسَ مكلّفاً بهِ[٤] {ومن ثَمَّ} اي من هنا وهوَ انَّ المندوبَ ليسَ مكلّفاً بهِ اي من اجلِ ذلكَ {كانَ التّكليفُ إلزامَ مافيهِ كلفة} من فعلٍ او تركٍ {لاطلَبُهُ} اي طلَبُ مافيهِ كلفةٌ على وجهِ الإلزام اولاً[٥]

{خلافاً للقاضي} ابي بكر الباقلاني في قولِهِ بالثّاني[٦] فعندَهُ المندوبُ والمكروهُ بالمعنى الشاملِ لخلافِ الأولى مكلّفٌ بهما كالواجبِ والحرام[٧] وزادَ الأستاذ ابو إسحق الأسفراييني على ذلكَ المباحِ فقالَ: إنَّهُ مكلّفٌ من حيثُ وجوبِ إعتقادِ إباحَتهِ[٨] تتميماً للأقسامِ وإلاّ فغيرُهُ مثلُهُ في وجوبِ الإعتقاد[٩]

---

(١)ئەم جیاوازیە دروست کراوە لەسەر ئەوە: ئایا ( أ مَ رَ ) حەقیقەتە لەواجب کردندا وەك: صیغەی (إفعل)ە؟ دە ئەوە بە (مأمورٌ بە) ناونابرێ ، رازیش ئەم رایەی تەرجیح داوە. (٢)یاخود امَرَ حەقیقەتە لەشتێکدا کە ئیجاب و نەدب هەردوکیان هاوبەشن تیایدا کەداوای کردنی کارێکە ، ئەگەر ئەوەیان ئەوە مەندوبە بە (مأمورٌ بەِ) یە چونکە طەلەبی تیایە، ئامێدیش تەرجیحی ئەمەی داوە.

(٣)بەلاّم ئەگەر بڵێ: مەندوب (مأمورٌ بە)یە یانی متعلقی ئەمرەو صیغەی (إفعل)ە، ئەوە هەیچ جۆرە نیزاعێکی تێدا نیە، ئیتر کەیفی خۆیەتی بڵێین: صیغەی (إفعل) مەجازبێ لەنەدبدا، یاخود حەقیقەت بێ تیایدا، وەك ئیجاب ئەوە جیاوازیەکە لەنێوان زانایاندا کەلەمەوداو باس دەکرێ. (٤)قەولی راستتر ئەوەیە: مەندوب مکلفی پێ ئیلزام نەکراوە، بەحەتمی نەخراوەتە ئەستۆی مکلف، مەباحیش هەروەك مەندوب وایە ئەویش مکلفی پێ‌ئیلزام ناکرێ. (٥)لەبەر ئەوەی لێرەدا وتمان: مەندوب (مکلف بە) نیە، تەکلیف خستنە ئەستۆی شتێکە کەمەشەقەتی تێدابێ، ئیتر بەکردن یابەنەکردن، نەك بەمانا طلب و داوای شتێ بکرێ کەسەختیو گرانی تێدابێ ئیتر داواکە بەئیلزام بێ یانە. (٦)ئەم رایە جیاوازە لەگەڵ رای باقلانیدا، کەوتویەتی: رای دووەم راستە. (٧)چونکە بەلای ئەوەوە مەندوب و مەکروهی بەمانا گشتگیریەکەی بۆ (خلافُ الأولى) تەکلیفیان تیادا هەیە، وەك: واجب و حەرام. (٨)ئەسفەراییني مەباحیشی زیاد کردووە لەسەر ئەو پێنجەی پێشوو، کە ئەویش کولفەتی تێدایە، لەجەنبەی ئەوە ئەبێ باوەڕی وابێ کەمەباحە. (٩)بۆیە ئەم شەشەمەی زیادکرد لەبەر تەواوکردنی بەیانی

{والأصحّ انّ المباح ليس بجنسٍ للواجبِ} وقيلَ إنّهُ جنسٌ لهُ لإنّهما مأذونٌ في فعلهما، واختصّ الواجبُ بفصل المنع من الترك[1] - قلنا واختصّ المباحِ ايضاً بفصل الإذنِ في التركِ على السواء[2] فلا خلاف في المعنى إذ المباح بالمعنى الأول اي المأذون فيه جنسٌ للواجبِ إتفاقاً وبالمعنى الثاني اي المخيّرُ فيه وهو المشهورُ غيرُ جنسٍ لهُ إتفاقاً[3] {و}الأصحّ {انّهُ} اي المباحُ {غيرُ مأمورٍ بهِ من حيثُ هو} فليسَ بواجبٍ ولامندوبٍ[4] وقال الكعبي انّهُ مأمورٌ بهِ اي واجبٌ إذ ما من مباحٍ إلاّ ويتحقّقُ به تركُ حرامٍ ما فيتحقّقُ بالسكوتِ تركُ القذفِ وبالسكونِ تركُ القتلِ وما يتحقّقُ بالشيئ لايتمّ إلاّ بهِ وترك الحرامِ واجبٌ[5]

---

هەموو بەشەکان، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ هەموو بەشەکانیتر وەك مەباح ئەبێ عەقیدەی پێ هەبن.

(١)قەولی صەحیح تر ئەوەیە: کە موباح جنس نیە بۆ واجب ، وەك حەیوان بۆ زەید، فەرەس ، قیلێکیش ووتویەتی مەباح جنسە بۆ واجب ، چونکە واجب و مەباح هەردوکیان مۆڵەتی کردنیان دراوە بەڵام واجب لە مەباح جیاکراوەتەوە ئەوە کە نەکردنەکەی قەدەغەیە. (٢)ئێمە ئەڵێین مەباحیش شتێکی تایبەتی خۆی هەیە کە جیای ئەکاتەوە لە شتەکانی تر ، ئەویش مۆڵەتی کردن و نەکردنی چون یەك دراوە - وەك زەید، فەرەس هەریەکی فەصلێکی تایبەتیان هەیە، ئەمانیش بەوجۆرە.

(٣)کەوابوو هیچ جیاوازیەك لەنێوان ئەصەح و قیلەکەدا نیە لە ناوەڕۆکدا، چونکە مەباح ئەگەر بەواتای یەکەم بێ کە سەرپشك بوونە لەکردن و نەکردنیا، ئەمەش پێناسەی مەشهورو بەناوبانگە، ئەوە بەڕای هەموویان جینسی واجب نیە. (٤)قەولی (اصحّ) ئەوەیە کە مەباح ئەگەر تەنها سەیری لایەنی مەباحیەتی بکەی ئەوە مأمور بەو فەرمان بەکردنی نەکراوە، دەی کەوابێ نەواجبەو نەمەندوب ، بەڵام ئەگەر بە پێشەکیو موقەدمە حیسابی بکەی ئەوە (مأمور بە) یە.

(٥)کەعبی ووتویەتی مەباح فەرمان بەکردنی کراوە فەرمانیش بۆ واجب ئەبێ کەوابوو مەباح واجبە، چونکە هیچ مەباحێك نیە نەبێتە هۆی تەرکی حەرامێك بۆ وێنە: بەهۆی بێدەنگی و قسە نەکردنەوە، بێگومان تەرکی حەرامێك ئەکرێ کە قەذفە، وەبەهۆی نەجوڵانەوە کە مەباحە، بێگومان حەرامێك تەرك ئەکری، ئەوەش بێگومان ئەبێتە هۆ بۆ ئەنجامێك، ەو ئەنجامەش تەواو جێناگرێ بێ هۆکەی، خۆ بێگومان تەرکی حەرامیش واجبە.

وما لايَتِمُّ الواجبُ إلاّ به فهو واجبٌ كما سيأتي فالمباح واجبٌ ويأتي ذلك في غيرِهِ كالمكروهِ[1] {والخُلْفُ لفظيٌّ} اي راجع الى اللفظ دونَ المَعنى فإنّ الكعبي قد صرّحَ بما يُؤخَذُ من دليلهِ من انّهُ غير مأمورٍ به من حيثُ ذاتِهِ فلمْ يُخالف غيرَهُ، و من انّهُ مأموربهِ من حيثُ ما عرض لهُ من تحقّقِ تركِ الحرامِ بهِ وغيرهُ لا يُخالِفُهُ في ذلك كما اشار اليهِ المصنّفُ بقوله: من حيث هو[2]

{و}الأصحُّ {انَّ الإباحةَ حكمٌ شرعيٌّ} إذ هي التخييرُ بين الفعلِ والتركِ المتوقفُ وجودهُ كغيرهِ من الحكم على الشرع كما تقدَّمَ[3] و قال بعض المعتزلة: لا، إذ هيَ إنتفاءُ الحرجِ عنِ الفعلِ و التركِ وهو ثابتٌ قبل ورود الشرعِ مستمرةٌ بعدَهُ[4]

---

(١)وە ئەوەش بێ ئەو تەواو واجب جێ بەجێ نابێ هەر واجبە، وەك ئەوەی لەمەودوا دێ، کەوابوو مەباح واجبە، ئەوەی کە ووترا مەباح پێشەکیەکە بۆ مەبەستێك، هەر خودی ئەوەش ئەوترێ بۆ غەیری مەباح، وەك مەکروە هەندێ جار ئەبێ بەهۆی تەرکی حەرام، دەی کەوابێ مەکروە هەندێ جار واجبە.

(٢)ئەو جیاوازییە جیاوازیەکی سەرزارەکیە ، نەك جیاوازیەك پەیوەندی هەبێ بەناوەرۆکەوە . چونکە کەعبی خودی خۆی بەراست و ڕەوان ووتویەتی -ئەوەش لە بەڵگەکەی وەرئەگیرێ- : مەباح ئەگەر تەماشای خودی خۆی بکەی (مأمور به) نیەو فەرمان نەدراوە بەکردنی ، کەوابوو کەعبی جیاوازی خەڵکی تری نەکردوە، بەڵام ئەگەر لەوبارەوە تەماشای‌کە بۆی پەیدا بووە و بوەتە پێشەکی ئەنجامێك، وەك بێگومان تەرکی حەرامێکی پێبکرێ ، ئەوە لەمە کەس جیاوازی لەگەڵدا ناکا لەم بارەیەوە ، وەك دانەر ئاماژەی بۆ کرد، کە وتی: (من حیث هو).

(٣)قەولی ئەصەح ئەوەیە کە (إباحة) حوکمێکە کە لەشەرع وەرگیراوە، چونکە (إباحة) سەرپشك کردنی ئادەمیزادە لەنێوان کردن و نەکردنی کارێکدا، دەخۆ بوونی ئەو تخییرو سەرپشك کردنە بەستراوە بەشەرعەوە ، وەك حوکمەکانی‌تر هەتا شەرع نەبێ چۆن بزانین ئەوە واجبە ئەوە حەرامە..هتد وەك لەمەوبەر باسکرا.

(٤)هەندێ لە موعتەزیلەکان ئەڵێن: نەخێر (إباحة) حوکمی شەرع نیە بەڵکو حوکمی عەقڵە چونکە لای ئەوان (إباحة) بریتیە لە: نەبوونی لۆمە لەسەر کردنی نە لەسەر نەکردنی، دەخۆ ئەو لۆمە نەکردنە پێش هاتنی شەرع بووە ، ئێستە لۆمە هەر هەیەو بەردەوامە.

{و}الأصحّ {انّ الوجوب} لشيءٍ {إذا نسخ} كأنْ قال الشارعُ: نسَختُ وجوبَهُ {بقي الجواز} لهُ الذي كان في ضمنِ وجوبه من الإذنِ في الفعلِ بما يقومهُ من الإذنِ في الترك الذي خلف المنع منهُ إذ لاقوام للجنسِ بدون فصلٍ[1] ولإرادة ذلك قال: {أي عدم الحرج} يعني في الفعلِ والتركِ من الإباحة او الندب او الكراهة بالمعنى الشامل لخلاف الأولى إذ لا دليل على تعيين احدهما[2] {وقيل} الجواز الباقي بمقوِّمه {الإباحة} إذ بإرتفاع الوجوبِ ينتفي الطلبُ فيثبتُ التخيير[3] {وقيل} هو {الإستحبابُ} إذ المتحقّقُ بارتفاع الوجوب إنتفاءُ الطّلبِ الجازم فيثبتُ الطّلبُ غير الجازم[4] وقال الغزالي لايبقى الجواز لأنّ نسخ الوجوب يجعلهُ كأن لم يكن[5]

---

قەولی(أصح)ئەوەیە ئەگەر واجبێتی شتێ نەسخ کراو سڕایەوە- بۆ وێنە خوا بفەرموێ واجبێتی نوێژم سڕیەوە و لام برد – ئەوە جەوازیەتەکەی هەر دەمێنێ ، سەرپشك بوون لە کردن و نەکردنا حەرام نابێ، جەوازێك کەلە دوتۆی مانای واجبدا هەبوو ، ئەویش ئەوەیە کە ووتت ئەو شتە واجبە ، ئەوە مۆڵەتی کردنی دراوە ، ئەو مۆڵەتە جنسە ئەبێ فەصل و جیاکەرەوەی هەبێ ، واتە لەگەڵ مانەوەی جەوازدا ئەوەش ئەمێنێ کە مۆڵەتەکە جیابکاتەوە ئەویش مۆڵەتی نەکردنە ، کە لەجێ قەدەغەیە نەکردنی ، واتە واجب بەمانا ئیزنی کردن و مەنعی نەکردن، بەلام ئێستا مەنعی نەکردن نەماوە و ئیزنی کردنەکەی ماوە، چونکە جنس بێ فەصل وجودی نیە، هەموو جنسێك ئەبێ فەصلێکی هەبێ. (٢)چونکە دانەر ئەوەی ووێستوە بۆیە وتی: جەوازێك بەمانای نەبوونی گلەیی لەکردن و نەکردنیا –واتە جنس بێ فەصل نابێ– ئەوەش کە گلەیی تیادا نەبێ وەك (إباحة و ندب) و کەراهەتێك بەواتا گشتگیریەکەی بێت بۆ (خلاف الأولی)یش، بەکورتی ئەگەر واجب نەسخ کرا جەواز ئەمێنێ، ئیتر ئەو جەوازە یا (إباحة) یا (ندب)ە یا کەراهەتی عامە بۆ (خلاف الأولی) ئەی باشە بۆ دیاری ناکەی ئەو جەوازە بەمانا کامیانە؟ ئەمیش دەڵێ : (إذ لادليل على تعيين أحدهما) چونکە بەڵگە نیە لەسەر دیاریکردنی یەکێکیان

(٣)ووتراویشە لەجێی واجبی نەسخ کراو ئەو جەوازە ئەمێنێتەوە هاوتا لەگەڵ فەصلەکەیدا ، کە إباحەیە، چونکە کە وجوب نەما طەلەبی جازمیش نامێنێ، دەی کەوابوو تخییرو سەرپشك کردن ئەمێنێ. (٤)هەندێکیش ووتویانە ئەو جەوازەی ئەمێنێ(إستحبابة)، چونکە بێگومان بەلابردنی وجوب طەلەبی جازم نەماوە ، کەوابوو طەلەبی غەیرە جازم دەمێنێ و دێنەجێ (٥)بەلام غەزالی دەڵێ : ئەصلەن جەواز هەر نامێنێت و چونکە سڕینەوەی وجوب یانی وای لێ ئەکا (كأنما) هەر نەبووە .

ويرجع الأمر الى ماكان قبلَهُ من تحريمٍ او إباحةٍ اي لكون الفعلِ مضرةً او منفعةً كما سياتي في الكتاب الخامس[١]

{مسئلةٌ: الأمـر بواحدٍ} مُبهمٍ {من اشياء} مُعيّنة كما في كفّارةِ اليمينِ فإنّ في آيتها الأمر بذلك تقديراً {يوجب واحداً} منها {لابعينه}[٢] وهو القدرُ المشترك بينهما في ضمن ايّ معيّن منها لأنّهُ المأمور به[٣] {وقيل} يوجبُ {الكلّ} فيثابُ بفعلها ثوابُ فعلِ واجباتٍ ويُعاقبُ بتركها عقابَ تركِ واجبات {ويسقط} الكلّ الواجب {بواحدٍ} منها[٤] حيث اقتصر عليه لأنّ الأمر تعلّقَ بكلٍّ منها بخصوصه على وجه الإكتفاء بواحدٍ منها[٥] قلنا إن سلّمَ ذلك لايلزم منهُ وجوبُ الكلِّ المرتبِ عليه ماذُكر[٦]

---

(١)ئیتر کارەکە ئەگەڕێتەوە بۆ کاتی پێش وجوب و دوای بیعسەت، ئیتر یا حەرام کراوە یا خود حەڵاڵە ،جا خۆ حەرام و حەڵاڵ شەرع دیاری ئەکا ئەمە بەچی دیاری کراوە ؟ ئەمیش دەڵێ : قازانج و زیان سەنگی مەحەکن، ئەگەر ئەو کارە قازانجی بوو ئەوە حەڵاڵە وە ئەگەر زیانی بوو ئەوە حەرامە، وەك لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا باس ئەکرێ.

(٢)مسئلة: لەناو چەند شتێکی دیاریکراودا فەرمان بە ئەنجام دانی یەکێکیان بکرێ بێ دەست خستنەسەر – وەك کەفارەتی سوێن چوارشتی دیاری کردوە، بەڵام فەرمانی بە ئەنجام دانی یەکێکیان کردوە بێ‌دیاریکردنی– جا کوا فەرمان و ئەمرە؟ خۆ ئەفەرموێ: ﴿ فإطعام عشرة مساكين..الخ ﴾ ئەمە خەبەرە کوا ئەمە ئەمرو ئینشایە؟ (تقديراً) ئەمرە (لفظاً) خەبەرە ئەوە یەکێکی نادیاریان واجب ئەکا

(٣)ئەویش بریتیە لەو ئەندازەی کە موشتەرەکە لەنێوان هەموانیاندا لە دوو تۆی هەریەکێکیان کە دیاری بکرێ، جا ئەو ئەندازە موشتەرەکە بۆ واجبە؟ چونکە ئەوە فەرمان دراوە بەکردنی.

(٤)ووتراویشە هەموویان واجب ئەکا ، کە وابوو بەکردنیان پاداشی ئەنجام دانی واجیبات ئەدرێتەوە، وە بەنەکردنیان تۆڵەی تاریك واجیبات ئەدرێتەوە، وە هەموویانی لەکۆڵ ئەکەوێ بە ئەنجام دانی یەکێکیان . (٥)ئەگەر تەنها هەر یەکێکیانی کرد ، دوانەکەی تر لازم ناکا، چونکە ئەمرەکە پەیوەندی تایبەتی بەستوە بەتاك تاکی هەمویانەوە، بەڵام بەشێوەییێك کە یەکێکیان لەباتی هەموویان رۆڵ ببینێ.

(٦) لەوەڵامی ئەم قیلەدا ئەڵێین: ئەگەر ئەوەش بسەلمێنین، هەر لێیەوە لازم نابێ کە هەموویان واجبن ، واجبێك پاداشتی تۆڵەی واجبی لەسەر بێ.

{وقيل الواجبُ} في ذلك الواحد منها {معيّنٌ} عند الله تعالى إذْ يجبُ ان يعلمَ الآمرُ المأمورَ به لأنّهُ طالبهُ ويستحيلُ طلبُ المجهولِ[1] {فإن فعل} المكلّفُ المعيّنَ فذاك وإن فعل {غيره} منها {سقط} الواجبُ بفعلِ ذلكَ الغيرِ لأنّ الأمر في الظاهرِ بغيرِ معين. قلنا لايلزم من وجوبِ علمِ الآمرِ المأمور به أن يكون معيناً عندهُ بل يكفي في علمه به ان يكونَ متميّزاً عنده عن غيرهِ وذلكَ حاصلٌ على قولنا لتميزِ أحد المعيّناتِ المبهم عن غيرهِ من حيثُ تعيُّنها[2] {وقيلَ} هو اي الواجبُ في ذلك {مايختاره المكلّفُ} للفعلِ من اي واحدٍ منها بأن يفعلهُ دون غيرهِ و إن إختلفَ بإختلافِ إختيار المكلّفين للإتّفاقِ على الخروجِ عن عهدةِ الواجبِ بأيّ منها يفعلُ[3]

---

(١)ووتراویشە لەوانە تەنها یەکێکی دیاریکراویان لای خوا واجبە ، چونکە ئامرو فەرماندەری خودی خۆی بزانێ فەرمانی بەچیداوە ، چونکە ئامرەکە لە فەرمانەکەی خۆی ئەپرسێتەوە ، لە کاتێکیشدا پرسینەوەو بەدواچونی شتی نادیار مەحاڵە .

(٢)ئەگەر موکەلەفەکە واجبەکەی ئەنجام داو پڕاوپڕ واجبەکەی پێکا ، ئەوە کاری بەخێرە. بەڵام ئەگەر ئەوەی کردی دیاریکراوەکە نەبوو ئەوە هەر بەوە واجبەکەی لە کۆڵ کەوتووە، جا چۆن واجبی دیاریکراوی نەکردوەو واجبیشی لە کۆڵ ئەکەوێ؟ چونکە فەرمانەکە لای خوا دیارە ، بەڵام بەڕواڵەت دیاریکراو نیە. لەبەر ئەوە هەرکامیان بکا واجبی لەکۆڵ کەوتووە. ئێمەیش ئەڵێین: لازم ناکا مأموربە یەکە مشخص بێ لای ئامرەکە، لەمەوە نەتیجە بگری بڵێت: واجبە ئامر عیلمی هەبێ بەو فەرمانەی کە ئەیدا بەڵکو ئەوەندە کە ئامرەکە مأموربە یەکەی لای جیاکراوە لەغەیری خۆی ئەوە بەسە- واتە عیلم بەمشخص لازم ناکا، بەڵام عیلم بە نەوع و جۆەکە ئەوە لازمە- دەخۆ ئەو قسەش لای ئێمە هەیە- کەواجب یەکێکی دیاری نەکراوە غەیری خۆی متحیزە چونکە دوو لایەنی هەیە:١-چواری دیاریکردوە لەناو هەزاران شتدا دە ئەو چوارە لە غەیری خۆیان جیا کراونەتەوە، واتە نەوعەکەی ، کە یەکێك لەو چوارە دیارەیە، دە ئەمەش معلومە. ٢-دیاریکردنی لەناو ئەو چوارەدا ئەمەیان مبهم و نادیارە واتە مشخص نیە.

(٣)ووتراویشە ئەوەی کە واجبە لەنێوان ئەو چەند شتە دیاریکراوانەدا بریتیە لەوەی موکەلەفەکە هەڵیئەبژێرێ بۆ کردن ئیتر هەرکامیان بێ، یان تەنها ئەو هەڵبژاردە نەك ئەوانیتر هەرچەندە هەڵبژاردەکان جیاوازن بەهۆی جیاوازی ویستی موکەلەفەکانەوە تۆ ئیختیاری رۆژوو دەکەی، من ئیختیاری ئیطعام ئەکەم، چونکە زانایان یەکڕان کە بە ئەنجام دانی هەریەکێکیان لە عوهدەی واجبەکە دەرئەچێ.

قلنا الخروج بهِ عن عهدةِ الواجبِ لكونهِ أحدَها لا لِخصوصهِ للقطعِ بإستواءِ المكلَّفين في الواجبِ عليهم[1] والأقوال غير الأوّل للمعتزلةِ وهي متفقةٌ على نفي إيجابِ واحدٍ لابعينهِ كما سيأتي، كما قالوا من انّ تحريم الشيئِ أو إيجابهُ لما في فعلهِ أو تركهِ من المفسدةِ التي يدركها العقلُ وإنّما يدركها في المعيَّنِ[2] وتعرفُ المسئلة على جميعِ الأقوالِ بالواجبِ المخيَّرِ لتخيير المكلّفِ في الخروجِ عن عهدةِ الواجبِ بأيّ من الأشياءِ يَفعلهُ وإن لم يكن من حيثُ خصوصهِ واجباً[3]

{فإن فعلَ} المكلّفُ على قولنا {الكلَّ} وفيها أعلى ثواباً و عقاباً وادنى كذلكَ {فقيلَ الواجبُ} اي المُثابُ عليهِ ثواب الواجب الذي هو كثوابِ سبعينَ مندوباً أخذاً من حديثٍ رواه ابن خزيمة والبيهقي في شعبِ الإيمان {أعلاها} ثواباً بأنهُ لو اقتصرَ عليهِ لأثيبَ عليهِ ثواب الواجبِ فضمَّ غيرهُ معاً أو مرتباً لاينقصهُ عن ذلك[4]

---

(١)ئێمەیش ئەڵێین: بە کردنی یەکێکیان لە عوهدەی واجبە دەرئەچیٚ، هۆکەی ئەوەیە کەبەکێکە لەو چوارەی خوا دیاریکردون بۆ کەفارەتی سوێن ، نەك بەهۆی هەڵبژاردنی خۆیەوە واجب بووە چونکە شتێکی بێگومانە موکەلەفەکان یەکسانن لەئەرك و واجباتدا –نوێژ کە فەرزە بۆهەموومانە بیٚجیاوازی–

(٢)ئەو قەولانە هەموویان جگە لەیەکەمیان هی موعتەزیلەن ، ئەوانیش هەموویان یەکڕایان هەیە کە : نابیٚ شتیٚ واجب بکریٚ دیاری نەبیٚ، وەك نابیٚ کەشتیٚ حەرام بکریٚو دیاری نەبیٚ وەك لەمەودوا دیٚ، چونکە موعتەزیلە ووتویانە و پێشیان وایە شتێك کەحەرام بکریٚ لەبەر مەفسەدەیەکە لەکردنەکەیدا، مەفسەدەیەك کە عەقڵ ئیدراکی ئەکا، دەخۆ عەقڵ لەشتی دیاریکراودا مەفسەدە دەرئەخا و ئیدراکی ئەکا.

(٣)ئەم بابەتە لەسەر رای سەرجەم قەولەکان دەناسریٚو ناودەبریٚبە (الواجب المخيّر) واجبێکی هەڵبژاردە، چونکە موکەلەفەکە سەرپشك کراوە هەریەکیٚ لەو دیاریکراوانە بکا ، ئەوە لە عوهدەی واجبەکە دەرئەچێت هەرچەندە ئەوەی ئەیکا من حيث الخصوص لای ئێمە واجب نییە.

(٤)جا ئەگەر مكلف هەموو ئەوانەی جیٚبەجیٚ کرد –بێگومان ئەوانەش هەیانە لە هەموویان زیاتر پاداشی هەیە، هەیانە لە هەموویان کەمتر پاداشی هەیە، بۆ تۆڵەش ئەو کەم و زۆریە هەیە– پاداش چیە؟ هەندیٚ ووتویانە: پاداشی واجبی لەسەر وەرئەگریٚ کە بەئەندازەی پاداشی حەفتا سوننەتە ئەم ئەندازەی پاداشەش لە فەرمودەیەك وەرگیراوە کە (إبن خزيمةو بيهقي) لە کتێبی(شعب الإيمان) دا ریوایەتیان کردووە، چونکە پاداشی واجب لە هەموویان بەرزترو زیاترە، چونکە ئەگەر تەنها

{وإن تركها} بأن لم يات بواحدٍ منها {فقيلَ يعاقَبُ على ادناها} ان عُوقِبَ لأنَّهُ لو فعلَهُ فقط لم يُعاقَب فإن تساوت فثوابُ الواجبِ والعقابِ على واحدٍ منها فعلت معاً او مرتباً[1] وقيل في المرتب الواجب ثواباً اولها تفاوتتْ او تساوت لتادّى الواجبُ بهِ قبلَ غيرهِ ويُثابُ ثوابُ المندوبِ على كلّ من غير ما ذُكرَ لثوابِ الواجبِ[2] وهذا كلّهُ مبنيٌّ كماترى على انّ محلّ الثوابِ والعقابِ احدها من حيث خُصوصه الذي يقع نظراً لتأدي الواجبِ بهِ[3] والتحقيقُ المأخوذُ مما تقدّمَ انّهُ احدها من حيثُ انّهُ احدُها لا من حيثُ ذلك الخصوصِ وإلاّ كان من تلك الحيثيّة واجباً حتّى ان الواجب ثواباً في المرتب اولها من حيثُ انّهُ احدها لا من حيثُ خصوصه[4]

---

واجبەکەی بکردایە، هەر پاداشی واجبی ئەدرایەوە ، کە وابوو ئەگەر لەگەڵ ئەنجام دانی واجبدا ئەوانی تریش بکا یاخود هەر ماوەیێك یەکێکیان بکاتەوە هەر پاداشی واجبی ئەدرێتەوە و لێی کەم ناکرێتەوە. (١)وەئەگەر هیچ یەکێ لە دیاریکراوەکانی نەکرد، ئەوە هەندێ ووتویانەئاسانترین تۆڵە ئەدرێ ئەگەر تۆڵە بدرێ، چونکە لەسەر نزمتریان ئەدرێ و حیسابی بۆ ئەکرێ – میهرەبانی خوا وایە بۆ پاداش بەرزترین پلەیان بۆ حیساب ئەکرێ کە واجبە، بەڵام بۆ تۆڵە نزمتریان بۆ حیساب ئەکرێ– چونکە ئەگەر تەنها ئەو نزمەشی بکردایە تۆڵە نەئەدرا، بەڵام ئەگەر پلەی بەرزو نزمیان تێدا نەبێ هەموویان چون یەکبن، ئەوە چ تۆڵەو چ پاداش هەر لەسەر یەکێکیان ئەبێ، ئیتر هەموویان پێکەوە کرابن یاخود بەرودوا کرابن

(٢)ووتراویشە: ئەگەر بەرودوا هەموو کران، ئەوە یەکەمیان ، پاداش و واجبی هەیە، ئیتر جیاوازبن لەیەك کەسەرو خواریان هەبێ، یاخۆ هەموو یەکسان بن چونکە واجب بەیەکەمیان هاتووەتەدی پێش ئەوانیتر ، وە پاداشی سوننەت لەسەر هەموو ئەوانی تر ئەدرێتەوە ، جگە لەوەی کە باسکرا بۆ پاداش بۆ واجب.

(٣)ئەمە هەمووی کە بینیت لەسەر ئەوە دروست کراوە، کە شوێنی پاداشی جێبەجێکردنی واجب و نەکردنی تەنها یەکێکیانە مِن (حیث الخصوص)ی ئەو یەکەی کە وقوع ئەبێ، بۆیە ئەڵێن: مەحەلەکە ئەوە؟ چونکە واجبەکە بەو جێبەجێ کراوە. (٤)قسەی محەقەق و سەلمێنراو کەلەوەی پێشوو وەرگیراوە ئەوەیە: مەحەلی پاداشەکە یەکێکیانە لەو لایەنەوە کە یەکێکە لە دیاری کراوەکان نەك لایەنی خصوصی تایبەتیەی– کە اعلی یا ادنی یا اولویەتە هیچی ئەمانە نیە– ئەگەر وانەبێ لەو لایەنەوە واجب ئەبوو،( حتّى ان الواجب ثواباً في المرتب اولها من حيثُ انّهُ احدها لا من حيثُ خصوصه) هەتتا یەکەمی ئەوانەی بەرودوا ئەکرێن واجبەو پاداشی

وكذا يُقال في كلٍّ من الزائد على ما يتأدّى بهِ الواجب منها[1] {ويجوز تحريم واحدٍ لابعينه} من أشياءَ معيّنة وهو القدر المشترك بينها في ضمن اي معيّنٍ منها فعلى المكلّفِ تركُهُ في ايّ معيَّنٍ منها ولهُ فعلُهُ في غيرهِ إذ لامانع من ذلك[2] {خلافاً للمعتزلةِ} في منعهمْ ذلك كمنعهِم إيجابَ واحدٍ لابعينه لما تقدّمَ عنهم فيها[3]

{وهي كالمخيّرِ} اي و المسئلة كمسئلة الواجبِ المخيّرِ فيما تقدّمَ فيقال على قياسه النهي عن واحدٍ مبهمٍ من اشياء معيّنةٍ نحوِ لاتتناولِ السمكَ أو اللبن أو البيض يحرّم واحداً منها لابعينه بالمعنى السابقِ[4] وقيل: يحرُمُ جميعها فيعاقبُ بفعلها عقابَ فعلِ محرّماتٍ ويُثابُ بتركها إمتثالاً ثوابُ تركِ محرّماتٍ ويسقطُ تركها الواجبُ بتركِ واحدٍ منها[5]

---

واجبی هەیە، ئەوە لەبەر ئەوەیە لەو لایەنەوەیە کەیەکێکە لەو دیاری کراوانە، نەك لەلایەنی خصوصیەت و تایبەتمەندییەوە. (١)ئەووتریٚ لە هەموو بابەتێکدا کەزیاتر لەوەی تیادابیٚ کە ئەدای واجبی پیٚبکریٚ، ئەوەی ئەوتریٚ کە پاداشی مەندوبی ئەدریٚتەوە، لەبەر ئەوە لەو لایەنەوە کە یەکێکە لە دیاریکراوەکان، نەك لەبەر تایبەتمەندیو خصوصیەتەکەی . (٢)دروستە لەناو چەند شتێکی دیاریکراودا یەکێکیان بیٚدەست خستنەسەری حەرام بکریٚ، ئەو یەکەش بریتیە لەو ئەندازە هاوبەشەی نێوانیان لە دوتوٚی هەریەك لەو دیاری کراوانەدا، کە وابوو مکلف لەسەریەتی یەکێکیان هەرکامیان هەبیٚ تەرك بکا، ئیتر جگە لەو یەکە ئەوانیتر بکا قەی ناکا، چونکە شتیٚ نیە ریٚی ئەوەی لیٚبگریٚ.

(٣)ئەمە جیاوازی رای موعتەزیلەیە، ئەوان ئەمەیان بەلاوە قەدەغەیە، وەك واجب کردنی یەکێکی نادیار بەلایانەوە قەدەغەیە، لەبەر ئەو هوٚیانەی لەپێشەوە باسکران وەلاٚم درانەوە.

(٤)ئەم مەسئەلەیەش وەك مەسئەلەی پێشوو وایە، چوٚن واجبی مخیر ئەو جیاوازیەی پێشووی تێدا بوو ئەمیش هەر عەینی ئەوە ، بوٚیە بلێرەدا ئەوتریٚ: یەکێك لەمانە نەخوٚی ماسی یاشیر یا هێلکە ئەمە تەنها یەکێکیان حەرام ئەکا بیٚدەست خستنەسەر (٥)هەندێکیش ووتویانە هەمویان حەرام ئەبن نەك یەکێکیان کەوابوو ئەگەر هەرسیٚ بکا توٚلەی سیٚ کاری حەرامی ئەدریٚ ، ئەگەر هەر سێکیش نەکا ئەوە پاداشی نەکردنی سیٚحەرامی ئەدرێتەوە، بەلاٚم بەمەرجی گوێرایەلّی بوٚ خوا نەی کردبن، نەك بوٚی ریٚنەکەوتبیٚ، خوٚ ئەگەر یەکێکیشان واجبە نەیکا، ئەوە هەرکامیان بیٚ واجبەکەی بەجێهێناوە.

وقيل المحرّمُ في ذلك واحد منها معيّن عند الله تعالى ويسقط تركهُ الواجبَ بتركهِ أو ترك غيرهِ منها[1] وقيل المحرّمُ في ذلك مايختارهُ المكلّفُ للترك منها بأن يتركهُ دونَ غيرهِ وإن إختلفَ بإختلافِ إختيارِ المكلّفين[2] وعلى الأول إن تركتْ كلّها إمتثالاً او فعلتْ وهي متساويةٌ أو بعضها اخفّ عقاباً و ثواباً فقيلَ: ثوابُ الواجبِ والعقابِ في المتساوية على ترك و فعل واحدٍ منها[3] وفي المتفاوتةِ على ترك اشدِّها و فعلِ اخفِّها سواءٌ افعلتْ معاً او مرتباً[4] وقيل العقابُ في المرتَّبِ على فعل آخرها تفاوتتْ او تساوت لإرتكاب الحرام به ويُثابُ ثوابَ المندوبِ على ترك كلّ من غير ما ذُكرَ تركهُ لثواب الواجبِ[5] والتحقيقُ انّ الثوابَ والعِقابَ على تركٍ و فِعلِ احدها من حيث انّهُ احدُها[6] حتّى انّ العقاب في المرتّبِ على اخرها من حيث انّهُ احدُها ويُثابُ ثواب المندوبِ على ترك كلّ من غيرِ ما يتأدّى بتركه الواجبُ منها من حيث انّهُ احدُها[7]

---

(١)هەندێکیش ووتویانە ئەوەی حەرام بێ یەکێکی دیاری کراوە بەلای خواوە، بە دوو جۆر لە کۆڵ ئەکەوێ: أ-بەنەکردنی ئەوەیان کە واجب بوو دیاری بوو لای خوا. ب-بەنەکردنی یەکێکیتر لەوانەی دیاریکراون، هەر لە کۆڵی ئەکەوێ.

(٢)ووتراویشە ئەوەیان حەرامە کە موکەلەفەکە هەڵی ئەبژێرێ بۆ نەکردن ، واتە ئەویان نەکا و ئەوانی تر بکا ، هەرچەندە هەڵبژاردەی من لەگەڵ هەڵبژاردەی تۆدا جیاوازن. (٣)لەسەر رای قەولی یەکەم ئەگەر هەموویان تەرك کران یا خود کران لەبەر گوێ رایەڵی، لە کاتێکدا کە هەموویان یەکسانن یاخود کە هەندێکیان تەرك کران یا بەجێهێنران پاداش و تۆڵەیان کەمترو سوکترە . ئەوەی هەندێ ووتویانە پاداش و تۆڵە لە یەکسانەکاندا لەسەر کردن یانەکردنی یەکێك لەوانەی دیاری کراون. (٤)بەلاَم ئەگەر فەرق و جیاوازیان هەبوو ئەوەپاداش و تۆڵەیان کامیان تۆڵەی توندە ئەگەر بکرێ یاخود نەکرێ ئەوە بەو شێوەی وەری ئەگرێ، ئیتر کەیفی خۆیەتی پێکەوە هەمووی کردبێ یاخود بەرودوا کرابن. (٥)ووتراویشە ئەگەر بەرودوا کردنی، تۆڵەکەی بەگوێرەی ئەوەی ئەخیریانە ئیتر یەکسان بن یا یەکسان نەبن ، چونکە بەهۆی کردنی کۆتاییەکەیان ئیرتکابی حەرام بووە، وەپاداشی ئەدرێتەوە بەپاداشی مەندوب لەسەر نەکردنی هەموو ئەوانی تر ئەدرێتەوە، جگە ئەو تاکەی نەبێ کە تەرکی کردوە پاداشی واجبی ئەدرێتەوە. (٦)قسەی محقق ئەوەیە پاداشی واجب و تۆڵە لەسەر کردن و نەکردنی یەکێکیان، لەبەر ئەوەیە لەو لایەنەوەیە کە یەکێکە لەوانەی دیاری کراون (٧)هەتا ئەگەر بەراورد کردنی تۆڵە بەگوێرەی ئەخیرەکەیانە ، نەك لەبەر ئەوەی ئەخیریانە بەڵکو یەکێکە لەو دیاری کراوانە وە پاداشی مەندوب ئەدرێتەوە لەسەر

{وقيلُ} زيادة على ما في المخيّرِ من طرفِ المعتزلةِ{لم ترد بهِ} ايْ بتحريمِ ماذكر {اللغة} حيثُ لم تَردْ بطريقةٍ من النهي عن واحدٍ مبهمٍ من اشياء معيّنةٍ كما وردت بالأمرِ بواحدٍ مبهمٍ من اشياء معيّنة وقوله تعالى: ﴿ ولاتطع منهم آثماً او كفوراً ﴾ نهيٌ عن طاعتهما إجماعاً قلنا الإجماعُ لمستندهِ صرفهُ عن ظاهره[١]

{مسئلةٌ فرض الكفاية} المنقسم اليهِ والى فرض العينِ مطلقُ الفرضِ المتقدِّم حدُّهُ {مهمّ يُقصدُ حصولهُ من غيرِ نظرٍ بالذاتِ الى فاعله} اي يقصدُ حصولهُ في الجملة.[٢] فلا ينظرُ الى فاعلهِ الاّ بالتبعِ للفعلِ ضرورةَ انّهُ لايحصلُ بدون فاعله[٣] فيتناول ما هو دينيٌ كصلاةِ الجنازةِ والأمرُ بالمعروفِ، و دنيويّ كالحرفِ والصنائعِ[٤]

---

نەكردنی هەموو ئەوانی‌تر ، جگە ئەوەیان بەنەكردنی ئەوان واجبی پێ كراوە، لە كاتێكا یەكێك بێ لەدیاری كراوەكان ، لەبەر ئەوە لەو لایەنەوە كە یەكێكە لە دیاری كراوەكان. (١)ووتراویشە جگە لەوەی لە باسی مخیر دا باسكرا، لە لایەن موعتەزیلەوە دیاردەیەكی‌تر هەیە كە ئەڵێن لەزاراوەی عەرەبدا بەهیچ جۆ.ێك لە تاكێكی نادیار لە ناو چەند شتێكی دیاردا نەبووە ، بەڵام ئەمر بە یەكێكی نادیار لەناو بەچەند شتێكی دیاردا هاتووە، ئەو ئایەتەش نەهی تیایە نەهیەكەش (إجماعا) بڕاوە بەسەر گوێ ڕایەڵی هەردووكیان ، ئێمەیش ئەڵێن: ئیجماع لە ظاهیری ئایەتەكەدا لای داوە لەبەر سەنەدەكەی بووە، كە كیتاب و سوننەو لوغەت و زاراوەی عەرەبە، كە وابوو لەزاراوەی عەرەبدا نەهی لەشتێكی نادیار لە ناو چەند شتێكی دیاردا هەیەو هاتووە.

(٢)ئەبێ تەعریف بە (اعمّ) بێ چونكە مەبەست ئەوەیە لە (فرض العین) جیابكرێتەوە ، ئەوە بۆ لێرەدا یەكسەر دەڵێ (فرض الكفایة)، خۆ ئەبێ پێناسەكراو بەجۆرێ لە جۆرەكان شتێكی لێ بزانرێ ئەمجا تەعریف بكرێ؟ ئەمیش دەڵێ : ئەگەر ووتت فەرز ئەوە فەرزی كیفایەو فەرزیعەینیش دەگرێتەوە وە خۆ لەپێشەوە تەعریفی فەرزت زانیوە ، كە فەرزی كیفایە بەشێكیەتی ، جا ئەو فەرزە كیفایەش بریتیە: لە كارێكی زۆر گرنگ هەر ئەبێ جێبەجێ بكرێ ، ئامر ئەیەوێ ئەوكارە پەیدا بێ ئیتر هەر كەسێ ئەیكا ، بێ ئەوەی بڕوانێ بۆ خودی فاعیلو بكەرەكەی، واتە (من الجملة) هەر پەیدابوون و كردنی كارەكە مەبەستە ئیتر. (٣)كەوا بوو بیر لەوە ناكرێتەوە كێ بكەرو فاعیلیەتی ، مەگەر هەر ئەوەندەنەبێ كە فیعل بێ فاعیل نابێ و بەس ئیتر فاعیل لە فەرزی كیفایەدا دیار نیە. (٤)كەوا بوو پێناسەی فەرزی كیفایە گشتگیرە بۆ فەرزی كیفایەی دینی وەك نوێژی مردوو فەرمان بەچاكە كردن ، و فەرزی كیفایەی دونیایی وەك هەموو پیشەو صەنعەت سازێك كە میللەت پێی موحتاج بێ.

وخرجَ فرض العينِ فإنَّهُ منظور بالذاتِ الى فاعله حيث قصد حصوله من كلِّ عينٍ اي واحدٍ منُ المكلفين او منْ عينٍ مخصوصةٍ كالنبيِّ ﷺ فيما فُرضَ عليهِ دون امّته ولم يقيّد قصد الحصولِ بالجزم إحترازاً عن السنّة لأنّ الغرض تمييز فرض الكفاية عن فرضِ العينِ وذلك حاصلٌ بما ذُكر[٢] {وزعمهُ} اي فرضَ الكفاية {الأستاذ} ابو إسحٰق الاسفراييني {وإمام الحرمين وابوه} الشيخ ابو محمد الجويني {افضل من} فرضِ {العينِ} لأنهُ يُصانُ بقيام البعضِ به الكافي في الخروجِ عن عهدته جميعُ المكلّفين عن الإثمِ المركبِ على تركهم لهُ[٣] وفرضُ العينِ إنّما يُصانُ بالقيامِ به عنِ الإثمِ القائم به فقط[٣] والمتبادرُ الى الأذهانِ وإنْ لم يتعرّضوا لهُ فيما علمتُ انّ فرض العين افضل لشدّة اعتناء الشارعِ به بقصد حصوله من كلِّ مكلّفٍ في الأغلب[٤]

---

(١)وەهەم بەم تەعریفە فەرزی عەین چووەدەر چونکە ئەم خودی فاعیلەکە چاوەروانی لێدەکرێ، کە ئەو کارە بکا و ئەبێ هەموو کەسێکیش بیکا، ئیتر تاك تاکی هەموو مکلفێك بێ، یاخود یەك کەسی تایبەتی بێ وەك پێغەمبەر ﷺ هەندێ شتی لەسەر فەرز کراوە ، بەلام بۆ ئوممەتەکەی نیە وەك شەونوێژ.

(٢)دانەر لە پێناسەکەدا وشەی جەزمی نەلکاند بەقصدی حصولەکەوە ، بۆ ئەوەی لە سوننەتی کیفایە جیابکرێتەوەو خۆی بپارێزێ؟ چونکە مەبەستی دانەر تەمییزو جیاکردنەوەی فەرزی کیفایە و عەینە بەس، نەك لەگەڵ شتی تردا جیابێتەوە، دەخۆ ئەو مەبەستەش بەوەی داتەرۆتی:هاتوتە دی،کەوا نایەوێت. (٣)( أسفراييني وإمام الحرمين)و باوکی پێیان وایە کە فەرزی کیفایە لە فەرزی عەین گەورەترە، چونکە بەهۆی هەستانی هەندێ بە ئەنجامدانی ئەو فەرزی کیفایە هەموو مکلفێکی سەر زەوی ئەپارێزن لە گوناهێك کە ئەگەر نەیکەن توشیان ئەبێ ئەو هەستانی ئەوانە بەسە بۆ دەرچونیان لە عوهدەی ئەو فەرزی کیفایە (٣)بەلام فەرزی عەین تەنها ئەوەی پێی هەستاوە لە گوناه دەپارێزێ و بەس. (٤)ئەوەی زیهنی مرۆڤ بۆی ئەچێ- هەرچەند زانایان لە دوو توێی باسەکانیان دا لێی نەدواون ، وەك ئەوەی من بزانم چونکە لەوانەیە باسیان کردبێ من نەم دیبێ- فەرزی عەین پاداشی زیاتری ئەبێ، چونکە خاوەنی شەرع زۆر توند گرنگی پێداوە، ئەو بایەخ پێدانە بەچی ئەزانری؟ بەوە ئەزانری کە خوا ویستویەتی ئەو فەرزی عەینە لەلایەن هەموو کەسێکەوە ئەنجام بدری بەلام بە اغلب بۆیە بە اغلب ئەوتری هەتا ئەوانەی فەرزی تایبەتی پێغەمبەر بچنەدەر - بەکورتی ئەگەر (افضلية) بەگوێرەی قازانج بێ بۆ خەلك ، ئەوە فەرزی کیفایە افضلە وە ئەگەر بەگوێرەی گرنگی پێدانی خوا بێ ئەوە فەرزی عەین افضلە.

ولمارضةِ هذا دليلَ الأولَ اشار المصنِّفُ الى انّ النظرِ فيه بقوله بقوله زعمهُ و إز اشار كما قال الى تقويه بعزوهِ الى قائليه الأئمّةِ المذكورين المفيد أن للإمام سلفاً عظيماً فيه فإنّهُ المشهور عنهُ فقط كما اقتصر على عزوهِ اليه النووي والأكثر[1] {وهو} اي فرض الكفاية {على البعضِ وفاقاً للإمام} الرازي للإكتفاء بحصوله من البعضِ {لا} على {الكلّ خلافاً للشيخ الإمام} والد المصنِّف {والجمهور} في قولهم انهُ على الكلّ لأثمهم بتركه ويسقُطُ بفعلِ البعضِ[2] وأُجيبَ بأنّ إثمهم بالترك لتفويتهم ما قصد حصولهُ من جهتهم في الجملةِ لا للوجوبِ عليهم[3] قال المصنِّف: ويدلّ لما إخترناهُ قولهُ تعالى: ﴿ ولتكنْ منكم امّةٌ يدعون الى الخيرِ يأمرون بالمعروف وينهَونَ عن المُنكر﴾[4]

(١)لەبەر ئەوەی ئەم بەڵگە نەیاری بەڵگەی یەکەمە ، دانەر ئاماژەی کرد بۆ ئەو رەخنەیەی تیایەتی بەوشەی زعمه، چونکە زەعم بۆ شتێ بەکاردێ بەڵگەی نەبێ ، یابێ بەڵام زۆر لاواز بێ، هەرچەند دانەر ئاماژەی کردوە بۆئەوەی بەهێزی بکا. بەهۆی ناوبردنی بوێژەکانیەوە ، کە ئەو پێشەوا بەرێزانەن ناوی بردوون و باسکراون. ئەو دانە پاڵ ئەوانە ئەوە ئەگەیەنێ کە إمام الحرمین خۆی خاوەنی ئەو بۆچونە نیە بەڵکو مامۆستای زۆر گەورە هەیە کە لەپێش ئەودا ئەو قسەیەی وتوە ، چونکە ئەم قسەیە هەر بەناوی إمام الحرمین‌ەوە بەناوبانگە ، وەك ئیمامی نەوەوی‌و زۆربەی‌تری زانایان تەنها هەر پاڵ ئەویان داوە. (٢)فەرزی کیفایە تەنها لەسەر هەندێ فەرزە ، ئەم قسەش موافقی قەولی ئیمامی رازیە، چونکە فەرزی کیفایە بەهەندێ خەڵك جێ‌بەجێ ئەکرێت، پێویست بە هەموویان نیە ، ئەو هەندەی بەسە بەڵام بە پێچەوانەی شیخ الإمام کە باوکی دانەرە هەموو زانایانی تر ئەڵێن: فەرزی کیفایە لەسەر هەموو کەسێکە ، چونکە ئەگەر نەکرێ هەموویان گوناهبار دەبن، بەڵام فەرزێکی وایە ، ئەگەر هەندێکیان لەکۆڵی هەموویان ئەکەوێ خوا خۆی ئەم فەرزەیەی واداناوە.

(٣)وەڵام دراونەتەوە: کە نەکراوە گوناهبار بوون لەبەر ئەوە نیە کە واجب بووە لەسەر هەموویان بەڵکو لەبەر ئەوەیە : ئەوەی خوا ویستویەتی لەلایەن ئەوانەوە بکرێ من الجملە –واتە هەندێکیان بیکەن –گوێیان لێ‌نەداوەو نەکراوە ، یاخود هەتا نەکرێ لەسەر هەموانە، کە هەندێکیشیان کردیان لەکۆڵ هەموان ئەکەوێ. (٤)دانەر ووتویەتی : ئەوەی ئێمە هەڵمان بژارد ووتمان لەسەر هەندێ واجبە ، ئەم ئایەتە دەیگەیەنێ دەفەرموێ: بالەناو ئێوە کۆمەڵێك هەبن بانگەوازی خەڵك بکەن بۆ چاکەو فەرمان بەخەڵك بکەن کە چاکە بکەن و خەڵك قەدەغە بکەن و رێی خراپەیان لێ‌بگرن ،

وذكر ولدَهُ مع الجمهورِ مُقدّما عليهم قال تقويةً لهم فإنَّهُ اهلٌ لذلك[١] {والمختارُ} على الأول {البعضُ مبهمٌ} إذ لادليل على انَّهُ معيّنٌ فمن قام بهِ سقط فرض بفعلهِ[٢] {وقيل} البعضُ {معيّنٌ عند الله تعالى}يسقط الفرضُ بفعلهِ وبفعلِ غيرهِ كما يسقط الدَينُ عن الشخصِ بأداءِ غيرهِ عنهُ[٣] {وقيل} البعضُ {من قام بهِ} لسقوطهِ بفعله[٤] ثمّ مدارهُ على الظنِّ فعلى قولِ البعضِ من ظنَّ انّ غيرهُ لم يفعله وجبَ عليه ومن لا فلا[٥] وعلى قولِ الكلِّ من ظنَّ انّ غيرهُ فعلهُ سقط عنهَ ومن لا فلا[٦] {ويتعيّنُ} فرضُ الكفايةِ {بالشروعِ} فيه اي يصير بذلك فرض عينٍ يعني مثلَهُ في وجوبِ الإتمام {على الأصحّ} بجامع الفرضيّة[٧]

---

ئەوەنیە ئایەتەکە ئەفەرموێ کۆمەڵێك ئایخاتە ئەستۆی هەموویان. (١)باسی باوکی کرد لە جمهوردا لەگەڵ ئەوەش باوکی لەپێش جمهورەوە هێنا بۆ وای کرد؟ دانەر ئەڵێ بۆ ئەوەیە کەرای جمهور بەهێز بکرێ ، بۆ باوکی ئەو کەڵە زانایە؟ بەڵێ چونکە باوکی شایانی ئەوەیە لەسەرەتای زنجیرەی زانایانەوە بێ. (٢)قسەی هەڵبژاردە لەسەر قەولی یەکەم ئەوەیە : ئەو هەندەی هەڵئەسن بەکردنی هەندیکی نادیارەوە ، چونکە بەڵگە نیە کە ئەو هەندە دیاریکراوە ، کەوا بوو هەرکەسێ پێی هەڵسێ فەرزەکە لە کۆڵ ئەکەوێ. (٣)ووتراویشە ئەو هەندەی پێی هەڵئەسن لای خوا دیاری کراون، فەرزەکە لەکۆڵی میللەت ئەکەوێ ، ئیتر ئەو هێندە دیاری کراون لای خوا بیکەن یاخود هەندێکیتر بیکەن ، وەك ئەگەر قەرزاری کابرایەك بیت خۆت بیدەیتەوە لەکۆڵت دەکەوێ، یابۆت بدەنەوە هەر ئەبێ. (٤)وەووتراویشە ئەو هەندەیە بریتین لەو هەندەیەی هەستاون بەکردنی، چونکە فەرزەکە بەو کردنە لەکۆڵ کەوتووە.

(٥)پاشان خولگەی فەرزی کیفایە ئایا لەسەر هەندێ ئەبێ یا لەسەر هەموانە، ئەم خولانەوە هەمووی لەسەر گومانە ، کەوا بوو لەسەر رای ئەوانەی ووتیان فەرزی کیفایە لەسەر هەندێکە ئەوە ئەگەر کەسێ گومانی برد غەیری خۆی نەی کردوە ئەوە واجبە لەسەر خۆی بیکا ، وە ئەگەر گومانی وابێ کراوە، ئەوە لەسەری نیە ئەم بیکاتەوە. (٦)بەلام لەسەر رای ئەوانەی ئەڵێن: فەرزی کیفایە لەسەر هەموانە، ئەوە ئەگەر کەسێ گومان بەرێ کەسانی تر کردویانە ، ئیتر لە کۆڵی ئەم کەوتووە، وە ئەگەر گومانی وانەبێ کەسانیتر کردویانە ، ئەوە لە کۆڵی ناکەوێ. (٧) فەرزی کیفایە بەدەسکردن بە ئەنجام دانی ئەبێ بە فەرزی عەین واتە نەك خۆی ئەبێ بە فەرزی عەین بەڵکو یانی وەك ئەو واجب ئەبێ تەواوکردنی بەلای قەولی (اصح)ەوە، چونکە کۆکەرەوەی جامیعی هەردوولا وشەی فەرزیەتە، ئەم فەرز و ئەو فەرز.

وقيل لايجبُ إتمامهُ[1] والفرقُ أنّ القصد بهِ حصولُهُ في الجملةِ فلا يتعيّنُ حصولُهُ ممن شرعَ فيهِ[2] فيجبُ إتمام صلاةِ الجنازةِ على الأصحِّ كما يجبُ الإستمرارُ في صفِّ القتال جزماً لما في الإنصراف عنهُ من كسرِ قلوبِ الجند[3]

وإنّما لم يجبِ الأستمرارُ في تعلُّمِ العلم لمن آنسَ الرُّشدَ فيه من نفسهِ على الأصحِّ أنّ كلَّ مسئلةٍ مطلوبةٌ براسها منقطعةٌ عن غيرها بخلافِ صلاةِ الجنازةِ[4] وما ذكرهُ تبعاً لإبن الرفعة في مطلَبهِ في باب الوديعة من انّهُ يتعيَّنُ بالشروعِ على الأصحِّ بالنظرِ الى الأصولِ اقعَدُ[5]

---

(١)ووتراويشه واجب نيه تەواوكردنی بەهۆی دەستپێکردنیەوەچونکه. (٢)قیاسی فەرزی کیفایەیه ، ناکرێتە سەر فەرزی عەین ، چونکە فەرق و جیاوازیان هەیە . چونکه مەبەست لە فەرزی کیفایەتدا پەیدا بوونیەتی (في الجملة)بێ ئەوەی بکەرەکەی مەبەست بێ، بەڵام لە فەرزی عەیندا بکەر مەبەستە، کەوابوو فەرزی کیفایە بۆ کەسێ دەست ئەکا بە ئەنجامدانی نابێ بە فەرزی عەین. (٣)قەولی (أصح) وتی: واجب ئەبێ ، کەوابوو بەچوونە ناو نوێژی مردوو واجب ئەبێ تەواوکردنی لەسەر قەولی (أصح) ، وەك واجبە بەردەوام و مانەوەی لەبەرەی جەنگدا، بەلأم ئەمەیان بێگومان بەلای هەردوو قەولەکەوە واجبە ، چونکە کشانەوەو راکردن لەبەرەی جەنگدا شکانی مەعنەوییات و عیزەتی سوپاکەی تیایە.

(٤)ئەی بۆ بەردەوامی واجب نیە لەفێربوونی عیلمدا بۆ کەسێك لە خۆیدا دەرکی روشدو پێگەیشتن لەو بوارەدا ، هەر لەسەر قەولە ئەصەحەکە؟ چونکە هەموو مەسئەلەیەك بۆ خۆی سەربەخۆیە و پەیوەندی نیە بە مەسئەلەی ترەوە ، ئەمە جیاوازە لەگەڵ نوێژی مردوودا ، نوێژی مردوو هەمووی هەر یەك مەسئەلەی سەربەخۆیە.

(٥)ئەوەی دانەر باسی کردوە کەهی خۆی نیە بەڵکو شوێنی (إبن الرفعة) کەوتوە ، ئەویش لە کتێبی (مطلب)دا کە دانراوی (إبن الرفعة)یە، لە بابی وەدیعەو سپاردە دایە، کە فەرزی کیفایە بە دەستپێکردنی ئەبێ بە فەرزی عەین ، لەسەر قەولی ئەصەح ئەوە گونجاوترە ، ئەگەر سەیری ئوصول و قەواعید بکرێ ، چونکە ئەم ئەیکا بە قاعیدە دەڵێ هەرچی فەرزی کیفایە هەیە ئەبێ بە فەرزی عەین، دە خۆ هەموو قاعیدەیەکیش هەندێ مەسئەلەی لێجیا ئەکرێتەوە وەك فێر بوونی عیلمەکە گونجاوو موناسبترە لەچی؟ لەوەی...

مما ذكرهُ البارزي في التمييزِ تبعاً للغزالي من انَهُ لايتعيَّنُ بالشروعِ على الأصحِّ الاّ الجهادُ وصلاةُ الجنازةِ ، وإنْ كان بالنظرِ الى الفروعِ اضبطُ[١]

{وسنّةُ الكفايةِ} المنقسم اليها والى سنة العين مطلقُ السنّةِ المتقدّم حدُّهُ {كفرضِها} فيما تقدَّمَ وهو امورٌ[٢] احدها انَها من حيث التمييز عن سنّةِ العينِ مهمٌّ يقصدُ حصولهُ من غيرِ النظرِ بالذات الى فاعله كإبتداءِ السلام وتشميتِ العاطسِ والتسميةُ للأكلِ من جهةِ جماعةٍ في الثلاث مثلاً[٣] ثانيها انَها افضل من سنّةِ العينِ عندَ الأستاذ ومن ذكر معهُ لسقوطِ الطلَبِ بقيامِ البعضِ بها عنِ الكلِّ المطلوبين بها[٤] ثالثُها انَها مطلوبةٌ من الكلِّ عند الجمهور وقيل من بعضٍ مبهمٍ و هو المختارُ وقيلَ معيَّنٍ عند الله تعالى يسقط الطلبُ بفعله و بفعلِ غيره و قيل من بعضٍ قام بها[٥]

---

(١)كە بارزی لە كتێبی (التمييز)دا باسی كردوە وە ئەمیش شوێن كەوتەی غەزالیە ، هی خۆی نیە دەڵێ : فەرزی كیفایەبە دەست پێكردنی نابێ بە فەرزی عەین بەلای قەولی ئەصەحەوە، جگە لە جیهاد و نوێژی مردوو نەبێ ، هەرچەند ئەم قسەی بارزیە ئەگەر سەیری فروع و جوزئیات و میثال هێنانەوە دیاری كردنی شت بكەی مضبوط ترە لەویتر ، واتە دانەر ئەیكا بەقاعیدەو كولیات، بەلاْم بارزی وێنە ئەهێنێ بە جیهادو نوێژی مردوو، ئەم ئەیكا بە جوزئیات، جوزئیاتیش لە كلیات رونترە. (٢)سوننەتی كیفایە كەووتت: سوننەت كە لەپێشەوە تەعریف كراوە ئەبێ بە دوو بەشەوە: أ- كفایە ب -عەین جا سوننەتی كیفایە هەر وەكو فەرزی كیفایە وایە ، لەو شتانەدا كە لە پێشەوە باسكران، ئەوانەش چەند شتێكن :

(٣)یەكەمیان لەبارەی جیاكردنەوەی سوننەتی كیفایە لە سوننەتی عەین، ئەویش بە پێناسەكردنی كە شتێكی گرنگە و ئەنجامدانی مەبەستە بێ‌ئەوەی بیر لە خودی بكەرەكەی بكرێتەوە- چونكە كارەكە مەبەستە نەك بكەرەكەی- وەك سلاْوی یەكەم و وتنی خوا رەحمەت پێ‌بكا بۆ كەسێ بپژمێ، و الحمد لله بكا و بسم الله كردن بۆ خواردن، ئەم سیانە ئەگەر لەلایەن كۆمەڵێكەوە بكرێن واتە : یەكێكیان لەلایەن ئەمزویانەوە بسم الله بكا هەروەها ئەوە سوننەتی كیفایەیە ، بەلاْم ئەگەر یەك یەك بیكەن ئەوە سوننەتی عەینە. (٤)دووهەمیان ئەوەیە سوننەتی كیفایە گەورەترێكە لە سوننەتی عەین ، بەلای مامۆستا اسحاقو ئەوانەی لەگەڵیدا باسكران ، چونكە هەموویان داوایان لێكرابوو بیكەن بەهۆی ئەوەی هەندێكیان پێ‌ی هەستان لە كۆڵی هەموویان كەوت. (٥)سێ‌هەمیان ئەوەیە سوننەتی كیفایە لە هەموان داواكراوە . بەلای جمهورەوە وتراویشە لەهەندێكی دیاری نەكراو داواكراوە، یا ئەو هەندە دیاری‌كراوە

رابعُها انّها تتعيّنُ بالشروعِ فيها اي تصيرُ بهِ سنّةَ عينٍ يعني مثلَها في تاكّدِ طلبِ الإتمامِ على الأرجح[1]

{مسئلة: الأكثر} من الفقهاءِ ومن المتكلّمين على {انّ جميع وقت الظهرِ جوازاً ونحوه} اي نحو الظهرِ كباقي الصلوات الخمس {وقتٌ لأدائه} ففي ايّ جزءٍ منهُ اوقع فقد اوقع في وقت ادائهِ الذّي يسعه وغيره ولذلكَ يُعرفُ بالواجب الوسَع[2] وقولهُ جوازاً راجعٌ الى الوقتِ لبيانِ انّ الكلامَ في وقتِ الجوازِ لا في الزائدِ عليهِ ايضاً من وقتِ الضرورةوان كان الفعلُ اداءً بشرطه[3] {ولايجبُ على المؤخّر} اي مُريد التأخيرِ عن اولِ الوقتِ {العزمُ} فيه على الفعلِ بعد في الوقتِ {خلافاً لقومٍ} كالقاضي ابي بكر الباقلاني من المتكلّمين وغيرهِ في قولهم بوجوبِ العزمِ ليتميّزَ به الواجبُ الموسّعُ عن المندوبِ في جوازِ الترك[4]

---

بيكەن، هەر لەكۆڵ ئەكەوێ یاخود هەندێکی‌تر بیکەن، ووتراویشە لەکەسێ داواکراوە کە پێی هەستاوە. (١)چوارەمیان ئەوەیە سوننەتی کیفایە ئەبێ بە سوننەتی عەین بەدەست پێکردن و چونە ناویەوە، واتە نەك خۆی ئەبێ بە سوننەتی عەین بەڵکو وەك ئەوی لێدێ لە دوپات کردنەوەی داوای تەواوکردنیدا لەسەر قەولی ئەصەح.

(٢)مەسئەلە: زۆربەی زانایانی فیقە و کەلام رایان وایە: کە هەموو ئەوکاتەی کە دروستە نیوەڕۆ و چوار فەرزەکەی تری تیابکرێ، ئەوە کاتی ئەدای نیوەڕۆیە، کە وابوو لە هەرکاتێکی نیوەڕۆدا جێبەجێ کرابێ، ئەوە بێگومان لەکاتی ئەدای خۆیدا ئەنجام دراوە ، ئەو کاتی ئەدایەی کە ویسعەتی نیوەڕۆ و غەیری نیوەڕۆیشی هەیە، هەر لەبەر ئەوەیە: پێناسە ئەکرێ بەو اجبی کات بۆ فراوان کراو.

(٣)دانەر کە وتی : (جوازاً) ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ کاتەکە ، بۆ رون کردنەوەی ئەوەیە کە گفتو گۆی ئێمە لێرەدا لەبارەی ئەو کاتەوەیە کە دروستە نوێژەکە تیادا بکرێ ، نەك ئەو کاتەش مەبەست بێ کە زیاد ئەکرێ بەسەر کاتی جەوازدا، کە کاتی ضەرورەت و پێویستە، هەرچەندە نوێژەکەش تیایدا بە ئەدا حیساب ئەکرێ، بەڵام بەمەرجی خۆی -کەرکاتێکی لەکاتی خۆیدا بووبێ کاتی جەواز هەیەو کاتی حورمەت هەیە ، ئەگەر لەکاتی خۆی دەرچوو ئەو کاتە حەرامە نوێژ ئەوەندە دوابخرێ-

(٤)واجب نیە لەسەر ئەو کەسەی ئەیەوێ نوێژ لەسەرەتای کاتەکەیەوە نەکا نیەتی ئەوە بێنێ هەر لە سەرەتای کاتەکەوە دوایی نوێژەکە بکا لەکاتی خۆیدا، ئەمەش جیاوازە بۆ گەلێك وەك باقلانی کە یەکێکە لە زانایانی کەلام و غەیری ئەویش،

واجيب بحصول التمييز بغيرهِ وهو انّ تأخير الواجبٌ عن الوقت يؤثم[1] {وقيلَ}وقت ادائه {الأول} من الوقت لوجوب الفعل بدخول الوقت، {فإن اخَّرَ} عنهُ {فقضاءٌ} وإن فعل في الوقت حتّى يأثمُ بالتأخير عن اولهِ كما نقله الإمام الشافعي رحمهُ الله عن بعضهم و إن نقل القاضي ابوبكر الباقلاني الإجماع على نفي الإثم ولنقلهِ قال بعضهم: إنهُ قضاءٌ يسدُّ مسدَّ الأداء[2]

{وقيلَ:} وقتُ ادائهِ {الآخر} من الوقت لأنتفاءِ وجوبِ الفعلِ قبلَهُ[3] {فإن قدّمَ} عليه بأن فعلَهُ قبلَهُ في الوقتِ {فتعجيلٌ} اي فتقديمه تعجيلٌ للواجبِ مُسقطٌ له كتعجيل الزكاةِ قبلَ وجوبها[4]

---

كەئەڵێن: ئەگەر دوای خست ئەبێ نییەتی کردنی بێنێ، بۆ ئەوەی واجبێ کە کاتی فراوانە لەگەڵ مەندوب جیا بکاتەوە، لەوەدا کە ئەم هەر دروستە نەیکا.

(١)وەڵامیان دراوەتەوە، ئەگەر مەبەست تەنها جیاکردنەوەی واجبە لە مەندوب، ئەوە ئەو جیاوازیە بەشتێکی‌تر پەیدا بووە، کە ئەویش:١-دواخستنی واجب لە هەموو کاتی خۆی گوناهباری ئەکا، لە مەندوبدا گوناهبار نابێ. ٢-مکلف ئەبێ بزانێ دوا خستنی دروست لە نادروست جیابکاتەوە.

(٢)ووتراویشە کاتی ئەدای نوێژ یەکەم کاتەکەیەتی، چونکە بەهاتنی ئەو کاتە نوێژەکە واجب ئەبێ، ئەگەر لەکاتی یەکەمی دوای خست ئەوە ئیتر قەزایە، هەرچەند لەکاتی جەوازیشدا بکرێ هەر گوناهبار ئەبێ بە دوا خستنەکەی لە کاتی یەکەمیدا. وەك پێشەوا شافیعی لە هەندێ لە زانایانی وانەقڵی کردوە، هەرچەند باقلانی نەقڵی ئیجماع و رای تەواوی زانایانی کردوە کە گوناهبار نابێ، لەبەر ئەم نەقڵی باقلانیە هەندێ زانا ووتویانە: ئەو نوێژەی دوای کاتی یەکەم ئەکرێ قەزایە بەڵام قەزایەکی وا کە لە جێی ئەدا دابنیشێو جێی ئەوبگرێتەوە.

(٣)ووتراویشە کاتی ئەدای نوێژ بەشی کۆتایی کاتی دیاری‌کراویەتی، چونکە پێش بەشی کۆتایی کردنەکەی واجب نەبو. (٤) بەڵام ئەگەر پێشی خست بەسەر کاتی کۆتایی‌دا، واتە: هەر لەکاتەکەی خۆیدا کرا، بەڵام لەکاتی وجوبدا نەبوو، ئەوە ئەو پێشخستنە پەلە کردنە بۆ ئەنجام دانی واجب و لە کۆڵی ئەکەوێ، وەك پەلە کردن لەسەر فیطرەدانەدا، کاتەکەی لە مانگی شەوالدایە. کە لە مانگی رەمەزانیشدا دروستە بدرێ.

{و}قالت الحنفيّةُ وقتُ ادائه {ما} ايّ الجزء الذي {إتصلُ به الأداءُ من الوقتِ} اي لاقاهُ الفعلُ بأن وقع فيهِ {وإلاّ} ،إن لم يتصل الأداءُ بجزءٍ من الوقت بأن لم يقع الفعلُ في الوقتِ {فالآخرُ} اي فوقتُ ادائهِ الجزء الآخرُ من القتِ لتعيينهِ للفعلِ فيهِ حيثُ لم يقع فيما قبلَهُ[1]

{و}قال {الكرخيُّ: إن قدّم} الفعلُ على آخر الوقت بأن {وقع} قبلَهُ في الوقت وقع ماقدّم {واجباً بشرط بقائهِ} اي بقاء المقدم لهُ مكلّفاً الى آخر الوقتِ[2] فإن لم يبقَ كذلك كأن ماتَ او جُنَّ وقع ماقدّمَهُ نفلاً فشرط الوجوبِ عندَه أن يبقى من ادركَهُ الوقتُ بصفة التكليفِ الى آخر المتبيّنِ بهِ الوجوب وإن أخّرَ الفعل عنهُ ويُؤمر به الفعل قبلَهُ لأنَّ الاصل بقاؤهُ بصفةِ التكليف فحيثُ وجبَ فوقتُ ادائهِ عنده كما تقدّمَ عن الحنفيةِ لأنّهُ منهم وإن خالفهم فيما شرطهُ[3]

---

(١)زانایانی حەنەفی ووتویانە: دەقی ئەدا بریتیە لەو بەشو ئەندازەیەلەکاتی دیاریکراوی خۆیدا کە ئەداکەی پێوە لکاوە، واتە کارەکە بەکاتەکە گەیشتووە لەناویدا رویداوە، ئەگەر ئەداکە نەلکایە بەبەشێك لەکاتەکەیەوە، بەم مانایە کارەکە لەکاتەکەیدا نەکرا ئەوە کاتی ئەداکەی بەشە کۆتایی کاتی دیاریکراوەکەیەتی، چونکە ئەو بەشە کۆتایە دیاریکراوە بۆ ئەنجام دانی نوێژەکە تیایدا، چونکە پێش ئەم بەشە کۆتایە نەکراوە کاتە فراوانەکەی نەماوە، بو بەکاتێکی تەنگەلان بۆیە ئەمەیان دیاریکراوە.

(٢)کەرخی ووتویەتی ئەگەر واجبەکەی پێش خست و کردی پێش بەشی کۆتایی، واتە هەر لەکاتی خۆیدا کردی بەڵام لەسەرەتای کاتەکەوە کردی ، ئەوە ئەوەی کردویەتی پێشی خست حیسابی واجبی بۆ دەکرێ، بەڵام بەمەرجی مانەوەی ئەو شەخصە بە موکەلەفی هەتا کۆتایی کات.

(٣)بەڵام ئەگەر بە مکلفی نەمایەوە وەك ئەوەی بمرێ یاشێت بێ ئەوە لەو کاتەدا ئەوەی پێشی خستووە بە عەقڵ بۆی حیساب ئەکرێ، کەوابوو – جیاوازی ئەم لەگەڵ زانایانی مەزهەبەکەی خۆیدا– مەرجی واجب بونەکەی بەلای کەرخیەوە ئەوەیە: ئەوەی دەرکی کارەکەی کردوە بمێنێتەوە بەصیفەتی تەکلیفەوە، چونکە لە هەرجێ واجب بوو ، ئەوە کاتی ئەداکەی کاتی واجب بونیەتی ، ئەمیش وەك زاناکانی تری حەنەفی وایە، چونکە یەکێکە لەوان هەرچەند لێیان جیابووتەوە لەو مەرجەدا دیاریکرد، کە بریتیە لەمانەوەی بەموکەلەفی.

فذكرهُ المصنِّف دون الأولُ المعروف مما قدّمه[1] والأقوال غير الأول منكرةٌ للواجبِ الموسّع لإتفاقها على انّ وقت الأداء لايفضل عن الواجب[2] {ومن اخّر} الواجبَ المذكورَ بأنْ لم يشتَغلْ بهِ اول الوقتِ مثلاً {مع ظنِّ الموت} عقبَ مايسعهُ منهُ مثلاً {عصى} لظنّه فواتَ الواجبِ بالتأخيرِ[3] {فإن عاش وفعلهُ} في الوقتِ {فالجمهور} قالوا: فعلُهُ {اداءً} لأنّهُ في الوقتِ المقدّرِ لهُ شرعاً[4] {و}قال {القاضيان ابوبكر} الباقلاني من المتكلّمين {والحسين} من الفقهاء فعلهُ {قضاءً} لأنه بعدَ الوقتِ الذي تضيّقَ عليه بظنِّه وإن بان خطؤُهُ[5] {ومنْ اخرَّ} الواجبَ المذكور بأن لم يشتغل به اول الوقت {معَ ظنِّ السلامة} من الموتِ الى آخرِ الوقتِ ومات فيه قبلَ الفعلِ {فالصحيحُ} انّهُ {لايعصى} لأنّ التأخيرِ جائزٌ لهُ والفواتُ ليس بإختياره[6]

---

(١)دانەر تەنها مەرجی دووهەمی باس کرد – مەرجی یەکەمی باس نەکرد، کە مەرجی حەنەفیەکانە کەبریتیە لەو بەشەکاتەی ئەداکەی پێوە لکاوە– واتە لەکاتی کردنی قەولی کەرخی– چونکە لەپێشەوە باس کرا ئیتر ئەزانیٚ پێویست ناکا باس بکرێتەوە. (٢)قەولەکان هەمویان جگە لەیەکەمیان باوەڕیان بە واجبی (موسّع)نیە، لەبەر یەك رایی هەمویان لەسەر ئەوەیە کاتی ئەدا لە ئەندازەی ئەنجامدانی واجب زیاتر نیە. (٣)کەسیٚ ئەگەر واجبی کاتەکەی فراوانە دوایخست، بەم شێوە کەلەسەرەتای کاتەکەوە پێوەی خەریك نەبوو لەگەڵ ئەوەش گومانی مردنی هەبیٚ دوای ئەو کاتەی ویسعەتی واجبەکەی هەیە لەیەکەمی کاتەکەوە ئەوە گوناهبار ئەبیٚ، چونکە گومانی فەوتانی واجبەکەی هەیە بەهۆی دواخستنیەوە. (٤)بەلاّم ئەگەر گومانەکەی غەلّەت بوو نەمردو ژیا ، لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دان ئەوە جمهوری زانایان ووتویانە ئەو کردنە ئەدایە، چونکە لە کاتی دیاری کراوی شەرعدا کردویەتی.

(٥)ئەو دوو قازیە بەرێزە ووتویانە: –کە یەکێکیان باقلانیە لە زانایانی عیلمی کەلامەو ئەویشێن قازی حسێنە کە لەزانایانی فیقهە– ئەو کردنە ئەدا نییە، بەلّکو قەزایە چونکە دوای ئەو کاتە کردویەتی کە بە گومانی خۆی لەسەری تەنگەلان بووەتەوە، هەرچەندە گومانەکەش بە غەلّەت دەرچوو. (٦)کەسیٚ ئەگەر واجبە موسعەکەی دواخست یانی لەسەرەتای کاتەکەوە پێوەی خەریك نەبوو، لەگەڵ ئەوەش گومانی وابوو نامریٚ تاکۆتایی کاتی بۆ دیاری کراو ، بەلاّم نەخشەی خوا وابوو پێش ئەوەی نوێژ بکا مرد، ئەوە قەولی صەحیح ئەوەیە گوناهبار نابیٚ، چونکە دواخستنی نوێژەکەی دروست بووەو فەوتانەکەشی بەدەستی ئەو نەبووە.

وقيلَ يعصي وجوازُ التأخيرِ مشروطٌ بسلامةِ العاقبةِ[1] {بخلاف ما} اي الواجب الذي {وقتهُ العمرُ كالحجِّ} فإنّ من اخّرهُ بعدَ ما امكنهُ فعله مع ظنِّ السلامةِ من الموتِ الى مضيِّ وقتٍ يمكنهُ فعلُهُ فيهِ ومات قبلَ الفعلِ يعصي على الصحيحِ وإلاّ لم يتحقق الوجوب[2] وقيل لايعصي لجوازِ التأخيرِ لهُ وعصيانهُ في الحجِّ من آخر سنيِّ الإمكان لجوازِ التأخيرِ اليها[3] وقيلَ: من أولها لإستقراءِ الوجوبِ حينئذٍ[4] وقيلَ غير مستندٍ الى سنةٍ بعينها[5]

{مسئلةٌ:} الفعل {المقدور} للمكلّفِ {الذي لايتمّ} اي يوجدُ {الواجبُ المطلَقُ إلاّ به واجبٌ} بوجوب الواجبُ سبباً كان او شرطاً {وفاقاً للأكثرِ} من العلماء[6]

---

(١)وتراویشە گوناهبار ئەبێ، وەنوێـژ دواخسـتن کـاتێ دروسـتە عیلمـی هـەبێ لـە کۆتایی کاتا سەلامەتە. (٢)ئەوەی ووتمان جیاوازە لەگەڵ ئەو واجبەی کە کاتی دیاری کراوی هـەموو تەمەنـە، وەك: حـەج، چونکـە هـەر کەسـێ دوای بخـات ئەسـی توانـی جیٚبەجێی بکات، لەگـەڵ ئەوەش گومـانی سـەلامەتی هەیـە لـە مـردن، ئـەوەندە کـات تێپەڕی کرد کە گونجاو بێ ئەو حەجەی تێدا بکات ، بـەڵام پێش کردنـی بمـرێ ئەوە لەسەر قەولی ئەصەح گوناهبار دەبێ ، ئەگەر گوناهبـار نەبێ ئەوە ئیتر وجـوب نـابێ ، دەخۆ وجوب هەیە کەوابوو گوناهبار ئەبێ.

(٣)ووتراویشە گوناهبارنابێ چونکە دروستە دوای بخا. ئایا لەسەر قەولی یەکەم کە وتـی : گوناهبــار دەبــێ گوناهەکــە لــە کوێــوە دەســت پێئـەکا؟ ئـەمیش دەڵــێ : گوناهەکەی لە بارەی دواخستنی حەجەوە ، لە کۆتـایی ساڵەکانی توانایەوە دەست پێدەکا، چونکە تـاکو کۆتـایی ئـەو سـاڵانە دروسـتە دوای بخـا کـەوابوو لەوێشـەوە گوناهەکەی لەسەر حیساب ئەکرێ.

(٤)ووتراویشـە: گوناهەکـەی هـەر لەســەرەتای سـاڵانی توانایـەوە دەسـت پێئـەکا، چونکە واجبەکەشی هـەر لـەو کاتـەوە لەسەر سابت بووە. (٥)ووتراویشـە: گوناهبـارە بەڵام نادرێتە پاڵ ساڵێکی دیاریکراو. (٦)ئیشێك کە لەتوانای موکەلـەفدابێ و خۆی واجب نەبێ و واجبی مطلق بێ ئەو لە خارجدا دەست نەکەوێ، ئا ئەویشـە واجبـە – واجبـی مطلق ئەوەیە وجوبەکەی متوقف نـەبێ لەسـەر شـتێ، واجبـی مقیـد ئەوەیـە متوقف بێ لەسەر شتێ،وەك زەکات واجبی موقەیەدە ئەگەر لەپاڵ نصابدا دابنرێ، تا نصاب نەبێ زەکات نابێ، بەڵام بەگوێرەی سوڕانی ساڵ و ئامادەیی مستحقان واجب مطلقە، چونکە وجوبەکـەی لەسـەر ئـەمر تـەوەقفی بەسـتوە نـەك وجوبەکـەی– بـەهۆی واجب بوونی واجبی مطلقەوە– بەزەوال نوێژ واجب دەبێ بە واجب بــوونــی نـوێــژ

إذ لو لمْ يجبْ لجاز تركُ الواجبِ المتوقف عليه[1] وقيل: لايجبُ بوجوب الواجبِ مطلَقاً لأنّ الدالَ على الواجبِ ساكتٌ عنه[2]

{وثالثُها} اي اقوال يجِبُ {أن كان سبباً كالنّارِ للإحراقِ} اي كإمساسِ النّارِ لمحلّ فإنّهُ سببٌ لإحراقه عادةً بخلافِ الشرطِ كالوضوءِ للصلاةِ فلايجبُ بوجوبِ مشروطه. والفرقُ أنّ السبب لإستنادِ المسببِ اليه أشدّ إرتباطاً به من الشرطِ بالمشروط.[3]

{وقالَ إمام الحرمين:} يجبُ {إن كان شرطاً شرعياً} كالوضوءِ للصلاةِ{لا عقلياً} كترك ضدِّ الواجبِ[4] {او عاديّاً} كغسل جزءٍ من الرأسِ لغسلِ الوجه فلا يجبُ بوجوبِ مشروطه إذْ لاوجودَ لمشروطه عقلاً أو عادةً بدونه فلايقصدُهُ الشارعُ بالطلَبِ بخلافِ الشرعيِّ فإنّهُ لولا إعتبار الشرعِ لهُ لوجدَ مشروطُهُ بدونه.[5]

---

دەست نوێژ و داپۆشینی عەورەت واجب دەبیّ–ئەو ئیشەی کەواجب ئەبیّ کەیفی خۆیەتی هۆیە یاخود مەرجە، ئەم بۆچونەش موافیقی زۆربەی زانایانە. (١)چونکە ئەگەر ئەو ئیشە واجب نەبێ ئەو کاتە دروستە نەکردنی وا.جبێك کە بەو نەبێ ناکریّ. (٢) ووتراویشە ئەو ئیشە واجب نابێ بەهۆی وجوبی واجبە مطلقەکەوە کەیفی خۆیەتی هۆبێت یامەرج چونکە ئەوەی دەلاّلەت لەسەر واجبی مطلق بکا لێی بیّدەنگە.

(٣)سێ هەمی ئەو قەولانە دەڵێ: ئەو ئیشە ئەگەر سەبەبێ بێ بۆ واجبەکە ئەوە ئەویش واجب ئەبێ، وەك چزاندنی ئاگر بەشوێنێکەوە، دە ئەوە عادەتەن هۆیە بۆ سوتاندنی، بەلاّم شەرط و مەرج وانیە وەك دەست نوێژ بۆ نوێژ، دە ئەو دەست نوێژە واجب نابێ بەهۆی واجب بوونی نوێژەکەوە، فەرق و جیاوازی چیە لونێوان سەبەب و شەرط دا ؟ لەبەر ئەوەی (مسبَّبْ) هەموو کات ئەدرێتە پاڵ سەبەب پەیوەندیەکەیان زۆر توندو تۆڵترە، تا ئەو پەیوەندییەی کە لەنێوان شەرط و مشروط دا هەیە.

(٤)ئیمام الحرمين ووتویەتی: ئەو ئیشەی لە توانای موکەلەفدایە ئەگەر شەرعی بێ، ئەوە واجب ئەبێ وەك دەست نوێژ بۆ نوێژ، بەلاّم ئەگەر مەرجێکی عەقڵی بێ واجب نابێ، وەك نەکردنی دژی واجب وەك دانیشتن لە نوێژدا کە دژی بەپێوە وەستانە بۆ کەسێکی بەتوانا.

(٥)بەلاّم ئەگە رمەرجەکە عادی بوو –وەك شۆردنی بەشێك لەسەر بۆ شۆردنی دەم و چاو– ئەوە بەهۆی واجب بوونە مەشروطەکەیەوە، واجب نابێ چونکە عەقڵەن و عادەتەن مەشروطەکە نایەتەدی بێ مەرجەکەی، لەبەر ئەوە شارع نایەوێ داوای

**وسكت الإمام عن السّببِ وهو لأستناد المسببِ اليهِ في الوجودِ كالذي نفاهُ فلا يقصدُهُ الشارعُ بالطلبِ فلا يجبُ كما افصحَ بهِ إبن الحاجب في مختصرهِ الكبير مختاراً لقولِ الإمام.[1]**

**وقول المصنّف في دفعهِ السّببَ اولى بالوجوبِ من الشرطِ الشرعيِّ ممنوعٌ يؤيّدُ المنعَ. إنّ السببَ ينقسمُ كالشرطِ الى شرعيٍّ كصيغةِ الإعتاقِ لهُ، وعقليٍّ كالنظر للعلم عند الإمام الرازي وغيرِه، وعاديٍّ كحزِّ الرقبةِ للقتلِ[2] نعم قال بعضُهم القصدُ بطلبِ المسبَّبات الأسبابَ لأنَّها التي في وسعِ المكلّف[3]**

---

جیٚبەجیٚ کردنی بکا، چونکە خۆی مسوٚگەرە، بەلاٚم مەرجی شەرعی وانیە، لەبەر ئەوەئەگەر شەرع ئیعتبارو نرخ و داوای نەکا ئەو کاتە مەشروطەکە بەبیٚ مەرجەکەی دەهاتەدی.

(١)ئیمام بیٚدەنگ بوو لەبارەی سەبەبەوە باسی نەکرد، سەبەبیشی لەبەر ئەوەی هەموکات مسبب ئەدریٚتە پاڵی لە بوندا وەك مەرجی عەقلّی و عادی وایە کە ئیمام نەفیکردن ، کەوابوو ئەویش شارع نایەویٚ داوای بکا، لەبەر ئەوە سەبەب واجب نابیٚ، وەك بەڕونی ابن الحاجب لە کتیٚبی ( المختصر الكبير ) دا رای ئیمامیهەڵبژاردوە.

(٢)دانەر لە وەلاٚمی إبن الحاجب دا ووتویەتی: سەبەب باشتر واجب ئەبیٚ تا شەرطی شەرعی، ئەم قسەیە قەدەغەیە بووتریٚ. ئەوەی قەدەغەکە بەهیٚز بکا، ئەوەیە وەك شەرط سیٚبەشە: شەرعی و عەقلّی و عادی، سەبەبیش هەر عەینی ئەو ئیتر بوٚ سەبەب باشتر واجب ئەبیٚ هەتا شەرط ، نەخیٚر هەروەك یەك وان، مفضل و مفضل عليه نیە، سەبەبی شەرعی وەك وشەی ئازاد کردن، ئەمجا ئازاد ئەبیٚ، عەقلّی وەك بیرکردنەوە هوٚیەکی عەقلّیە بوٚ پەیدابوونی عیلم بە نتیجە، بەڕای ئیمام غەیری ئیمامیش عادی وەك سەر لەلاشە کەندنەوە هوٚیە بوٚ کوشتن عادەتەن.

(٣)بەلّیٚ هەندیٚ زانا ووتویانە مەبەست بەداواکردنی مسببات ئەسبابە هەموو کات چونکە جیٚبەجیٚ کردنی ئەسباب کە توانای موکەلەف دایە نەك مسببات، ئەمەش پشتگیری وەلاٚمەکەی دانەرە بوٚ إبن الحاجب.

واحترزوا بالمطلقِ عن المقيّدِ وجوبُهُ بما يتوقّفُ عليهِ كالزكاةِ وجوبها متوقفٌ على ملك النصابِ فلا يجبُ تحصيلُهُ[1] وبالمقدورِ عن غيرهِ، قال الآمدي كحضورِ العددِ في الجمعةِ فإنَّهُ غير مقدورٍ لآحادِ المكلّفين اي ويتوقّفُ عليهِ وجود الجمعةِ كما يتوقّف وجوبها على وجود العدد[2] {فلو تعذّر تركُ المحرَّم إلاّ بتركِ غيرهِ} من الجائزِ كماءٍ قليلٍ وقع فيهِ بولٌ {وجبَ} تركُ ذلكَ الغيرِ لتوقّفِ تركِ المحرَّم الذي هو واجبٌ عليه[3] {او إختلطتْ} اي اشتبهتْ {منكوحةٌ} لرجلٍ {باجنبيّةٍ} منهُ {حرمتا} اي حرم قربانهما عليه[4] {او طلقَ معيّنةً} من زوجتيهِ {ثمَّ نسيَها} حرُمَ عليهِ قربانُهما ايضاً ، امّا الأجنبيّةُ والمطلّقةُ فظاهرٌ، وامّا المنكوحةُ وغير المطلّقةِ فلأشتباههما بالأجنبيّة و المطلّقةِ و قد يظهرُ الحال فيرجعان الى ما كانتا عليه من الحلّ[5] فلم يتعذّر في ذلك ترك لمحرّمِ وحدهُ فلم يتناوله ماذكرَ قبلَهُ[6]

---

(١)كاتێ زانایان وتیان: واجبی مطلق ئەوە واجبی مقید دەرئەچێ، کە وجوبەکەی بەشتێ ئەبێ ئەو وجوبەی متوقفە لەسەری وەك زەکات وجوبەکەی متوقفە لەسەر هەبونی نیصاب، دەئەوە واجب نیە بڕوا ئەو نصابە پەیدا بکا. (٢)کاتیکیش ئەڵێن کارێك لەتوانادابێ، ئەوەی لە توانادا نەبێ ئەچێتەدەر. ئامدی دەڵێ : وەك ئامادەبونی چل کەس بۆ بەرپاکردنی نوێژی هەینی ، دەخۆ ئەمەش لەتوانای تاك تاکی مکلفەکاندا نیە، واتە بونی جومعە متوقفە لەسەر بونی ئەو ژمارەیە ، وەك وجوبەکەی متوقفە لەسەر بونی ژمارەکە. (٣)کە وابوو ئەگەر نەئەکرا تەرکی حەرامێك بکرێ بەتەرکی حەلاڵێك نەبێ- وەك ئاوێکی کەم میزی تێکرابێ- ئەوە ئەم حەلاڵە واجبە تەرك بکرێ چونکە تەرك کردنی حەرامێك کە واجبە ئەوەستێو تەرك ناکرێ هەتا ئەو حەلاڵە تەرك نەکرێ. (٤)یاخود مارەبڕاوی پیاوێك لەگەڵ بێگانەیەك بەو پیاوە تێکەڵ بوون و جیا نەئەکرانەوە دەی ئەوە حەرامە لە هەردوکیان نزیك بێتەوە.

(٥)یاخود نازانێ روناکی ژنی طەلاق ئەدا کە یەکێکە لە دوو ژنەکەی یاسێ ژنەکەی . پاشان لەبیری ئەچێتەوە کامیانە ئەوە هەر دووکیانی هەم لەسەر حەرام ئەبێ بەڵام بۆ وایە؟ ئەوە بێگانەکەو طەلاق دراوەکە دیارە بۆ حەرامن ، بەڵام مارە براوەکەو طەلاق نەدراوەکە لەبەر ئەوە ئێستە ئیشتیباهو تێکەڵ بوون لەگەڵ بێگانەکەو طەلاق دراوەکەدا، بێگومان حاڵی هەمویان دەرئەکەوێ ئەوکاتە هەمویان دەگەڕێنەوە بۆ حوکمی پێشویان کە حەلاڵیە، ئەمە حەرامی موەقەتە، ئەوەی میز و ئاوەکە هەموکات حەرامە. (٦)کەوابو کاتێك کە دەرکەوت کامیان حەلاڵەو کامیان حەرامە ، ئیتر معذور نابێ لەتەرك کردنی تەنها حەرامەکە، لەبەر ئەوەیە (فلو تعذّر)ەکەی پێشوی نەگرتەوەو

وتركُ جوابِ مسئلة الطلاقِ للعلم بهِ من جوابِ ماقبلها[١] ولو اخّرهُ عنهما لإحتاجَ الى ذكرِ ما زدتهُ بعدَ قولهِ معيّنةٍ، كما لايخفى فيفوّتُ الإختصارُ المقصود له[٢]

{مسئلةٌ: مطلق الأمر} بما بعض جزئياته مكروهٌ كراهةَ تحريمٍ او تنزيهٍ بان كان منهياً عنهُ {لايتناولُ المكروه} منها[٣] {خلافاً للحنفيّةِ}[٤] لنا لو تناوله لكان الشيئ الواحدُ مَطلوبَ الفعلِ والتركِ من جهةٍ واحدة وذلك تناقض[٥] {فلا تصحُ الصّلاةُ في الأوقاتِ المكروهةِ} اي التي كرهت فيها الصّلاةُ من النافلةِ المطلقةِ كعند طلوعِ الشمسِ حتّى ترتفع كرمحٍ واستواءها حتّى تزول، واصفرارها حتّى تغرب، إن كانت كراهتُها فيها كراهةَ تحريمٍ وهو الأصحُ عملاً بالأصلِ في النهي عنها في حديثِ مسلم[٦]

---

باسیکرد. (١)لەپێشەوە وتی: ئەگەر مارە بڕاوەکەی لەگەڵ بێگانەیێکا لێ تێك چوو. ئەوە حوکمەکەی : هەر دووکیانی لەسەر حەرام ئەبێ ، بەڵام لەباسی طەڵاقەکەدا حوکمەکەی نە ووت بۆ؟ چونکە بەوەڵامەکەی پێشوو ئەمیش ئەزانرێ ، لەبەر ئەوە دووبارەی نەکردەوە. (٢)ئەی بۆ (حرمنا)ی نەخستە دواوە، ئیتر پێویستی بەو پرسیارو وەڵامە نەئەکرد؟ ئاخر ئەگەر دوای بخستایە ئەوەی من زیادم کردوە لەدوای (معینة)ەوە، کە (من زوجتیە مثلاً)یە، پێویستە ئەویش زیاد بکا دەخۆ ئەو کاتە مەبەستی دانەر ئەفەوتا ، کە گەیاندنی مەبەستە بەکورتی ئەم وەڵامەش شاراوە نیە لەکەس ، هەموو کەس ئەزانێ ئەگەر وای بکردایە ئەبوایە وایشی بکردایە.

(٣)مطلقی ئەمر فەرمان بە شتێك ماهیەتێك ، کە هەندێ لە جوزئیاتی ئەو ماهیەتە مەکروهە ، ئیتر کەیفی خۆیەتی کەراهەتی تەحریمی بێ یاخود تەنزیهی بێ، مەکروهی بەو مانایە قەدەغە لێکراوبێ، جا ئەو ئەمر بە ماهیەتە مەکروە ناگرێتەوە، هەر چەند هەندێکیشە لە جوزئیاتی ماهیەتەکە. (٤) ئەمە جیاوازە بۆ زانایانی حەنەفی ئەوان رایان وایە: ئەمر مەکروهیش ئەگرێتەوە. (٥)بەڵگەی ئێمە ئەمەیە ئەگەر ئەمر مەکروە بگرێتەوە، ئەوە ئەو کاتە یەك شت تەنها لە یەك روەوەو لەیەك کاتدا داواکردنیش و داوانەکردنیشی ئەکرێ ، دە خۆ ئەمانەش بێگومان دژ بەیەکن ، کەوابوو ئەمر مەکروە ناگرێتەوە – بەڵام ئەگەر دووڕو یا دوولایەنی هەبێ، واتە ئەمرەکە بۆ رویەك بێ و کەراهەتەکە بۆ رویەکی‌تر– ئەوە جیایە. (٦)کەوابوو نوێژدروست نیە لەو کاتانەدا نوێژکردنی تیا کەراهەتە، واتە ئەو نوێژە سوننەتەی کە هۆی نیە، وەك لەکاتی هەڵهاتنی رۆژ هەتا بەئەندازەی رمێك بەرز دەبێتەوە، وەکاتی گەیشتنی رۆژ بە ناوەڕاستی ئاسمان هەتا لائەدا، وکاتێ رۆژ زەرد ئەبێ هەتا ئاوا ئەبێ، کاتێ نوێژەکە صەحیح نیە کەراهەتەکە لەو کاتانەدا بەمانای کەراهەتی تەحریمی بێ، کە ئەمەش

{وإن كان كراهةَ تنزيه} وصحّحهُ النوويّ ايضاً في بعضِ كُتبهِ فلا تصحُّ ايضاً {على الصحيح}[1] إذ لو صحّتْ على واحدٍ من الكراهتينِ اي وافقتِ الشرعَ بأن تناولها الأمرُ بالافلةِ المطلقةِ المُستفادِ من احاديثِ الترغيبِ فيها لزم التناقُضُ فتكونُ على كراهةِ التنزيهِ مع جوازها فاسدةً اي غيرَ معتدٍّ بها لايتناولُها الأمرُ فلايُثابُ عليها[2]

وقيل: إنّها على كراهةِ التنزيهِ صحيحةٌ يتناولُها الأمرُ فيُثابُ عليها، والنهيُ عنها راجعٌ الى امرٍ خارجٍ عنها كموافقةِ عبادِ الشمسِ في سجودهم عندَ طلوعِها وغروبِها دلَّ على ذلك حديثُ مسلم و سيأتي انّ النهي لخارجٍ لايفيدُ الفسادَ[3] وبرجوعِ النهي فيها الى خارجٍ إنفصل الحنفيّةُ ايضاً في قولهم فيها بالصّحةِ، مع كراهةِ التحريم كالصلاةِ في المغصوب[4]

---

قەولی (اصح)ە، چونکە ئەو کارکردنە بەر قاعیدەیە ئەکەوێ دەڵێ : أصل وایە نەهی بۆ تەحریم بێ، لێرەش کەنەهی کراوە لە نوێژ لە کاتی مەکروهدا بۆ تەحریمە ، وەك لە فەرمودەیەکدا هاتوە موسلیم ریوایەتی کردووە. (١)ئەگەر کەراهەتی تەنزیهیش بێ نەوەوی ئەمیشی سەلماندوە لە هەندێ نوسراویدا دووبارە هەر دروست نیە، لەسەر رای قەولی صەحیح. (٢)چونکە ئەگەر ئەو نوێژە صەحیح بێ و یەکێك لەو کەراهەتیشە هەبێ -صەحیح بێ یانی موافقی شەرع بێ، بەم شێوەیە ئەمر بەنافیلەی مطلق بیگرێتەوە ئەمر بەو نافیلەیە وەرگیراوە لەچەندەها فەرمودە کە هانی موسوڵمان ئەدەن بۆ کردنی - ئەو کاتە لازم ئەکا دو دژ بەگژ یەکدا بچن، لایە ئەمر بەکردنی کراوەو صەحیحە ، لە عەینی کاتیشا مەکروهە کەوابوو نوێژ لەکاتی مەکروهدا - کەراهەتیتەنزیە- لەگەڵ ئەوەش دروستە بەڵام فاسیدە، واتە ئیعتیباری پێ ناکرێ و ئەمرەکە نایگرێتەوە کەوابوو پاداشتی لەسەر وەرناگرێ.

(٣)ووتراویشە نوێژ لەکاتی مەکروهدا ئەگەر کەراهەتی تەنزیهی بێ ئەو نوێژە دروستە، ئەمرەکە ئەیگرێتەوە لەبەر ئەمە پاداشتی لەسەر ئەدرێتەوە ، ئەی خۆ نەهی لێکراوە چۆن صەحیحە؟ ئاخر نەهیەکە رو دەکاتە شتێکی دەرەکی نوێژەکە، نەك خودی نوێژەکە وەك هاوکات بوونی رۆژپەرستان لە کڕنوش بردنیان لەکاتی هەڵهاتنی رۆژ و ئاوا بوندا ، فەرمودەیێك موسلم ریوایەتی دەکا ئەوە دەگەیەنێ ، کە لە مەودوایش دێ نەهی کردن لەشتێ لەبەر کارێکی دەرەکی ئەوە فەسادو نادروستی ناگەیەنێ. (٤)بەهۆی گەڕاندنەوەی نەهیەکە بۆ شتێکی دەرەکی، وە موافقەبێ، لەکاتی مەکروهدا ئەوە حەنەفیەکانیش رزگاریان ئەبێ وەك قیلەکە، لەوەدا ئەڵێن: نوێژ لەکاتی مەکروهدا صەحیحە، هەرچەند کەراهەتی تەحریمیش لەگەڵدایە، قیلەکە

**امّا الصلاةُ في الأمكنةِ المكروهةِ فصحيحةٌ والنهي عنها لخارجٍ جزماً[1] كالتعرض بها في الحمام لوسوسةِ الشياطينِ، وفي أعطانِ الإبلِ لنَفارِها وفي قارعةِ الطريقِ لمرورِ النّاسِ وكلّ من هذهِ الأمور يشغلُ القلبَ في الصّلاةِ و يشوِّشُ الخشوعَ فالنّهي في الأمكنة ليسَ لنفسِها بخلافِ الأزمنةِ على الأصحِّ، فافترقتا.[2] واحترز بمطلقِ الأمرِ عنِ المقيّد بغير المكروه فلايتناولهُ قطعاً[3] {أما الواحدُ بالشّخصِ لهُ جهتانِ} لا لزوم بينهما {كالصلاةِ في} المكانِ {المغصوب} فإنّها صلاةٌ وغصبٌ اي شغلُ ملك الغيرِ عدواناً و كلٌ منهما يوجدُ بدونِ الآخَرِ.[4]**

---

ئاسانتری وت کە ئەڵێ: کەراهەتی تەنزیــهە. حەنەفیەکان ئەڵێن: ئەمە وەك نوێژکردن وایە لـە زەوی داگـیرکراودا ، واتـە قیاسـی زەمـانی مـەکروهیان کردوەتـە سـەر نوێـژ لەمەکانی مەکروهدا. (١)بەڵام نوێژکردن لـەجێو شوێنی مەکروهدا ئەوە صـەحیح و دروستە، نەهی‌یەکەش روو لەشتێکی دەرەکی ئەکا بێگومان ، واتە لەزەمانیەکەدا شتە دەرەکیەکە ئیحتیمـالی هـەبوو، بـەڵام لـێرەدا بێگومانـە چونکـە نوێـژ بـێ ئـەم مەکانـە ئەکرێ، بەڵام نوێژ بێ زەمان ناکرێ.

(٢)وەك کەوتنەبەری وەسوەسەی شـەیتانەکان بەهۆی نوێژکردن لەحەمام داو یاخود وەك خۆ خستنەبەر ئەوەی خەڵك پـێی پیابنێ‌ئەگەر لـەناو جەرگەی رێدا نوێـژ بکـا. دەخۆ هەریەکێ لەمانە دڵـی بێ‌ئاگـا ئـەکا لـە نوێژەکـەو تەشـویش لەسـەر خشـوعی نوێژەکە دروست دەکا، کـەوابوو قەدەغـەکردنی نوێـژ لـەو شـوێنانەدا لەبـەر خـودی خۆیـان نیەبە پێچەوانەی کاتەکانەوە ئەمان لەبەر خـودی کاتەکانـە، بـەرای ئەصـەح کەوابوو بەمە لەیەك جیابوونەوە ، لەبەر ئەوە قیاسی حەنەفیەکان بەتاڵ بویەوە کە زەمانیان وەك مەکان لێکرد.

(٣)دانەر بەوەی کە(مطلق الأمر)ی ووت خـۆی لـەوە پاراسـت کـە ئـەمر بەماهیـەتی بێ‌مقیـدو بەسـراوبێ بەغـەیر مەکروهـەوە ، وەك بفـەرموێ نوێژبکـەن لـەکاتێکدا کـە مەکروە نەبێ دەی ئـەوە بێگومـان نایگرێتـەوە. (٤)بـەڵام ئەمروفـەرمان بەیـەك شـتی مـەعلوم و دیـار، کە دووڕوی هـەبێ، بـەڵام ئـەو دووڕوە بـێ یـەکیان نـە ئـەکرێ- وەك ئەوەی پێشو نەبن بەبێ یەك نەئەبوون- دروستە لەیەك جیابکرێنـەوە وەك نوێژکـردن لەجێیەکی داگیرکراو ، ئێستە لێرەدا دووڕوەکە: ١-نوێژەکەیە فەرمان بەکردنی کراوە. ٢-شوێنە داگیرکراوەکەیە قەدەغەی لێکراوە. واتـە لەرویەکـەوە داواکراوە لەرویەکـەوە قەدەغـەکراوە. داگیرکراو- واتـە بەدەسـت درێـژی مـاڵی یـەکێکی‌تر بـەکاربێنی-دەخـۆ هەریەك لەو دووڕوە بێ‌ئەوی‌تر ئەکرێو ئەبێ.

{فالجمهور} من العلماءِ قالوا: {تصحّ} تلك الصّلاةُ التي هي واحدٌ بالشخصِ..الخ فرضاً كانت او نفلاً نظراً لجهةِ الصّلاةِ المأمور بها {ولا يُثابُ} فاعلها عقوبةً لهُ عليها من جهةِ الغصبِ.[1] {وقيلَ: يثابُ} من جهةِ الصّلاةِ ، وإن عُقِبَ من جهةِ الغصبِ فقد يُعاقب حرمان الثّوابِ او بحرمان بعضه، وهذا هو التحقيق، والأول تقريبٌ رادعٌ عن إيقاعِ الصّلاةِ في المغصوبِ . فلا خلاف في المعنى[2]

{و}قال {القاضي} ابوبكر الباقلاني {والإمام} الرازي: {لاتصحّ} الصلاةُ مطلقاً نظراً لجهةِ الغصبِ المنهيِّ عنه[3] {ويسقطُ الطّلبُ} للصلاةِ {عندها} لأنّ السلفَ لم يأمروا بقضائها مع علمهم بها[4]

---

(١)ئەوە زانایان ووتویانە: صەحیح و دروستە ئەو نوێژەی کە فەردێکی دیار و مەعلومە و دوورو لایەنی هەیە بێیەکتریش ئەکرێن -ئیتر ئەو نوێژە فەرزبێ یاسوننەت- بۆیە دروستە چونکە سەیری ئەو لایەنەی ئەکا ، کە نوێژەو فەرمان بەکردنی کراوە، بەڵام کەسەیری لایەنی داگیرکردنەکەی بکرێ وەك تۆڵەیێك بۆی لەسەر ئەو نوێژە لەجێی داگیرکراودا کردویەتی پاداشی نادرێتەوە.

(٢)ووتراویشە: پاداش ئەدرێتەوە لەرووی ئەنجام دانی نوێژەکەوە ، هەرچەند سزاشی بدرێ لەرووی دەست بە سەراگرتنەکەوە، چونکە جاری واهەیە تۆڵەکەی تەنها نەبوونی پاداش نیە. بەڵکو ئاگرە یاخود جاری واهەیە تۆڵەکەی بریتیە لەوەی هەندێ پاداش وەردەگرێ نەك هی هەمووی ، ئەم قسەی ئێمە راستەو سەلمێنراوە ، قسەی جمهوریش نزیکە لەراستیەوە، بەڵام بەر بە موسوڵمان ئەگرێ نوێژ لە جێی داگیرکراو بکا، کەوابوو لەناوەرۆکدا جیاوازیان نیە، چونکە یەکەم: پاداشی نیە لەبەر گوناهەکەیە، دووەم: دەڵێ: هەیەتی لەبەر ئەدای نوێژەکەیە.

(٣)باقلانیو رازی هەموو فەرموویانە: ئەو نوێژە ئەونوێژە فەرزبێ یا سوننەت دروست نیە ، چونکە تەنها سەیری لایەنی غەصبەکە ئەکرێ کە شەرعەن قەدەغەی لێکراوە، (٤)بەڵام ئیتر داوای کردنی نوێژەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ کاتێ لەو جێگە حەرامەدا کردویەتی چونکە زۆربەی زانایانی پێشوو فەرمانیان نەکردوە بەگێڕانەوەی لەگەڵ ئەوەش زانیویانە ئەو نوێژانە لەجێی داگیرکراودا کراون .

{و}قال الإمام {احمد: لا صحةَ} لها {ولاسقوطَ} للطّلب عندها[١] وقال إمام الحرمين وقدْ كان في السّلفِ متعمقون في التّقوى يأمرون بقضائها[٢]

{والخارجُ من} المكانِ {المغصوبِ تائباً} اي نادِماً على الدُّخولِ فيهِ عازِماً على لن لايعودَ اليهِ {آتٍ بواجبٍ} لتحقُّقِ التّوبةِ الواجبةِ بما اتى به من الخروجِ على الوجه المذكورِ[٣] {وقال ابو هاشم} المعتزِلةُ: هوَ آتٍ {بحرامٍ} لأنّ ما اتى بهِ من الخروجِ شغلٌ بغيرِ إذنٍ كالمكثِ والتوبةُ إنما تتحقّقُ عند إنتهائه إذ لاإقلاعَ إلاّحينئذٍ[٤]

{وقال إمام الحرمين:} متوسطاً بين القولين:{هو مرتبكٌ} اي مشتبكٌ {في المعصيةِ مع إنقطاعِ تكليفِ النّهي} عنهُ من طلَبِ الكفِّ عن الشغلِ بخروجه تائباً المأمور به فلا يخلصُ بهِ منها لبقاءِ ما تسبّبَ فيهِ بدخولهِ من الضررِ الذي هو حكمةُ النهي[٥]

---

(١)پێشەوا ئەحمەد فەرمویەتی: نە ئەو نوێژە دروستە وە نەبەکردنیشی داوای لێکردنی لەکۆڵ ئەکەوێ، هەر ئەبێ کاربەدەستان داوای کردنەوەی لێبکەن

(٢)( إمام الحرمين)ووتویەتی لەناو سەلەفدا هەبوون زۆر لە خۆپارێزیدا رۆچو بوون و یەدەکیان ئەکرد ئەوانە فەرمانیان ئەدا بەگێڕانەوەی ئەو نوێژانە.

(٣)کەسێ تەوبە بکاو پەشیمان بێ لە چونەناو جێیەکی داگیرکراو، ئێستە ئەیەوێ لێی دەرچێ و نەگەڕێتەوە ناوی ، ئایا ئەو ماوەی خەریکی دەرچونەو هەنگاو بەسەر ئەرزی داگیرکراودا ئەنێ . حەرامە یاخود واجبی بەجێ هێناوە؟ بەلای ئێمەوە واجبی بەجێ هێناوە ، چونکە تەوبەێیك کە واجبە بکرێ‌بەوە دێتەدی کەلەو جێ دەرچێ بەلام بەو شێوەی باسکرا- واتە پەشیمان بێ و مەبەستی وابێ بۆی نەگەڕێتەوە-

(٤)ابو هاشم کە یەکێکە لە موعتەزیلە دەڵێ : ئەو کەسەی کە دەرچوو حەرامی ئەنجام داوە چونکە ئەو دەرچونەی کەکردویەتی بەکارهێنانی ماڵی خەڵکە بێ مۆڵەتی خاوەنەکەی وەك مانەوەکەی تیایدا حەرام بووە بۆی هاتوچۆکەشی حەرامە ، تەوبەش کاتێ بەتەواوی جێبەجێ‌ئەکرێ کۆتایی بەدەرچونەکەی بێنێ، چونکە إقلاع و وازهێنانی تەواو مەرجی تەوبەیە، دەی نایێتە دی ئەو کاتە نەبێ لەجێگە داگیرکراوەکە دەرچێ.

(٥)(إمام الحرمين)راێیکی مام ناوەندی ووتوە: ئەوەی ئەیەوێ دەرچێ هێشتا لەناو گوناهدایە و دەستی لێ نەبوەتەوە، لەگەڵ ئەوەش لەوەبووەتەوە داوای وازهێنانی لێبکرێ لە داگیرکردنی ئەو جێیەو قەدەغە بکرێ، چونکە خەریکە بەدەرچونێکەوە فەرمانی پێکراوە بیکا، لەبەر ئەوە گەڕانەوەو تەوبەکەی بێتەدی، کەوابوو رزگاری نابێ لەو گوناهە بەخەریك بوونی بە دەرچوونەوە ، لەبەر مانەوەی ئەو شتەی بەهۆی

فاعتبروا في الخروجِ جهةَ معصيةٍ وجهةَ طاعة وإن لزمت الأولى الثانية[1] والجمهورُ الغوا جهةَ المعصيةِ من الضررِ لدفعهِ ضررَ المُكثِ الأشدّ كما ألغى ضرر زوال العقلِ في إساغة اللُقمةِ المغصوصِ بها بخمرٍ حيثُ لم يُوجدْ غير لدفعهِ ضررُ تلفِ النَفسِ الأشدّ[2]

{وهو} أي قولُ إمام الحرمين {دقيقٌ} كما تبيّنَ، وإن قالهُ إبن حاجب إنَّهُ بعيدٌ حيثُ استصحبَ المعصيةَ مع إنتفاءِ تعلّقِ النهي[3] ويدفعُ استبعادهُ قولِ الفقهاءِ إنّ من جنَّ بعدَ إرتدادهِ ثمَّ افاقَ واسلمَ يجبُ عليهِ قضاءُ صلواتِ زمنِ الجنونِ استصحاباً لحكم معصيةِ الردّة[4]

---

چوونە ناوو داگیرکردنی ئەوەوە دروست بووە، کە ئەویش زەرەرو زیانەیە هۆکاری دەیە شەرع دەست بەسەرا گرتنی قەدەغە کردووە. (١)بەکورتی (إمام الحرمين) لە دەرچونی کابرای تەوبەکاردا هەردوو لایەنی گوناهو گوێڕایەڵی خوێندووتەوە هەرچەندە یەکەمیان لازمی دوەمەکەیانە، واتە گوێڕایەڵییەکە بێ ئەو گوناهە، خەریك بوونە بەدەرچوونەوە ناکرێ.

(٢)بەلاّم جمهوری زانایان گوێیان نەدا بەلایەنی تاوانەکەی کە زیانەکەیە، چونکە ئەو زیانی خەریك بوونە بەدەرچوون، ئەوە ئەبێتە هۆی لابردنی زیانێکیتری توندترو خراپتر کە مانەوەیەتی تیایدا ، بۆ یاسای واهەیە خراپتر بەخراپ چاك بکرێ؟ وەك گوێ نادرێ بەزیانی لابردنی عەقڵ لە کاتێکدا کە تیکەیێك لەقورگیدا گیراوە بەهۆی عەرەقەوە بەئاسانی قوت ئەدرێ، چونکە لەوێ جگە لەعەرەق شتیتر دەست ناکەوێ، دەئەم زیانە دروستە چونکە بوەتە هۆی لابردنی زیانێکی گەورەتر، کە لەدەستدانی ئادەمیزادێکە. (٣)ئەو قسەی (إمام الحرمين)ە زۆر ووردە، وەك لە پیشەوەبۆت دەرکەوت، هەرچەندە إبن الحاجب ووتویەتی : ئەمە قسەیێکی زۆر ووردە لەروی شەرعەوە، چونکە گوناهە کۆنەکەی پێوە نوساندوە و لەسەری هێشتووەتەوە، لەگەڵ ئەوەش نەهی و قەدەغەکردنی لەسەر هەڵگرتووەو نەماوەتەوە چونکە تا گوناه هەبێ، نەهیش هەر ئەبێ-بەلاّم..

(٤)قسەو رای زانایانی شەرع ئەو بەدوور زانینە ئەباتە دواوەو پوچەڵی ئەکاتەوە کەسێ پاشگەز بوویەوە لەئیسلام و ئەمجا شێت بوو، پاشان باش بوویەوە گەڕایەوە بۆ سەر ئیسلام، ئەوە واجبە لەسەری قەزای هەموو ئەو نوێژانە بکاتەوە کە لە کاتی شێتیا فەوتاون، چونکە ئەو شێتیە لەکاتی پاشگەزبوونیدا بووە، کەوابوو هەر حوکمی ئەوی لەسەر ئەمێنێتەوە .

لأنّ إسقاطَ الصّلاةِ عنِ المجنونِ رخصةٌ والمرتدُّ ليس من أهلِ الرخصةِ أمّا الخارجُ غير تائبٍ فعاصٍ قطعاً كما الماكثُ[1] {والساقطُ} بإختيارهِ او بغيرِ إختيارهِ {على جريحٍ} بين جَرحى {يقتُلهُ/ إنْ إستمرَّ} عليهِ {و} يقتُلُ {كفأهُ} في صفاتِ القصاصِ {إن لم يستمرْ} عليهِ لعدمِ موضعٍ يعتمدُ عليهِ إلاّ بدن كفءٍ.[2] {قيلَ : يستمرُّ} عليه ولاينتقلُ الى كفئهِ لأنّ الضررَ لايُزالُ بالضررِ[3] {وقيل: يتخيّرُ} بين الإستمرار عليه والأنتقال الى كفئهِ لتساويهما في الضررَ[4]

{وقال إمام الحرمين: لاحكم فيهِ} من إذنٍ او منعٍ لأنّ الإذنَ لهُ في الأستمرارِ والإنتقال واحدُها يؤدّي الى القتلِ المحرّم والمنع منهما لاقدرة على إمتثالهِ قال مع إستمرار عصيانه ببقاء ماتسبّبَ فيهِ من الضَّررِ بسقوطه إنْ كانَ بإختياره وإلاّ فلا عصيانَ[5]

---

(١)چونكە نوێژ لە كۆڵ خستنی شێت بارسوكیو كارئاسان كردنە، دەخۆ مرۆڤی پاشگەزبوی هی ئەوەنیە بارسوكیو كارئاسانی بۆ بكرێ، بەلام ئەوەی خەریكی دەرچونە لەسەر مالی دەست بەسەرگیراوی خەلك، تا بەتەواوی دەرنەچێ. ئەوە تەوبەكارو گەڕاوەی بۆ لای خوای پێناوترێ، دەخۆ كەسێكیش تەوبە نەكا بێگومان گوناهبارە، هەروەك كەسێوایە لەناو خانوبەرەی خەلكدا مابێتەوە بێ مۆلەتی خاوەنەكەی.

(٢)كەسێ بەئارەزووی خۆی، بێ ئەوەی توانای هیچ هەلبژاردنێكی هەبێ، بكەوێ بەسەر برینداریكدا لەناو چەندەها برینداریتردا، ئەمەی كە كەووتوە بەسەریدا ئەگەر ئەمێنێتەوە بەسەریەوە ئەوە ئەیكوژێ ، وەئەگەر ناشمێنێتەوە بەسەریەوە خۆی بەهەركوێكا لادا یەكێكیتر ئەكوژێ ، وە ئەگەر ناشمێنێتەوە بەكوشتەوەدا، چونكە جێیەكیتر نیە نیازی بكا و لەسەر دانیشێ جگە لەلاشەی برینداریك نەبێ كە هەروەك ئەم وایە ، ئایا بەسەریەوە بمێنێتەوە یاخود خۆی لادا بۆ سەر یەكێكیتر.

(٣)هەندێ ووتویانە : بەسەریەوە بمێنێتەوە خۆی نەگوێزێتەوە بۆ سەر یەكێكیتر وەك ئەم، چونكە نابێ زیانێك رامالرێ و زیانێكیتر وەك خۆی بیتەجێ.

(٤)ووتراویشە بەئارەزوی خۆیەتی بەسەر ئەوەو نەمێنێتەوە یا نەگوێزێتەوە بۆ سەر یەكێكیتر وەك ئەو چونكە زیانی هەردووكیان چون یەكە.

(٥)( إمام الحرمين)ووتویەتی هیچ جۆرە حوكمێكی تێدا نییە، نە مۆلەت پێدانیو نەقەدەغەكردنی ، چونكە ئەگەر مۆلەتی مانەوەییو خۆ گواستنەوەی ئەدەی بەتەنها مۆلەتی مانەوەی ، یا تەنها مۆلەتی خۆ گواستنەوەی ئەدەی ئەوە تەنها لەهەر سێجۆرەكەدا سەرنەكێشێ بۆ كوشتنێكی حەرام ، خۆ ئەگەر قەدەغەیش ئەكەی لە

{وتوقف الغزالي} فقال في المستصفى: يحتَملُ كلَ من المقالاتِ الثلاث وإختار الثالثة في المنخول ولايُنافي قولَهُ كإمامهِ: لاتخلو واقعةٌ عن حكم الله[1] لانَّ مرادهما بالحكم فيه ما يصدُقُ بالحكم المتعارفِ[2] وبإنتفائه لقول إمامه لمّا سألهُ هو أولاً عن ذلك حكمُ اللهِ هُنا على انْ لاحكم على انَّهُ نقلَ عنهُ انَّهُ إختار في بابِ الصّيدِمن النّهايَةِ المقالةَ الأولى على الثالثة[3]

---

هەردووكيان ، ئەوە هيچ توانايەكى نيە لەسەر گوێڕايەڵی ، (إمام الحرمين)ووتويەتی: هيچ حوكمێكی تيانيە لەگەڵ بەردەواميش لەسەر گوناهباريەكەی ئەگەر بە ئارەزوی خۆی خستبێت بەمليا ، بەهۆی مانەوەی ئەو زەرەرو زيانەی ئەم بوو بەهۆ بۆ پەيدابوونی، ئەويش كە كەوتنيەتی بە مليا. (١)بەڵام غەزالی لە حوكمی ئەو روداوەدا هەڵوێستەی كردوە ، بۆيە لە (المستصفى)دا ووتـــويەتی: ئەو روداوە هەرسێ وەڵامەكە هەڵدەگـــرێ، وەلە كتێبی (المنخول) دا وەڵامی سێهەمی هەڵبژاردووە، جا چـــۆن غەزالی وەڵامی سێهەم هەڵدەبژێرێ، خۆ خۆيشـــو مامۆستاكەشی قسەيەكی بەنـــاوبانـــگيان هەيە ، دەڵێ : هيچ روداوێك نيە لە بوونـەوەردا حوكمی خوای لەبـــارەوە نەبێ ، ئێستەش ئەڵێن: ئەم روداوە هيچ حوكمێكی تێدا نيە؟ ئاخر ئـــەم دوو قـــســـەيە دژ بەيەك نين و يەكتر پوچەڵ ناكەنەوە، چـــونكە حوكم بەلای ئەوانەوە دوومـــانای هەيە.

(٢)ئەوەيە كە حوكمی عورفی بەسەردا ئەبڕێ وەك : حەرام و واجب ، دەی لەم بيردۆزەدا ئەم حوكمەيان مەبەستە. (٣)ئەوەيە كە نەفی حوكم بكرێ ، چونكە نەفی حوكميش هەر حوكمە –ئەم مانايەش بۆ وەڵامەكەی (إمام الحرمين)ە كەوابوو سالبە كولييەكە كە بيردۆزەكەيانە لەگەڵ موجبە كولييەكە كە پرسيارەكەيە لەيەك جيان ، والا موجبە جوزئيەكە نقيضی سالبەی كوليە- بەچيا ئەزانی نەفی حوكميش هەر حوكمە؟ ئاخر يەكەم جار غەزالی پرسياری لە مامۆستاكەی كرد (إمام الحرمين) لەو بارەيەوە كە ئايا كەسێ بكەوێ....حوكمەكەی چی‌يە؟ ئەويش وتی: (حكم اللهِ هنا انْ لاحكمَ)حوكمی خوا لێرەدا ئەوەيە كە حوكمی تێدا نيە، لەوەش زياتر غەزالی لە(إمام الحرمين)ەوە نەقڵی كـــردوە : كە (إمام الحرمين) لە (النهايـة)دا لەباسی راودا رای يەكەمی هەڵبژاردوە بەســـەر رای سێهەمدا-ياخود زياد لە سێ‌هەميشدا-كەوابوو غەزالی لە مامۆستاكەی لای نەداوە، واتە مامۆستاكەی دووڕای هەبووە ١-لاحكم بۆ ئێرەيە ٢-ئيختياری يەكەم لە (النهاية)دا ، غەزاليـــش : ١-توقفی كردووە لێرەدا ٢-ئيختياری سێ‌هەمی كردوە لە (منخول)دا

واحترز المصنِّف بقولِه كفأه عن غيرِ الكفءِ كالكافرِ، فيجبُ الإنتقالُ عن المسلم اليه لأنّ قتلَهُ اخفّ مفسدةً[1]

{مسئلة: يجوز التكليفُ بالمحالِ مطلقاً} ، اي سواءٌ كانت محالاً لذاتهِ اي ممتنع عادةً وعقلاً كالجمع بين السّواد والبياض، ام لغيرهِ اي ممتنِعاً عادةً لا عقلاً كالمشي من الزّمِنِ والطَيرانِ من الإنسانِ او عقلاً لا عادةً كالإيمانِ ممن علم الله انّهُ لايُؤمنُ[2]

{ومنع اكثر المعتزلةِ والشيخ ابو حامد} الأسفراييني {والغزالي وإبن دقيق العيد} مـ اي المحال الذي {ليس ممتنعاً لتعلقِ العلم بعدم وُقوعـه} اي منعوا المُمتنعَ لغيرِ تعلُق العلم لأنـهُ لظهورِ إمتناعـهِ للمكلّفـين لافـائدةَ في طلَبـهِ منـهمْ.[3] واُجيـبَ بأنـه فائدتـه إختبـارُهُم هـل يـأخذون في المقدّمـاتِ فيـترتّبُ الثّـوابُ عليــه اولا فالعقـابُ، امّـا الممتنـع لتعلّقِ علمِ الله لابعَدمِ وقوعه فالتكليفُ به جائزٌ وواقعٌ إتفاقاً[4]

---

(١)دانـەر خـۆی پاراسـت بەوشـەی (كفأه) لـە كەسـێك كـە هاوشـانی ئـەو نـەبیٚ وەك ئەوەی ئەویتریان كافربێ، دە ئەوە واجبە لەسەری موسوڵمانەكە خۆی بگوێزێتەوە بۆ سەر كافرەكە، چونكە كوشتنی كافرەكە فەسادی سوكترێكە.

(٢)دروستە تەكلیفی ئینسان بكرێ بەمەحاڵ بە هەموو جۆرەكانیەوە ، واتـە كـەیفی خۆیەتی خودی ئەوشتە مەحاڵ بێ ، واتـە بەعـەقڵ و عـادەت قـەبوڵی بـوون نـەكا، وەك شتێك لەیەك كاتدا سپیش بێ و رەشیش بـێ، یـاخود مەحاڵەكـەی لەبـەر خـودی خـۆی نیـە ، بەڵكو لەبـەر شـتێكی‌ترە واتـە بـەعادەت نەیەتـەدی —نـەك بەعـەقڵ عــەقڵ قــەبوڵی ئەكا—وەك رۆشـتن بـۆ ئینسـانی شەلەلاوی، یـان وەك فڕیـن لەلایــەن مرۆڤــەوە، یـاخود عەقڵ قەبوڵی ناكا عادەت قەبوڵی ئەكا، وەك موسوڵمان بوونی كەسێك كە خـوا ئەزانێ موسوڵمان نابێ وەك ئەبو لەهەب عەقڵەن مەحاڵە نەك عادەتەن.

(٣)زۆربەی موعتەزیلەو ئەبوحامدو غەزالی‌و ابن دقیق تەنها ئەو تەكلیف بەمەحالەیان قەدەغەكردوە كـە قبوڵـی بـوون نـەكا لەبـەر ئـەوەی كـە عیلمـی خـوا تێپـەڕی كـردوە بەنـەبوونی نـەك ئـەو دووەكـەی‌تر چونكە بـۆ هـەموو موكەلـەفێك دەركـەوتوە قـەبوڵی هاتنە بوون ناكا، مادام خوا بزانـێ نـابێ ئیتر تـەكلیف پـێ‌ی قەدەغەیـە، كەوابوو هیچ سودێكی نیە داوای وایان لێ‌بكرێ بۆ هێنانـەدی. (٤)وەڵام دراونەتـەوە ئـەو داواكردنـی مەحاڵەی خوا ئەزانێ نابێ سودی هەبێ، كە بریتیـە لەتاقی‌كردنـەوەی بـەندەكانی ئایا دەست ئەكەن بەبەرپاكردنی پێشەكیەكانی ئەو ئەنجامەی كە مـەحاڵ بـێ، ئەگـەر ئـەوە بكەن ئەوە اداشی لەسەر وەرئەگیرێ ، وەئەگەر پێشەكیەكانی ئەو ئەنجامە مەحاڵـەیان گوێ پێ‌نەدا ئەوا تۆڵەی لەسەر ئەدرێن، كەوابوو ئەو مەحاڵەی كە ممتنِعە چونكە خوا

{و}منعَ {معتزلةُ بغداد والآمدي المَحالَ لِذاته} دونَ المحال لغيره[1] {و}منع {إمام الحرمين كونهُ} اي المحال لغيرِ تعلّقِ العلم لما سبق {مطلوباً} اي منعَ طلبَهُ من قبلِ نفسه، اي لإستحالَته، فهي عنده مانعةٌ من طلبِهِ بخلافِها على القول الثاني، فاختلف كما قال المصنِّف مأخذاً لاحكماً.[2] {لاورود صيغَةِ الطّلب} لهُ لِغيرِ طلبهِ فلم يمنَعْهُ الإمام كما لمْ يمنَعْهُ غيرُهُ فإنَّهُ واقعُ كما في قولِهِ تعالى:﴿ كونوا قِردةً خاسئين ﴾[3] والإمام ردّدَ بما قالَهُ فيما نُسِبَ الى الأشعريِّ من جوازِ التكليفِ بالمحالِ فحكاهُ المصنِّف بشقّيه[4]

---

ئەزانیٚ کەنابیٚ ئەو تەکلیفە دروستەو کراویشە بەیەك رایی هەمویان کە کافر تەکلیفی ئیمانهێنانی لیٚکراوە. (١)بەلاّم موعـــــتەزیلەکانی بەغداو ئامدی تەنها تەکلیفی بـــە مەحاڵیان قەدەغەکردوە کە لەبەر خودی خۆی مەحاڵ بیٚ ، نەك لەبەر غەیری خۆی.

(٢)(إمام الحرمين) مەنعی ئەوەی کردوە کە مەحاڵە خوا داوای پەیدا بوونی بکا ، واتە ئەو داواکردنەش لەبەر ئەوەیە خودی ئەو شتـــە مەحاڵە، ئەم مەحاڵبونە نایەڵیٚ داوای پەیدا بوونی بکریٚ، ئەمە جیایە لەگـــەڵ راوبۆچونی دووەمدا، ئەمان ووتیان چونکە فائیـــدە نیە لەداواکـــردنەکەیدا، کەوابوو دانەر ووتویەتی: لەبەڵگەدا جیاوازن نەك لەحوکمدا .

(٣)بەلاّم ئیمام مەنعی کردوە ئەوەی نەیکردوە، صیغەی طەلەب و داواکردنی مەحاڵ هاتبیٚ، بەلاّم نەك بۆ جیٚبەجیٚکردنی بەڵکو بۆ ئیمتحان بیٚ، کەوابوو نەئیمام و نەغەیری ئیمام مەنعی ئەوەیان نەکردوە صیغەی طەلەبی مەحاڵ هاتبیٚ بۆ دوو مەحاڵە پیشوەکە، چونکە ئەمە هاتووە لەم فەرمودەی خودا دەفەرمویٚ: ﴿ كونوا قِردةً خاسئين ﴾ ئەم صیغەی ئەمـــرە بۆ سوکایەتی پیٚکردنیانە ، نەك بۆ تەکوین و گۆڕینی خۆیان بۆ مەیمون.

(٤)ئیمام بەهۆی ئەو قسەوە کە کردی : تەکلیف بەمەحاڵ بۆ جیٚبەجیٚ کردنی بیٚ مەمنوعە، بەلاّم بۆ إبتلا بیٚ قەیناکا، تەردیدو گومانی دروست کرد لەو قسەدا کەدراوەتە پاڵ ئەشعەری ، گوایە ووتویەتی: دروستە تەکلیف بەمەحاڵ ، -ئەگەر مەبەست ئەوەبیٚ دوو مەحاڵەکەی پێشو مەطلوبن ئەوە درۆیە، وەئەگەر مەبەست تەنها هاتنی صیغەی ئەمرەکەبیٚ ئەوە زۆر بەجیٚیە و راستە- جا لەبەر ئەو تەردیدە دانەر هەردوو لایەنەکەی ووت و گـــێڕایەوە: ١-بۆ جیٚبەجیٚکردنی ممنوعە ٢-هاتنی صیغەکەی ممنوع نیە .

ولو تركهُ الإمام و ذكر الإمام مع من ذكرَهُ في القول الثاني كما فعلَ في شرح المنهاج فاتّه الإشارة الى إختلاف المأخذِ المقصود[1] {والحقّ وقوعُ الممتنعُ بالغيرِ لا بالذّات} امّا وقوعُ التّكليف بالأولِ فلأنّهُ تعالى كلّفَ الثّقلين بالإيمان وقال ﴿ وما اكثرُ النّاس ولو حرصتَ بمؤمنين ﴾، فامتنعَ إيمانُ اكثرِهمْ لعلمه تعالى بعدَم وقوعه، وذلك من الممتنع لغيره، وامّا عدمُ وقوعِه بالثاني فللأستقراء[2] والقول الثاني: وقوعهُ بالثاني ايضاً لأنّ من انزلَ اللهُ فيه انّهُ لايؤمنُ بقوله مثلاً:﴿ إنّ الّذين كفروا سواءٌ عليهم اانذرتَهُم ام لمْ تنذرهمْ لايؤمنون ﴾ كأبوي جهلٍ ولهبٍ وغيرهما مكلّفٌ في جملةِ المكلّفين بتصديق النبيّ ﷺ في جميع ماجاءَ به عن الله[3]

---

(١)ئەی ئەگەر وایە بۆ ئیمامیش لەگەڵ قەولی دووەمدا باسی‌نەکرد؟ ئەمیش دەڵێ : ئەگەر ئیمام لەگەڵ خاوەنی رای دووەمدا باسی بکردایە وەك لە شرح المنهاج دا کردویەتی و راکەی ئیمامیشی وەلاخستایە، ئەو کاتە دانەر گەورەترین مەبەستی دەفەوتا: کە ئامارژەکردن بو بۆ جیاوازی جێدەست و بەڵگەیان ، وەك ووتمان بەڵگەیان جیایە لەحوکمدا یەکن.

(٢)قسەی حەق و راست ئەمەیە : تەکلیف بەمەحاڵێك کە لەبەر هۆیەکی دەرەکی جێیەکە دوانە پێشووەکەیە-ئەو تەکلیفە کراوەو هەیە- بەڵام مەحاڵ لەبەر خودی خۆی نیە. تەکلیف بەمەحاڵی یەکەمیان بووە، چونکە خوای گەورە تەکلیفی لە هەردوو بەرەی ئادەمیو جن کردووە بروا بێنن، لە کاتێکیشدا خوا فەرمویەتی: بەردەوام زۆربەی خەڵی برِوادار نین هەرچەندە تۆ حەز لە دینداریان بکەی، دەخۆ باوەری زۆربەیان ئەبێ قبوڵ بکەی کەنابێ و قەدەغەیە، چونکە خوا خۆی زانیویەتی کەنابێ ، دەئەوەش لەبەر هۆیەکی دەرەکی قەدەغەیە، کە عەقڵەنە بەڵام بەڵگە لەسەر ئەوەی تەکلیف بەمەحاڵ لەبەر خودی خۆی نەبوبێ، ئەوە ئیستیقرائە هەرچی گەراوم و خوێندومەتەوە نەمبینیوە شتێکی ئاوا روی دابێ.

(٣)قەولی دووەم دەڵێ : تەکلیف بە مەحاڵی لذاتە هەم کراوە ، چونکە ئەو کەسەی خوا لەبارەیەوە ئەم هەواڵەی دابەزاندوە کە برِوا ناهێنێ دەفەرموێ: بەراستی ئەوانەی کە بێبروان چون یەکە بۆ ئەوان ترساندبێتن یا نە، ئەوانە هەر باوەرناهێنن وەك ئەبوجەهل ئەبولەهەب غەیری ئەوانیش یەکێکە لەوانەی تەکلیفیان لێکراوە برِوا بە پێغەمبەر ﷺ بکەن لە هەموو ئەوەی پێی هاتووە لەلایەن خواوە.

ومنه  انّه لايؤمن اي لايصدق النبيّ ﷺ في شيئٍ مما جاء به عن الله فيكـون مكلّفـاً بتصديقِهِ في خبَرِهِ عنِ اللهِ بأنّهُ لايصدُقُ في شيئٍ مماجاءَ بهِ عنِ اللهِ وفي هذا التصديقِ تناقضٌ حيثُ إشتملَ على إثباتِ التصديقِ في شيئٍ و نفيهِ في كلِّ شيئٍ فهو من الممتنعِ لذاته.[1]

وأُجيبَ بأنّ منْ انزلَ اللهُ فيهِ انّهُ لايُؤْمنُ لم يقصُدْ إبلاغَهُ ذلك حتّى يكلّف بتصديقِ النبيّ ﷺ فيهِ دفعاً للتناقضِ ،وإنّما قصدَ إبلاغ ذلك لغيرِهِ وإعلامَ النبيّ ﷺ به  ليَيْأس من إيمانهِ ، كما قيل لنوح عليه السلام ﴿ لن يؤمن من قومك إلاّ من قد آمن ﴾ فتكليفُهُ بالإيمانِ من التكليفِ بالممتنعِ لغيرهِ[2] والثالث وهو قول الجمهورِ عدم وقوعهِ بواحدٍ منها إلاّ في الممتنعِ لتعلّقِ العلمِ بعدَمِ وقوعهِ لقولهِ تعالى: ﴿ لايُكلّفُ اللهُ نفساً إلاّ وسعها﴾ و الممتنعُ لتعلّقِ العلمِ في وسعِ المكلّفينَ ظاهرٌ[3]

---

(١)دەخۆ بەشێك لەوەی پێی هاتووە ئەو هەواڵەیە کە دەفەرموێ: باوەڕناهێنن، واتە بڕوا بەهیچ شتێك ناکا لەوەی لەلایەن خواوە پێی هاتووە، کەوابوو لەلایەکەوە موکەلەفە بڕوا بە پێغەمبەر ﷺ بکا لەو هەواڵەدا لەلایەن خواوە ئەیدا کە ئەو بڕوا بەهیچ شتێك ناهێنێ کەلەلایەن خواوە ئەم پێی هاتووە ، کەوابوو لەم تصدیقەدا دوو لایەن هەیە دژ بەیەکن، چونکە ئەم هەواڵە دووشت ئەگرێتەوە: ١-إثباتی تصدیقی ئەم هەواڵە ٢-باوەڕنەهێنانی بەوەی پێغەمبەر پێی هاتووە لە هەموو شتێکدا، کەوابوو بۆیە ئەوە لەبەر خودی خۆیەوە ممتنعە.

(٢)وەڵام دراوەتەوە : ئەوەی خوا لەبارەیەوە هەواڵی دابەزاندوە باوەڕناهێنێ، مەبەست ئەوە نەبووە ئەو هەواڵە بەو بگەیەنرێ تا تەکلیفی لێبکرێ باوەڕ بە پێغەمبەر هەبێ لەو هەواڵەدا، ئەم وەڵامەش بۆ لادان و پوچەڵ کردنەوە دژایەتیو تناقضەکە ، بەڵکو مەبەست ئەوەبوو ئەو هەواڵە بەکەسانیتر بگەیەنرێ ، پێغەمبەریش ئاگاداربکرێتەوە بەو هەواڵە بزانێ، بۆ ئەوەی بێئومێدبێ لە باوەڕهێنانی ئەوانە ، وەك ووترا بەنوح پێغەمبەر علیه السلام: جگە لەوانەی باوەڕیان هێناوە ئیتر لەمەودوا هەرگیز هیچ کەس لەگەلەکەت باوەڕ ناهێنێ . کەوابوو تەکلیف لێکردنی بەباوەڕهێنان لەبەشی تەکلیف بەمەحاڵ لغیرە نەك لذاتە. (٣)قەولی سێهەم رای جمهورە تەکلیفی بەهیچ مەحالێکیان نەبووە، تەنها ئەوەیان نەبێ کەلەبەر ئەوەی عیلمی خوای پێوە بەسراوە بەنەبونەکەی ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: خوا تەکلیفی هیچ شتێ لەکەسێ ناکا جگە ئەوە نەبێ کە لەتوانایدایە، دەخۆ ئەوەی کە مەحاڵە لەبە تەعەلوقی عیلمی خوا لەتوانای مکلف دایە ظاهرا، نەك برهانا ، چونکە ئەوەی فەرمـــان دراوە

{مسئلةٌ: الأكثر} من العلماءِ على {أنّ حصول الشرط الشرعيِّ ليس شرطاً في صحة التكليف} بمشروطٍ فيصحُّ التكليفُ بالمشروطِ حالَ عدمِ الشرطِ[1] وقيلَ هو شرطٌ فيها فلا يصحُّ ذلك وإلاّ فلا يمكن إمتثالهُ لو وقع[2]

واجيب بأنّ إمكان إمتثاله بأن يُؤتى بالمشروطِ بعد الشرط وقد وقع[3] وعلى الصحّة والوقوعِ ما تقدّمَ عن جواب الشرطِ بوجوبِ المشروطِ وفاقاً للأكثرِ يعني من الأكثر هنا[4] {وهي} مسئلةٌ {مفروضة} بين العلماءِ {في تكليفِ الكافرِ بالفروعِ} اي هل يصحّ تكليفهُ بها مع إنتفاء شرطِها في الجملةِ من الإيمان لتوقّفها على النّية اللّتي لمْ يصح من الكافرِ فالأكثرِ على صحته ويمكنُ إمتثالهُ بأن يُؤتى بها بعدُ الإيمانِ[5]

---

بیکەن هەموو کەسیٚ ئەتوانیٚ بیکا، هەمومان چون یەکین ناتوانی بلێیت: تەکلیفی ئەبوبەکر ئاسان بووە ، بەڵام ابو لهب گران بووە هەموویان چون یەکن. (١)زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن پەیدابوونی مەرجی شەرعی مەرج نیە بۆ دروستی تەکلیفی ئینسان بە مشروط و مەرجەکەی – کافر موکەلەفە بە ئیمان هێنان دەی مەرج نیە بیهێنیٚ، چونکە نیەت لە موسوڵمانەوە دروستە- کەوابوو دروستە تەکلیف بە مەشروطەوە بکریٚ لەکاتی نەبوونی مەرجەکەیشدا.

(٢)ووتراویشە: پەیدابوونی مەرجەکە مەرجە بۆ دروستی تەکلیفی مەشروطەکە . کەوابوو دروست نیە تەکلیفی مەشروط بکریٚ لە کاتی نەبوونی مەرجەکەیدا ، ئەگەر وانەبیٚ گونجاو نابیٚ فەرمانبەرداریەکە ئەگەر ئەو تەکلیفە روی‌دا وەك تەکلیفی کافر بە نوێژ. (٣)وەڵامی ئەو قیلە دراوەتەوە بە گونجاوە گوێڕایەڵی ئەو تەکلیفە بەم شێوە دوای مەرجەکە مەشروطەکە جیٚبەجیٚ بکریٚ، هەتا وقوعیش بووە ئەو هەمووە کافرە موسوڵمان بووە، مستحیل نیە. (٤)ئەوە لەپێشەوە باسمان کرد کە واجبی مطلق شەرطەکەی واجب ئەبیٚ بە واجب بوونی خۆی بەلای ئەکثرەوە، ئەوە مەبنیە لەسەر دروستی تەکلیف بە مەشروط و واقع بوونی لەکاتی نەبوونی شەرطەکەیدا، بەڵام زانایان بۆ تێگەیاندنی سەرەتایی فەرزی ئەو کولیەیان لەجوزئێکدا کردوە کە ئەویش تەکلیفی کافر بە فروعە –ئەو مەسئەلە لە نێوان زانایان دا هەرچەند کوالیە بەڵام فەرزکراوە لە تەکلیفی کافردا بەفروع واتە ئایا دروستە کافر تەکلیف بکریٚ بەفروع لەگەڵ ئەوەش مەرجیان نەهاتبێتەدی کە ئیمانە، لەزۆربەیان دا بۆ ئیمان بوو بەشرط؟ ئاخر هەموو فەرعەکان بەستراون بەنیەتەوە دەخۆ نیەتیش لە کافرەوە دروست نیە ئەوە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن دروستە تەکلیفی کافر بە فروع- گونجاویشە کافر گوێڕایەڵی بکا شتێکیمستحیل نیە–بەم شێوە دوای باوەڕهێنان جیٚبەجێیان بکات.

{والصحيحُ وقوعُهُ} ايضاً ، فيُعاقَبُ على تركهِ إمتثالهِ وإن كان يسقطُ بالإيمانِ ترغيباً فيه[1] قال تعالى:﴿ يتساءلون عنِ المُجرمين ماسلككُمْ في سقرْ قالوا: لم نكُ منَ المُصلّين ﴾ و﴿ وويلٌ للمشركين الذينَ لايُؤتون الزكاة﴾ و﴿ والذينَ لايدعونَ مع الله إلهاً آخر ...الآية﴾ وتفسير الصلاةِ بالإيمانِ لأنّها شعارهُ، والزّكاةِ بكلمةِ التّوحيدِ وذلك لإفرادهِ بالشركِ فقط كما قيلَ خلافَ الظاهرِ[2]

{خلافاً لأبي حامد الأسفراييني واكثر الحنفيةِ} في قولِهم ليس مكلّفاً بها {مطلَقاً} إذ المأموراتُ منها لايمكنُ مع الكُفرِ فعلها ولا يُؤمرُ بعد الإيمانِ بقضائها والمنهيّاتُ محمولةٌ عليها حذراً من تبعيضِ التكليفِ ، وكثيرٌ من الحنفيّةِ وافقونا[3]

---

(١)صحيح ئەوەیە وەك جەوازەكەی تەواوە رویشیداوەو بووە، كەوابوو كافر تۆڵەی ئەوەش ئەدرێ كە هەڵنەساوە بەو ئەرك و تەكلیفە، هەرچەند بەهۆی باوەڕهێنانیەوە ئەو عیقابوو تۆڵەیە لە كۆڵی ئەكەوێ، ئەو لابردنەش بۆ تەشویق كردنیانە بۆ باوەڕهێنان . بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی تەكلیفی كافر واقیع بووە؟ ئەی ئەوە نیە خوا دەفەرموێ.

(٢)لە فەرمودەی یەكەما : هۆی چونە سەقەریان ئەوەبوو، وتیان ئێمە لە نوێژگەران نەبووین . لە فەرمودەی دووەمدا: زەكات نەدانیان بوەتە هۆی شایستە بوونیان بەوەیل. لە فەرمودەی سێهەمدا : ئەوانەی كە قەتل و زینا ناكەن، ئاخر ئەوانە هەریەكێ مانایەكیتریان هەیە؟ ئەگەر (صلاة) بەمانا باوەڕو ئیمان بێ، چونكە نوێژ نیشانەی باوەڕە ، وەمانای زەكات وشەی یەكتاپەرستی بێ، وە وشەی (ذلك) ئەوەی بە صیغەی موفرەد هاتووە بۆ شرك بگەڕێتەوە ، وەك ووتراوە ئەمانە هەموو مانایەكی جیاوازن و نەگونجاون لەگەڵ ظاهیری وشەو سیاقەكەدا.

(٣)رای ئەسفراییني و زۆربەی حەنەفیەكان جیایە، چونكە ئەمان ئەڵێن كافر موكەلەف نیە بە هەموو فەرعێك ، ئیتر امر بێ یا نهی، چونكە ئەو ئەركانەی فەرمان دراوە بەكردنیان ، هەیانە كردنەكەی گونجاو نیەو ناكرێ لەگەڵ كوفردا، وەلەدوای باوەڕهێنانیشی فەرمان نادرێ بە قەزاكردنەوەیان. ئەو فەرمانەش كە قەدەغە كراون، حەمل كراونەتە سەر ئەو فەرمانەی لەگەڵ كوفردا ئەنجام نادرێن لەترسی بەش بەش كردنی تەكلیف ، زۆربەی حەنەفیەكانیش هاوڕایان كردوین.

{و}خلافاً {لقومٍ في الأوامرِ فقط} فقالوا لاتتعلّقُ بهِ لما تقدَّمَ بخلافِ النّواهي لأمكانِ إمتثالها مع الكفرِ لأنّ متعلّقاتها تروكٌ لاتتوقفُ على النّيةِ المتوقّفةِ على الإيمانِ[1] {و} خلافاً {لآخرين فيما عدا المرتدّ} أمّا المرتدُّ فوافقوا على تكليفهِ باستمرارِ تكليفِ الإسلام[2] {قال الشيخ الإمام} والد المصنِّف: {والخلافُ في خطابِ التّكليفِ} من الإيجابِ والتّحريمِ {وما يرجعُ اليهِ من الوضعِ} ككونِ الطلاقِ سبباً لحرمةِ الزوجةِ فالخصمُ يخالفُ في سببيته[3] {لا} ما لايرجع اليهِ نحو {الإتلاف} للمالِ {والجنايات} على النّفسِ وما دونها من حيثُ انّها اسبابٌ للضّمانِ {وترتّب آثار العقود} الصحيحة كملكِ المبيعِ وثبوتِ النّسبِ والعوضِ في الذّمّةِ فالكافر في ذلك كالمسلمِ اتفاقاً نعم الحربيّ لايضمن متلفهُ و مجنيه[4]

(١)بەجیاوازی بۆ گەلێکیتر تەنها لەو فروعانەی کە فەرمانن، وتویانە هەموو فەرمانەکانی شەرع هیچ پەیوەندیەکیان نیە بە کافرەوە ، لەبەر ئەو هۆیەی لە پێشەوە باسکرا بەلاّم بە پێچەوانەی ئەو فەرمانەی بۆ قەدەغەو ریٚ‌لیٚگرتن بیٚ لە .ترایە ، چونکە ئەوانە ئەگونجیٚ بەگویٚبکرێن لەگەڵ بیروڕای کوفردا ، چونکە متعلقی گوناە نەکردنە. دەخۆ نەکردنیشی نەبەستراوە بەنیەتەوە ، کە ئەویش بەسراوە بەباوەڕو ئیمانەوە.

(٢)بەجیاوازی بۆ هەندێکیتر لەبارەی هەموو کافرێکەوە جگە لە پاشگەزبویەوە ، بەلاّم ئەم هەمولایێک یەك قسەن لەسەر تەکلیفی و بەردەوام تەکلیفی لەسەرە.

(٣)باوکی دانەر ووتویەتی: جیاوازی لەنێوان زانایان دا هەیە لە خیطابی تەکلیفدایە -نەك لە خیطابی وضع دا- وەك واجب کردن و حەرام کردن ، لەو خیطابی وضعەشدا کە ئەگەڕێتەوە بۆ خیطابی تەکلیف، واتە هەردوکیان ذاتەکەیان یەکە، وەك طەلاق هۆیە بۆ حەرام بوونی ژنەکەی و خیطابیشە بۆ حەرام کردنی لەزەت لێوەرگرتنی بەهۆی طەلاقەکەوە ، بەلاّم زانایانیتر ئەلێن: طەلاق نابیٚ بەسەبەب هەر خیطابی تەکلیفە نەك وضع. (٤)بەلاّم هیچ جۆرە جیاوازیەك نیە لونێوان زانایاندا لەو خیطاب وضعەیدا ناگەڕێتەوە بۆ خیطابی تەکلیف و ذاتەکەیان یەك نیە، وەك لەناوبردنە ماڵ و دەست درێژی بۆ کوشتن و کەم ئەندام کردن، ئەمانە هەموویان هۆکارن بۆ ضمان بۆ جیاوازی نییە- چ کافر بیانکا و چ موسوڵمان هەر ضامنە- یاخود وەك بەشوێن هاتنی شوێنەواری سروشتی بۆ عەقدی صەحیح، وەك زید خانوەکەی دەفرۆشیٚ بە عەمر، دە عەمر ئەبیٚ بە مالکی شەرعی ئەو خانووە، یاخود ژنێك ئەهێنیٚ هەر منالێکیان بوو هی ئەو باوك و دایکەیە، یاخود وەك پارەی خانوەکە لەگەردنیعەمردایە ئەبیٚ بیدا بە زید، لەوانەدا هەموویان کافر و موسوڵمان چون یەکن

وقيل: يضمن المسلم وماله بناءً على انّ الكافر مكلّفٌ بالفروع ورُدَّ بأنّ دار الحربِ ليستْ دارَ ضمانٍ(١)

{مسئلةٌ: لاتكليفَ إلاّ بفعلٍ} وذلكَ ظاهرٌ في الأمرِ لأنّهُ مقتضي للقتلِ وأمّا في النهي المقتضي للتركِ فبيّنهُ بقولِهِ: {فالمكلّفُ بهِ في النّهي الكفُّ اي الإنتهاءُ} عن المنهيِّ عنهُ {وفاقاً للشيخ الإمام} اي والده وذلكَ فعلٌ يحصُلُ بفعل الضدِّ للمنهيِّ عنهُ(٢) {وقيل:} هو {فعل الضدِّ} للمنهي عنهُ(٣) {وقال قومٌ} منهم ابو هاشم: هو غير فعلٍ وهو {الإنتفاءُ} للمنهيّ عنهُ، وذلك مقدورٌ للمكلّفِ بأن لايشاءَ فعلَهُ الذي يوجَدُ بمشيئتهِ، فإذا قيلَ: لاتتحرّكْ فالمطلوبُ منهُ على الأول الإنتهاءُ عنِ التّحرُّكِ الحاصلِ بفعلِ ضدهِ من السكونِ وعلى الثاني فعلُ ضدّهِ، وعلى الثالث إنتفاءَهُ بأن يستمرَّ عدمهُ من السكونِ فبه يخرجُ عن عهدةِ النّهي على الجميع(٤)

بەڕای هەموو زانایان بەڵام ئەوەندە جیاوازی هەیە کافرێك لەبەرەی کافراندا بیّ و لەکاتی جەنگدا هەر ماڵێکی فەوتاندبیّ و دەستدرێژی بۆ سەر هەر موسوڵمانێك کردبیّ ضامن نابیّ. (١)ووتراویشە کافر ضامن ئەبیّ ئەگەر دەست درێژی بکاتە سەر موسوڵمانێك، یا ماڵی، بەڵگەش ئەوەیە کافر موکەلەفە بە فروع، بەڵام بەرپەرچ دراوەتەوە کە وڵاتێك کەجیّی شەڕو بشێوی بیّئەوە جیّی ضمان و لیّپرسینەوە نیە.

(٢)هیچ تەکلیف و ئەرکێك نیە کە فیعل و کارو جیّبەجیّکردن نەبیّ، ئەوەش بەرونی لە ئەمرو فەرماندا دیارە، چونکە ئەمر داخوازی فیعل و کارە ، بەوە نەبیّ ئەمر جیّبەجیّ ناکریّ، بەڵام لەنەهی و قەدەغەکردندا کە داخوازی تەرك و وازهێنانە ، ئەوە دانەر خۆی بەم ووتەی خۆیەوە روونی کردوەتەوە. کەوابوو ئەوەی کراوە بە ئەرك و موکەلەفو بەپەلە نەهیدا، بریتی‌یە لە وازهێنان و کۆتایی پیّهێنان لە قەدەغەکراوەکە -هەڵکەندنی لە دەرونیدا- ئەم قسەی دانەرە یەکسانە لەگەڵ قسەی باوکیدا ، بێگومان وازهێنانیش فیعل و کارێکە بەهۆی کارکردن و جوڵانەوە بەدژی قەدەغە کراوەکە پەیدا ئەبیّ. (٣)ووتراویشە موکلف بریتی یە لە ئەنجام دانی کارێك کە دژی قەدەغەکراوەکە بیّ -واتە هەر خودی دژی کارەکەیە-. (٤)گەلێکیش ووتویانە ئەبو هاشمیش لەوانەیە موکلف بە لە نەهیا فیعل و کارنیە بەڵکو بریتی‌یە لەوەی موکلەفەکە قەبوڵی فەوتاندنی قەدەغەکراوەکە بکا ئەویش لەتوانای دایە، بەم شێوەیە ئەو کارە قەدەغە کراوەی نەویّ کە بەویستی ئەو ئەنجام ئەدریّ، کەوابوو ئەگەر ووترا نەجوڵێیت ئەوە لەسەر قەولی یەکەم ئەوەی داواکراوە لیّت بریتی‌یە لە : کۆتاهێنانێك لە جوڵە جوڵ ، کە بەکردنی دژەکەی -نەجوڵانە- پەیدا ئەبیّ. لەسەر قەولی دووەم

{وقيلَ: يشترطُ} في الإتيان بالمكلّف بهِ في النّهي مع الإنتهاءِ عنِ المنهي عنهُ {قصد الترك} له إمتثالاً فيرتبُ العقاب إن لم يقصدْ، والأصح: لا، وإنّما يشترطُ لحصولِ الثّواب لحديثِ الصحيحينِ المشهورِ : إنّما الأعمال بالنّيات.[1]

{والأمرُ عند الجمهور يتعلّقُ بالفعلِ قبلَ المُباشَرةِ} لهُ {بعدَ دخول وقته إلزاماً وقبله إعلاماً}[2] {والأكثر} من الجمهورِ قالوا: {يستمرّ} تعلّقُهُ الإلزاميّ بـهِ {حالَ المُباشرة له}[3] {و}قال {إمام الحرمين والغزالي: ينقطعُ} التعلّقُ حالَ المُباشرَةِ و إلاّ يلـزمُ طلب تحصيل الحاصلِ ولا فائدةَ في طلَبهِ وأُجيبَ بأنَّ الفعلَ كالصّلاة إنّما يحصُلُ بالفراغِ منه لإنتفائه بإنتفاء جزءٍ منه}[4]

---

داواكراو: كردنی داوای جولّجولّ-نەك كۆتاهێنان- وەك لەسەر قەولی سێهەم قەبول كردنی فەوتاندنی جوڵەیە بەم شێوە نەبوونەكەی كە سكونە هەر بەردەوام بێ كەوابوو بەو بەردەوام بوونە موكلف لە عوهدەی نەهیەكە دەرئەچێ، بەڕای هەموان (١)ووتراویشە بەمەرج گیراوە لە ئەنجامدانی ئەرك و مەكلف بەلەنەهیدا لەكەڵ ئەوەش كۆتا هێنان بەقەدەغە كراوەكە بێ، ئەبێ نیەت و مەبەستی ئەوەی هەبێ لەبەر گوێڕایەڵی شەرع وازی لێهێناوە، كەوابوو لەسەر رای ئەو قیلە ئەگەر ئەو نیەتەی نەبوو ، هەر چەند قەدەغە كراوەكەشی نەكردوە هەر تۆڵە ئەدرێ، بەڵام رای ئەصەح تۆڵە نادرێو وانیە، چونكە نیەت تەنها بۆ پەیداكردن و دەست كەوتنی پاداش بەمەرج گیراوە -واتە ئەگەر نیەتی گوێڕایەڵی بوو ئەوە پاداشی هەیە، ئەگەر نیەتی نەبوو تەنها پاداشی نیە- بەڵگەیش ئەو فەرمودەیە لە هەردوو صحیحدایەو بەناو بانگە دەفەرموێ: بێگومان پاداشی كردارەكان بەنییەتەكانیانەوە پەیدا ئەبێ.

(٢)ئەمرو فەرمان بەلای جمهورەوە پەیوەند و بەسراوە بە فیعل و كارەكەوە پێش دەست كردن بە جێبەجێ كردن، بەڵام ئەگەر دوای هاتنی كاری جێبەجێ كردنی ئەو كارە بێ، ئەوە ئەمرێكی ئیلزامە، وە ئەگەر پێش هاتنی كاتەكەی بێ ئەوە ئەمرێكی ئیعلامی و ئاگاردارکردنە ، واتە بزانە لەو كاتەدا ئەو كارەت لەسەرە -بۆ وێنە ئەگەر ووتت صلاه العصر ئەگەر بانگ درابوو ئەمرە بۆ ئیلزامە ، ئەگەر نەدرابووە بۆ ئیعلامە-. (٣)زۆربەی جمهور ووتویانە: لەكاتی جێبەجێ كردنیشا پەیوەندییە ئیلزامیەكە بەكارەكەوە هەر ئەمێنێتەوەو بەردەوامە نەك تەنها پێش دەست پێكردنی

(٤)ئیمام الحرمین و غەزالی ووتویانە بەدەست كردنی بەئەنجام دانی ئەو ئەمرە پەیوەندیەكە ئەپچڕێ، چونكە ئەگەر نەپچڕێ پێویست ئەكا داوای شتێ بكرێ جێبەجێ بێ كەبووە، دەخۆ هیچ سودێكیش لەو داوایەدا نیە. بەدوو جۆر وەڵام

{وقال قومٌ} منهم الإمام الرّازي: {لا يتوجّهُ} الأمرُ بأن يتعلّقَ بالفعلِ إلزاماً {إلاّ عند المباشرةِ} لهُ. قال المصنِّف: {وهو التحقيقُ} إذ لاقدرةَ عليهِ إلاّ حينئذٍ[1] وما قيلَ من انّهُ يلزمُ عدمُ العصيانِ بتركِهِ، فجوابُهُ قولُهُ {فالمَلامُ} بفتح الميم اي اللوم والذّمّ {قبلها} اي قبل المباشرةِ بأن ترك الفعل اي اللوم حال التركِ {على التلبّسِ بالكفِّ} عنِ الفعلِ {المنهيِّ} ذلك الكفّ عنهُ لانّ الأمر بالشيئِ يفيدُ النهي عن تركه[2]

{مسئلةٌ: يصحُّ التكليفُ ويوجد معلوماً للمأمورِ إثرَهُ} اي عقبَ الأمرِ المسموعِ لهُ الدّالِّ على التكليفِ {مع علم الآمرِ وكذا المأمورِ} ايضاً {في الأظهرِ إنتفاء شرطِ وقوعِه} اي شرط وقوعِ المأمورِ بهِ {عند وقتِه كأمرِ رجلٍ بصومِ يومٍ علم موتهُ قبلَهُ} للآمرِ فقط او لهُ وللمأمورِبهِ بتوقيفٍ من الأمرِ فإنَّهُ في ذلك إنتفاءُ شرطِ وقوعِ الصومِ المأمورِ من الحياةِ والتمييزِ عند وقتِه[3]

---

ئەدرێتەوە: ١-جیٚبەجیٚ کردنی کارێك وەك نوێژ، کاتیٚ جیٚبەجیٚ کردن ئەبیٚ، تەواو بکریٚ و لیٚبێتەوە، چونکە ئەگەر یەك روکنی نەکا ئەوە وەك نەکردنی وایە.

(١)گەلێکیتریش ووتویانە کەئیمامی رازی یەکێکیانە: ئەمرو فەرمان روناکاتە هیچ کەسێك —واتە ئەمرەکە پەیوەندی بە فیعلەکەوە نابیٚ بە ئەمرێکی ئیلزامی ، بەلاٚم ئیعلامیە- لەکاتی جیٚبەجیٚ کردنی ئەو فیعل و کارانەدا دەبیٚ، دانەریش ووتویەتی ئەو رەئیە سەلمێنراوە چونکە هیچ توانایێك نیە بەسەر ئەو کارەدا هەتا ئەو کاتە دەست ئەکریٚ بە ئەنجام دانی. (٢)ئەوەش ووتراوە ئەگەر هەر نەیکا ئەبیٚ گوناهبار نەبیٚ؟ ئەوە وەلاٚمەکەی ئەم ووتەیە کەهی دانەر خۆیەتی: گلەیی و سەرزەنشت کراوە پێش دەست کردن بەئەنجام دانی ، بەم شێوە گلەیی و سەرزەنشتەکەی لەکاتی وازهێناندا لەسەر ئەوەیە ئێستە تلبسی هەیە بەوازهێنان لەنوێژەکە، کە ئەو وازهێنانەی لیٚقەدەغەیە.

(٣)ا-ئایا مکلف پێش ئەوەی توانای کردنی کارەکەی هەبیٚ ئەزانیٚ مکلفە؟ ب-ئایا دروستە ئەمر بەشتیٚ بکریٚ ئامر یا مأمور بزانیٚ شەرطی تەکلیف فەوتاوە.؟ دروستە تەکلیف بەشتیٚ بکریٚ فەرمان بەسەردا دراوەکە دوایبیستنی ئەو فەرمانەی کە نیشانەی تەکلیفە ، بۆی دەرکەویٚ کە موکلەفە وە دروستیشە تەکلیف لەگەلٚ ئەوەش کە ئامرو فەرمان بەسەردا دراوەکەش بزانیٚ —بەلای ئەظهروە بە مەرجی ئەنجامدانی فەرمانە لەکاتی کردنیدا فەوتاوە ، وەك فەرمان کردن بەپیاوێك بەیانی بەرۆژو بێت، لەگەلٚ ئەوەشدا تەنها ئامر یاخود فەرمان بەسەردا دراوەکە بزانیٚ ئەمریٚ پێش بەیانی-لەلایەن ئامرەکەوە زانیویەتیئەمریٚ بەهۆی پێغەمبەرەوە ﷺ کەوابوو لەوکاتا

{خلافاً لإمام الحرمين والمعتزلة} في قولهم: لايصحُ التكليفُ مع ما ذُكر لإنتفاءِ فائدته من الطاعة او العصيان بالفعلِ او الترك.[1] وأجيب بوجودها بالعزمِ على الفعلِ او الترك[2] وفي قولهم: لايعلم المأمور بشيئٍ إنَهُ مكلَفٌ به عقبَ سماعه للأمر به لأنَهُ قد لا يتمكَن من فعله لموتٍ قبلَ وقته او عجزٍ منهُ[3] وأجيب بأنّ الأصل عدم ذلك وبتقدير وجوده ينقطعُ تعلّق الأمرِ الدالّ على التكليفِ كالوكيلِ في البيع غداً إذا مات او عُزِل قبلَ الغد ينقطعُ التوكيلُ[4] و مسئلةٌ: علم المأمورِ حكى الآمدي وغيره الإتفاقَ فيها على عدم صحّة التكليف لإنتفاء فائدته الموجودة حالَ الجهل بالعزمِ[5] وبعضُ المتأخرين قال: بوجودها بالعزم على تقدير وجود الشرط[6]

ئیتر زانراوە مەرجی ئەنجامدانی فەرمانەکە فەوتاوە، کە ژیانەو تەمییزە لەکاتی گرتنیدا. (١)بەجیاوازی بۆ ئیمام الحرمين و موعتەزیلە کە ووتویانە تەکلیف دروست نیە ئەگەر ئامرو فەرمان بەسەردا دراو بزانن لەکاتی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەدا مەرجەکەی دەفەوتێ ، چونکە گوێڕایەڵیەکە هیچ سودێکی نیە، کەبەکردنی فەرمانبەرداری‌یەو بەنەکردنی سەرپێچیە. (٢)بۆ یەکەمیان بەو شێوەیە وەڵام دراوەتەوە: هەر بەوەی نیەتی ئەنجام دانی هێناوە ، یاخود نەکردنی ئەگەر بمێنێ ئەوە سودەکەیەتی ئیتر پاداش یا تۆڵەی لەسەر وەرئەگرێ.

(٣)ئیمام و موعتەزیلەش لەمەدا جیان : کە ئەڵێن فەرمان بەسەردا دراوەکە نازانێ موکەلەفەبە ئەنجام دانی ئەو شتە پاش بیستنی نەبێ کە ئەویش بەفەرمان پێ‌کردنی ئەبێ بە ئەنجام دانی ، چونکە لەوانەیە تواناى ئەنجام دانی نەبێ، یالەبەر مردنی بێ پێش هاتنی کاتی ئەنجام دانی ئیش یا لەبەر نەتوانایی بێ. (٤)وەڵامی ئەمیش دراوەتەوە بەوە کە ئصل ئەوەیە نەمرێ یا پەکی نەکەوێ، خۆ ئەگەر هاتوو ئەوەش بوو ئەوە ئەو کاتە پەیوەندی ئەو ئەمرەی کە تەکلیف ئەگەیەنێ ئەپچڕێ و بەتاڵ ئەبێتەوە ، وەك کەسێك ئەکرێ بەوەکیل بۆ ئەوەی بەیانی ئەو شتە بفرۆشێ ، دەخۆ کاتێ ئەو وەکیلە بمرێ یا لە کاربخرێ ئەو وەکالەتە ئەپچڕێ و بەتاڵ ئەبێتەوە.

(٥)لە بارەی ئەوەی فەرمان بەسەردراوەکە بزانێ، مەرجی ئەو فەرمانە ئەفەوتێ لەکاتی واجب بونیدا ، ئەوە ئامێدی و غەیری ئەویش لەو مەسئەلەیەدا یەك رایی هەموو زانایانیان گێڕاوەتەوە کەئەوە تەکلیفی دروست نیە، چونکە ئەو سودەی تەکلیف هەیەتی ئیمتیثالە یا ئیبتیدایە لەکاتی جەهل و نەزانیدا نیە ، بەعەزم ئەو فائیدە ئەبێ ، دەخۆ نەیزانیوە تا عەزمی بکا. (٦)هەندێ لە زانایانی چەرخی دوایی ووتویانە : فائیدەو سودەکەی هەیە بەوە کە عەزم و نـــیەتی کردنی یاخود نەکردنی

قال كما يعزمُ المجبوبُ في التَّوبةِ من الزِّنا على أن لايعود اليه بتقدير القدرةِ عليه فيصحُّ التكليفُ عندَهُ.[1] وجعل المصنِّف صحتهُ الأظهر واستنَدَ في ذلكَ كما اشارَ ليه في شرح المُختصرِ الى مسئلةِ منْ عَلِمَتْ بالعادةِ او بقول النبيّ ﷺ انّها تحيض من اثناء يوم معيّن من رمضان هل يجبُ عَليها إفتتاحُهُ بالصّوم قال الغزالى في المُستصْفى امّا عند المُعتزلة فلا يجبُ لأنّ صوم بعضِ اليوم غيرُ مأمورٍ به، وامّا عندنا فالأظهَر وجوبُهُ لأنّ الميسورَ لايسقُطُ بالمعصورِ[2] ووجْهُ الإستناد انّها كلِّفت الصّومَ مع علمها إنتفاءَ شرطِهِ من النقاءِ عنِ الحيَضِ في جميع النّهار[3]

وهذا مُندفعٌ فإنّ المُكلّفَ به صومُ بعضِ اليوم الخالي عنِ الحيَض و النقاءِ عنهُ جميعَ اليوم شرطٌ لصوم جميعه لا بعضه أيضاً[4]

---

ئەوكارەی هەبێ، ئەگەر گریمان مەرجەکەی هاتە دی . (١)جا ووتویانە وەك کەسێك عەورەتی بڕابێ بەڵام ئەیەوێ تەوبەبکا و عەزمی هەیە ئیتر نەگەڕێتەوە سەری ، ئەگەر توانای ئەوەشی هەبێ، ئەو تەکلیفە دروستە بەلای ئەم کۆ ەڵەوە.

(٢)دانەر وتی:ئەگەر مەئمورەکە بزانێ مەرجی فەرمانەکە ئەفەوتێ لەکاتی خۆیدا، دروستی ئەو قەولەی دایە پاڵ قەولی ئەظهر، لەوەشدا خۆی پشت ئەستور کرد –وەك لە(شرح المختصر)دا ئاماژەی پێکردوە– مەسەلەی ئەو ئافرەتەی ئەزانێ ئەکەوێتەوە حەیزەوە لەناوەڕاستی فلانە ڕۆژی ڕەمەزاندا ، ئیتر بە عادەتی جارانی ئەزانێ یا پێغەمبەرێك هەواڵی ئەداتێ، ئایا واجبە لەسەری لەسەرەتای ڕۆژەکەوە بەڕۆژوو بێت؟ غەزالی لە (المستصفی)دا ووتویەتی: بەلای موعتەزیلەوە واجب نیە، ڕۆژوی هەندێك لەڕۆژ فەرمانی پێنەکراوە، بەڵام بەلای ئێمەوە قەولی اظهر ئەوەیە واجبە بیگرێ، چونکە شتی ئاسان بەهۆی شتی قورسەوە لەکۆڵ ناکەوێ –لەسەفەردا ناتوانی چوار رکات نوێژ بکەی ، دووت لەکۆڵ ناکەوێ–

(٣)بەڵگەی پشت بەستنەکەش ئەوەیە ئەو ئافرەتە تەکلیفی ڕۆژوی لێکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەزانێ مەرجی ڕۆژو فەوتاوە ، کە بریتیە لەوەی لەهەموو ڕۆژەکەدا پاك بێ لە حەیز کەواتە لەگەڵ زانینیش دا بەفەوتانی مەرجەکەی هەر لەسەری واجب کراوە. (٤)ئەمەی کە دانەر پشتی پێسور کردووە مندفع ئەبێ، چونکە ئەوەی کراوە بەئەرکی ڕۆژوی هەندێك لە ڕۆژەکەیە، کە ئەویش خاڵیە لەحەیز بەڵام پاکی لەحەیز لە هەموو ڕۆژەکەیدا ئەوە دووبارە مەرجی ڕۆژوی هەموو ڕۆژەکەیە نەك هەندێکی.

وكذا ماقبلَهُ مندفعٌ فإنَهُ لايتحققُ العزم على مالا يوجَدُ شرطهُ بتقديرِ وجودِهِ ولا على عدم العودِ الى ما لاقدرةَ لهُ عليهِ بتقديرِها، فالصَوابُ ما حكوهُ من الإتِّفاقِ على عدم الصّحة[1] {امّا} التكليفُ بشيئٍ {مع جهلِ الآمرِ} إنتفاءُ شرطِ وقوعهِ عندَ وقتهِ بأن يكون الآمر غيرُ الشّارعِ كأمرِ السّيدِ عبدَهُ بخاطةِ ثوبٍ غداً {فإتّفاقٌ} اي فمتّفقٌ على صحّةِ وجودِهِ[2]

{خاتمةٌ: الحكمُ قد يتعلّقُ بأمرينِ} فأكثرَ {على الترتيبِ فيحرُمُ الجمعُ} كأكلِ المُذكى و الميتةِ فإنّ كلاً منهما يجوزُ اكلُهُ لكن جوازُ اكلِ الميتةِ عند العجزِ عن غيرِها الذي من جملةِ المذكى فيحرُمُ الجمعُ بينهما لحرمةِ الميتِ حيثُ قدرَ على غيرِها[3] {او يُباحُ} الجمعُ كالوضوءِ و التّيممِ فإنهما جائزان ، وجوازُ التّيممِ عندَ العجزِ عنِ الوضوءِ، او قدْ يُباحُ الجمعُ بينهما كأنْ تَيمَّمَ لخوفِ بُطءِ البُرءِ من الوضوءِ لمن علمتْ ضرورتَهُ محل الوضوءِ ثمّ توضأ مُتحمِّلاً لمشقّةِ بُطءِ البُرءِ وإن بطلَ بوضوئهُ تيمّمه لإنتفاءِ فائدَتهِ[4]

(١)هەروەها پێش ئەویش مندفعە چونكە تصمیم و عەزم لەسەر شتێ مەرجەكەی نەیەتەدی ناسەلمێنرێ، بەوەی بلّێ گریمان ئەگەر هەبوو، هەروەهاشە عەزم لەسەر نەگەڕانەوەی بۆ شتێ كەتوانای نیە بەسەریدا، ئەویش بەگریمانە هەبوونی توانا، ئەوە قسەی راست ئەوەیە كە ریوایەت كراوە هەموویان یەك ڕان لەسەر نادروستی ئەو تەكلیفە. (٢)بەلاّم تەكلیفی كەسێ بەشتێ لەگەلّ ئەوەش ئامرەكە نەزانێ كاتی ئەنجامدانی ئەوشتە مەرجی كردنەكەی فەوتاوە ، بەم شێوە ئامرەكە شارع نەبێ ، وەك ئەوە ئاغایێك بە خزمەتكارەكەی ئەمر بكا بەدورینی كراسێك لەبەیانیەوە ئەو تەكلیفە بەڕای هەموان هەیەو دروستە.

(٣)كەلامی ئەزەلی جاری واهەیە پەیوەند ئەبێ بەدووشتەوە : یا زیاتر بەلاّم ئەو پەیوەندییە بەتەرتیب و یەك لەدوای یەك ئەبێ، كەوابوو لەو كاتەدا حەرام ئەبێ كۆبكرێتەوە وەك خواردنی سەربڕاوو مردارەوە بوو، چونكە ئەمانە هەردوكیان خورادنیان دروستە ، بەلاّم خواردنی مردارەوە بوو كاتێ دروستە توانای خواردنی شتی تری نەبێت كە یەكێ لە غەیری مردارەوە بوو بریتیە لە سەربڕاو، كەوابوو حەرامە جەمع لەنێوانیاندا سەربڕاوو مردارەوە بوو، لەبەر حەرامی مردارەوە بوو لە شوێنێكدا توانای بەسەر شتیتر هەیە.

(٤)یاخود حەلاّلە جەمعیان وەك دەست نوێژو تەیەموم، چونكە هەردوكیان دروستن ، تەیەموم كاتێ دروستە توانای دەست نوێژ نەبێ، بەلاّم جاری واهەیە هەردوكیان حەلاّلە كۆبكرێنەوە وەك ئەوەی تەیەموم ئەكا لەترسیدرەنگ چاكبونەوەی ئەوبرینەی

{او يُسنُّ} الجمعُ كخصالِ كفارةِ الوِقاعِ فإنّ كلاً منها واجبٌ لكنْ وجوبَ الإطعامِ عندَ العجزِ عنِ الصّيامِ ووجوبَ الصّيام عندَ العجزِ عنِ الإعتاقِ ، ويسنُّ الجمعُ بينهما كما قال في المحصولِ: فينوي بكلّ الكفارة وإن سقطتْ بالأولى، كما ينوي بالصّلاةِ المُعادَةِ الفرضَ وإنْ سقطتْ بالفعلِ اولاً.[1]

{و}قدْ يتعلّقُ الحكمُ بأمــرينِ فأكثرَ {علـى البـدلِ} كذلكَ اي فيحرُمُ الجمعُ كتزويجِ المرأةِ من كفأينِ فإنّ كلاً منهما يجوز التزويجُ منهُ بدلاً عــن الآخر اي لم تزوّج من الآخر و يحرُمُ الجمعُ بينهما بأن تزوّج منهما معاً او مرتّباً[2] او يبــاحُ الجمعُ كسترِ العورَةِ بثوبينِ فإنّ كلاً منهما يجبَ السّترُ به بدلاً عنِ الآخرِ اي انّهُ لم تســتترْ بــالآخَرِ ويباحُ الجمعُ بينهــما بأن يجعلَ أحدهــما فوق الآخــر.[3]

---

هەموو جیٚدەست نوێژەکەی گرنۆتەوە، هەموو ئەندامەکانی زەرورن لە ئاو بیانپارێزێ . بەلاّم پاشـان دەسـت نوێـژ ئـەگریٚ بـاری گرانـی درەنـگ چاکبوونـەوەی برینەکـەی هەڵئەگریٚ، هەرچەند دەست نوێژەکەی، تەیەمومەکەی پوچەڵ ئەکـــاتەوە

چونکـە تەیەمومەکـە تـازە سـودی نـەماوە. (١)یـاخود سـوننەتە جـەمعیان وەك هــەر سیٚجۆرە کەفارەتەکەی ئـەو کەسـەی بـە جـــوتبون لەگـەڵ خێزانەکـەیدا رۆژوەکـەی شکاندووە، چونکە هەریەك لەو سیانە واجبە بەلاّم کاتیٚ خواردن واجب ئەبیٚ توانـای رۆژوی نـەبیٚ، رۆژو کـاتێك واجـب ئـەبیٚ کـە توانـای ئـازادکردنی بەندەیـەکی نـەبیٚ ، سوننەتە هەموشیان جەمع بکا وەك لە محصول دا ووتویەتـــی : بۆ هـەمویان نیـەتی کەفارەت بێنیٚ هەرچەندە بەیەکەمیان لە کۆڵی کەوتووە، بۆ وێنە چۆن نوێـژی فـەرز بە جەماعەت دووبارە ئەکاتـەوەو نیـەتی قـەرز ئـەهێنیٚ، هەرچەند بەکردنی یەکـەم جاری لەکۆڵی کەوتووە.

(٢)جاری واهەیـە کـەلامی ئـەزەلی تەعـەلوق ئەبەستیٚ بە دوو شتەوە یان زیاتر بـەلاّم لەسەر بەدەلیەت، کەیەکەم ئەکـا ئەتوانــیٚ دووەمیـــش بکـــا هەروەهـــا، نـەك وەك پێشوو لەسەر تەرتیب، جائەمیش سیٚ حاڵـەتی هەیـە: ١-حـــەرامە جەمعیان وەك مارەکردنی ئافرەتێك لە دوو هاوشانی خۆی ، هەر یـــەکیٚ لەو دوانە، ئەو ئافرەتە بۆی هەیە شـووی پیٚبکـا لەسەر بەدەلیـەت ، واتە ئـەگـەر شـــوو بەمـیـان بکـاو شـوو بەوی تریـان نـەکا، حەرامـە جـەمعی هـــەردوکیان بکـریٚ، ئیـتر پێـــکەوە شـــوو بـــەهـــــەردوکـــیان بکـا یـاخـــود یـەك لـــەدوای یـــەك هـــەر بـەو عـــەقـــدەی پێشـــوو.

(٣)یاخود جەمعیان حەلاّڵە وەك داپۆشینی عەورەت بەدوو کراس، داپۆشینی عەورەت

**او يُسنُّ الجمعُ كخصالِ كفارةِ اليمينِ فإنّ كلاً منهما واجبٌ بدلاً عن غيرِهِ، اي إن لم يفعَلْ غيرَهُ منها كما قالَ والدُ المصنِّف: انَّهُ الأقربُ الى كلامِ الفقهاءِ اي نظراً منه للظاهرِ و إنْ كان التحقيقُ ماتقدّمَ من انّ الواجبَ القدرُ المشترَكُ بينهما في ضمنِ اي معيّنٍ منها، ويسنُّ الجمعُ بينهما كما قالَ في المحصول.[1]**

واجبه بەهەریەکیّ لەوانە لەباتی ئەویتر واتە ئەگەر بەویتر دانەپۆشرابیّ جەمعیشیان حەلاڵە بەو شێوە هەردوکیان لەبەرکا.

(١)یاخود سوننەتە جەمعیان وەك ئەو چوار شتەی دانراون بۆ کەفارەتی سوێن. چونکە هەریەکیّ لەوانە واجبە لەباتی ئەوانیتر بکریّ، واتە ئەگەر یەکیّ لەو سیانە کانیتر نەکرابیّ، وەك باوکی دانەر ووتویەتی : ئەو قسەیە نزیکترە لە رای زانایانی شەرع ، واتە چونکە ئەوان سەیری رواڵەتیان کردووە، هەرچەند قسەی سەلمێنراو کە لەپێشیشەوە رابوورد، کەووترا واجب قەدەری موشتەرەکی نێوانیانە ، لە دووتوێی هەر یەکێکی دیاری کراویاندا، سوننەتیشە جەمعی هەمویان بکا و ئەنجامیان بدا. وەك لە کتێبی (المحصول)دا ووتویەتی.

******

# { الكتاب الأول }

{في الكتابِ و مباحثِ الأقوالِ} المشتملِ عليها من الأمرِ والنَّهي والعامِ والخاصِ و المطلقِ والمقيَّدِ والمجملِ والمبيَّنِ وغيرِها[1] {الكتابُ} والمرادُ به {القرآنُ} غلبَ عليه من بينِ الكُتُبِ في عُرف اهلِ الشرعِ {والمعني به}اي بالقرآن {هُنا} اي في اصول الفقه {اللفظُ المُنزَّلُ على محمّدٍ ﷺ للإعجازِ بسورةٍ منهُ المتعبَّدُ بتلاوتِه} يعني ما يصدُقُ عليهِ هذا من اوّلِ سورةِ الحمدِ للهِ الى آخر سورةِ النّاسْ المُحتجِّ بأبعاضِهِ خلافَ المعنى بالقرآنِ في اصولِ الدّينِ من مدلولِ ذلك القائمُ بذاتِه تعالى[2]

---

کتابی یەکەم

(١)لەبارەی قورئانەوەیەو ئەو حالأنەی کە چەند قەولێکن و ئەم کتێبە ئەیانگێرێتەوە ئەو حالأنەش وەك: ئەمرو نەهیو خاص و عام و مگلق و مقید و مجمل و مبین و وێنەی ئەمانە.

(٢)مەبەست بە(الكتاب) قورئانە ، هەر کات ووترا(الكتاب)یانی قورئان بەلأم کتاب بەواتای نوسراوو نامەیە، تەورات و ئینجیلیش هەر وایە، تەغلیبی (الكتاب) دراوە بەسەر قورئاندا لەنێوان هەموو کتێبەکانی تردا، ئەم تەغلیبەش لە ناو عادەتی گفتوگۆی پرۆفیسۆرانی شەرعدا وایە، چونکە (الكتاب) لە گفتوگۆی نەحویەکاندا مەبەست(الكتاب) سیبەوەیهیە –قورئانیش سێ مانای هەیە:

١- لەفظی هەموو سورەتەکانە ٢-مانا لوغەویەکەی ٣-وەصفی قائم بەزاتی خواوە- جا مەبەستی ئێمە بە قورئان لێرەدا لەباسی زانستی عیلمی اصولی فقهدا یەکەمیانە واتە: قورئان ئەو لەفظەیە دابەزێنراوەتە سەر محمد ﷺ بۆ ئەوی بەتەنها سورەتێکی خەڵك دەستەوسان بکا، -کە ناتوانن وێنەی بڵێن- ئەو لەفظەی بە خودی خوێندنەوەکەی عیبادەت و خواپەرستی ئەکرێ. هەرچەند ماناکەشی نەزانیێ،-بەڵام حەدیث ماناکەی نەزانی خوێندنەوەکەی عیبادەت نیە- مەبەست ئەوەیە ئەوەی ئەم پێناسە ئەیگرێتەوە (المحتجّ بأبعاضه) لەفظەیە ئەبعاضەکانی ئەکرێن بەبەڵگە، واتە هەموی نابێتە بەڵگەی ئوصولیەکان، چونکە ئەوان هەر لە حوکم ئەدوێن بۆیە بەڵگە بە هەندێکی ئەهێننەوە، ئەو قورئانەی ئوصولیەکان دەیڵێن ئەو مانایە یان مەبەستە جیاوازە لە واتاو مەبەستی قورئانێك زانایانی ئوصولدین ئەیڵێن: کە بریتیە لەمانای عەقڵی ئەو لەفظە-نەك لوغەوی- کە ئەو مانایەش قائمە بەزاتی خواوە.

وإنّما حدّوا القرآن مع تشخّصه بما ذكِر من اوصافِه ليتميّزَ مع ضبط كثرَته عمّا لايُسمّى بإسمِه من الكلام[1] فخرجَ عن أن يُسمّى قرآناً بالمنزَلِ على محمّدٍ ﷺ من الأحاديثِ غيرِ الرّبانية والتوراة والإنجيل مثلاً.[2] و بالإعجازِ اي إظهارُ صدقِ النبيِّ ﷺ في دعواهُ الرِّسالةَ مجازاً عن إظهارِ عجزِ المُرسل اليهم عن معارضتِه الأحاديث الرّبانية كحديث الصحيحين انا عند ظن عبدي بي..الخ وغيره[3] والإقتصارُ على الإعجاز وإن انزِل القرآنُ لغيرِه ايضاً لأنّهُ المحتاجُ اليه في التمييزِ[4] وقولُهُ بسورةٍ منهُ ايّ سورةٍ كانت من جميعِ سُورِه[5]

---

(١)زانایان حەدو پێناسەی قورئانیان کردوە بەو وەصفانەی کە ووتراون–المنزّل المتعبّد، المحتجّ– لەگەڵ ئەوەش هەر بەوان مشخص بوو واتە بۆ شەخص حەد کراوە و (الکتاب) بالقرآن پێناسەی کراوە٬ –یەکەم بۆ ئەوەیە قورئان جیابکرێتەوە لەوەی کە کەلامی خوایەو بە قورئان ناونابرێ. دووەم: لەگەڵ ئەوەی ضبطی ئەو ئەلفاظە زۆرەی قورئان کراوە– واتە لەباتی ئەوەی دەڵێت قورئان بریتی‌یە لە قل هو الله أحد. وە بریتی‌یە لە الله الصّمد هەتا هەموو قورئان بەم پێناسە ضبط کراو. (٢)مە وابوو بە (المنزّل) هەموو فەرمودەیەکەی پێغەمبەر ﷺکەهی خوا نەبێ لەوە چونەدەر کە بە قورئان ناوبرێن چونکە (المنزّل) نین، و(علی محمّدٍ)یش تەورات و ئینجیل و وێنەی ئەوان چونەدەر، هەرچەند منزلن بەلاّم (علی محمد) نین.

(٣)بەوشەی (إعجاز)یش چوەدەر –مەبەست لە (إعجاز) مانای مەجازیە کە بریتی‌یە لە: دەرخستنی راستی داواکەی پێغەمبەر ﷺ لەداواکەیدا کە دەڵێ پەیامم بۆ هاتووە ئەمەش لە حەقیقییەکەی دەرهاتووە کە بریتی‌یە لە: دەرخستنی نەتەوایەتی نامە بۆچوەکان لە رووبەڕوبونەوەی قورئاندا بەپێشاندانی وێنەی– هەموو فەرمودەیەکی‌تری خوا –حدیث قدسي– وەك فەرمودەی (انا عند ظنّ عبدي بي) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردوە وە جگە لەویش. (٤) ئەڵێت قورئان تەنها بۆ (إعجاز) دابەزیوە خۆ بۆ چەندەها شتی تریش دابەزیوە وەك ئەوەی کەتەلۆکی ژیانە چۆن خواپەرستی بکرێ ، بۆ لێکۆڵینەوەی ئایەتەکانی؟ ئاخر لە جیاکردنەوەی قورئاندا لەشتی تر تەنها پێویستیمان بە(إعجاز) دەبێ، ئەوە نەفی ئەوەناکات بۆ شتی‌تر نەهاتووە.

(٥) دانەر لە پێناسەکەیدا وتی: (بسورةٍ منهُ) واتە هەر سورەتێك لە هەموو سورەتەکانی قورئاندا واتە بەتێخرەکە یەك ئەگەیێنێ و بە تەنوینەکەی ئەوە ئەگەیێنێ کەمترین سورەتی قورئان خەڵکی دەستەوسان کردووە.

حكايةً لأقلّ ما وقعَ بهِ الإعجازُ الصّادقُ بالكوثرِ اقصَر سورةٍ و مثلِها فيهِ قدرِها من غيرِها بخلافِ ما دُونَهاوفائدَتُهُ كما قالَ دفعُ إيهامِ العبارةِ بدونِهِ انّ الإعجازَ بكلِّ القرآنِ فقط[1] وبالمتعبّدِ بتلاوتُهُ اي ابداً ما نُسِخَتْ تلاوتُهُ كما قال منهُ: الشيخُ و الشيخَةُ إذا زنيا فارجموهما البتةَ قال عمرﷺ فإنّا قدْ قرأناها رواهُ الشافعيّ وغيرهُ وللحاجةِ في التمييزِ الى إخراجِ ذلكَ زادَ المصنِّف على غيرهِ المتعبّدَ بتلاوتهِ وإنْ كان من الأحكامِ وهي لاتدخُلُ الحدود[2]

{ومنهُ} اي من القرآنِ {البَسملةُ اوّل كلّ سورةٍ غير براءةٍ على الصحيح} لأنّها مكتوبةٌ كذلكَ بخطِّ السُوَرِ في مصاحفِ الصّحابةِ مع مُبالَغَتِهم في انّهُ لايُكتَبُ فيها ما ليس منهُ مما يتعلّقُ بهِ حتّى النقط والشكلِ.[3]

---

(١)ئەوەش ئەبڕێ بەسەر سورەتی(الكوثر)دا كە كورتترین سورەتی قورئانە، یاخود بەئەندازەی ئایەتەكانی(الكوثر) لە قورئاندا هەر موعجیزەیە ، نەك كەمتر لە(الكوثر) بۆیە(بسورةٍ منهُ) ووتوە ئەو سودەی هەیە، وەك دانەر خۆی ووتویەتی نەك دارشتنی عیبارەتەكە خەڵك بخاتە گومانەوە وابزانێ، (إعجاز) تەنها بە هەموو قورئان ئەكرێ و بەكەتر ناكرێ، نەخێر بەكورتترین سورەتیش ئەكرێ، وەك بە ئەوی‌تریش ئەكرێ.

(٢)لە پێناسەكەدا وتی: بەخوێندنەوەی ئەو قورئانە هەتا هەتایە عیبادەت بكرێ، بەمە ئەو قورئانە چووە دەر خوێندنەكەی سڕاوەتەوە، وەك دانەر خۆی ووتویەتی: هەندێ لەو قورئانەی تەنها خوێندنەوەی سڕاوەتەوە، ئەمەیە پیاو و ژن ئەگەر زینایان كرد، ئێوەش بەردبارانیان بكەن ئەمە بێگومان قورئان بووەو نەسخ كراوەتەوە چونكە عومەر دەڵێ :ئێمە بێگومان خوێندومانەتەوە. شافیعی و غەیری شافیعیش ریوایەتیان كردوە، وە بۆ ئەوەی قورئان لە غەیری قورئان جیابكرێتەوە پێویستمان هەبوو بۆ دەركردنی ئەو قورئانەی خوێندنەوەكەی سڕاوەتەوە، دانەر (المتعبّدُ بتلاوتهِ) زیاد كرد بەسەر هی‌تردا هەرچەند ئەوەی بەخوێندنەوەی بكرێ هەندێكە لە ئەحكام ، ئەحكامیش ناچێتە پێناسە و حدودەكانەوە، چونكە حد تصور ئەگەیەنێ، حوكمیش بەسەر شتێكدا فەرع و لقی تصوری شتەكەیە، دەخۆ ئەگەر تصوری ئەو شتە بەسرابێ بەو حوكمەوە، ئەوە دەور ئەبێ، واتە لێرەدا پێناسەی قورئان كراوە بە (المتعبّدُ بتلاوتهِ) پێناسەی شتە بەحوكم.

(٣)بسمِ اللهِ الرّحمنِ الرَّحيمِ لەسەرەتای هەموو سورەتێكەوە جگە لەسورەتی بەرائەت بەشێكە لە قورئان، لەسەر رای صەحیح، چونكە هەرچی بسم الله هەن بەعەینی رەنگی سورەتەكان نوسراون لە پەڕاوگەكانی یارانی پێغەمبەردا ، لەگەڵ

وقال القاضي ابوبكر الباقلاني و غيرهُ ليسَتْ منْهُ في ذلكَ وإنّما هيَ في الفاتِحَةِ لإبتداء الكتابِ على عادة الله في كُتُبهِ، ومنهُ سنَّ لنا إبتداءُ الكتُبِ بها وفي غيرِها للفصلِ بين السُّورِ.[1] قال إبن عبّاس: قال رسول اللهﷺ لايعرف فرق السُّوَرِ حتّى ينزِلَ عليهِ بسم اللهِ الرّحمنِ الرَّحيمِ رواهُ أبو داود و غيره[2] وهي منهُ في اثناءِ النّمل إجماعاً[3] وليسَتْ منهُ أول برائة لنزولِها بالقتالِ الذّي لاتُناسبُهُ البسملة للرحمة والرّفق[4]

{لا مانُقِل آحاداً قرآناً كأيمانُهما في قراءة: ﴿ والسّارِقُ والسّارِقَةُ فاقطعوا ايمانَهُما ﴾ فإنَّهُ ليسَ من القرآنِ {على الأصحِّ} لأنّ القرآنَ لإعجازِهِ النّاسَ عنِ الإتيانِ بمثلِ اقصرِ سورَةٍ تتوفّرُ الدواعي على نقلِهِ تواتُراً[5]

---

ئەوەش دا زۆربەیان زیادەڕەوییان کردوە لەوەی شتێك کە قورئان نەبێ لە پەڕاوگەکەدا نەنوسرێ ، هەرچەندە ئەو شتەش پەیوەندی هەبووبێ بە قورئانەوە . تابگاتە خاڵ و نوقطە و سەرو ژێریشیان نەنوسیوە -لەسەردەمی کۆندا مەتن بەرەنگێك ئەنوسرا شەرح بەرەنگێك، سەرو ژێر بەرەنگێك، مێژوو بەرەنگێك، نیشانەی جیاوازی ئەو شتەبوو- (١)باقلانی ووتویەتی: بسم الله بەشێك نیە لە هەموو سورەتێکدا، تەنها لە سورەتی الفاتیحە دا نەبێ، چونکە ئەویش سەرەتای قورئان و نامەی خوایە ، خوا لەهەموو کتێبەکانیدا هەروای کردوە سەرەتایان بە بسم الله بووە. لەو کردەوە بەردەوامەی خواوە ئێستەش کراوە بەسوننەت بۆ ئێمە، سەرەتای هەموو نوسراوێك ئاوابێ، ئەوە لە الفاتحەدا لەبەر سەرەتایی بوو ، ئەی لە سورەتەکانیتردا بۆ؟ بۆ ئەوەی بە بسم الله ئەم سورەت لە ئەو سورەت جیابکاتەوە، واتە کۆتایی‌و سەرەتای هەموو سورەتێك بە بسمِ اللهِ ئەزانرێ.

(٢)ابن عباس دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ سورەتێك لە سورەتێکیتری نەئەزانی جیابکاتەوە هەتا بسم اللهِ بۆ دائەبەزی. (٣)بسم الله ی ناو سورەتی النمل بە إجماع بەشێکە لە قورئان. (٤)بەڵام بێگومان بسم الله لە سەرەتای سورەتی بەرائەتەوە بەشێك نیە لە قورئان، چونکە ئەو سورەتە بۆ جەنگ و هەرا دابەزیوە، ئەویش گونجاو نیە لەگەڵ بسم الله دا چونکە ئەم گونجاوە لەگەڵ شتێکدا میهرەبانی ونەرم ونیانی تیابێ.

(٥)ئەوەی چەند کەسێك دەماودەم گەڕاندویانەتەوە قورئان نیە، وەك وشەی (ایمانهما) لەباتی وشەی (أیدیهما) لە خوێندنەوەی ئەو ئایەتەدا ئەوە قورئان نیە، بەڕای ئەصەح، چونکە کارێکی گرنگی هەیە ئەویش دەسەوسان کردنی خەڵکەکە لەوەی بتوانن بەوێنەی کورتترین سورەتی قورئان بهێنن، دەخۆ بێگومان کاری گرنگیش داخوازو باعث و گەڕانەوەو نەقڵی زۆرن ، لە هەموو سەردەمێکدا کاری

و قيلَ إنّهُ من القرآنِ حملاً على انّهُ كانَ متواتراً في العصرِ الأوّلِ لعدالةِ ناقلِهِ و يكفي التّواتُرُ فيهِ.[1] {و}القراءآت {السبع} المعروفةِ للقراءِ السبعةِ: ابي عمرو نافع، و إبن كثير و عامر وعاصم و حمزة والكسائي {متواترةٌ} من النبيِّ ﷺ الينا اي نقلَها عنهُ جمعٌ يمتنعُ عادةً تواطؤهُم على الكذبِ لمثلِهِم وهلمّ[2] {قيل} يعني قال إبن الحاجبْ {فيما ليسَ من قبيلِ الأداءِ} اي فما هو من قبيلِهِ بأن كان هيئةً للفظِ يتحقّقُ بدونِها فليسَ بمتواترٍ[3] وذلك {كالمدِّ} الذي زيدَ فيهِ متّصِلاً و منفصِلاً على اصلِهِ حتّى بلغَ قدْرُ الفينِ في نحوِ جاءَ و ماانزِلَ، و واوينِ في نحوِ السّوءْ و قالوا انؤمِنُ، و ياءينِ في نحوِ جيئَ، و في انفُسِكُم، او اقلَّ من ذلكَ بنصفٍ او اكثرَ منهُ بنصفٍ او واحدٌ او إثنينِ طرُقٌ للقراءةِ[4]

---

بچوك دەنگ و باسی زوو تەواو ئەبیٚ و خەڵکیش کەم باسی ئەکەن- (١)ووتراویشە ئەو وشەی (ایمانهما)لە قورئانە ، گوایە لەسەردەمی چەرخی یەکەمدا بەسەر زاری خەڵکانێکی زۆرەوە بووە، بەعەدالەتی هەواڵدەرەکەیدا دەزانم، دەخۆ دەماو دەمی خەڵکانێکی زوری سەردەمی یەکەم بەسە بۆ ئەوەی بسەلمیٚ کە قورئانە

(٢)هەر حەوت خوێندنەوەکەی قورئان موتەواترن کە ناسراون بە (القراءِ السبعة) حەوت قورئان خوێنەکە ابی عمرو هتد، موتەواترن لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا بگاتە لای ئێمە ، واتە کۆمەڵێکی ئەوەندە زۆر بە دەماو دەم گەڕاندویانەتەوە عادەتەن گونجاو نیە هەموویان لەسەر درۆ یەك کەوتبن و ئەوانیش بۆ زیاتر لە خۆیان و هەروەها بێت تا بگاتە لای ئێمە.

(٣)ووتراویشە کە إبن الحاجب ئەو جۆرە خوێندنەوەیەی کەلە قەبیلی ئەدابیٚ، بەم شێوە شێوازێك بیٚ بۆ لەفظەکە بیٚئەویش هەر جیٚبەجیٚ بکریٚ، ئەوە موتەواتر نیە، -اداء واتە وەك داپۆشینی عەورەت ، قبیل الأداء وەك داپۆشینی هەموو لاشە، أداء واجبە بەڵام قبیل الأداء چاکە هەبیٚ، قبیل الأداء واتە کەفیلی تەواو جیٚبەجیٚ کردنیەتی-. (٤)ئەوەش وەك ئەو مەددو پیت درێژ کردنەوەی زیاد لەسەر ئەصل و سروشتی خۆیەتی ، ئیتر لە یەك وشەدابیٚ یا لە دوو وشەدا بێت، ئەوەندە زیاد بکریٚ تابگاتە ئەندازەی دوو ئەلیف، وەك جاء-یەك وشەیە-، یان وەك: وما انزل - بۆ دوو وشە-، یاخود بگاتە دوو واو وەك: السوء-یەك وشەیە-، یاخود وەك : قالوا انؤمن - بۆ دوو وشە-، یاخود بگاتە ئەندازەی دوو بیٚ وەك: جیئ- یەك وشەیە-، وفي انفسکم - بۆ دوو وشە-، یاخود لەوە کەمتر بیٚ بەئەندازەی نیو ئەلف-ئەلف و نیوێك- یاخود لەوە زیاتر بێت بە ئەلف و نیوێك -دوو ئەلف و نیو- ، یاخود لەوە زیاتر بێت بە

{والإمالةُ }التي هي خلافُ الأصلِ من الفتحِ محضةً او بينَ بينَ بأنْ يُنحى بالفَتحة فيما يُمالُ كالغارِ نحوَ الكسرَةِ على وجهِ القربِ منها او منَ الفتحَة.[1] {وتخفيفُ الهمزة} الذي هو خلافُ الأصلِ منَ التَّحقيقِ نقلاً نحو: قدَ افلَحَ و إبدالاً نحو: يؤمِنون ، وتسهيلا نحو: اينَكُم، وإسقاطاً نحو: جاءَ اجلُهم[2]{قال ابو شامة: او الإلفاظ المختلفُ فيها بين القرّاء} اي كما قال المصنِّف في اداءِ الكلمَةِ يعني غير ما تقدَّمَ كألفاظهم فيما فيهِ حرفٌ مشدّدٌ نحو: إيّاكَ نعبُدُ بزيادَةٍ على اصلِ التشديدِ من مبالغَةٍ او توسّطٍ[3] وغير ابن الحاجبِ و ابي شامة لم يتعرّضوا لما قالاهُ[4]

---

ئەندازەی ئەلفیٚ-واتە بکاتە سیٚ ئەلف- ، یاخود بە ئەندازەی دوو ئەلف زیاتر بیٚ- واتە ببیٚ بە چوار ئەلف- ئەوە هەموو ریٚگاو چۆنیەتی خویٚندنەوەی قورئانی قورئان خویٚنەکانە.

(١)یاخود وەك ئیمالە کە جیاوازە لەگەلٚ ئەصل و خویٚندنەوەی سروشتی وشەکە - واتە لارکردنەوەو شۆڕکردنەوەی سەری پیتەکە بەرەو ژێر بریٚ، ئەوە ئیمالەی تەواوە، وە ئەگەر لەسەرەوە نزیکتربیٚ، ئەوە بەینە بەینەیە، بیٚگومان ئەمەش لەو ووشانەدا کە ئیمالەیان تیادا بیٚ. (٢)یاخود وەك سوك کردنی هەمزە -خۆی پیتی گەروە گرانە- کە ئەوەش جیاوازە لەگەلٚ ئەصل و سروشتی خۆیدا ، ئەصلەکەی تەمگیق و خویٚندنەوەیەتی سوك کردن وەك گواستنەوەی هەمزەکەی قد افلح بۆ سەر دالی قەدەکە، یاخود بەدانانی پیتیٚکیتر لەجیٚی دا وەك (یؤمنون) واومان داناوە لەجیٚی هەمزەکە ، یا خویٚندنەوەکە گرانە و ئاسان ئەکریٚ وەك: اینکم، دوو هەمزەکە بەشویٚن یەکەوە گرانە، ئەیکەین بەییٚ ئاسان ئەبیٚ یا هەر نایخویٚنینەوە وەك: (جاء أجلهم).

(٣)هەندیٚکیان بەڕای هەمویان من قبیل الأداء ، بەلاٚم هەندیٚکیان رای زانایان تیایدا جیاوازە، لەبەر ئەوە ئەبو شامە ووتویەتی یاخود وەك ئەو ووشانەی زانایان جیاوازن لە چۆنیەتی خویٚندنەوەیاندا، وەك دانەر لەباسی ئەدای کەلیمەدا ووتویەتی، واتە نەك ئەوانەی پیٚشوو، بەلٚکو وەك خویٚندنەوەی ئەو وشەیەی پیتیٚکی تەرەدار و گرانی تیادا بیٚ، وەك إیاك نعبد . بەزیاتر لە کەمترین پلەی گرتن پیتیٚکە -ئەوەیان متواترە- ئیتر بە زیادەڕەوی بیٚ، واتە دوو تری بۆ زیاد بکەی ، یاخو مام ناوەندی بیٚت، واتە یەك ییٚ بۆ زیاد بکەی، ببن بەسیٚ ییٚ. (٤)ئەوەی ابن الحاجب وتیو ئەوەش ئەوشامە بۆی چووە زانایانیتر دەستیان بۆ نەبردوە . ئەی رای دانەر چییە؟

والمصنِّف وافقَ على عدمِ التَّواتُرِ الأول، وتردّدَ في التواترِ الثاني وجزم بتواتُرِ الثالثِ بأنواعهِ السابقة، وقال في الرّابع إنّهُ متواترٌ فيما يظهَرُ[1] ومقصودُهُ مما نقلَهُ عن ابي شامة المتناوَلِ بظاهرِهِ لما قبلَهُ مع زيادَةِ تلكَ الزيادةِ التي مثّلها بما تقدّمَ على انّ ابا شامة لم يردْ جميعَ الألفاظ.[2] إذْ قالَ في كتابِهِ المرشد الوجيزْ: ما شاعَ على السُّنة جماعةٍ من متأخرّي المُقرئين و غيرِهم ، من انّ القراآت السبعَ متواترة نقولُ بهِ، فيما إتّفقتِ الطُرُقُ على نقلهِ عن القرّاءِ السبعة دونَ ما إختلفتْ فيهِ ، بمعنى انّهُ نفيتْ نسبتُهُ إليهم في بعضِ الطُرُقِ ، وذلك موجودٌ في كتُبِ القراآتِ لاسيما كُتُبِ المغاربةِ والمشارقة فبينهما تباينٌ في مواضعَ كثيرة[3]

---

(١)دانەریش هاورِا بووە لەسەر ئەوە یەکەمیان متواتر نیە، گومانی هەبووە لە تەواتری دووەمیان دا سیٚهەمیان بە هەموو جۆرەکانیەوە بێگومان بووە لە تەواتریا ، بەلاّم لە چوارەمدا دەلّیٚ : بەگوێرەی ئەوەی لە قسەکەی ابو شامەوە دەرئەکەویٚ، چوارەم متواترە.

(٢) ئەوەی ئەبو شامە وتی:ئەوەی پێشویش ئەگرێتەوە، ئەمە دووبارەکردنەوەیە بۆ؟ ئەمیش دەلّیٚ مەبەستی دانەر لەوەی گێرایەوە لە ئەبو شامەوە ، کە بەئاشکرا ئەوەی پێشیش ئەگرێتەوە لەگەلّ زیادەیێکا ووتیەوە ، دانەر مەبەستی ووتنی ئەو زیادەیە بوو، کە وێنەی بەوەی پێشوو هێنایەوە (إيّاك نعبد) زیاد لەوەش ابوشامە مەبەستی هەموو ئەلفاظیك نەبووە چونکە هەیانە هەموو قراء متفقن لەسەری ، وەهەشیانە جیاوازن تیایدا ، ئەم دووهەمەی مەبەستەچونکە..

(٣)ابوشامە کتێبێکـــــــی هەیە بەناوی المرشد الوجیز لەوێدا دەلّیٚ : ئەوەی بەناوبانگەو هابەسەر زبانی کۆمەلّێك لە قورئانخـــوێنانی چەرخی دوایـــی و هیتریشەوە ، ئەوەیە کە هەر حەوت جۆر خوێنـــدنەوەکـــەی قورئان متواتـــرن، ئێمەش ئەوە ئەلّێین واتە لەوێدا هەموو ریوایەتـــەکـــان یـــەکـــن لەسـەر نـــەقـــلّ کـــردنی لە هـــەر حەوت قـــورئان خوێنـــەوەکـــە، نەك ئەوەی ئـــەوان جیاوازن تیایدا بەم مانایـــە لەهەنـــدیٚ ریوایەتدا خوێـــندنەوەیەك هەبیٚ نەفی ئەوە بکریٚ بدرێـــتە پالّ ئەو حـــەوتە - واتـــە عاصـــم بلّیٚ: هی ابو عمرو وە نافع بلّیٚ: هی هی ئەو نیە- بۆ شتی واهـــەیـــە؟ بـــەلّیٚ ئەوە هەیە لە ناو نوسراوەکـــانی (القراآت)دا ، بە تایبەت نوســراوەکانیرۆژئـــاواو رۆژهـــەلاّت ، چونکە لـەزۆر جێدا جیاوازی و دژایـــەتیـــان هەیە.

والحاصل انَّا لانلتزِمُ التَّواتر في جميع الألفاظِ المُختَلَف فيها بينَ القرّاءِ اي بل منه المُتواتِر : وهي ما إتَّفقتِ الطرق على نقله منهم ، وغيرُ المُتواتِر: وهي ما اختلفت فيه بالمعنى السابق، وهذا بظاهرِه يتناول ما ليسَ من قبيلِ الأداءِ وما هوَ من قبيلِه، و إن حملَهُ المصنِّف على ما هوَ من قبيلِه كما تقدَّم[1]

{ولاتجوزُ القراءةُ بالشّاذ} اي مانُقِلاً قرآناً آحاداً لافي الصّلاةِ ولاخارجها بناءً على الأصحِّ المتقَدِّم انه ليس من القرآن، وتبطُلُ الصّلاةُ به إنْ غيَّرَ المعنى وكان قارئُهُ عامد عالماً كما قال النّووي في فتاواه.[2] {والصّحيحُ انّ ما وراء العَشرةِ} اي السّبعَةِ السّابقة وقراآتُ يعقوب و ابي جعفر و خلف فهذهِ الثّلاثة تجوزُ القراآت بها {وفاقاً للبغوي والشيخِ الإمام} والد المصنِّف لأنّها لاتخالفُ رسم السّبعِ من صحَّةِ السنَدِ و استقامةِ الوجه في العربيةِ و موافقة خط المصحَفِ الإمامِ[3]

---

(١)بەرهەمی ئەمەی رابووردو پاڵفتەکەی ئەمەیە: ئێمە ناڵێین هەر ئەبێ متواتر هەبێ لە هەموو لەفظیکا کە قورئان خوێنان خۆیان بۆچونی جیاوازیان هەیە تیایدا، بەڵام ئەڵێین هەیانە متواترن ، کە بریتین لەوانەی هەموو ریوایەتەکان یەك قسەن لەسەر نەقڵیان لەو حەوتەوە، هەشیانە متواتر نیە، ئەوانەش بریتین لەو لەفظانەی ئەو حەوتە خۆیان جیاوازیان هەیە تیایاندا، بەمانای جیاوازی پێشوو، دەئەمە بەڕوونی ئەوەی لە قەبیلی ئەوابێ لە قەبیلی ئەوانەبێ ئەیگرێتەوە، هەرچەند تەنها دانەر داویەتی بڕیویەتی بەسەر ئەوەدا کە لە قەبیلی ئەوابێ، وەك لەپێشەوە باسکرا.

(٢)دروست نیە خوێندنەوەی قورئان بەشێوازی شاذ، واتە ئەو لەفظانەی هەندێ کەس ریوایەتیان کردوە، ووتویانە ئەوانە قورئانن نەلە نوێژداو نەلە دەرەوەی نوێژدا دروست نیە بخوێنرێتەوە ، ئەمەش بینا لەسەر ئەصحە پێشینەکە کە وتی: ئەوە لە قورئان نیە ، نوێژی پێ‌پوچەڵ و بەتاڵ ئەبێتەوە ئەگەر ماناکەی بگۆڕێ، بەڵام بەو مەرجەی عەمدی بیخوێنێتەوە وەبشزانێ نوێژی پێ‌بەتاڵ ئەبێ و دروست نیە بخوێنرێتەوە، وەك نەوەوی لە فەتاوەکەی ئەو حوکمەی داوە.

(٣)شاذ کامەیە؟ شاذ بەلای قەولی صەحیحەوە جگە لەو دەجۆرەیە واتە حەوتەکەی پێشوو و ئەم سیانەش، دروستیشە قورئان بەشێوازی خوێندنەوەی ئەم سیانەش، ئەو قەولە هاو قسەیە لەگەڵ بەغەوی‌و باوکی دانەردا، بۆیە دروستە قورئانیان پێ بخوێنینەوە؟چونکە جیاواز نین لەگەڵ رەسمی حەوتەکەی‌تردا رەسم چی‌یە؟ بریتی‌یە لە: ١-دروست کردنی قەباڵە. ٢-بەڵگەکەی لە قواعیدی عەرەبیدا راست بێ‌و جێ هەبێتەوە.٣-جیاواز نەبێ لەگەڵ نوسینەوەی قورئانە نوسراوەکەی ئیمامی عوسماندا

ولايضرُّ في العزو الى البغوي عدمُ ذكرِهِ خلفاً فإنّ قراءتَهُ كما قال المصنِّف مُلَفقةٌ من القراآتِ التسعةِ إذْ لهُ في كلِّ حرفٍ موافقٌ منهم وإنْ إجتمَعَتْ لهُ هيئةٌ ليست لواحدٍ منهم فجعلَتْ قراءَةً تخصُّهُ[1] {وقيل} الشاذّ {ما وراءَ السّبعَة} فتكونُ الثّلاثُ منهُ لاتجوزُ القراءةُ بها على هذا ، وإن حكى البغوي الإتّفاقَ على الجوازِ غيرَ مصرَّحٍ بخلفٍ كما تقدَّمَ[2] {أمّا إجراءهُ مجرى} الأخبارِ {الآحاد} في الإحتجاجِ {فهو الصّحيحُ} لأنّهُ منقولٌ عن النبيِّ ﷺ[3] ولايلزمُ من إنتفاءِ خصوصِ قرآنيته إنتفاءُ عمومِ خبَريتِهِ، والثّاني و عليهِ بعضُ اصحابِنا لايُحتجُّ بهِ لأنّهُ إنّما نُقلَ قرآناً ولم تثبَتْ قرآنيتُهُ. وعلى الأولِ إحتجاج كثيرٌ من فقهائنا على قطعِ يمينِ السّارقِ بقرائَةِ أيمانهما[4]

---

٤-متواتر بێ بەم چوار مەرجە هەموو قرائەتێك دروستە. بێ یەكەمیان بەتاڵە.

(١)خۆ بەغەوی خەلەفی باس نەكردوە، چۆن ئەڵێیت: هاوقسەیە لەگەڵ بەغەوی‌دا؟ باس نەكردنی زیان ناگەیەنێ بەدانە پاڵی بەغەوی ، چونكە جۆری خوێندنەوەی خەلەف وەك دانەر ووتویەتی: تێكەڵەو پێكەڵە هاتووە هەر لە نۆ جۆرە خوێندنەوەكەی‌تر، چونكە بە هەر حەرفێكی خوێندبێتەوە، یەكێك لەو نۆیە پێیان خوێندوەتەوە، هەرچەند لەكۆی هەموی‌دا دیمەنێكی تایبەتی بۆ دروست دەبێ، هی یەكێكیان نیە لەبەر ئەو دیمەنە تایبەتی‌یە كراوە بە خوێندنەوەیەكی تایبەت بە خۆیەوە.

(٢)ووتراویشە شاذ بریتی‌یە لە حەوتەكە بەدەر ، كەوابوو ئەو سیانەش ئەكەونە بەر شاذ و دروست نیە قورئان بەو سێ شێوازە بخوێنرێتەوە، لەسەر رای ئەم قیلە هەرچەند بەغەوی ووتویەتی دروستە بەڕای هەموان ، بەڵام بەرونی ناوی خەلەفی نەبردووە، وەك لەپێشەوە رابورد.

(٣)خوێندنەوەی وەك قورئان دروست نیە، بەڵام كردنی بە بەڵگە لەسەر بابەتێك وەك فەرمودەیێك كەچەند كەسێك ئەیگەیەنن، ئەوە صەحیح و دروستە، چونكە ئەو خوێندنەوە شاذە لە پێغەمبەرەوەﷺ نەقڵ كراوە وەك حەدیثە ئاحادەكە.

(٤)بەنەمانی تایبەتی قورئانێتی پێویست ناكا هەموو پلەكانی هەواڵی بفەوتێ وە خەبەریەتی خۆی لەدەست دا، قەولی دووەم كەبەرابەر قەولی صەحیحەكەیە هەندێ لەیارانی ئێمەی لەسەرە شاذ ناكرێ بەبەڵگە ، چونكە ناوی بە قورئانەوە نەقڵ كراوە قورئان بوونیشی نەسەلماوە ، لەسەر قەولی یەكەم: زۆربەی زانایانی شەرع ئەڵێن: دەستی راستی دز ئەبڕێ ، بە بەڵگەی (ایمانهما)كە خوێندنەوەو قیرائەتێكی شاذە لەگەڵ ئەوەش..

ولم يوجِبوا التَّتابُـــعَ في صومِ كفارةِ اليمينِ الذي هـــو احَدُ قولَيْ الشافعي بقراءة مـــتتابِعاتْ. قال المصـــنِّف : كأنَّهُ لمَّـــا صحَّـــح الدَّارقـــطني عليهِ إســـنادَه عـــن عائـــشة رضي الله عنها نُزلتْ:﴿ فصيـــامُ ثلاثةِ ايّامٍ ﴾ متتابِعـــاتٍ فسقـــطت متـــتابِعـــاتٍ.[1]

{ولا يجوزُ ورودُ ما لامعنى لهُ في الكتابِ والسنّةِ خلافاً للحشويّةِ} في تجويزهم ورود ذلك في الكِتابِ، قالوا لوجودهِ فيهِ كالحروفِ المقطّعةِ اوائلَ السّورِ في السّنّةِ بالقياس على الكِتابِ و أُجيبَ بأنّ الحروفَ أسماءً للسوَرِ كطه و يس[2] وسمّوا حشويّة من قول الحسَن البصري لمَا وجد كلامهم ساقطاً وكانوا يجلسون في حلقتهِ امامَه: ردّوا هؤلاء الى حشى الحلقةِ اي جانِبَها.[3]

{ولا}يجوزُ ان يردَ في الكِتابِ والسّنَةِ {ما يعني بهِ غير ظاهِره إلاّ بدليلٍ} يبيّنُ المُراد كما في العامِ المخصوصِ بمتأخّر[4]

---

(١)فتوای واجب بوونی سێ ڕۆژی یەك لە دوای یەكـیـان نەداوە ، لە كەفـارەتـی سوێندا یەك لەدوای یەكێكیش یەكێكە لە دوو قەولی شافـعی بە بەڵگەی متتـابعات. دانەر ووتویەتی: لەوانەیە لەبەر ئەوەبێ ئەم فەرمودەیە كـە دارە قطنی ئیسـنادەكەی بەصەحـیح زانیـووە لە عائشەوە ئەگەڕێنێتەوە، و دەفەرمـوێ: (فصيامُ ثلاثةِ ايّامٍ متتابِعاتٍ) هاتە خوار، بەڵام دوایی خوێندنەوەو حوكمی سڕایەوە، خۆ شاذیش كاتێ ئەبێ بەبەڵگە حوكمەكەی نەسڕابێتەوە.

(٢)دروست نیە هاتنی وشەیەك یان ڕستەیەك لە قورئان و سوننەتدا بێ، كە مانا و مەبەستێكی نەبێ ئەم ڕەئیە جیاوازە لەگەڵ حەشەویەكاندا، بەلای ئەوانەوە دروستە شتی وەها هەبێ لە قورئاندا و بەدروستیان زانیوە چونكە ئەڵێن هاتووە لە قورئان دا ، وەك هـەموو پیتـە لەیـەك پچڕاوانـەی سـەرەتای سـورەتەكان – ئـەلف، لام، میـم– لـە سوننەتیشدا بەقیاس لەسەر قورئان.

(٣)لەووتەیـــەكی شێخ حەسـەنی بەصریـەوە نـــاونــراون (حەشــویە) كـــاتێ ئـەبینی گفتوگۆكـــانیان بێنرخـــن و بـــێئەدەبن، لەگـــەڵ ئـــەوەش لـــە ئەڵقـــەی دەرسەكەیدا لەبەردەمیدا دادەنیـــشتن وتی: ئا ئەوانە بگـێـــڕنەوە بۆ تەنیـــشـــت و دوای ئەڵـــقەكە.

(٤)دروست نیە شتێك لە قورئان و سوننەتدا هەبێ مەبەست پێی ظاهیرەكەی نەبێ، مەگەر بەبەڵگە نەبێ مەبەست روون بكاتەوە ، چۆن عام هەموو كات هەر بۆ عام ئەبێت؟ مەگەر شتێك بێت بەدوایدا تایبەتیبكا و لەعامیەتی بخا.

{خلافاً للمرجئة} في تجويزهم ورودَ ذلكَ من غيرِ دليلٍ، حيثُ قالوا المُرادُ بالآياتِ والأخبارِ الظاهرةِ في عقابِ عصاةِ المؤمنينَ الترهيبَ فقط، بناءً على مُعتقدِهم انّ المعصيةَ لا تضرُّ مع الإيمانِ ، وسمّوا مرجئةً لإرجائهم اي تأخيرهم إيّاها عنِ الإعتبار[1]

{وفي بقاءِ المُجمَلِ} في الكِتابِ والسنّةِ بناءً على الأصحّ الآتي من وقوعِهِ فيها {غير مبينٍ} على إجمالِهِ بأن لم يتّضحِ المراد منهُ الى وفاتهِ ﷺ اقوالٌ[2] احدُها لا لأنّ الله تعالى اكمل الدّين قبل وفاته لقوله تعالى : ﴿ اليومَ اكملتُ لكم دينكم ﴾[3] ثانيها: نعم قالَ تعالى في متشابهِ الكِتابِ : ﴿ وما يعلَمُ تأويلَهُ إلا الله ﴾ إذ الوقف هنا كما عليه جمهورُ العُلماء، وإذا ثبتَ في الكِتابِ ثبَتَ في السنّةِ لعدَمِ القائلِ بالفَرقِ بينهما[4]

---

(١)بە پێچەوانەی مرجئەوە، بەلای ئەوانەوە دروستە شتێك لە قورئاندا هەبێ مەبەست ظاهیرەکەی نەبێ، چونکە ووتویانە مەبەست بەو چەندەها ئایەت و فەرمودەیە کە هاتووە لەبارەی تۆڵەی موسوڵمانانی گوناهبارەوە تەنها ترساندیان مەبەستە ، ئەم رایە لەسەر چاوەی عەقیدەیانەوە دروست کراوە لەوێوە هەڵقوڵاوە، چونکە باوەڕیان وایە گوناه لەگەڵ ئیماندا زیانی نیە، بە مرجئە ناونراون چونکە ئەو هەموو ئایەت و فەرمودەیە لەبارەی تۆڵەی موسوڵمانی گوناهبارەوە هەیە هەمووی ئەخەنە دواوەو ئیعتیباری پێناکەن و ظاهیرەکەیان ناخوێننەوە.

(٢)لەمانەوەی (مجمل)لە قورئان و سوننەتدا بینا لەسەر قەولی ئەصەح کە لەودوا دێت و هەیە لە هەردووکیاندا بەڕون نەکراوی و هەر لەسەر ئیجمالی خۆی ماوە، واتە مەبەستەکەی رون نەکراوەتەوە هەتا لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ ، لەو مجملەدا چەند قەولێك هەیە. (٣)یەکەمیان: نەخێر مجملێك نیە لە قورئاندا مەبەستەکەی رون نەکرابێتەوە ، چونکە خوا پێش فەوتی پێغەمبەر ﷺ دینی خۆی تەواو کردووە، چونکە ئەفەرموێ: ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆ تەواو کردن .کەوابوو هیچ شتێك نەماوە پێویستیمان پێی هەبێ.

(٤)دووەمیان : بەڵێ هەیە چونکە خوای گەورە لەبارەی متشابهی قورئانەوە دەفەرموێ: (جگە لە خوا نەبێ کەس تەئویلی نازانێ) لەقورئانەکەدا ئەبێ لێرەدا بوەستی ، چونکە جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن،مجملەکە لە قورئان دا هاتبێ لە سوننەتیشدا سەلمێنراوە، چونکە کەس نیە جیاوازی بخاتە نێوان قورئان و سوننەتەوە.

{ثالثُها: الأصحّ لايبقى} المجملُ {المكلّف بمعرفته} غيرَ مبيّنٍ للحاجةِ الى بيانهِ حذر من التّكليف بما لايُطاقُ ، بخلافِ غيرِ المكلّف على انّ صّوابَ العبارةِ العمل به كما في البُرهان وفي بعضِ نسخَه بالعلمِ بهِ وهو تحريفٌ من ناسخٍ مشى عليهِ المصنّف إذ وقع لهُ من غيرِ تأمّلٍ[1] {والحقُّ} كما إختارهُ الإمامُ الرّازي وغيره {انّ الأدلّةَ النقليّةَ قد تُفيد اليقينَ بانضمامِ تواتُرٍ او غيرِهِ} من المُشاهَدَةَ كما في ادلةِ وجوبِ الصلاةِ ونحوها فإنّ الصّحابةَ علموا معانيها المرادَةِ بالقرائنِ المُشاهدة، ونحنُ علمناها بواسطةِ نقلِ تلك القرائنِ إلينا تواتُراً، فاندفع توجيهُ من اطلقَ انّها لاتفيدُ اليقين بانتفاءِ العلم بالمُراد منها[2]

(١)سیٚهەمیان كە ئەصەحیانە– لەوانی تر راستترە بۆیە لە متنەكەدا ئەوانیتری باس نەكرد– مجمەلێك كەئینسان مكلف بیٚ بەزانینی نامێنێتۆ بەڕون نەكراوی چونكە ئینسان پێویستی بەرون كردنەوەی هەیە، نەوەك تەكلیف بكریٚ بەشتێك لەتوانایدا نەبیٚ، بەپێچەوانەی محملی غیر مكلف بەزانینی ئەوە هەر بە مجملی ئەمێنێتۆ – چونكە مجمل دوو بەشە: ١–مكلف بەزانینی ئەوە نامێنێتۆ. ٢– مكلف نیە بەزانینی ئەو ئەمێنێتۆ– زیاد لەوەش راستتر وایە بوتریٚ مجملێك كە ئینسان مكلف بیٚ بەكارپێكردنی نامێنێتۆ، نەك بەزانینی، چونكە لە البرهان دا وایە، بەلاّم هەندیٚ لە نوسخەی البرهان دا نوسراوە، لەباتی العمل به العلم به نوسراوە، ئەو گۆڕینە لەلایەن نوسخە لێگرەكەوە بووە ، دانەریش بەسەریدا رۆشتوە بیٚ بیر لێكردنەوە كاتیٚ خراونەتە بەردەمی و نیشان دراوە.

(٢)قسەی راست و حەق وەك رازیو غەیری رازیش هەڵیان بژاردوە– ئەوەیە بەڵگە نەقڵیەكان جار جاریٚ یەقین ئەگەیەنیٚ بەهۆی لكاندنی تواتر یا شتی ترەوە وەك بینین، پێیانەوە وەك بەڵگەی نوێژ و واجبەكانیتر ، یارەكانی پێغەمبەر مانای مەبەستی بەڵگەكانیان زانیوە، بەهۆی بینینەوە بەچاوی خۆیان پێغەمبەریان بینیوە چۆن جیٚبەجیٚی كردون، بەلاّم ئێمە مانای ئەو بەڵگانە بەهۆی نەقڵ كردنی ئەو قەرینەی ئەوانەوە بۆ لای ئێمە بە نەقڵێكی متواتر، كەوابوو بەڵگەی ئەو كەسانە لەبەین چوو كە ئەڵێن: بەڵگەی نەقڵی بەهیچ جۆرێك یەقین ناگەیەنیٚ، بەڵگەكەشیان ئەمە بوو ئەیان ووت نازانین مەبەستی چیە لەو بەڵگانە صحابە بەبینین زانیویانە ئێمەیش بەتواتر دەلالەتی نەقلی هەموویان مفیدی ظنن، مقید بەیەقین نین، بە قورئان و هەموو حەدیثەوە، لەفظەكەیان متواتر و یەقینە، دەلاّلەتەكەیان ظەن و گومانە.

{المنطوقُ و المفهوم} اي هذا مبحثُهما {المنطوقُ ما} اي معنىً {دلّ عليه اللفظُ في محلّ النطق} ايّاً كانَ كما مثّلَهُ في شرح المُختَصرْ كغيرِه بتحريم التأفيفِ اي للوالدَينِ الدالّ عليهِ قولُهُ تعالى: ﴿ فلا تقل لهما أفٍ ﴾ او غير حكمٍ كما يُؤخَذُ من تمثيلهِ في قوله. [1]

{وهو} اي اللفظُ الدالُ في محلّ النّطقِ {نصّ} اي يسمَّى بذلكَ {إن افادَ معنىً لايحتَملُ غيرَهُ} اي غير ذلكَ المعنى {كزيد} في نحو: جاء زيدٌ فإنّهُ مفيدٌ للذاتِ المُشخّصَةِ من غيرِ إحتمالِ لغيرِها[2] {ظاهرٌ} اي يُسمّى بذلكَ {إنْ إحتَمَلَ} بدلّ المعنى الّذي افادهُ {مرجوحاً كالأسدِ} في نحوِ : رايت اليومَ الأسدَ فإنّهُ مفيدٌ للحيوانِ المفترِسِ محتملٌ للرجلِ الشُجاع بدلّهُ وهو معنىً مرجوحٌ لأنّهُ معنىً مجازيٌّ والأولُ الحقيقيٌّ المتبادر الى الذهن [3]

---

(١)واتە ئەمە جێی باسکردنی منطوق و مفهومە – کەلە ئەقسامی دەلالەتن– مەنطوق واتە ئەو مەبەستی لەفظەکەی ئەیگەیەنێ و لەلگەیە لەسەری لەجێ‌و شوێنی دواندنی ژێری‌دا بدوێ– ئیتر ئەومانایە حەقیقی بێ یامەجازی بێ– ئیتر کەیفی خۆیەتی ئەو منطوق ومانایە حوکم بێ یا حوکم نەبێ– حوکمە بەمانای واجب....هتد حوکم وەك ئەو وێنەی دانەر لە شرح المختصر دا هێناویەتیەوە ، غەیری ئەویش حەرام کردنی ئۆف کردن لەبەر باوك و دایك ، کە ئەم فەرمودەی خوایە ئەیگەیەنێ و بەلگەیە لەسەری – کەوابوو پێیان نەلێیت ئۆف– ئۆفیش حەرامە ، حەرامیش یەکێکە لە ئەحکام ، ئەمە منطوقە بەلام لێدانیان مەفهومی ئایەتەکەیە واتە بەلفظ دەلالەت لەسەر ئۆف دەکا، بەعیلەتی حەرام بوونی ئۆف لێدانەکەش حەرامە، ئەو عیلەتەش ئەزیەتە ، یاخود ئەو منطوق و مانایە حوکم نیە، وەك لەوێنە هێنانەوەکەی خۆی وەرئەگیرێ لە قسەکەی دانەر خۆیدا

(٢)ئەو لەفظەی دەلالەت ئەکا لەشوێن گفتوگۆدا، ناوئەبرێ بە نص و دەق، ئەگەر ماناو مەبەستی قسەکەر بگەیەنێ بەبەرامبەرو جگە لەو مانایە مەبەستێکی‌تر هەلنەگرێ، وەك زیدٌ لە (جاء زیدٌ) دە ئەوە بێگومان تەنها ئەو کەسە ئەگەیەنێ بێ ئەوەی هەلبگرێ بۆ کەسێکی‌تر ، بێ‌بڕیارێکی تازە. (٣)ناویش ئەبرێ بە ظاهیر–وادەرئەکەوێ – ئەگەر لەباتی مانا ئەصلەکەی خۆی مانایەکی تر هەلگرێ بە مرجوحی وەك شێر لەوێنەی: ئەمڕۆ شێرێکم چاو پێ‌کەوت، مانای راجح و اصلی شێر یانی ئەو گیانلەبەرو دوڕندەیە، بەلام لەباتی ئەوە هەلنەگرێ مەبەست پیاوی ئازابێ، ئەمەش مانای مەرجوحە چونکە جیاوازیەو بەسەر ئەصلەکە تێپەڕ کراوە،

امّا المحتملُ لمعنىً مساوٍ للآخَرِ فيُسمّى مجملاً، وسيأتي كالجونِ في ثوبِ زيدٍ الجون فإنّهُ محتملٌ لمعنييهِ على السّواء.[١]

{واللفظُ إن دلّ جزؤه على جزءِ المعنى} كغلام زيدٍ {فمركبٌ}[٢] {وإلاّ} اي وإن لم يُدلّ جزؤهُ على جُزءِ معناهُ بأن لايكون لهُ جزءٌ كهمزةِ الإستفهامِ او يكونَ لهُ جزءٌ غير دالّ على جزءٍ كزيد، أو دالّ على معنىً غير جزءِ معناهُ كعبدُ الله علماً {فمفرد}[٣] {ودلالةُ اللفظِ على معناهُ مطابقةٌ} وسميَ دلالة مطابقةٍ ايضاً لمطابقةِ الدالّ للمدلول {وعلى جزءه} اي جزءِ معناهُ {تضمُنٌ} وسميَ دلالة تضمُنٍ ايضاً لتضمُنه المعنى لجزئه المدلول[٤]

---

مانای یەکەمیش حەقیقیە چونکە کە ووترا: شێر یەکسەر عەقڵ بەرەو دورندەکە ئەڕوا، بەکورتی مانای راجح حەقیقیەو نصە و مانای مرجوح جیاوازیە و ظاهرە.

(١)بەڵام ئەگەر ئەو ماناکەی تریش یەکسان بێ بۆ ئەم ، راجح و مەرجوح نەبێ ئەوە ناوئەبرێ بە مجمل، لەمەودوا باسی دێ وەك وشەی: جون ، بەواتای رەش و سپیش بێجیاوازی.

(٢)لەفظ ئەگەر بەشێکی نیشانەو بەڵگە بێ لەسەر بەشێك لە ماناکەی – وەك (غلام زید) غلام بۆ کەسێك ئەبێ و زید بۆ کەسێکیتر– ئەوە پێی ئەوترێ لەفظی مرکب وپێك هاتەی چەند لەفظێك.

(٣)ئەگەر بەشێك لە لەفظەکەی نیشانە نەبوو لەسەر بەشێ لەماناکەی، بەم شێوە لەفظەکە هەر یەك لەفظ بوو بەشی تری نەبوو ، وەك هەمزەیێ کە بۆ إستفهام و داوای حاڵی کردن بێ أ– یاخود لەفظەکە بەشی هەبێ بەڵام دەلالەت و نیشانە نەبێ بۆ دەست گرتن بۆ سەر مانایێك، وەك: زید ئەم لەفظەکە زێو یێ و دالی هەیە ، بەڵام نیشانە نین ، یاخود دەلالەتیش بکات بەڵام لەسەر مانای مەبەستی لەفظەکە نەکا ، وەك عبد الله ناوبێ بۆ کەسێك، دەی عبد ماناییکی هەیەو(الله) یش مانای خۆی بەڵام مەبەست نیە، ئەگەر ئەو لەفظە ئاوا بوو ئەوە پێی ئەوترێ مفردو تاك کراوە یاخود هەرتاك. (٤)دەلالەتیلەفظ لەسەرماناکەی پێیئەوترێ مطابقەو پڕاوپڕی یەك وەناویش ئەبرێ بەمطابقی دووبارە،چونکە داللەکە پڕبەپڕ مەدلولەکە ئەگەیەنێ کە بۆی دانراوە واتەمانا ئەوەیە لەفظەکە بۆئەو دانرابێ، بەڵام مەدلول ئەوەیە لەفظەکە دەلالەتی لەسەر ئەکات و ئەبێتە نیشانەو بەڵگە بۆی..بەڵام ئەگەر لەفظەکە دەلالەت لە سەر بەشێك لەماناکەی ئەکرد، ئەوە تضمنیەو دووبارە ناویش ئەبرێ بە دەلالەت تضمنی، چونکە ماناکە بەشێك لەمانا مەدلولەکەی گرتۆتە خۆی–ماناجیایە لەمەدلول–.

{ولازمه} اي لازم معناهُ {الذّهني} سواءً لزمَهُ في الخارجِ ايضاً ام لا {إلتزامٌ} وتسمَّى دلالةِ الإلتزامِ ايضاً لإلتزام المعنى اي إستلزامِه للمدلولِ كدلالَةِ الإنسانِ على الحيوانِ الناطقِ في الأوّل و على الحيوانِ في الثّاني، وعلى قابلِ العلمِ في الثّالثِ اللازمِ خارجاً ايضاً، وكدلالَةِ العمى اي عدم البصـــر عمّا من شأنـــه البصر ، على البَصرِ اللازِمِ للعمى ذِهناً المُـــنافي لهُ خارِجــاً[1]

{والأولى} اي دلالة المطابقةِ {لفظيّةٌ} لأنّها بمحـــضِ اللفظ {والثنتـــانِ} اي دَلالتا التَضمّنِ والإلتزامِ {عقليّتانِ} لتوقّفـــهما على إنتـــقالِ الذّهـــنِ من المعـــنى الى جزئهِ ولازمِه[2]

(١)وە ئەگەر لەفظەکە دەلالەت بکا لەسەر شتێ کە لازمی مانای لەفظەکە بێ لـــە ذهندا، نـەك لـە واقیع و جێبەجێ کردنـی سـەر زەوی‌دا، –ئیتر کـــەیفی خۆیـەتی لازمـــی بلێ یاخود نا– ئـــەوە پێی ئەوترێ: ئـــیلتزام وە دووبارە ناویش دەبرێ بە دەلالـــەتـــی ئیلتزامی، حونـــکە ماناکەی مستلزمی مانـــاکەیەتی. وەك دەلالـەتی ئینسـان لەســـەر حەیوانی ناطـــق و گیانلەبەرێکی ژیـر، ئـەوە مطابقەیـە، دەلالـەت لەسەر حەیـــوان و گـــیانلـــەبەری تەنها ، ئەوە تضمنە ، وەدەلالەتی لەســـەر فێری زانست ئەبێ ، ئـــەوە دەلالەتی ئیلتـــزامـــیە، هەرچەند ئەمەیان هـەر لـــە واقعـدا لازمی نـەبێ بـــەلـــکـــو دژی بـــێ، وەك کوێری – نەبـــوونی چاو– لـە کەسێکدا کاری سوشتی خۆی بیـــنین بێ ، واتـە کوێـر دەلالـەت بکـا لەسـەر عدَمیـش لەسـەر بصریش بەهـــەردوکیانەوە، چونکە ئـــەگەر دەلالـەت بکا لەســـەر یەکێکیان ئـەوە تضمنیە – دەلالەت بکـــا لـــەســـەر بینین کە لە ذهندا لازمـــی کوێرە ووتت کوێـر تاتصــــوری چاوبینین نەکـــەی لێی حـــالـــێ نابی کـــوێری یـانی چـی– وەلـە خارج و دەرەوەی ذهندا دژی‌یەکن.

(٢)یەکەمیان کە دەلالەتی مطابقەیە دەلالەتێکی لەفظیە، چونکە تەنـــها بە لـەفظی روت مەدلولەکەی ئەگەیێنێ پێویستی زۆری بە عەقـــڵ نیە – پـــێویســـتی بە عـەقڵ هەیە بـەلام زۆر نـا– دوانەکەی تریـــان کە تضمن و إلتزامن عـەقڵین، چونکـە هاتنـە جێیان بەسراوە بە تێپەربونی عەقڵەوە بەسەر مانا کولیەکەوەیە بۆ بەشێك لەو مانایە ، یاخود لازمی ئەو مانایـە –پێـــویستی بـەم لەفظەنیـە، بـــەلام پێویسـتی عـەقڵ، چونکە ئەمیش بێ لەفظ هەر نایکرێ–

{ثمّ المنطوقُ إنْ توقّفُ الصّدقُ} فيه {او الصحّة} لهُ عقلاً او شرعاً {على إضمار} اي تقدير فيما دلّ عليه {فدلالةُ إقتضاءٍ} اي فدلالةُ اللفظِ الدالّ على المنطوقِ على معنى ذلكَ المُضمَرِ المقصودِ تسمّى دلالةَ إقتضاءٍ[1]

الأول كما في سند اخي عاصم الآتي في مبحثِ المجملِ: رفعَ عن امّتي الخطأ والنسيان اي المؤاخذة بهما لتوقف صدقه على ذلكَ لوقوعهما . والثّاني كما في قوله تعالى: ﴿ واسألِ القريةَ ﴾ اي اهلها، إذ القريةُ وهي الأبنيةُ المجتمّعةُ لايصحُ سؤالُها عقلاً والثالثُ كما في قولكَ لمالكِ عبدٍ: إعتقْ عبدَكَ عنّي ففعَلَ فإنّهُ يصحُ عنكَ اي ملكهُ لي فأعتقهُ عنّي لتوقّفِ صحّةِ العتقِ شرعاً على الملك[2]

---

(١)پاشان منطوق صريح ئەگەر صدق و راستی کەلامـــەکە لە منطوقەکەدا – يـﺎ صحەتی عـەقلّیبێ، کـە مومکـین بوونـە، کـە موافــقـــەکەی دوو دیـواره بـۆ شـەرع بەسرابێ بەدیاریکردنی وشەیەکی شاراوه لـــە رستـــەکەدا ، ئەوه دەلالـەت ئەکا و دەست ئەگرێ بۆ سەر منطوقەکە ، ئەوه پێی ئەوتـــرێ دەلالـەتی إقتضاء –چونکە داوای شتێی مقـدر ئـەکا– واتـە کـەوابوو دەلالـەتی ئـــەو لەفظـەی دەلالـەت لەسـەر مەنطوقەکە ئەکا هەر دەلالەتیش لەســـەر مانای ئەو وشە شاراوەی کەمەبەستە ئەکا. ناو ئەبرێ بەدەلالەتی إقتضاء.

(٢)وێنـەبۆ یەکـەمیان وەك لـەکتێبی موسنەدی بـرا بچوکەکـەی عـاصم دایـە –کـە لەمـەودوا لەباسـی مجمـل دا دێ – لەسـەر ئوممـەتی مـن غەلـەت و لـەبیر چونـەوه هەلگیراوه ، تۆلەدانیان بەهۆی غەلەت و لەبیرچون لەسەر نەماوه ئەگەر وانەبێ ئەوه نیە غەلەت و لەبیرچونەوەی زۆرمان هەیە، –چونکە راستی فەرمودەکە بەسراوه بەو تقدیرکردن و دیاریکردنی ئەو وشە شاراویە– کـە لـێرەدا تۆلەدانیانـە،چونکـە وەك ووتمـان هــەردوکیان هــەر بەســەر ئــەرزی واقعـــەوه ، دووەمـــیان کەدروســتی مەنطوقەکەیە بەگوێرەی عەقلّ، وەك خوا ئــەفــەرمــوێ: پرسیــار لـــەو دێ بکە، واتە لەئەهلی دێکە، چونکە دێ بریتیە لـــە چـــەند خانوبـــەرەیـــێك، دەخۆ خانو بەگوێرەی عەقلّ دروست و گونجاو نیە پرســیاری لێبکرێ، ســـێهەمیان کەدروستی مەنطوقەکەیە بەگوێرەی شەرع وەك ئەڵێت: بەکەسێ کە خاوەنی بـــەندەیێکە لەباتی من ئەو بەندەیە ئازاد بکە، ئەویش کردی دە ئەو ئازادکردنە لەباتی تـــۆ دروستە، واتە ئەو بەندە بکە بە موڵکی من ئەمجا لەباتی من ئازادی بکە ، بۆیە ئەبـــێ بڵێت: بیکە بە موڵکی من چونکە بەگوێرەی شـەرع ئـازادی بـەندە دروستیەکەی بەسـراوه بەوەوه کە موڵکت بێ.

{وإنْ لم يتوقّف} اي الصّدقُ في المنطـوقِ ولا الصحّةُ لـهُ علـى إضمـارٍ {ودلَّ} اللفظُ المفيدُ لهُ {على ما لمْ يقصُدْ} بِهِ {فدلالـةُ إشارَةٍ} اي فدلالَةُ اللفظُ علـى ذلك المعـنى الذيّ لمْ يقصُدْ بـهِ تسـمّى دلالـةَ إشـارةٍ[1] كــدلالةِ قــولهِ تعـالى: ﴿ احـلّ لكـم ليلَـةَ الصّيــام الرّفـثُ الى نسـائكم ﴾ علـى صحّـةِ صــوم مـن اصبــح جُنُبـاً للزومـه للمــقـصود بهِ من جـوازِ جماعِهِنّ في الليلِ الصّادقِ بـآخر جزءٍ منــهُ.[2]

{والمفهوم ما} اي معنىً {دلّ عليهِ اللفظُ لا في محلّ النطقِ} من حكمٍ ومحلّهِ كتحريم كذا كما سيأتي[3]

---

(١)بـەڵام ئەگـەر راسـتی کەلامەکـە دەلالـەت لەسـەر مەنطوقەکـە ئـەکا و دروسـتی مەنطوقەکە هیچ کامیان پێویستیان نەئەبوو نەئەوەستان لەسەر دیاری کردنی وشە یا رستەیێکی شاراوە، لەگەڵ ئەوەش ئەو لەفظەی مەنطوقەکەی گەیاندووە دەلالەتیش ئەکا لەسەر شتیٚ کە مەبەست نیە، ئائەوە دەلالەتی ئیشارەیە، واتە دەلالـەت و دەست گرتنی ئەو لەفظە بۆ تـۆ لەسـەر ئـەو مانایـەی کەمەبەسـتی رستەکە نیـە و قـەصد نـەکراوە، ئـەوە ناوئـەبریٚ بـە دەلالـەتی إشـارە و ئامـاژەپێکردنی، -چونکـە پەنجـەو ئیشارەت بۆ ئەکا بۆ ئەوەش-

(٢)وەك خوای گەورە ئەفەرمویٚ: بۆتان حەلاڵ کراوە جیمـاع لەگەڵ ژنەکانتان بکەن لەشەویٚکدا بەیانیەکەی بـەرۆژو بـن ، دە ئـەم فەرمودەیـەی خـوای گـەروە دەلالـەت ئـەکا لەسەر دروستی رۆژووی کەسیٚ بەلەش پیسی رۆژ بکاتەوە، چونکە دروستی رۆژوەکە لازمی ئەو مەبەستەیە کەوشـەی ﴿ احلّ لکـم ﴾ ئەیگەیـەنیٚ دروسـتی جیمـاع کردنـە لەگەڵ خێزاندا لەشەودا، کە وشەی شەو بەکۆتا چرکەیشی دەوترێ، کـەوابوو راسـتی ئایەتەکە لـە مەنطوقەکـەدا دروسـتی مەنطوقەکـەش پێویسـتیان بـە تـەقدیر نـەبوو هـەر عەینی ئەو لەفظەی مەنطوقەکەی گـەیاند دەلالەتیشی کرد لەسـەر حوکمـی ئـەو لـەش پیسـە، کـە خـودی حوکمـی ئـەویش مەبەسـت نـەبوو، لـە ئایەتەکـەدا کـەوابوو بۆیـە دەلالەتی إشارەیە.

(٣)مەفهومیش بریتیە: لەو ماناو حوکمەی لەفظەکەی دەلالـەت ئـەکا لەسـەری، بەلاّم نەك لەشوێنی تەلەفوظ بە لەفظەکەدا -واتە لەفظەکەی نایگەیەنیٚ عیللەتی مەنگوقەکە ئەیگەیەنیٚ- یـانی مەفهوم بریتیـیە لـەحوکمێك لەگـەڵ شـوێنەکەیدا ، کـە لەفظەکـە دەست ئەگریٚ -وەك حـەرام کردنی ئەو شـتە- واتـە حـەرام کردنـی لێدانـی دایـك و بـاوك، وەك لەمـەودوا باسـەکەی دێـت ووتـت: حـەرام کـردن ، ئـەو حوکمەکەیـە، ووتـت: وەك ئەمەی لەمەودوا دیٚ، ئەوە شوێنەکەیەتی.

{فإنْ وافق حكمهُ} المشتملَ هو عليهِ{المنطوقَ} اي الحكم المنطوق به {فموافقة ويسمّى مفهوم موافقةٍ ايْضاً}[1] ثمّ هو {فحوى الخِطابِ} اي يسمّى بذلك {إن كان اولى من المنطوقِ}[2] {ولحنَهُ} اي لحن الخطابِ اي يُسمّى بذلكَ {إنْ كانَ مُساوياً للمنطوقِ}[3] مثالُ المفهوم الأولى تحريمُ ضربِ الوالدَين الدالّ عليه نظر للمعنى، قولُهُ تعالى: ﴿ فلاتقُلْ لهما افّ ﴾ فهو اولى من تحريم التأفيف المنطوق لأشديّة الضربِ من التأفيفِ في الإيذاء[4] ومثالُ المُساوي تحريمُ إحراقِ مالِ اليتيم الدالّ عليه نظراً للمعنى آيةُ ﴿ إنّ الذين يأكلونَ اموال اليتامى ظلماً ﴾ فهو مساو لتحريم الأكلِ لمساواةِ الإحراقِ للأكلِ في الإتلاف[5] {وقيلَ لايكونُ} الموافقة {مساوياً} اي كما قال المصنّف لايُسمّى بالموافقة المساوي وإن كان مثل الأولى في الإحتجاج به[6]

---

(١)جا ئەگەر ئەو حوكمەی -حەرام یا واجب- مەفهومەکەشی ئەگرێتەوە موافق و هاوچەشنی حوکمی مەنطوق و تلفظ پێکراوەکە بوو، ئەوە ئەو مەفهومە نائەبرێ بە مەفهومی موافقە وەك هەر موافقەشە.

(٢)پاشانیش ئەو مەفهومە ناو ئەبرێ بە (فحوى الخطاب) ناوکرۆکی گوتار ، ئەگەر مەفهومەکە لە مەنطوقەکە نزیکتر بێ لە حاڵی بوونی عیللەتەکە. (٣)ناویش ئەبرێ بە (لحن الخطاب) و مەبەستی گوتار ئەگەر مەفهومەکە یەکسان بێ بۆ مەنطوقەکە.

(٤)وێنە بۆ مەفهومێك کە نزیکتر بێ لە مەنطوق ، وەك حەرام کردنی لێدانی دایك و باوك ئەو فەرمودەی خوایە دەلاڵەت ئەکاتە سەری -نەك بەدەلاڵەتی وضعی بەڵکو بەهۆی تێڕوانینی ماناکەی- واتە عیللەتی حوکمی مەنطوقەکەیە- دەخۆ حەرام کردنی لێدان نزیکترە لە حەرام کردنی ئۆف کردن ، کە مەنطوقەکەیە چونکە ئازاری لێدان توندترو بەئازارترە لەئازاری ئۆف کردن.

(٥)وێنە بۆ ئەوەی مەفهوم و مەنطوق یەکسان بن: حەرام کردنی سوتاندنی ماڵی هەتیوە کە ئایەتی: بێگومان ئەوانەی سامانی هەتیوان ئەخۆن لەڕێی ستەمەوە... دەلاڵەت ئەکات لەسەری -نەك بەدەلاڵەتی وەضعی- بەڵکو بەووردبوونەوە لە ماناکەی ومەبەستیو عیللەتەکەی . چونکە سوتاندنی یەکسانە بۆ خواردنی .

(٦)ووتراویشە مەفهومی موافقە یەکسان و مساوی نابێت بۆ مەنطوق واتە: وەك دانەر خۆی لە (منع الموانع)دا ووتویەتی: مەفهومی یەکسان و مساوی ناونابرێ بە موافقە بەلای شافعیەوە، هەرچەند مەفهومە مساوی وەك (المفهوم الأولى) وایە ئەکرێ بە بەڵگەو بەبەڵگە قبولْ ئەکرێ.

وبإسمه المتقدِّم يسمى الأولى ايضاً على هذا[١] وفحوى الكلام مايفهمُ منهُ قطعاً[٢] ولحنُهُ معناهُ ومنْهُ قولُهُ تعالى: ﴿ ولتعرفنَّهم في لحنِ القولِ ﴾[٣] ويطلقُ المفهومُ على محلِّ الحكمِ ايضاً كالمنطوقِ وعلى هذا ما قال المصنِّف في شرحِ المنهاجِ كغيرهِ المَفهومُ إمّا اولى من المنطوقِ بالحُكمِ او مساوٍ لهُ فيه[٤]

{ثمّ قال الشّافعي} إمام الأئمةِ {و الإمامان} اي إمام الحرمين و الإمام الرّازي {دلالَتهُ} اي الدّلالَةُ على الموافقةِ {قياسيّةٌ} اي بطريقِ القياسِ الأولى او المساوي المُسمّى بالجليّ كما يعلمُ مما سيأتي[٥] والعلّةُ في المِثالِ الأوّلِ الإيذاءُ و في الثّاني الإتلافُ ولايضرُّ في النقلِ عن الأولينِ عدمُ جعلِها المساوي من الموافقةِ لأنّ ذلك بالنظرِ الى الإسمِ لا الحكمِ كما تقدَّمَ وامّا الثالثُ فلم يُصرِّحْ بالتسميةِ بالموافقةِ ولا نحوهِ مما تقدَّمَ[٦]

---

(١)(الأولى) ناوئەبرێ بەناوە پێشوەکەی خۆی (لحن الخطاب) بوو لەسەر رای ئەم قیلە. (٢)فحوى لە زاراوەی عەرەبیدا بریتی‌یە لەو مانا بێ گومانەی لە گوفتارێك وەردەگیرێ. (٣)لحنیش هەر بەواتای مانایە -بەڵام ئەم بێگومان بێ یان بەگومانەوەبێ-، لەم فەرمودەی قورئانەشدا هەر بەم واتایە هاتووە، (سوێند بە خوا دووڕوەکان لەمانای قسەکانیانەوە ئەیان ناسی) -لەبەر ئەم مانایە ئەم مەفهومانە وادانراون-.

(٤)مەفهوم وەك بەمانای حوکم و شوێنی حوکمەکە هاتووە، دووبارە ئەشبرێ بەسەر شوێنی حوکمەکەدا بەتەنها، وەك مەنطوق بۆ هەر دوولا بەکاردێ ، هەر لەبەر ئەمە دانەر لە شرح المنهاج دا ووتویەتی:مەفهوم یا أولى و نزیکترە بە حوکمەکەوە وەك مەنطوقەکە ، یاخود یەکسانە بۆی هەر لە حوکمەکەدا، دەخۆ دیارە ئەم مەفهومە تەنها بەمانای شوێنی حوکمەکەیە، نەك بۆ هەردووکیان.

(٥)شافیعی-کە پێشەوای پێشەوایانە-و هەردوو پێشەوا ووتویانە لەسەر مەنطوق: دەلالەتی لەفظی دال کە دەلالەت لەسەر مەفهومی موافقە ئەکا، ئەو دەلالەتە دەلالەتێکی قیاسیە -نەك لەفظی- یابە قیاسی الأولى یابە قیاس المساوی، ئەم دوو قیاسە ناوئەبرێ بە قیاس الجلی، وەك دەزانرێ لە بابەتی قیاسدا کە لەمەودوا دێت.

(٦)جا کە قیاس بوو پێویست بە مقیس و مقیس علیه و علەت هەیە، ئەی علەتەکە چی‌یە؟ ئەڵی علەت لە وێنەی یەکەمدا ئازاردانە، لە دووهەمدا لەناوبردنە، جا چۆن ئەو نەقڵە لە شافیعی و ئیمام الحرمین ئەکەی ! خۆ ئەم دووانە مساویان بە موافقە نەکردوە، ئیتر بەناوی ئەوانەوە نەقڵی ئەکەی؟ ئەمیش دەڵێ : مساوی باس نەکردن و

{وقيلَ} الدلالَةُ علـيهِ {لفظيّةٌ} لامدخَلَ للـقياسِ فيـها لفهمهِ من غيرِ إعتبار قياسٍ[1] {فقال الغزالي والآمـدي} من قائلي هذا القول: {فـهمتْ} اي الدّلالةُ عليهِ {من السّياقِ والقرائنِ} لا من مجردّ اللـفظِ فلولا دلالتُهما في آيةِ الـوالـدينِ على أنّ المطلوب بها تعظيمهما وإحترامُـهُما ما فهـم منها مـن منع التأفيفِ منع الـضّرب إذْ قدْ يقول ذو الغرض الصّحيح لعـبدِه لا تشتم فُلاناً ولكن إضربهُ[2] ولـولا دلالتهمـا في آيـةِ مالِ اليتيمِ على انّ المطـلوبَ بـها حفظُهُ وصيانتُـهُما فُهِمَ منها من منعُ أكلِه منعُ إحـراقــه إذْ قدْ يقولُ القائـلُ واللهِ ما اكلتُ مـالَ فـلانٍ ويكـونُ قـدْ احرقَـهُ فـلا يحـنثُ[3]

---

ناو نەبردنی بە موافقە زیان ناگەیێنیٚ‌بەم نەقڵە لەو دوو بەرێزەی یەکەمەوە، چونکە ئـەو نەکردنـە بـەگوێرەی نـاوە ، نـــەك بـەگوێرەی حـــوکم وەك لەپێشــەوە وتمان(لايُسمّى بالموافقة المساوي وإن كان مثل الأول الآخر) مساوی ناونابریٚ بە موافقە هەرچەند لە کردن و بەڵگەدا وەك: الأولى وايە، بەڵام سـێهەمیان کە ئیمامی رازیە ، هەر بێدەنگ بـوو نەمساوی ناوبردووە بە موافـقە، وە نـە (الخطاب) وەنە بەبیٚ (الخطاب).

(١)ووتراویشە دەلالەتی دال لەسەر مەفهومە موافقەی لیٚحاڵی ئەبیٚ، بیٚ ئەوەی ئیعتیباری قیاس بکەی، هەر لە لەفظەکەی فەهم ئەکریٚ. (٢)غەزالی و ئامێدی کەسەر بەم قەولەن ووتویانە دەلالەت لەسەر مەفهومی موافقە کە فەهم ئەکریٚ وەرئەگیریٚ لە سیاق واتە بابەتی باسەکەت و قەرینەوەیە نەك تەنها لە لەفظە روتەکە، چونکە ئەگەر دەلالەتی سیاق و قەرینە نەبیٚ‌لەسەر ئەوەی کە مەبەستی ئایەتەکە، ئەوەنەبیٚ باوك و دایك بەگەورە سەیر بکرێن و رێز لیٚنرێن، ئەوکاتە مەنعی لێدان لە مەنعی ئۆف کردنەوە لە ئایەتەکەوە وەرئەگیراو حاڵی نەئەبوی، بۆ حاڵی نەئەبوون؟ چونکە پیاوێکی ژیر مەبەستێکی هەیە لەم قسەیدا کەدەڵیٚ بە بەندەکەی : جوێن نەدەی بە فلانەکەس ، بەڵام لیٚی دەچونکە کەسی وا هەیە جوێنی پیٚ‌بدریٚ ئازاری نیە، تەنها لێدانی لاگرانەو ئازارە.

(٣)ئەگەر لەئایەتی باسی ماڵی هەتیـودا سیاق و قەرینە نەبن لەسەر ئەوەی مەبەست پیٚ پاراستنی ماڵیەتی ، ئەو کاتە مەنعی سوتاندنی ماڵی هەتیو وەرنەئەگیرا لە مەنعی خواردنیەوە، چونکە لەوانەیە یەکیٚ بڵیٚ: واللە ماڵی فلانە کەسم نەخواردوە بەڵام سوتاندویەتی ئەو کاتە سوێندەکەی نەدەکەوت و گوناهبار نەئەبوو.

{وهي} اي الدلالةُ عليه حينئذٍ {مجازيّةٌ من إطلاقِ الأخصِّ على الأعمّ} فأطلق المنع من التأفيف في آيةِ الوالدينِ واريدَ المنعُ من الإيذاءِ ، واطلق المنع في اكلِ مال اليتيمِ، في آيته واريدَ المنعُ من إتلافه[1]

{وقيل نقل اللفظ لها} اي للدلالةِ على الأعمِّ {عرفاً} بدلاً عنِ الدّلالةِ على الأخصِّ لغةً فتحريمُ ضربِ الوالدين و تحريمُ إحراقِ مالِ اليتيمِ على هذينِ القولينِ من منطوق الآيتينِ، وإن كانا بقرينةٍ على الأوّل منهما[2] وكثيرٌ من العلماءِ منهم الحنفيّة على انّ الموافقةَ مفهومٌ لامنطوقٌ ولا قياسيّ كما هو ظاهرُ صدرَ كلام المصنِّف[3] ومنهُم منْ جعلَهُ تارةً مفهوماً وأُخرى قياسياً كالبيضاوي فقالَ الصّفيُّ الهنديُّ، لاتَنافي بينَهما لأنَّ المفهومَ مسكوتٌ والقياسُ إلحاقُ مسكوتٍ بمنطوقٍ[4] قال المصنِّف: وقدْ يُقالُ بينهما تنافٍ لأنّ المفهومَ مدلولُ اللفظِ والمقيسُ غيرُ مدلولٍ له[5]

---

(١)لەم كاتەدا ئەم دەلالەتە لەسەر مەنطوقی موافقەیە، دەلالەتێكی مەجازیە لەم، بارەیەوە كە اخص ووتراوەو اعم مەبەستە، واتە مەنعی ئۆف كردن لە ئایەتی رێزلێنانی باوك و دایكدا تلفظ پێكراوەو مەبەست پێی هەموو جۆرە ئازاردانێكە ، وەلەو ئایەتەی قەدەغە كردنی خواردنی ماڵی هەتیو ئەكا مەبەست پێی لەناو بردنیەتی بەهەرجۆرێك هەبێ.

(٢)وتراویشە هەر حەقیقەتێكی عورفیە، لە دەلالەت كردنەوە لەسەر اخص لە روی لۆغەتەوە –كە ئۆف كردنە– نەقڵ كراوە بۆ دەلالەت كردن لەسەر اعم لە روی عورفەوە كە وابوو حەرام كردنی لێدانی دایك و باوك و حەرام كردنی سوتاندنی ماڵی هەتیو لەسەر رای ئەم دوو قیلە مەنطوقی ئایەتەكانن، نەك مەفهومیان، هەرچەندە ئەو لێدان و سوتاندنە لەسەر قیلە یەكەمەكەیان

(٣)زۆربەی زانایان كە حەنەفیەكانیش لەوانن لەسەر ئەوەن كە موافقە مەفهومە و بەس، نەك مەنطوقە وەك غەزالی كۆمەڵێ ووتیان: وەنە قیاسیشە وەك شافیعی و شوێن كەوتوانی، ظاهیری سەرەتای گفتو گۆی دانەریش هەروابوو. واتە موافقە مەفهومە.

(٤)هەندێكیان موافەقەكەیان جارێ بە مەفهوم داناوە و جارێكیش بە قیاس، وەك بەیضاوی چونكە الصفی ووتویەتی: دژایەتی لە نێوان مەفهوم قیاس دا نیە، چونكە مەفهومەكە محلی حوكمەكەی مسكوتە، قیاسیش شوێن خستنی مسكوتە بەدوای مەنطوقەوە. (٥)بەلام دانەر ووتویەتی: دەبێ بووترێ لەنیوانیاندا دژایەتی هەیە، چونكە مەفهوم مەدلولی لەفظە و ئەو ئەیگەیەنێ، بەلام مقیس مدلول علیە لفظ نیە و لفظ نایگەیەنێ.

{وإن خالَفَ} حكمَ المفهوم الحُكمَ المنطوقَ به {فمُخالَفةٌ} يُسمَّى مفهومَ مُخالَفة ايضا كما سيأتي التعبيرُ بِهِ في مبحَثِ العام[1] {وشرطُهُ} ليتحقّق {أن لايكونَ المسكوتُ تُرِكَ لخوفٍ} في ذكرِهِ بالموافقَةِ كقولِ قريبِ العهدِ بالإسلامِ لعبدِهِ بحضورِ المُسلمين تصدَّقْ بهذا على المُسلمِين و يريدُ و غيرَهم، وتركهُ خوفاً من ان يُتَّهَمَ بالنِّفاقِ {ونحوِهِ} اي ونحوِ الخوفِ كالجَهلِ بحُكمِ المسكوتِ كقولِكَ في الغَنَمِ السائمَةِ زكاةٌ وانتَ تجهلُ حكمَ المعلوفَةِ.[2] {و}ان {لايكون المذكورُ خرَجَ للغالبِ} كما في قولِهِ تعالى: ﴿ وربائبكم اللاتي في حجورِكُمْ ﴾ فإنَّ الغالبَ كونُ الربائبِ في حجورِ الأزواجِ اي تربيتِهِم {خلافا لإمام الحرمين} في نفيهِ هذا الشرطَ لما سيأتي مع دفعه[3]

---

(١)وەئەگەر حوکمی مەفهومەکە جیاواز بوو لەگەڵ حوکمی مەنطوق و تەلەفظ پێکراوەکەدا، ئەوە مخالفەیە، وەناویش ئەبرێ دووبارە بە مەفهومی موخالفە، وەك لەمەودوا لەباسی عامدا هەر بەمەفهومی مخالفە، وەك لەمەودوا لەباسی عامدا هەر بە مفهومی مخالفە ناو ئەبرێ.

(٢)مەرجی مەفـهومی مخالەفە بۆ ئەوەی بێتەدی، ئەوەی بێدەنگی لێکراوە لە ترسی ئەوە تەرك نەکرابێ نەوێرێ باس بکرێ بەشێوەی مەنطوقەکە ، وەك کەسێکی تازە موسوڵمان بە بەندەکەی دەڵێ بەئامادەیی هـەندێ لە موسوڵمانان: ئەم پارەی خەیرە دابەش بکە بەسەر موسوڵماندا، بێگـومان چونکە هێـشتا باوەڕی جێی خۆی نەگرتووە، مەبەستیش موسوڵمان و غـەیرە موسوڵمانیـشە، بەڵام لەترسی ئەوەی گومانی مونافقی لێنەبرێ تەرکی غـەیـرە موسوڵمانی لێکـردووە، یاخود ئەوەی بێدەنگی لێکراوە لەبەر شتێکی تربـێ وەك تـرس، ئـەویش وەك نـەزانینی حوکمی ئەوەی بێدەنگی لێکراوە وەك ئەڵێت: لەمەڕو ماڵاتیشدا کەبەدەمی خۆیـان ئەلەوەڕێن زەکات هەیە، ئەمـەش لەکاتێکدا تۆ حوکمی ئەو ئاژەڵە نەزانی کەبە ئالف دان ئەژی.

(٣)مەرجی دووەم ئەوەیە ئەوەی باسکراوە لەبەر غالبیەتی نەبێ، وەك ئـەو ئایەتە دەفەرموێ: (ئەو زڕ کچانەتان لێحەرامە کە خۆتان پەروەردەیان ئەکەن) ئەمە غـاڵب وایە زڕ منـداڵ و منداڵـی ژنەکـەی پیاوەکـان بـەخێویان ئەکـەن ، ئەمـە مـەفهومی موخالەفەی نیە، چونکە (في حجورکم) بۆ غاڵـبە، زۆربەی تریش هەن لای ئەم مێردەی نین و لێشی حەرامن رای ئیمام جیاوازە چونکە نەفی ئەم مەرجەی کردوە ، لەبەر ئەوەیە بەڵگەی لەمەودوا دێو لەبەینیش ئەچێ وەبەرپەرچ ئەدرێتەوە .

{او} خرجَ المذكور {لسؤالٍ} عنهُ او {حادثةٍ} تتعلّقُ بهِ {او للجَهلِ بحكمِهِ} دونَ حكم المسكوتِ عنْهُ كما لو سُئِلَ النبيّﷺ هل في الغنَمِ السائِمةِ زكاةٌ ، او قيلَ بحضرَتِهِ لفُلانٍ غَنمٌ سائِمةٌ ، او خاطَبَ من جَهِلَ حكمَ الغَنَمِ السائِمةِ دونَ المعلوفَةِ فقال في الغنَمِ السائِمةِ زكاةٌ[1] {او غيرِهِ} اي خرَجَ المذكورُ لغيرِ ما ذُكِرَ {مما يقتضي التخصيصَ بالذّكرِ} كموافقَةِ الواقعِ كما في قولِهِ تعالى: ﴿ لايتَّخذِ المؤمنون الكافرِينَ اولياءَ من دونِ المؤمنين ﴾ نُزِلتْ كما قال الواحدي وغيرِهِ في قومٍ من المؤمنين والوا اليهود اي دون المؤمنين[2] وإنّما شرطوا للمفهومِ إنتِفاءَ المذكوراتِ لأنّها فوائِدٌ ظاهِرةٌ وهو فائِدةٌ خفيّةٌ فأخّرَ عنها[3]

---

(١)یاخود ئەوەی باسکراوە لەبەر ئەوەیە پرسیاری لەبارەوە کراوە، یاخود کەباسکراوە تەنها لەبەر دەرخستنی حوکمی روداوێکە وەهەر پەیوەندی بەوەوە نەبێ. یاخود کە باسکراوە لەبەر ئەوەیە حوکمی باسکراوە نازانێ، نەك حوکمی ئەوەی بێدەنگی لێکراوە، وەك ئەوەی ئەگەر پرسیار بکرێ لە پێغەمبەرﷺ ئایا زەکات ئەدرێ لە ماڵاتێکدا بەدەم خۆی بلەوەرێ؟ یاخود بووترێ: فلانە کەس مەڕو ماڵاتی هەیە کەبەدەم خۆیان ئەژین، پێغەمبەریش ئامادەی ئەم گفتوگۆیە، یاخود پێغەمبەر گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکدا بکا کە حوکمی مەڕ و ماڵاتێك نەزانێ بەدەم خۆی بلەوەرێ، نەك دابەسە، پێغەمبەریش بفەرموێ: لەمەڕ و ماڵاتێکدا بەدەم خۆی بلەوەرێ زەکات هەیە، ئەمە وەڵامە بۆ هرسیێمەسئەلەکە.

(٢)یاخود مەنطوقەکە باسکراوە لەبەر هۆیەکیتر جگە لەو هۆیانەی پێشوو، لەو هۆیانەی داخوازی ئەوەیە حوکمەکە تایبەت کراوە بە مذکور و باسکراوەکە، لەبەر ئەو تخصیصە مەفهومی مخالەفەی نیە، لەو هۆیانە موافقەی واقع وەك لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: موسوڵمانان نەکەن و بۆیان نیە کافران بکەن بەگەورەی خۆیان بێبڕواداران ، ئەم ئایەتە مەفهوم مخالەفەکەی دروست نیە،کە بریتییە لە ئەگەر موسوڵمانان کافر لەگەڵ موسوڵمانێك بکەن بە گەورەی خۆیان دروستە، ئەم ئایەتە وەك واحدی و غەیری ئەویش ووتویانە دابەزیوە لەسەبارەت هەندێ موسوڵمانەوە کە جولەکەیان کردبوو بەگەورەی خۆیان نەك موسوڵمانان بکەن بە پشت و پەنای خۆیان ، دەی ئەم ئایەتە موافقی واقع و روداوەکەیە، بۆیە مەفهومی مخالەفەکەی دروست نیە.

(٣)ئەی بۆ ئەو هەموو مەرجەیان بۆ مفهومی مخالەفە داناوە؟ بۆیە مەرجیان گرتووە ئەوانە هەموویان نەبێ ئەمجا مفهومی مخالەفە دێتەدی، چونکە ئەوانە هەموویان سودەکەیان ئاشکرایەو بەدەرەوەن، بەڵام ئەو سودێکی شاراوەو نادیارە، دەخۆ

وبذلكَ إندفعَ توجيهُ إمامِ الحرمينِ لما نفاهُ مُخالِفاً للشافعي بأنّ المفهوم من مقتَضياتِ اللفظِ ، فلاتسقطُهُ موافقةُ الغالِبِ وقد مشى في النهاية في آية الربيبة على مانقله عن الشافعيّ من أنّ القيد فيها لموافقةِ الغالب لامفهوم له بعد أن نقل عن مالك القول بمفهومه منا نّ الربيبة الكبيرة وقت التزوّج بإمّها لاتحرم على الزّوج لأنّها ليست في حجره وتربيته وهذا و إن لم يستمر عليه مالك فقد نقله الغزالي عن داود كما نقل إبن عطية عن علّي كرم الله وجه أنّ البعيدة عن الزةج لاترم عليه لأنّها ليست في حجره ورواه عنه بالسندِ إبن ابي حاتم و غيره[١] ومرجعُ ذلكَ الى أنّ القيدَ ليس لموافقة بالغالِبِ[٢] والمقصودُ مما تقدَّمَ أنّهُ لامفهومَ للمذكورِ في الأمثِلَةِ المذكورةِ ونحوِها. ويُعلَمُ حكمُ المسكوتِ فيها من خارجٍ بالمخالَفَةِ، كما في الغَنَمِ المعلوفَةِ لما سيأتي[٣]

دیاریش پێش نادیارە بۆیە تا ئەوان بن ئەم نیەو دوایان کەوتووە.

(١)بەو بەڵگەیە بەڵگەی ئیمام الحرمین لەبەین چوو، کەدەڵێ : مفهوم داخوازی لەفظە، دە کەوابوو بە موافقە غالب لاناچێ. بەلاّم چونکە مفهوم خەفیەو ئەوانیش ظاهیرن ، هەموو کات تا ظاهیر هەبێ خەفی نابێ، چونکە موافقەی غالب ظاهیریش و مفهومیش خەفیە، ئەمە بەڵگەیە بۆ مەرجی نەبوونی صیغەی غالب لە مفهومی لغەدا. بە جیاوازیش بۆ شافیعی، لە کتێبی (النهایة)دا لەبارەی ئایەتی زڕکچەوە ئیمام الحرمین لەسەر رۆیشتوە کە خۆی نەقلی کردوە لەشافیعی‌یەوە کەقەیدی(الحجور)لە ئایەتەکەدا بۆ موافقەی غالب مفهومی نیە، دوای ئەوەش لە ئیمام مالیکەوە نەقلی کردووە، کە ووتویەتی‌ئەم قەیدە مەفهومی هەیە، بەم مانایە زڕکچی گەورە لەکاتی شوکردنی دایکیا حەرام نابێ لەسەر مێردەکەی ، چونکە لە کۆش و پەروەردەکردنی ئەودا نەبووە، ئەمەش هەرچەند ئیمام مالك زۆر بەسەر ئەم رەئیەوە نەماوەتەوە، بەلاّم غەزالی لە داودەوە نەقلی کردوە ، وەك إبن عطیە لە عەلی‌یەوە نەقلی‌کردوە، کە ئەو زڕکچەی دوورە لەپەروەردەی مێردی دایکیەوە حەرام نابێ لەسەر مێردەکەی چونکە لە کۆش و پەروەردەی ئەودا نەبووە، إبن أبی حاتەم و غەیری ئەویش لە حەزرەتی عەلیەوە نەقلیان کردووە.

(٢)ئەو قسە بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە، ئەو قەیدە بۆ موافقەی غالب نیە، بەڵکو پێیان وایە بۆ إخراجی زڕ کچی گەورەیە. (٣)مەبەست ئەوەنیە ئەو حەوت میثالەی پێشوو حوکمیان نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە مەفهومی مخالەفە بۆ مەنطوقەکە نیە لەو هەموو میثالانەدا کە باس کران و وێنەی ئەوانیش، بەڵکو حوکمی ئەوەی بێدەنگی لێکراوە لەشتێکی‌تر ئەزانرێ کە لەدەرەوەی ئەم میثالانەیە، جا ئیتر حوکمی مەفهومەکە

او الموافقةِ كما في المثالِ الأولِ لما تقدَّمَ وفي آيتي الربيبةِ والموالاةِ للمعنى وهو انّ الربيبَةَ حرمَتْ لئَلا يقَعَ بينها وبينَ امِّها التباغُضُ لو أُبيحَتْ بأنْ يتزوَّج بها فيوجَدُ نظرٌ للعادَةِ في مثْلِ ذلكَ سواءٌ كانتْ في حجرِ الزَّوجِ أم لا.[1] وموالاةُ المؤمنِ الكافرِ حرمت لعداوةِ الكافرِ لهُ وهي موجودةٌ سواءٌ والى المؤمنَ أم لا، وقدْ عمَّ من والاهُ ومن لمْ يوالهِ قوله تعالى:﴿ ياءيها الذينَ آمنوا لاتتخذوا الذينَ إتخذوا دينكم ... ﴾ الى قوله: ﴿والكفَّارَاولياء ﴾[2]

ومن المعنى المعلوم به موافقةُ المسكوتِ للمنطوقِ نشأ خلافٌ في انّ الدلالةَ في المسكوت قياسيَّةٌ او لفظيَّةٌ وكانَ القيدُ لم يُذكر حكاهُ في قوله[3]

---

بەموخالفی مەذکورەکە بێ، وەك لە ماڵاتی دابەستەدا زەکات نیە، لەبەر ئەو هۆیەی لەمەودوا دێت یاخود. (١)حوکمی مەفهومەکە موافق و هەروەك حوکمی مەنطوق وایە، وەك لە میثالی یەکەمدا، ئەم پارە ببەخشەرەوە...هتد، لەبەر هۆکەی پێشوو کەترسی توهمە بوو، یا وەك ئەو دوو ئایەتەی لە زڕ کچ ئەدویٚو لە موالات ئەویش لەبەر مەبەست و عیلەتێك ، کەلە یەکەمیاندا، زڕکچ حەرام کراوە بۆ ئەوەی لەنێوان ئەوو دایکا رق و قین بەرپا نەبێ، ئەگەر دایکی حەڵاڵ بکرێ واتە مارەی بکا، چونکە بەگوێرەی عادەت رق و قین لە هەوێ یاریدا دروست ئەبێ، ئیتر لای خۆی پەروەردە بووبێ یاخود نا.

(٢)لەدووهەمیاندا پشتگیری موسوڵمان بۆ کافر حەرام کراوە چونکە کافر دوژمنایەتی هەیە بۆ موسوڵمانان، ئەو دوژمنایەتیە هەر هەیە ئیتر کەیفی خۆیەتی موسوڵمانەکە تەنها کافرەکە بکا بەپشت و پەنای خۆی یاخود لەگەڵ کافردا بیکا بەگەورەو پشتی خۆی، خۆ بێ گومان ئەو ئایەتە هەردوکیان ئەگرێتەوە ، کە ئەفەرموێ: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەوانی ئایینی ئێوەیان کردوە بەگەمە و گاڵتە، و کافرەکانیش نەیان کەن بەگەورەو پشت و پەنای خۆتان..

(٣)لەوعیلەت و هۆیەی موافەقەتی مسکوتی پیٚزانرا بۆ مەنطوقەکە ، جیاوازی دروست بووە، ئایا ئەو دەلاڵەتەی دەلاڵەت ئەکا لەسەر مەسکوتەکە قیاسیە یاخود لەفظیە، جا ئەگەر دەلاڵەتەکە لفظ بێت چۆن ئەتوانی بڵێیت: فی حجورکم ، غەیری حجوریش ئەگرێتەوە؟ ئەمیش دەڵێ : هەروای حیساب بکە ئەم قەیدە هەر نەبووە چونکە بۆ غالبە ئەم خیلاف و جیاوازیە دانەر خۆی بەزمانی خۆی گەڕاندویەتیەوە.

{ولايمنع} اي مايقتضي التخصيص بالذكرِ {قياسُ المسكوتِ بالمنطوقِ} بأن كانَ بينَهما علةٌ جامعةٌ لعـــدمِ معارضتِهِ لهُ بل قيلَ يعمّهُ أي المسكوتِ المشتمِلِ على العلةِ {المعروضِ} للمذكورِ من صـــفةٍ او غيرِها إذْ عارضَهُ بالنسبةِ الى المسكوتِ المشتمل على العلّة كأن لم يذكَرْ.[١]

﴿وقيلَ لايعمّـــهُ إجماعاً﴾ لوجـودِ العارضِ وإنَّمـــا يلـــحق بـه قـــيـــاســـاً[١] وعدم العموم هو الحقُّ كما قال المصنِّف ، لاسـيَما وقـــدْ إدّعـــى بعضُهم الإجمـاعَ عليهِ كما أفــادَتْـــهُ العبارةُ بخلافِ مفـــهومِ الموافقة لأنّ المـــسكوتَ هنا ادونُ من المـــنطوقِ بخلافِـــهِ هنـــاكَ كمـــا تقدَّمَ[٢] وبل هنا إنتقاليّةٌ لاإبــطاليّة[٣]

---

(١)ئەوەی تایبەت کردنی حوکمەکە ئـــەکا بە مذکورەکەوە -واتە مەفهومی موخالفە نیە- مانع نیە مەسکوتەکە قیاس بکـــا و بکێشێ بە مەنطوقەکەدا ، بەمەرجی خۆی بەم شێوە عیلەتێك هەبێ هەردوکیان کـــۆبکـــاتەوە، چونکە ئەوەی داوای تخصیص ئـەکا نەیارنیـە بـۆ قیـاس ، نـەك ئـەوە بـەڵکو ووتراویـــــشە لـەفظی مـەوصوف و مەعروضەکـە (الربـائب) و ذکـر کـراوە، مەسکوتـــێك کـە عیلەتەکــــە بگرێتـەوە ئەیگرێتەوەو عامە بۆی ، چونکە عارض و وەصفەکەی بەنیسبەت مـــەســـکوتەوەبە عیلەتیشەوە، هەروای دانێ ذکر نەکراوەو باس نەکـــراوە.

(١)ووتـــراویشە مـەعروض ومەوصـــوفەکـــە مەســـکـــوتەکە ناگرێتـەوە، بـــەڕای هەموان چونـــکە ڕێگـــرێك هەیـــە لە لــــەفظەکەدا کـــە قەیـــدەکەیە، بـــەڵام مەســـکوتەکە بـــە قیـــاس ئەگرێتـــەوە پـــاشـــکۆی مەنطوقەکـــە.

(٢)مـــەعـــروضەکە مەسکوتەکە ناگـــرێتەوە ، ئـــەو بۆچـــوونـــەی حـەق و ڕاستە وەك دانـــەر لە (منع الموانع) دا ووتویەتی بەتایبـــەت هەندێکـــیان لەسەر ئـەو ڕایـە داوای ئیجـــماعیشیان کـردووە، وەك داڕشـــتـــنی عیبارەتەکـــەش ئەیگەیەنێ -لەپێشا بەقیل هـــێناویە ئەمجا بە إجماع بە شوێنیـــا ئەهێنێ- بەڵام بە پێچەوانەی مەفهومە وافەقەوە لـــێدانی بـــاوك و دایك چونکە مەســـکـــوتەکەی ئێرە -زڕ کچی دوور- نزمترە لە مەنطوقەکـــە بـــەپـــێچەوانەی مەسـکوتەکەی ئـــەوێ -لێدانی باوك و دایك- وەك لە پێشەوە باسکرا.

(٣)حەرفی بـل لێرەدا بۆ ئینتقال و قۆنـــاغ بڕی بـــابـــەتـــەکەیە، نەك بۆ إبطال و پوچەڵ کردنەوەی پێش خۆی.

﴿وهو صفة﴾ اي مفهوم المخالَفَة بمعنى محلّ الحكم مفهومُ صفةٍ كما قال المصنّف والمرادُ بها لفظٌ مقيّدٌ لآخرٍ ليس بشرطٍ ولا إستثناءٍ ولا غايَةٍ، لا النعتُ فقط اي اخذاً من إمام الحرمينِ وغيرِه ؛ حيثُ ادرجوا فيها العدد والظرفَ مثلاً ﴿كالغنَم السائِمَة او سائِمة الغنَم﴾ اي الصّفةُ كالسائمةِ في الأولِ من في الغنَمِ السائِمَةِ زكاةٌ وفي الثّاني من في سائمةِ الغنَمِ زكاةٌ قدّم من تأخيرٍ[1] كلٌ منهما يروى حديثاً ومعناهُ ثابتٌ في حديثِ البخاري وفي صدقَةِ الغنمِ وفي سائِمتها إذا كانت اربعينَ الى عشرينَ ومأة شاة..الخ[2] ﴿لا مجردَّ السائمة﴾ اي من في السائمةِ زكاةٌ، إن روى فليس من الصِّفةِ ، ﴿على الأظهر﴾ لإختلالِ الكلامِ بدونه كاللّقب[3]

---

(١)مەفهومی موخالەفە -بەواتا جێی حوكمەكە كە في حجوركم حوكمەكەی حورمەتەنەك بەواتای حوكمەكەی یاهەردوكیان- بریتییە لە مەفهومی صفەت - مەفهومی في حجوركم من غير حجوركم-مەبەستیش بە صفەت هی نەحویەكان نیە بەڵكو هەر لەفظێك هەر لەفظێكی تر ببەستێتەوە كۆتی بكا ئەو لەفظە مەبەستە، بەلام ئەبێ ئەو لەفظە نەشروط بێ -إن جئتني اكرمك- نە إستثنا بێ -جائني القوم إلا زيداً- وە نە غایە بێ -سرتُ الى البصرةِ- ، مەفهومی ئەم سیانە موخالەفەی نیە ، چونكە شەرط نەبوو مەشروط نابێ، لە بەصرە زیاتر نەڕۆی لە غایەتەكە وەرئەگیرێ، نەك لە مەفهوم مەبەست تەنها ئەوەیە نەعتی نەحوی نەبێ، واتە بەڵگەشم ئەوەیە لە ئیمام الحرمین و غەیری ئیمام الحرمین وەرگیراوە: كە ژمارەو ظەرفیشیان خستۆتە ناو صفەتەوە بە صفەت حسێبیان كردوە، خۆ بێگومان (سبعين مرة) صفەت نیە، یاخود جاء یوم الجمعە صفەت نیە،، مەفهومی موخالەفەیان هەیە، واتە لەرۆژێكیتردا نەهاتووە، بۆ وێنە وەك-في الغنم السائِمةِ زكاةٌ- ئێستە وشەی السائمە صفەتە ، چونكە لەفظێكە زەكاتی ماڵاتەكەی بەستوەتەوە بەخۆیەوە، ئیتر كەیفی خۆیەتی لەپێشەوە بێ یاخود لەدواوە، چونكە (٢)هەردوكیان وەك فەرمودە ریوایەت كراوەو ماناكەشی لە بوخاریدا سەلمێنراوە چونكە ئەفەرموێ: زەكاتی مەڕو ماڵات و ئەوەی بەدەم خۆی ئەلەوەڕێ لە چلەوە تا سەدو بیست، یەك سەرە.

(٣)تەنها لەفظی السائمە لەرستەی (في السائِمةِ زكاةٌ)، ئەگەر ریوایەت بكرێ ئەوە بەصفەت حیساب ناكرێ لەسەر قەولی اظهر،چونكە رستەكە بەبێ ئەو ناتەواو ئەبێ چونكە (في الزكاة) ئەمێنێتەوە دەخۆ هیچ مانایەكی نیە ، وەكو لەقەب هەتا باسی

خاوەنەکەی ئەکەی هیچ مانایەکی بەسود ناگەیەنێ، هەزار ساڵ بڵێیت کەچەڵ بەکەڵك نیه هەتا نەڵێیت حەمە کەچەڵ، چونکە کەچەڵ زۆرن.

وقيل هو منها لدلالتِه على السّومِ الزائِدِ على الذّاتِ بخِلافِ اللّقبِ ، فيفيدُ نفي الزكاة عنِ المعلوفةِ مطلقاً، كما يفيدُ إثباتَها في السّائمةِ مطلقاً[(١)] و يُؤخذُ من كلام إبنِ السّمعاني أنّ الجمهور على الثّاني حيثُ قال الإسمُ المشتقُّ كالمسلمِ والكافرِ والقاتلِ والوارثِ يجري مجرى المقيّدِ بالصفةِ عندَ الجمهور[(٢)] «وهل المنفيّ» عن محليّةِ الزكاةِ في المثالينِ الأولينِ «غير سائمتها» وهي معلوفةُ الغنمِ «او غيرُ مطلقِ السوائمِ» وهو معلوفةُ الغنمِ و غيرُ الغنمِ «قولان»[(٣)] الأول: ورجّحهُ الإمامُ الرّازي و غيرهُ ينظرُ الى السّومِ في الغنَمِ[(٤)] والثّاني الى السّومِ فقط لترتّبِ الزكاةِ عليهِ في غيرِ الغنم من الإبلِ والبقرِ[(٥)] وجوّزَ المصنِّفُ أن تكونَ الصفةُ في سائِمةِ الغنمِ لفظُ الغنمِ، على وزانِها في: مطلُ الغنيِّ ظلمٌ. كما سيأتي فيفيد نفي الزكاةِ عن سائمةِ غيرِ الغنمِ ، وإنْ ثبت فيها بدليلٍ آخر وهو بعيدٌ لأنّهُ خلافُ المتبادرِ الى الأذهانِ.[(٦)]

---

(١)ووتراویشە السائمەی روت هەر لەو صیفەتەیە کە مەفهومی هەیە، چونکە دەلالەت ئەکا لەسەر بەدەم لەوەڕاندن، وەك دەلالەتیش ئەکا لەسەر خودی بەدەم بلەوەڕەکە، بەلام لەقەب وانیە قیاس ناکرێتە سەریەك، چونکە لەفظ بەتەنها دەلالەت لەسەر زاتەکە ئەکا، کەوابوو مادام خۆیشی بەتەنها هەر بەصفەت حیسابە، ئەو رستەیە نەفی زەکات لەهەموو جۆرە دابەستەیەك ئەگەیەنێ، وەك زەکات دانەکەشی ئەگەیەنێ لە هەمو جۆرە ئاژەڵێکدا بەدەم خۆی بلەوەڕێ.

(٢)لە ووتەکەی إبن السمعانیدا وەرئەگیرێ کە جمهوری عولەما لەسەر قیلی دووەمن، چونکە ووتویەتی: ئەو ناوەی لق و پۆی لێبکرێتەوە و جامید نەبێ وەك المسلم و ئەوانیتر ، بەلای جمهورەوە مامەڵەی ئەکرێ وەك مامەڵەی مەوصوفێك بەسرابێ و کۆت کرابێ بە صیفەتەوە. (٣)ئێمە ووتمان (في الغنَم السائمَة او سائِمة الغَنَم زكاةٌ) بە مەفهومی موخالەفەکەی چی نەفی زەکاتی لێکراوە؟ ئایا تەنها دابەستەی مەڕ و بزنە؟ یاخود هەموو جۆرە دابەستەیەك لە مەڕ و بزن و گا و گامێش و شتی تریش؟ ئەمە دوو قەولی تیایە. (٤)یەکەمیان رازی و زانایانی تریش تەرجیحیان داوە تێبینی ئەکاو ئەڕوانێتە السوم، بە قەیدی فی الغنم کەوابوو نەفی کراوە کە دابەستەی بزن و مەڕە. (٥)بەلام دوهەمیان تەنها چاوی بڕیوەتە وشەی السوم، وەبەدەم خۆی خۆ لەوەڕاندن چونکە زەکات بەهۆی ئەوەوە لەوشترو ماگاشدا

واجب بووە بەرپا ئەبێ. (٦)دانەر ووتویەتی دروستە صیفەتەکە لەرستەی(في سائِمةِ الغَنَم زكاةٌ) لەفظی غەنەم بێ -هەرچەند اسمی جنسە چونکە هاو کێشی ئەو هاتووە، ئەفەرموێ: (مطل الغني ظلم) ماطڵ کردنی دەوڵەمەند زوڵمە، -چونکە مەفهومەکەی ﴿ومنها﴾ اي من الصّفة بالمعنى السّابق ﴿العلّة﴾ نحو إعط السائلَ لحاجَتِه اي المحتج دونَ غيرِه[١]

﴿والظرفُ﴾ زماناً ومكاناً نحو سافرْ يومَ الجمعةِ اي لاقي غيرِه، واجلِس امام فلان اي لا وراءهُ.[٢] ﴿والحال﴾ نحو احسن الى العبدِ مطيعاً اي لا عاصياً[٣] ﴿والعددُ﴾ نحو قوله تعالى: ﴿ فاجلدوهم ثمانين جلدة ﴾ اي لااكثر من ذلك، وحديث الصّحيحين: إذا شربَ الكَلبُ في إناءِ احَدِكم فليَغسلهُ سبع مرّات اي لااقلَّ من ذلك[٤] ﴿وشرطٌ﴾ عطفٌ على صفةٍ نحو :﴿ وإنْ كنَّ اولات حملٍ فأنفقوا عليهِنَّ ﴾ اي فغيرُ اولاتِ الحملِ لايجبُ الإنفاقُ عليهِنَّ.[٥] ﴿وغايةٌ﴾ نحو: ﴿ فإنْ طلّقها فلاتحلُ لهُ من بعدُ حتّى تنكِحَ زوجاً غيرَه ﴾ فإذا نكحَتْهُ تحلُ للأولِ بشرطه[٦]

---

ماطڵ کردنی غەیری دەوڵەمەند زوڵم نیە وەك لەمەودوا دێت باسەکەی- کەوابوو ئەوە ئەگەیەنێ نەفی زەکات بکات لە ئاژەڵێك بەدەم خۆی بلەوەڕێو بزن و مەڕ نەبێ، هەرچەند بەڵگەی زەکاتیش لەودا هەبێ ، ئەو اسمەجنسە بەصفەت تەواشاکردنە زۆر دوورە ، چونکە ئەوە جیاوازە زوو ذهن و ژیری بۆیان بچن و لێیان حاڵی ببێ.

(١)واتە بەشێتر لە صفەت -صفەتی بەمانای پێشوو- عیلەتە، وەك ئەو پارە ببەخشە بەو سوڵکەرە ، چونکە پێویستی هەیە، واتە سواڵکەرێك پێویستی پێی نەبێ مەیدەرێ.

(٢)بەشێکیتریش ظەرفە ئیتر ظەرفی زەمان بێیا مەکان ، وەك لەرۆژی هەینیدا بچێ بۆ سەفرە، واتە لەغەیری هەینیدا نەچێ، دانیشە لەبەردەم فلانە کەس دا واتە لەدوایەوە دانەنیشی. (٣)یەکێکیتر حاڵە، وەك چاکە بکە لەگەڵ ئەو بەندەدا کاتێ کە گوێڕایەڵە، واتە نەك لەکاتی سەرپێچی کردنیدا. (٤)یەکێکیتر لەسەر صیفەت حیساب بکرێ ژمارەیە، وەك خوا ئەفەرموێ: هەشتا جەڵدەیان لێبدەن، واتە لەوەزیاتر و کەمتر نەبێ. (٥)مەفهومی موخالفە بریتیە لە مەفهومی شەرط وەك بریتیش بوو لەمەفهوم و صیفەت، - چونکە لەپێشەوە ووتمان سەرط و مەفهوم و غایە سەر بە صفەت نین- وەك خوا ئەفەرمووێ: ئەگەر ئافرەتە طەلاق دراوەکان سکپڕبوون مەسرەفیشیان بکێشن واتە ئەگەر سکپڕ نەبوون واجب نیە

مەسرەفیان بکەن. (٦)مەفهومی موخالفە بریتییە لە مەفهومی غایە وەك خوا ئەفەرموێ: ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی طەلاق دا هەتا ئەو ژنە شوونەكات بە پیاوێکیتر بۆی حەڵاڵ نابێتەوە ، ئەگەر پیاوێکیتر مارەی کرد بۆ یەکەم حەڵاڵ ئەبێتۆ، بەمەرجی خۆی، کەدخولە.

وإنّما نحو: ﴿ إنّما إلهكم الله ﴾ اي فغيرهُ ليسَ بإلهٍ والإلهُ المعبودُ بحق[١] ومثلُ لاعالمَ إلاّ زيدٌ مما يشتمِلُ على نفيٍ واستثناءٍ نحو ماقام إلاّ زيد منطوقهما نفي العلمِ والقيامُ عنْ غيرِ زيدٍ ومفهومهما إثباتُ العلمِ و القيام لزيدٍ[٢] وفصل المبتدأ من الخبرِ بضميرِ الفصلِ نحو: ﴿ أم إتخذوا من دونه أولياء فالله هو الولي ﴾ اي فغيرهُ ليس بوليٍ اي ناصرٍ[٣] وتقديم المعمولِ على ما سيأتي عن البيانيين كالمفعول والجارِ والمجرورِ نحو: إيّاك نعبُدُ اي لاغيرك لإلى الله تُحشرون اي لاالى غيره[٤]

واعلاهُ اي اعلى ماذُكرَ من انواعِ مفهومِ المُخالَفة لاعالمَ إلاّ زيدٌ اي مفهومُ ذلكَ ونحوهِ إذ قيلَ: إنّهُ منطوقٌ اي صراحةً لسرعة تبادُرهِ الى الأذهانِ[٥] ثمّ ماقيلَ إنّهُ منطوقٌ اي بالإشارةِ كمفهومِ إنّما و الغايةِ كما سيأتي لتبادُرهِ الا الأذهانِ ثمّ غيرهِ على الترتيبِ الآتي.[٦]

---

(١)مەفهومی موخالفە بریتیە لە مەفهومی (إنّما) وەك خوا ئەفەرموێ: تەنها ئیلاهی ئێوە الله یە، واتە غەیری الله ئیلاه نیە، ئەو ئیلاهەی کە بەحەق و ثابت و هەتا هەتایە هەر ئەپەرسترێ و پەرستراوە. (٢)یاخود وەك مەفهومی لاعالم إلاّ زید و وێنەی ئەو، وەك هەر رستەیەك کە نەفی استثناء بگرێتە خۆ، وەك ماقام إلا زید، مەنطوقی ئەم دوو میثالە نەفی کردنی عیلم و قیامە لەغەیری زید، مەفهومەکەشیان إثبات کردنی عیلم و قیامە. (٣)مەفهومی جیاکردنەوەی مبتدا و خەبەر بە ضەمیر مەفهومی موخالەفەیە، وەك ئەفەرموێ: تەنها هەر (الله)یە یارمەتیدەر، واتە جگە لە الله کەس پشت و پەناو یارمەتیدەر نییە. (٤)هەروەها یەکێکیتر کە بۆ حەصرە مەفهومی موخالەفەیە پێشخستنی مەعمولە بەسەر ئەوەی لەمەودوا دێت، لە بەیانیەکەیانەوە نەقڵیکراوە ، وەك مفعول و جارو مجرور، وەك: (إیاك نعبد)، واتە جگە لەتۆ ناپەرستین، یان وەك: (لإلى الله تحشرون) واتە تەنها بۆ لای خوا کۆ ئەکرێنەوە، واتە نەك بۆ لای یەکێکیتر.

(٥)بەرزترین جۆری مەفهومی مخالەفە لەوانەی ووتراون ، جۆری لاعالم الا زید، واتە مەفهومی ئەمەو وێنەی ئەم، هەر رستەیەك نەفی و استثنای لە خۆگرتبێ، چونکە ووتراوە مەفهومی نەفی و استثناء، مەفهومێکی رونهەموو کەس لێی حاڵی ئەبێ، چونکە بەزویی ئەگاتە ذیهنی ، هەربەوتنەکەی (٦)پاشان ئەوەی کەووترا مەنطوقی ئیشارەیە، وەك مەفهومی (إنما) و مەفهومی غایە -وەك لەمەوداو باسەکەی دێت- چونکە زۆر زوو دەچێتە ذهنەوە، پاش ئەمیش ئەوانیتر لەسەر ئەو شێوەی یەك لەدوایەکەی باسەکەی دێت.

مسئلةٌ: المفاهيمُ المُخـالفةُ الاّ اللّقبُ حجّةٌ لغـةً لقول كثيرٍ من ائمةِ اللغةِ بها منهم ابو عبيدة و عبيد تلميذُهُ قالا في حديث الصحيحين مثلاً: مطلُ الغنيِّ ظلمٌ على انّهُ يدلُ على انّ مطلَ غيرالغنيِّ ليس بظلمٍ وهم إنّما يقولون في مثلِ ذلك ما يعرفونَهُ من لسانِ العرب[1] وقيلَ حجةٌ شرعا لمعرفة ذلك من موارد كلام الشّارعِ وقد فهم ﷺ من قولهِ تعالى:﴿ إن تستغفر لهم سبعينَ مرّةً فلن يغفرَ اللهُ لهم ﴾ انّ حكمَ مازادَ على السبعينَ بخلافِ حُكمهِ حيثُ قال كما رواهُ الشيخان: خيّرَني اللهُ وسأزيدُهُ على السبعينَ[2] وقيلَ حجةٌ معنىً اي من حيثُ المعنى وهو انّهُ لو لم ينفِ المذكور الحكمَ عنِ المسكوتِ لم يكُنْ لذكرهِ فائدةٌ وهذا كما عبّرَ عنهُ هنا بالمعنى عبّرَ عنه في مبحثِ العامِ كما سيأتي بالعقلِ وفي شرحِ المُختصر هنا بالعُرف العام لانّهُ معقولٌ لأهله[3]

---

(١)هەرچی مەفهومی مخالفەیە ئەبێتە بەڵگە، جگە لە مەفهومی لەقەب نەبێ، ئەم بوونەشیان بەبەڵگە لەرێی لوغەت و زاراوەی عەرەبەوە ئەزانرێ-بونیان بەبەڵگە جیاوازی تیادا هەیە، بەلأم مەفهومی موافقە بەبێ جیاوازی بەڵگەن- چونکە زۆربەی پێشەوایانی لوغە دانیان ناوە بەبەڵگە بوونی هەموو مەفهومەکان ، لەوانە ابو عبیدە و عبیدەی قوتابی ، لەو فەرمودەی بوخاری‌و موسلیم ریوایەتیان کردوە، ووتویانە: (مطلُ الغنيِّ ظلمٌ) ئەم فەرمودەیە دەلألەت ئەکا لەسەر ئەوە ماطل کردنی کەسێك دەوڵەمەند نەبێ زوڵم نیە، ئەو زانایانە بۆیە ئەوە ئەڵێن -هەموو مەفهومی مخالفەیەك ئەکرێتە بەڵگە- چونکە لەزوبانی عەرەبەوە ئەیزانن و ئەی ناسن.

(٢)ووتراویشە هەموو مەفهومی مخالفێك بەڵگەیەکی شەرعیە، ئەوەش لەو جێیانەی گفتوگۆی شارعی تێدا هاتووە ئەزانرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ لەم ئایەتە کە ئەفەرموێ: (ئەگەر حەفتا جار داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەی ئەوە هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێ )

وا حاڵی بووە لێی کە ئەگەر حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆشبونیان بۆ بکا، حوکمەکەی جیاوازە چونکە وەك بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: خوا منی سەرپشك کردوە ، من لەحەفتا جارەکە زیاتر داوای لێخۆشبونیان بۆ ئەکەم (٣)ووتراویشە مەفهومی مخالفە هەموویان بەڵگەی عەقڵین و لە رێی مانای رستەکەوە ئەزانرێن، بەڵگەی عەقڵی ئەگەر مەذکورەکە-مطل الغني- نەفی حوکمی مەسکوتەکە نەکا، ئەوکاتە ذکرەکەی هیچ سودێکی نەئەبوو، هەر ئەی ووت: (المطلُ ظلمٌ) دانەر وەك لێرە بورهانی عەقڵە ناوناوە حجەی معنوی، لەباسی عامدا کەلەمەودوا دێ ناوی بردوە بەبەڵگەی عەقڵی ، بەڵام لە (شرح المختصر) دا لەباسی مەفهومی مخـــالـــفەدا

رحمه الله واحتجَّ باللقبِ الدقّاق والصيرفي رحمه الله من الشافعيّة رحمهم الله وابن خويز منداد رحمه الله من المالكيّة رحمهم الله و بعضُ الحنابلةِ رحمهم الله علماً كان أو إسمَ جنسٍ نحو: على زيدٍ حجٌّ لاعلى عمرو وفي النَّعم زكاةٌ لافي غيرها من الماشيَةِ إذْ لافائدةَ لذكرهِ إلاّ نفي الحُكمِ عن غيرهِ كالصّفَةِ واجيبَ بأنّ فائدتهُ إستقامةَ الكلامِ إذ بإسقاطهِ يختلّ بخلافِ إسقاطِ الصّفةِ وتقوى كما قال المصنِّف الدّقاق المشهور باللقبِ بمن ذُكرَ معهُ خصوصاً الصيرفي فإنّهُ اقدمُ منهُ واجلُ[1] رحمه الله وانكر ابو حنيفة الكلَّ مطلقاً رحمه الله اي لمْ يقُل بشيئٍ من مفاهيم المخالفةِ و إن قال في المسكوتِ بخلافِ حكم المنطوقِ فلأمرٍ آخَرَ كما في إنتفاءِ الزّكاةِ عنِ المعلوفَةِ قال: الأصلُ عدم الزّكاة و وردتْ في السائمةِ فبقيتِ المعلوفةُ على الأصلِ[2]

---

ناوی بردوە بە عورفی عام، چونکە ئەهلی خۆی لێی حاڵی ئەبن. (١)مەفهومی لەقەب الدقاق کردویەتیە بەڵگە صەیرەفیش کەلە زانایانی شافعیە و إبن خویزمندادیش کەلە زانایانی مالکیە وە هەندێکیش لە زانایانی حەنبەلی ، هەر بەبەڵگەیان زانــــیوە، - مەبەست لەقەبی نحوی نیە- ئەم لەقەبە کەیفی خۆیەتی عەلەم و ناوبێ وەك: (على زيد حجّ) واتە لەسەر عەمر حەج نیە، یانی مەفهومی مخالفەکەی ەوەیە، یاخود اسمی جنس بیّوەك: (في النعَم زكاةٌ) واتە جگە لەمەڕو ماڵات زەکات لە ئاژەڵی تردا نیە، ئەی بۆ لەقەبیان بەبەڵگە حیساب کردوە؟ چونکە لەقەب جگە لەنەفی حوکمی غەیری خۆی نەبێ هیچ سودێك لە هێنانەکەیدا نیە وەك وتمان- لەقەب وەك سیفەت وایە. وەڵام دراوەتەوە ، کەسودی لەقەب تەواوی کەلامەکەو رێکوپێکی گفتو گۆکەیە،چونکە ئەگەر لەناو رستەکەدا لای بەی کەلامەکە نوقصا ئەبێ : لەباتی (على زيدٍ حجٌّ) بڵێیت: على حج هیچ مانایەکی نیە، -بەڵام بەجیاوازی صفەت صفەت وانیە ئەگەر لە کەلامەکەدا لای بەی، نوقصان ئەبێ- لەباتی (وفي الغنم السّائمة زكاةٌ) بڵێیت: (وفي الغنم زكاةٌ)

ئەبێ و مانای خۆی هەر ئەگەیەنێ، کەوابوو وەك یەك وانەبوون، الدقاق بەناوبانگە خۆی بەوەی مەفهومی لەقەبی کردوە بەبەڵگە ، بەڵام وەك دانەر ووتویەتی: بەهۆی ئەوانەی لەگەڵیدا باسکران ، راو بۆچونەکەی بەهێز بوو، بەتایبەت زانایەکی وەك صیرفی کە لەو پێشترو گەورەترە. (٢)ابو حنیفه بڕوای نەبووە بەبەڵگە بوونی هەموو مەفهومی مخالفەیێك کەیفی خۆیەتی ، لە خەبەردابێ یا غەیری خەبەر، لەشەرعدا بێ یا غەیری شەرع ، لە صیفەتی گونجاودابێت یان غەیری صیفەتیگونجاو ، واتە دانی بە هیچ کامیاندا نەناوە، خۆ ئەگەر دانی نابێ بە جیاوازی حوکمی مسکوتەکە- معلوفە- لەگەڵ منطوقەکەدا-السائمە-ئەوە لەبەر بەڵگەییێکیتر بووە، نەك لەبەر مەفهومی مخالفە، بۆ وێنە ئەویش هەر دەڵێ : دابەستە زەکاتی تیادانیە ، بەڵام دەڵێ :

و انکر الکلُ قومٌ في الخبَرِ نحو في الشامِ الغنمُ السائمة فلاينفي المعلوفةَ عنها لأنّ الخبَرَ لهُ خارجيٌّ يجوزُ الإخبارُ ببعضِهِ فلايتعيّن القيدُ فيهِ للنفيِّ بخلاف الإنشاءِ نحو: زكّوا عن الغنَمِ السائِمةِ وما في معناهُ مما تقدّمَ فلا خارجيَّ لهُ فلا فائدةَ للقيدِ فيهِ الاّ النفي[1]

و انكر الكلَّ الشيخ الإمام والد المصنِّف في غير الشرع من كلام المصنِّفين و الواقفين لغلبةِ الذهولِ عليهم بخلافهِ في الشرعِ من كلامِ اللهِ ورسولِهِ المبلِغ عنهُ لأنّهُ تعالى لايغيبُ عنهُ شيئ[2]

و انكر إمام الحرمين صفةً لاتُناسبُ الحكمَ كأنْ يقولَ الشارِعُ في الغنم العفرِ الزكاة قال فهي في معنى اللقبِ بخلافِ المناسَبَةِ كالسَّوم لِخفّةِ مؤنة السّائمةِ فهي في معنى العلّة[3]

---

چونکە ئەصل ئەوەیە کە زەکات نەبێ، بەڵام کەشەرع هاتووە لەمەڕو ماڵاتێکدا بەدەمی خۆی بلەوەڕێزەکاتی واجب کرد، دابەستەکە لەسەر ئەصلەکەی خۆی مایەوە، کە نەبوونی زەکاتە.

(١)قەومێکیتر هەموو مەفهومی مخالفەیەکیان ئینکار کردوە، بەڵام تەنها لە رستەیەکی هەواڵدا نەك لە إنشاو رستەیەکدا داوای تیادابێ، وەك ئەڵێن: لەشام مەڕ هەیە بەدەم خۆی بلەوەڕێ دە ئەم هەواڵە ئەوە ناگەیەنێ دابەستە لە شامدا نیە،چونکە هەواڵ لە شتێك دەدرێ چەندەها شتی دەرەکی هەیە ئەو هەواڵە، لەوانەیە هەر هەندێکیان هەواڵیان لەبارەوە ئەدرێ، لەبەر ئەوە ئەو قەیدە-السائمة- لەم هەواڵەدا بۆنە مەسکوتەکە نیە-المعلوفة- بەڵام جیاوازی بۆ رستەیێکی إنشائی وەك زەکات لە مەڕو ماڵاتێك بدەن کە بەدەم خۆی دەلەوەڕێ، ئەمەو ئەوانەش لەپێشەوە باسمان کرد،

ئەوانە شتی دەرەکیان نیە، کەوابوو ئەم قەیدی -السائمة- جگە بۆ نەفی مەسکوتعک نەبێ هیچ سودێکی‌تری نیە. (٢)باوکی دانەر بڕوای بەهیچ مەفهومی مخالفەیعد نەبووە، لەناو کەلامی هیچ کەسێکدا جگە لەشەرع نەبێ، ئەوانەش وەك نوسەرەکان ێ ئەوانەی وەقف ئەکەن، چونکە ئەمانە بێئاگایی زاڵە بەسەریاندا، لەکاتی ئەو شتە ئاگای لە پێچەوانەکەی نیە، بەڵام کەلامی خوداو کەلامێکیش پێغەمبەر ﷺ بەناوی خواوە بیگەیەنێ چونکە شتێك نیە خوا ئاگای لێنەبێ و لە خوا ون بێ.

(٣)ئیمام الحرمین ئینکاری مەفهومی صفەتێکی کردوە کە گونجاو نەبێ لەگەڵ حوکمەکەدا وەك گریمان بڵێت: شارع ووتویەتی لە بزن و مەڕی ڕەشدا زەکات هەیە دەخۆ ڕەش هیچ گونجاوێکی لەگەڵ حوکمەکەدا نیە، لەبەر ئەوە ئیماد ووتویەتی:صیفەتێك نەگونجاوبێ لەگەڵ لەقەبدا لەمانای لەقەبدایە، لەوەدا کە گونجاو ولكونِ العلّةِ غيرِ الصّفةِ بحسَبِ الظاهرِ خلافَ ما تقدَّمَ اطلَقَ الإمام الرّازي عنهُ إنكارِ الصِّفَةِ ولكونِ غيرِ المناسبَةِ في معنى اللقَبِ اطلَقَ إبن الحاجبُ عندَ القولُ بالصّفةِ وامّا غيرِها مما تقدَّمَ فصرّح منهُ بالعلّةِ والظَرفِ والعدَدِ والشرطِ وإنّما وما وإلاّ سكَتَ عن الباقي وهو كالمذكور[1] و انكر قومٌ العدَدَ دونَ غيرِه فقالوا: لايدُلُ على مخالَفَةِ حكمِ الزائدِ عليهِ او الناقصِ عنهُ كما تقدَّم إلاّ بقرينةٍ أمّا مفهومُ الموافقةِ فاتفقوا على حجيّتِهِ وإنْ إختلفوا في طريقِ الدّلالةِ عليهِ كما تقدَّم[2]

مسئلةٌ: الغايةُ قيلَ منطوقٌ اي بالإشارةِ كما تقدَّمَ لتبادُرِه الى الأذهانِ[3] والحقُّ انهُ مفهومٌ كما تقدَّمَ ولايلزَمُ من تبادُرِ الشيئِ الى الأذهانِ أن يكونَ منطوقاً[4]

---

نیە لەگەڵ حوکمەکەدا، بەڵام جیاوازە ئەم قسەیە لەگەڵ صیفەتێکدا کە گونجاوبێ لەگەڵ حوکمەکەدا، وەك بەدەم لەوەڕان بۆیە زەکات واجبە تیایدا، لەبەر ئاسانی بەخێو کردنی مەڕو ماڵاتێك بەدەم خۆیان بلەوەڕێن، کەوابوو صیفەتی گونجاو لەمانای علەتدایە، (١)لەبەر ئەوەی بەگوێرەی ڕواڵەت علەت وەك صیفەت نیە، نەك ئەو صیفەتەی پێشوو بەڵکو صیفەتی نحوی، ئیمام رازی بە موطلقی ڕیوایەتی کردوە لە ئیمامی حەرەمەینەوە کە ئینکاری مەفهومی صیفەی کردوە -واتە نەگونجاو- وە لەبەر ئەوەی صیفەتی نەگونجاو لەمانای لەقەبدایە، إبن الحاجب ڕیوایەتی لە ئیمام الحرمینەوە کردووە، کە قەولی بە صیفەت کردوە -واتە گونجاو- بەڵام مەفهومی ئەوانی‌تر کە لەپێشەوە رابوردن بەڕوونی دانی بەهەندێکیاندا ناوە، وەك مەفهومی

علەت و ظرف و ژمارە و شروط و إنما و ما لەگەڵ إلاّ دا، بەڵام لەوانیتردا بێدەنگ بووە، بێگومان ئەوانیش لەلای هەروەك ئەمانە بووە.

(٢)قەومێکیتریش تەنها ئینکاری مەفهومی مخالفی ژمارەیان کردوە، نەك ئەوانیتر چونکە ووتویانە، ژمارە دەلالەت ناکا لەسەر مەفهومی مخالفەی حوکمەکەی چ زیاد بێ لەو ژمارەیە یاخود لێی کەمتربێ، وەك لەپێشەوە رابورد مەگەر بەهۆی قەرینەیەکی دەرەکی، نەك مەفهومی ژمارەی، بەڵام مەفهومی موافقە هەموویان یەك قسەن لەسەر بەبەڵگە بوونی ، هەرچەند لەرێی دەلالەت لەسەر کردنەکەیدا جیاوازن، وەك لەپێشەوە باسکرا هەندێ ووتیان قیاسیە، هەندێك لەفظیە. (٣) مەفهومی غایەت ووتراوە: مەنطوقە بەڵام نەك مەنطوقی صەریح بەڵکو بە إشارەو ئاماژەپێکردن، -وەك لەپێشەوە باسکرا- بۆ مەنطوقە؟ چونکە زۆر بەزوو ئەچێتە ذهنەوە، وەك مەنطوق.

(٤)بەڵام قسەی حەق و راست ئەوەیە مەفهومی غایەت هەر مەفهومە ، وەك لەپێشەوە رابورد، ئەمەی کەزوبەزو ئەچێتە ذهنەوە نابێ بەمەنطوق.

﴿يتلوهُ﴾ اي الغايَةَ ﴿الشرط﴾ إذ لم يَقُل احدٌ إنَّهُ منطوقٌ وفي رتبةِ الغايةِ إنما فسياتي قولُهُ إنَّهُ منطوقٌ اي بالإشارةِ كما تقدّمَ و مثلَهُ في ذلكَ فصل المبتدإ و تقدّمَ انّ مرتبةَ الغايةِ تلي مرتبَةَ لاعالم إلاّ زيد.[١] ﴿فالصفةُ المناسبةُ﴾ تتلوا الشرط لأنّ بعض القائلين به خالَفَ في الصفةِ[٢] ﴿فمطلقُ الصفةِ﴾ عنْ المناسبةِ ﴿غير العدد﴾ من نعتٍ وحالٍ و ظرفٍ و علّةٍ غيرُ مناسباتٍ فهي سواءٌ تتلوا الصّفةَ المناسبةَ[٣] فالعدد يتلوا المذكورات لإنكارِ قومٍ لهُ دونَها كما تقدَّم[٤] ﴿فتقديمُ المعمولِ﴾ اخر المفاهيم ﴿لدعوى البيانيّين﴾ في فنِّ المعاني ﴿إفادتَهُ الإختصاصَ﴾ اخذاً من موارِدِ الكلام البليغ[٥] ﴿وخالَفَهم إبن الحاجِب وابو حيّان﴾ في ذلك[٦] ﴿والإختصاصُ﴾ المفادُ ﴿الحَصرُ﴾ المشتَمِلُ على نفي الحُكم عن غيرِ المذكورِ كما دلّ عليهِ كلامُهُم.[٧]

---

(١)بڵندترین مەفهومی مخالفە غایەت بوو، بەشوێن ئەودا دێ مەفهومی شەرط بۆ شەرط لەدوای غایەتەوە؟ چونکە مەفهومی شەرط کەس نەی ووتوە مەنطوقە ، مەفهومی إنما لە پلەی مەفهومی غایەتدایە، چونکە لەمەودوا دێ قەولێك ووتویەتی: مەفهومی إنما مەنطوقە، واتە بەإشارە وەك لەپێشەوە رابورد، هەروەك شەرط وایە

مەفهومی مبتدا و خەبەر لەیەك جیاکردنەوە، لەپێشەوە رای بوردکە: پلەی مەفهومی غایە دێ بەشوێن مەفهومی ما و لەگەڵ إلاّ دا.

(٢)ئەمجا پلەی مەفهومی صیفەتی گونجاو بۆ حوکمەکە دێت بەدوا مەفهومی شەرط دا، چونکە هەندێ لەوانە ئەڵێن مەفهومی شەرط هەیە، ئەڵێن مەفهومی صیفەت نیە، و رازی نین. (٣)دوای صیفەت گونجاو پلەی مەفهومی صیفەت دێت بە مطلقی واتە صیفەتی کە (لفظ مقید للآخر)یە ، هەموویان ئەگرێتەوە، گونجاوو ژمارە نەبێ وەك نەعتی نەحوی، و ظروف و عیلەتی لوغەوی، بەڵام ئەمانە نەگونجاوەکانیانە لەگەڵ حوکمەکەدا،ئەمانە هەموویان چون یەکن ، پلەی دێت بەشوێن صیفەتی گونجاودا،

(٤)ئەمجا دوای ئەم پلەی مەفهومی ژمارە دێ بەدوای ئەم باسکراوانەدا ، بۆ پلە کەشی هات بەدوای هەمویانەوە؟ چونکە گەلێ لە زانایان رازی نەبوون بە مەفهومی ژمارەو ئەوانیتریان قبول بووە، وەك لەپێشەوە رابورد. (٥)ئەمجا لەکۆتایی هەموویانەوە مەفهومی پێش خستنی مەعمول دێت،چونکە زانایانی عیلمی بەیان لەبەشی انمعانیدا ئەڵێن: پێش خستنی معمول بەسەر عامل دااِختصاص و تایبەتمەندی ئەگەیەنێ، بۆیە وا ئەڵێن ، چونکە لەسەر چاوەکانی ووتاری پاراودا وەریان گرتووە.(٦)ئەم دوو زانایە لەو بۆچونەدا جیاوازی زانایانی بەیانیان کردوە. (٧)ئەو تایبەتمەندیە وەرئەگیرێ لە پێش خستنی معمول دا، ئەوحەصرەشی تیایە

ﷺخلافاً للشيخ الإمامﷺ والد المصنِّف ﷺحيثُ اثبَتَهُ وقال: ليس هو الحصرَﷺ وإنَّما هو قصد الخاص من جهَةِ خصوصِه فإنَّ الخص كضربِ زيدٍ بالنسبَةِ الى مطلَقِ الضَّربِ وقدْ يقصُد في الإخبارِ بِه لامن جهَةِ خصوصِه فيؤتى بألفاظِه في مراتبِها ، وقدْ يُقصد من جهةِ خصوصِه كالخصوصِ بالمفعولِ للإهتمام بهِ فيقدَّم لفظه لإفادةِ ذلكَ نحو: زيداً ضربتُ فليس في الإختصاصِ ما في الحصرِ من نفي الحُكم عنْ غيرِ المذكورِ وإنَّما جاءَ ذلكَ في إيّاكَ نعبُدُ للعلم بأنّ قائليه اي المؤمنين لايعبدون غيرَ الله[1] وحاصِلُهُ انّ التقديمَ للإهتمامِ ، وقد ينضمّ اليه الحصرُ لخارجٍ واختارهُ المصنِّف في شرحِ المختصر واشار اليه هنا بقوله لدعوى البيانيّين[2]

---

کە نەفی حوکمەکەیە لەغەیری مذکورەکە–إیّاك نعبُدُ ،وەك إختصاص عیبادەتە بۆ خوا، نەفی عیبادەتی غەیری خوایشە –ئەمەش گفتو گۆی زانایانی بەیان دەڵالەتی لەسەر ئەکا.

(١)باوکی دانەر جیاوازە بۆ چونەکەی چونکە إختصاص ئەسەلمێنێ ، بەڵام دەڵێ حەصری تیانیە بەڵام ئەو إختصاصە ئەوە مەبەستێکی تایبەتە لە دیوێکی تایبەتی

ـەو تایبەتیـەوە، -چونکـە دوو دیـوی هەیـە: ١-تەنـها وەك هـەواڵێك. ٢-بۆگرنگـی یێدان- چونکە تایبەت وەك لێدانی زەید، بەگوێرەی لێـــدانی روت سەیری بکـەی ـوو مەبەستی لێوەرئـەگیرێ: ١-جاری واهەیـە هـەر مەبەستی هەواڵـــدانـــــە بـە ێدانەکە نەك لـەروی تایبـەت بەکێوە بووە،زیـد خـۆی مەبەسـت نـــیە ، دەی ئالـەو کاتەدا فعل و فاعل و مفعول هەریەك لەجێی خۆیان دائەنرێن. (٢)جـــاری واهەیە مەبەست تایبەت لێدراوەکەیە، واتە دیوی تایبەتی مەفعولەکەیە، لەبەر گرنگی پێدانی ئەوکاتە لەفظی مەفعولەکە پێش ئەخرێ، بۆ ئەوەی ئەو تایبەتی و گـــرنگی پێدانە ـگەیێنێ، وەك زەیـد مـن لێم دا، دەی کـەوابوو لـەك تایبەتمەندیەدائەوەنــــیە کەلـە حەصردا هەیە، کە نەفی حوکمە لەغەیرە مذکورە، ئەی بۆ لــــە (إیّاك نعبد) دا لەگەڵ ختصاص دا حەصریش هەیە،چونکـە ئـەوە لەبـەر بەڵگەیـەکیتری دەرەکــــیە، کـە ئەزانین ئەوانەی إیّاك نعبد ئەڵێن جگە لە الله کەسی تر ناپەرســـتن.

(٢)دەست کـەوت و پاڵفــــتەی گوتار ئەمـــەیە: پێش خسـتنی معـــمول تەنـها ـەبـەر گرنگـی پێدانــە، بــەلاّم جارجـاریکیش حەصـــــری ئەچێتـە پـاڵ، لەبــەر بەڵـــگەیەکی دەرەکی ئەیگەیەنێ نەك تەقدیمەکە، دانەریش لە شرح المختصر دا ئەم بۆچـــوونەی هـەڵبژاردوە ، لێرەش ئامـاژەی کرد بۆی کـەوتی: زانایـانی عیلـــمی بەیان ئەوە ئەڵێن.

مسـئَلَةٌ: إنَّمـا بالكسر ، قـال الآمـدي وابـو حيّـان كقول ابي حنيفة، من جُملَةِ ما تقدَّمَ عنهُ لاتُفيـدُ الحصر لأنـها إنّ المؤكدة وما الزائدة الكافّة فلا تفيدُ النفي المشتملَ عليهِ الحصرُ، وعلى ذلك حديثُ مسلم : إنّما الرِّبا في النسيئة ، إذ ربا الفضلِ ثابتٌ إجماعاً وإن تقدَّمهُ خلافٌ، واستفادة النفي نفي البعض من خارجٍ، كما في إنّما إلهكم الله، فإنَّهُ سيقَ للردِّ على المخاطبين في إعتقادهم إلهيةَ غيرِ الله.[1]

وقـال الشـيخ ابـو إسـحق الشـيرازي والغـزالي و صاحبُهُ ابـو الحسـن الكيـا هراسـي ومعنـاهُ في لغـةِ الفُرس الكبيرُ، والإمـام الرّازي تفيـدُ الحصـرَ المُشـتمل علـى نفـي الحُكم عن غيرِ المذكورِ نحو: إنّما قامَ زيدٌ اي لاعمرو، او نفي غير الحكم عنِ المذكورِ إنّما زيدٌ قائمٌ ، اي لاقاعدٌ ، فهماً [2] وقيلَ نطقاً اي بالإشارَةِ كما تقدَّمَ لتبادُرِ الحصرِ الى الأذهانِ منها، وإنْ عُورض في بعضِ المواضِعِ بما هو مقدَّمٌ عليه[3]

(١)إنّما ، ابـو حیّـان و ئـامێدی ووتویانـە –وەك ابـو حنیفـە بـڕوای بـە مەفـهومی موخالەفە نەبوو، إنّما ش یەکێکە لەوان– حەصر ناگەیەنێ‌و مـــەفهومی مخالفەی نیە. چونکە إنّما پێك هاتووە لە یەك: إنّ دووەم: لە ما ، کە بۆ پـــوچەڵ کردنەوەی کارو عەمەلی إنّ یە ، دەی کەوابوو حەصر ناگەیەنێ، چونکە حـــەصر پێك هاتووە لە نەفی و ئیثبات، ئەم نەفیەکەی تیادا نیە، کەوابوو حەصری تیادا نیە، ئـــەو فەرمودەی کە موسلیم ریوایەتی ئەکا و ئەفەرمـــووێ: ســـــوود لـە نەسیئەدا هەیـە، لەسـەر ئـەو بۆچونەی ئامێدی و ئەبوحەییانە مانا ئەکرێ ، چونـــکە ئەگـــەر بۆ حەصربێ ئەبێ ئاوا مانا بکرێ، تەنها لـە نەســـیئەدا هەیە، دەخۆ وانـــیە، چونـــکە ربا الفضل بە إجماع ســـەلمێنراوە کـە حەرامـە، هەرچـەند پێـش إجماعەکـە زانـــایان جـــیاوازیان هەبوو، دەخۆ لە هەندێ جێدا إنّما بۆ حەصر بەکاردێ ؟ نەفی لەکـــوێوە بۆ پەیـــدا ئـــەبـــێ؟ لەو هـەندە جێگەیەدا نەفی لـــەدەرەوەی ئەو رستەیە وەرئەگـــیرێ، وەك: (إنّـــمـــا إلهکم الله) واتە تەنـــها (الله) الهی ئێوەیە نەك شتی تر و کـــەسیتـــر ، ئەم ئایەتە بۆ بەر پەرچدانـــەوەی ئـــەوانە هێنراوە ، کە باوەڕیـان وابـــوو جگـە لـە الله ئیـــلاهیتر هەیە.

(٢)شیرازی و غەزالی‌و الکیا و رازی ووتویانە: إنّما لەڕێی فەهمەوە حەصر ئەگەیـەنێ ئەو حەصرەی کەدوو نەفی بگرێتە خۆی:١–نەفی حوکم لەوەی کە ذکر کراوە وەك تەنها زەید وەستابوو ، واتە عەمر نەوەستاوە. ٢–یاخود نەفی غەیری حوکمەکەیە لە مذکورەکە ، وەك تەنـها زیـد وەسـتاوە واتـە دانەنیشتووە. (٣)ووتراویشـە إنّما ئـەو حەصرە ئەگەیەنێ لە روی مەنطوقەوە ، نەك بەصریح، بەڵکو بەئاماژە پێ‌کردن، وەك:

کمـــا في حـــدیثِ الرّبا الســـابق ولا یعـد في إفادةِ المُرکَّبِ مالم تفِدْهُ اجـــزاءهُ ولم یذکرِ المصنِّف إمـــام الحرمین مع قولِه بإنّمـا کما تقـدَّم لأنَـــهُ لم یصـــرِّح بأنَـهُ مفـهـــومٌ ولا منطوق.[1]

﷽ و ﷽ انّما ﷽ بالفتح الأصحَ انّ حرف انّ فیها ﷽ من حیثُ إنّهُ مـــن افـــراد إنّ ﷽ فـــرع ﷽ إنّ ﷽ المکیـســورة ﷽ فـــهي الأصـــل لإستغنائها بمعمولیها في الإفادةِ ، بخلافِ المفتوحَة لأنّها مع معمولیها بمنزِلةِ مفرد، وقیلَ المفتوحةُ الأصلُ لأنّ المفردَ اصلٌ للمرکبِ ، وقیلَ کلٌ اصل لأن لهُ محالٌ یقَعُ فیها دونَ الآخَرِ[2]

---

لەپێشەوە رابووردچونکە کەووترا إنّما ئەو حـەصرە ئەگەیـەنێ لەرووی مەنطوقـەوە نەك بە صریح ، بەڵکو بە ئاماژە پێ‌کردن ، وەك لەپێشـەوە رابورد، چونکە کە ووترا:

إنّما یەکسەر حەصرەکە ئەڕوا بۆ ذهن ، هەرچەند لەهەندێ جێدا ڕێی پی ئەگیرێ بەشتێك کە لەپێش ئەوانەوەیە (١)وەك ئـەو فەرمودەی: پێشەوە لەبارەی ریبا ووترا. ئەم فەرمودەیە صەحیحە ئاحادە ، ئاحادیش گومان ئەگەیەنێ، بەڵام إجماع لە ئاحاد لە پیشترو بەهێزترە إنّما لە (إنّ) و لە (ما) پێك هاتووە، حەصر ناگەیەنن،ئێستە بۆ یەکیان گرت حەصر ئەگەیەنێ؟ دەڵێ : هیچ دوور نیە ئـەو دوو وشـەیەی پێك هاتبێ لەچەند پیتێك مانایەك بگەیـەنێ بەتەنها نەتوانن ئەو مانایە بگەیـەنن، دانەر ئیمام الحرمینی باس نەکرد، لەگەڵ ئەوەش ووتویەتی إنما مەفهومی مخالفەی هەیە، وەك لـەپێشـەوە رابورد چـونکـە ئیمام بەروونی نەی ووتوە ئەو حەصرە مەفهومە یان مەنطوقە.

(٢)إنّما بەفەتحەی هەمزەکەی قەولی ئەصەح ئەمەیە حەرفی (أنّ) کەی أنّما لەبەر ئەوەی یەکێکە لەئەفرادی ئەننەی پەتی، بێئەوەی مای لەگەڵ بێ، فەرعو پەلی ئەننەی مەکسورەیە، کەوابوو أنّماش فـەرعو پـەلی إنّمـای مەکسورەیە کـەوابوو إنّ مەکسـورە ئـەصلی (أن) مەفتوحەیـە، چونکـە تەنـها بـەهۆی هـەردوو مەعمولەکەیـەوە سـود بـە بەرامبەرەکەی ئەگەیـەنێ ئەگـەیێنیو پێویستی بەشتی تریش نیە، بەڵام مەفتوحەکـە جیاوازە چونکە لەگەڵ هەردوو مەعمولەکەشیا لەجێی موفرەدایەو جێی ئەو ئەگرێ. ووتراویشـە مەفتوحەکـە ئەصلـە چونکـە مرکـب لـە مفرد دروسـت ئـەبێ وپێـك دێ، ووتراویشە: هەریەك ئەصلێکی سەربەخۆیە، چونکە هەریەك چەند پیتێکی تایبەتیان هەیە، ئەویتر تیایا نابێ.

﴿ومن ثمّ﴾ اي ومنْ هنا وهو انّ المفتوحة فرع المكسورة اي من اجلِ ذلكَ اللازم لهُ فرعيّة انّما بالفتحِ لانما بالكسر ، ﴿ادّعى الزمخشري﴾ في تفسيرِ: ﴿ قل إنّما يوحى اليّ انّما إلهكم إلهٌ واحد ﴾ وتبعَهُ البيضاوي فيه ، ﴿إفادَتها﴾ اي إفادةُ إنّما بالفتحِ ﴿الحصر﴾ كإنّما بالكسرِ، لأنّ ما يثبتُ للأصلِ يثبتُ للفرعِ حيثُ لا مُعارِضَ، والأصل إنتفاءهُ والزمخشري وإنْ لم يُصرِّحْ بهذا الماخذِ قوةُ كلامهِ تشيرُ اليهِ ومعنى الآية على هذا ماقالهُ انّ الوحيَ الى رسول الله ﷺ اي في امر الإله مقصورٌ على إستئثار الله بالوحدانيّة اي لايتجاوزه الى ان يكونَ الإله كغيره متعدداً كما عليه المخاطبون[1] ومثلُ ذلك في قولهِ في آية: ﴿ إعلموا إنّما الحياةُ الدّنيا لعبٌ و لهوٌ و زينةٌ وتفاخرٌ بينكم ﴾ لراد انّ الدّنيا ليسَتْ إلاّ هذهِ الأمور

المحقرَاتْ، اي واَمَا العبادات و القرب فمن امور الآخرة لظهور ثمرُتـها فيـها، و نقـز المصنِّف إفادتها الحصرَ عنِ التّنوخي ايضاً في الإقصى القريب[٢]

(١)لێرەدا و لەبەر ئەوەی انّ فەرعی إنّ بوو لێوەی پەیدا نەبوو انّمایش فەرعی إنّمـ بێت، زمخشری لە تەفسیری ئایەتی: تۆ بڵێ تەنها بۆ لای من وەحی دێت، کە تەنها ئیلاهی ئێوە تاك وتەنهایە-بەیضاویش لەم تەفسیرەدا شوێنی کەوت- إدعای ئەوەی کردوەکە انما بە مەفتوحی حەصر ئەگەیەنێ وەك إنّما ی مەکسورە، چونکە ئەوەی ثابت و سەلمێنراو بێ بۆ ئەصل، ئەشدرێ بە فەرع، لەهەر جێیەکدا رێگری بۆ پەید نەبێ، ئەصلیش ئەوەیە رێگر نەبێ ، هەرچەند ئەم بەڵگەیە -انّما فەرعی إنّما یە- دەرنەبڕیوە، بەلاّم بەهێزی قسەکانی ئاماژە ئەکات بۆ ئەو بەڵگەیە -کە دەڵێ : إنّما یـ بۆ قەصری صیفەتە لەسەر موصوف ، یاخود بۆ قەصری موصوفە لەسەر صیفەت- کەوابوو مانای ئایەتەکە لەسەر ئەم ادعایە ئەوەیە کە خۆی ووتویەتی: بێگومان وەحی بۆ لای پێغەمبەرﷺ لەبارەی خواوە تەنها ئەوەیە کە خوا تاكـ ـ تەنهایی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و تایبەتی کردوە بە خۆیەوە، واتە وەحی لەو تاك و تەنیایی‌یە تەجاوز ناکات بۆ ئەوەی ئیلاە بێن بەچەند ئیلاهێك وەك ئیلاهە دەست کردەکان، کە ئەوانەی ئەم گفتوگۆی لەگەڵ کردوو لەسەری بوون.

(٢)زومەخشەری هەروەك ئەوەی وتوە لەم ئایەتەشدا کە دەفەرموێ: ئێوە بزانن ئەم ژیانە تەنها بریتیە لە یاری و بێ‌ئاگایی وجوانیەکی کاتی‌و شانازی بەسەر یەکدا کردنە،-ئەمەی وتووە-مەبەست ئەوەیە تەنها بێگومان ئەم دنیایە ئەم چەند شتە بێ‌نرخەن. ئەی ئەم گوێڕایەڵیەی خوا چی‌یە؟ بەلاّم هەموو بەندایەتیەکان و ئەوانەی ئەبنە هۆی نزیك بوونەوەی مرۆڤ بە خواوە ئەوانە کاروباری دواڕۆژن، نەك هی ئەم وفي قولهِ لإبن هشام إدّعى إشارةٌ الى ما عليهِ الجمهور من بقاء انّ فيها على مصدريّتها مع كفّها بما، وإن لم يُصرِّحوا بذلكَ فيما علمتُ إكتفاءً بكونها فيها من افـراد انَّ.[١] وعلى هذا معنى الآيَةِ الأولى:ما يوُحى إليَّ في امرِ الإلـه إلاّ وحدانيَّتُهُ اي لا ماانتم عليـه من الإشراكِ[٢] ومعنى الثانية: إعلموا حقارةَ الدّنيا فلا تؤثروها على الآخرَة الجليلة[٣] فبقاء ان في الآيتين على المصدريةِ كافٍ في حصولِ المقصودِ بهما في نفي الشريكِ عنِ اللهِ تعالى و تحقيرِ الدّنيا[٤]

{مسئلةٌ: من الألطافِ} جمع لطف بمعنى ملطوف اي من الأمورِ الملطوفِ بالنّاسِ بها {حدوث الموضوعاتِ اللغويّةِ} بإحداثهِ تعالى و إن قيلَ واضعها غيرُهُ من العِبادِ

لأنَهُ الخالقُ لأفعالِهم {ليعبِّرَ عمّا في الضميرِ} بفتحِ الموحَّدةِ اي ليعبِّرَ كلٌ من النّاسِ عمّا في نفسِهِ مما يحتاجُ اليهِ في معاشِهِ و معادِهِ حتَّى يُعاوِنُهُ عليهِ لعدمِ إستقلالِهِ بهِ[٥]

دنیایـە، چونکـە هەریەکـەیان لـەرۆژی قیامـەت دەردەکـەون، هـەروەها دانـەر لـە تەنوخیەوە لە کتێبی(الأقصی القریب) دا نەقڵی کردوە إنّما حەصر ئەگەیەنێ.

(١)دانـەر وەك إبن هشام وتـی: إدعـی، ئـەم وشـەیە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی جمـهوری لەسـەرە، کە أن لـە ئایەتەکەدا لەسەر مەصدەریـەتی خـۆی ماوەتـەوە، لەگـەڵ ئـەوەش لەکارخراوە بەهۆی لکاندنی بە ماوە، هـەر چـەند لـەو کتێبانـەی کـەمن ئـەزانم بـەڕونی ئەوەیان نەوتووە، چونکە ئەوەیان بەبەس زانیوە کەوتویانە: إنّما لەو ئایەتەدا یەکێکە لـە ئـەفرادی أنّ، خـۆ ئەننـەش بـۆ تـەئویلی مـەصدەرە کـەوابوو لـێرەش هـەر بـۆ مەصدەریەتە. (٢)لەسەر ئەم راو بۆچونە مانای ئایەتی یەکەم ئەمەیە: لەبارەی خواوە هیچ وەحیەکم بۆ نایە جگە تاك و تەنهایی خوا نەبێ، واتە نەك ئەو هاوەڵ بڕیاردانەی ئێوەی لەسەرن. (٣)مانای ئایەتی دووەم ئەمەیە: سوکی و بێنرخی ئەم دنیایە بزانن واتە کـەوابوو تـەفضیلی مـەدەن بەسـەر دوارۆژێکـی بـەنرخ و گـەورەدا. (٤)کـەوابوو مانەوەی أنّ لەهەردوو ئایەتەکەدا، کە نەفی هاوەڵە بۆ خوا لەیەکەمدا، وبێنرخ کردنی دنیایە لە دووەمدا.

(٥)(الطـاف) جەمعە موفرەدەکەی لطفە لطفیش مـەصدەری بەمانا اسمی مەفعولـە واتـە ملطوفـە، بـەکورتی یـانی هـەندێ لـەو شـتانەی بـەهۆی ئەوانـەوە ئـادەمیزاد میهرەبانیو نەرم و نیانی لەگەڵ کراوە-علم البیـان-داهێنانی دانانی لەفظ بۆ ماناو مەبەسـت هەریـەك بـەگوێرەی زاراوەی خـۆی لەلایـەن خواوەیـە، یاوتراویشـە دانـەری لەفظـەکان لەبەرامبـەری مانـاوە هـەندێ لەبەندەکانی خوان، بۆیـە خـوا داهێنەریـەتی، چونکـە خـوا داهێنـەرو دروسـت کـەری کارو کردەوەی بەندەکانیـەتی، بۆیـە خـوا ئـەو

{وهي} في الدّلالَةِ على ما في الضميرِ {افيَدُ منَ الإشارةِ والمِـثالِ} اي الشـكلِ لأنّها تعمُّ الموجود و المعدوم ، وهما يخصّان الموجودَ الـمحسوسِ، {وايسـرُ} منـها ايضـاً لموافقتهما للأمرِ الطبيعيِّ دونهما، فإنّـها كيفاتٌ تعـرض للنفـسٌ الضـروريِّ[١] وهي الألفاظُ الدالّةُ علـى المعـاني[٢] خـرجَ الألـفاظ المـهملة[٣] وتشـملُ الحـدَّ المركـبَّ الإسنادي، وهـي من المحدودِ على المُخـتارِ الآتـي في مبحَـثِ الأخـبارِ[٤] {وتعـرفُ بالنقلِ تواتـراً} نحـو السماءُ و الأرض و الحرّ و الـبرد لمعانيـها المعروفـة{او آحـاداً} كالقـرءِ للحيضِ والطهرِ[٥]

لوطفەی کردووە، بۆ ئەوەی سەرەنجام هەموو کەسێ ئەوەی ها لەدڵیاو پێویستی پێیەتی بۆ ژیانی دنیاو قیامەتی بتوانێ دەری بڕێ بۆ یەکێکی‌تر بۆ ئەوەی یارمەتی بدات، بۆ جێبەجێ کردنی چونکە خۆی تەنها ناتوانێ بەدی‌بهێنێ، تیکە نانی پێویستی بەهەزار کەس ئەبێت هەر لە جوتیارەوە تا هارینی ، تا دروست کردنی.

(١)ئەو زاراوانەی دانراون بۆ مانا لە دەلالەت کردنیانا لەسەر ئەو مەبەستەی دەروندایە، بەسودو بەکەڵکترن لە ئاماژەپێکردن و نەخش وێنەی شت، چونکە لەفظ بینراوو نەبینراو ئەگرێتەوە، بەڵام ئیشارەو وێنە تەنها بۆ بینراو ئەبن و بەس، ناتوانن بەرهەمی ژیری بەیان بکەن بۆ بیسەرو بینەر، وە دوبارە لەفظ ئاسانتریشە لەوان چونکە موافقیشە بۆ کارو بارە سروشتیەکەی کە هەناسەدانە، بەڵام ئیشارەو وێنە وانین. بۆ موافقیشە؟ چونکە ئەو لەفظانەی دانراون بۆ مانا چەند کەیفیەتێك و صیفەتێکن پەیدا دەبن بەهۆی هەناسەدانەوە ، کە هڵمژین و دانەوەی چروری ژیانە بەم دوانە هەموو پیتەکان دروست دەبن. (٢)ئەو زاراوانەش دانراون بۆ مانا بریتین لە چەند لەفظێك دەلالەت دەکەن لەسەر چەند ماناو مەبەستێك.

(٣)بەم پێناسە هەموو لەفظێکی بێمانا چووە دەرەوە و لەمەبستمان نیە

(٤)ئەم پێناسە مرەکەبی ئیسنادیشی گرتەوە، لەکاتێکدا یەکێکیشە یەکێکە لە ئەفرادی پێناسەکراوەکە لەسەر رای هەڵبژاردراو کە لە باسی (الأخبار)دا دێت

(٥)بەچی بزانرێ ئەو لەفظەیە بۆ ئەو مانایە دانراوە؟ بەنەقڵکردن لە پێشینانەوە ئەزانرێ، ئیتر ئەو نەقل کردنە بەتەواتر بێ وەك: (السماء و الأرض والحر والبرد) لەبەرامبەر ئەومانایەی ئەزانرێ، یاخود ئەو نەقڵە چەند کەسێك نەقڵی کردبێ، وەك وشەی (القرء) کە بۆ حەیزیش و بۆ پاکیش لەناو عەرەبدا دەما و دەم لەهەندێ کەس بیستراوە.

{وبإستنباط العقل من النّقل} نحو الجمع المعرَّفِ بأل عامّ فإنَّ العقلَ يستنبطُ ذلك مما نقلَ أنَّ هذا الجمعَ يصحُّ الإستثناء منْهُ اي إخراجُ بعضِهِ بإلاّ او إحدى اخواتها بأن يضمَّ إليهِ، وكلُّ ما صحَّ الإستثناءُ منْهُ مما لاحصرَ فيهِ فهو عامٌ كما سيأتي للزوم تناولِه للمستثنى[1] {لامجرَّدَ العقلِ} فلاتُعرفُ بهِ إذ لامجال لهُ في ذلك[2] {ومدلولُ اللفظِ إمّا معنىً جزئي او كليّ} ، الأوّلُ ما يمنع تصوّرَهُ من الشركَة فيهِ كمدلولِ زيد، والثّاني مالايمنعُ كمدلولِ الإنسانِ كما سيأتي مايؤخذُ منهُ ذلكَ.[3] {او لفظ مفرد مستعمل

كالكلمةِ فهي قولٌ مفرد}، والقولُ اللفظُ المستعملُ ، يعني كمدلولِ الكلمَةِ بمعنى ماصدَقها كرجل وضربَ و هل[4]

(١)ياخود ئەزانرێ بەهۆی ژێریەوە كە نەقڵەكەی دەری ئەهێنێ، وەك جەمعێك ئەلیف و لامی بەسەرەوە بێ بۆ عام و گشتیە، دەعەقڵ ئەمەی لەوە دەرهێناوە كە نەقڵ كراوە : ئەم جەمعە دروستە ئیستیثناو هەندێكی لێدەركەی ، بەهۆی (إلا)وە، یایەكێكی تریانەوە، بەم شێوە ئەوەی عەقڵ دەری‌هێناوە ئەدرێتە پاڵ ئەوەی نەقڵ كراوە، هەموو شتێكیش دروست بێ ئیستیثنای لێبكرێ‌و هەندێكی لێجیابكرێتەوە -لەوەی كە حەصری تیادا نەبێ- ئەوە شتێكی عام و گشتیە - وەك لەمەودوا دێت- چونكە كە وتت (مستثنی) هەموو كات ئەبێ (مستثنی منه)ی هەبێ- بەم شێوە جەمعی معرف بە (ال) عامە، چونكە استثنای لێدروستە، هەر شتێكیش إستثنای لێدروست بێ عامە، كەوابوو ئەم جەمعە جەمعی عامە، ئەمە عەقڵ لە نەقڵ وەری ئەگرێ. (٢)بەتەنها عەقڵ مەوضوعاتی لوغەوی نازانرێ، چونكە ژێری جێ‌پەل هاوێشتنی نیە لە ناسینی ئەلفاظەكاندا بۆ ماناكانیان. (٣)ئەوەی لەفظ دەلالەت ئەكا لەسەری دوو شتە: ١- یامانایە -واتە بەلەفظ ناوترێ- جا ئەمیش دووبەشە: أ-یا جوزئیە كە بریتی‌یە لەو شتەی تصورو وێنەگرتنی لەزێهندا نەیەڵێ هاوەڵی هەبێ، و هاوبەشی هەبێ، وەك ئەوەی زەید بەسەریدا ئەبڕێ، كەژاتێكی مشخص و مەعلومە. ب-یا ئەو مانا كولییە كە بریتی‌یە لەو شتەی كە تصورو وێنەگرتنی لەزێهندا رێ لەوە نەگرێ هاوشێوەو هاوەڵی هەبێ، وەك مەدلول و مەفهومی ئینسان كە حەیوانی ناطقە لێرەوە وشەی مەدلول بۆ الماصدق و مفهوم بەكارهاتووە، وەك لەمەودوا دێت ئەوەی ئەم دوو پێناسەیەی لێوەرئەگیرێ.

(٢)یا لەفظە، جا ئەو ملفوظەش چوار جۆرە: أ-تاكە لەفظێك بۆ مانایەكی مەبەست بەكارهێنرابێ،، چونكە كەلیمە واتە قەولی موفرەدە -تاكە لەفظێكە- قەولیش بە لەفظێك ئەوترێ بۆ مانایەكی مەبەست بەكارهێنرابێ، وەك مەدلولی كەلیمە-مەدلول

{او} لفظٌ مفردٌ {مهملٌ كأسماءِ حروفِ الهجاءِ} يعني كمدلولِ اسمائها نحو الجيمِ واللامِ والسّينِ اسماءٌ لحروفِ جلَسَ مثلاً اي جه له سه[1] {او} لفظٌ {مركّبٌ} مستعملٌ كمدلولِ لفظِ الخبَرِ اي ماصدَقه نحو: قامَ زيدٌ او مهملٌ نحو: كمدلولِ لفظِ الهذيانِ. وسيأتي في مبحثِ الأخبارِ التصريحُ بقسمي المركّبِ مع حكايةِ خلافٍ في وصفِ الأوّلِ و وجودِ الثّاني.[2] وإطلاقُ المدلولِ على الماصدقَ كما هنا سائغٌ ، والأصلُ إطلاقُهُ على المفهومِ أي ما وضعَ لهُ اللفظُ.[3]

{والوضعُ جعلُ اللّفظ دليلاً على المعنى} فيفهمُهُ منْهُ العارِفُ بوضعِه لَهُ[٤] وسيأتي ذكرُ الوضعِ في الحقيقَةِ مع تقسيمها الى لغويَّةٍ وعرفيّة و شرعيّة وفي حدِّ المجازِ مع إنقسامها الى ماذُكر[٥]

لێرەدا بەواتای ماصدقی کەلیمەیە- وەك: (رجل) اسم، (ضرب) فيعل، (هل حەرف. (١)ب-یاخود تاکە لەفظێکی بیّمانایە وەك مەدلولی ناوەکانی پیتی هیجا-نەك ناوەکانیان- وەك مەدلولی جیم و لام و سین-کە ئەمانە ناون بۆ پیتەکانی جلس کەبریتین لە: جە لە سە ، واتە جە تەنها خۆی لەفظێکی تەنها و بیّمانایە.

(٢)ج-یاخود مەدلولەکە لەفظێکی ماناداری مرکب و پێکهاتەیە، لە چەند لەفظێك وەك مەدلولی بەمانا ماصدقی لەفظی خەبەبر ، وەك زید هەستایەوە. د-یاخود لەفظێکی مرکەبی بیّمانایە وەك مەدلولی لەفظی ورێنە، لەکەسێکی ورێنەدارەوە. بۆ مرکب ئەم دوو بەشەی هەیە؟ بەڵێ لەمەودوا دێت لەباسی (الأخبار)دا بەڕونی باسی هەردوو بەشەکەی مرکب ئەکریّ، لەگەڵ وتنەوەی ئەو جیاوازیەی لەنێوان زانایان دا هەیە لەبارەی مرکبی متصلەوە ئایا وەصفی بۆ هەیە؟ یاخود بۆ تاك تاکی لەفظەکانیەتی؟ هەروەها لەبارەی بوونی مرکبی مهملەوە ئایا هەیە یان نا؟

(٣)دابڕینی مەدلول بەسەر ماصدق دا ، واتە لەباتی الماصدق مەدلول بەکارهاتووە لێرەدا، ئەوەش دروستە بەڵام مەدلول لە حەقیقەت و إصطلاحدا ئەبڕیّ بەسەر مەفهومدا، واتە:بریتی‌یە لەوەی لەفظەکەی بۆ دانراوە.

(٤)وەضع بریتیە لەکردنی لەفظێك بەبەڵگەو نیشانە لەسەر ماناو مەبەستێك، ئیتر ئەوەی ئەزانیّ ئەو لەفظە بۆ ئەو مانایە دانراوە یەکسەر ئەو مانایە حاڵی ئەبیّ بەبیستنی ئەو لەفظەیە. (٥)لەمەودوا دێت باسی وەضع بکرێت لەباسی پێناسەی حەقیقەتدا لەگەڵ دابەش کردنیدا بۆ شەش بەش:١-وەضعی‌حەقیقی‌لوغەوی.
٢-وەضعی حەقیقی شەرعی. ٣-وەضعی حەقیقی‌عورفی. وەلە پێناسەی مەجازیشدا ئەکریّ بە سیّ بەشەوە: ١-وەضعی مەجازی لوغەوی.٢-وەضعی مەجازی عورفی.

فالحدُّ المذكورُ كما يصدُقُ على الوضع اللغويِّ يصدُقُ على العرفيِّ و الشرعيِّ، خلافَ قولِ القرّافي إنّهما في الحقيقَةِ كثرَةُ إستعمالِ اللفظِ في المعنى بحيثُ يصيرُ فيه اشهَرَ من غيرِهِ ، نعم يعرفانِ فيها بالكثرَةِ المذكورَةِ ويزيدُ العرفيُّ الخاص بالنّقل الذي هو الأصلُ في اللغوي.[١] {ولايُشترَطُ مناسبَةُ اللفظِ للمعنى} في وضعِه لهُ فإنّ الموضوعَ للضدينِ كالجونِ للأسودِ للأبيَضِ لايُناسبهما {خلافاً لعبادٍ} الصميريّ {حيثُ اثبتها} بين كل لفظٍ و معناهُ قال: وإلاّ فلِمَ إختصّ به[٢] {فقيلَ بمعنى إنّها حاملةٌ على الوضعِ} على

وفقها فيحتاجُ إليهِ[٢] {وقيلَ بلْ} بمعنى إنّها {كافيةٌ في دلالَةِ اللفظ على المعنى} فلا يحتاجُ الى الوضعِ يدرِكُ ذلكَ من خصّهُ اللهُ بهِ كما في القافة ، ويعرفُهُ غيرُهُ منْهُ ، قال القرافي: حكى انّ بعضُهم كان يدّعي انّهُ يعلَمُ المسمّياتِ من الأسماءِ، فقيلَ لهُ مامسمّى آذغاغ وهو من لغةِ البربرِ ، فقال: اجدُ فيه يبَساً شديداً وأراهُ إسمَ الحجرِ، وهو كذلك، قال الأصفهاني: والثّاني هو الصحيحُ من عباد"[٤]

---

٣-وەضعی مەجازی شەرعی، (١)کەوابوو پێناسەی ئەو وەضعەی کرا لەمەتنەکەدا وەك هەردوو جۆرە وەضعە لوغەویەکە ئەگرێتەوە، بەلاّم ئەم قسە جیاوازە لەگەلّ قەولی قەرافیدا ئەلّێ وەصفی عورفی شەرعی حەقیقی وەضع نیە ، بەلّکو بریتین لە زۆر بەکارهێنانی لەفظێکە بۆ مانایێك، بەشێوەیەك بەکارهێنانی لەو مانایەدا بەناوبانگترە لەبەکارهێنانی بۆ مانایەکی‌تر، نەك بۆی وەضع کرابێ، بەلّێ عورفیو شەرعی حەقیقی ئەناسرێتەوە بەهۆی زۆر بەکارهێنانیانەوە، بەس ئەوەندە هەیە عورفی خاص و تایبەت زیاد لەوە ئەناسرێتەوە بە نەقلّیش، کە نەقلّ خۆی سەرچاوەو بنەڕەتە لە وەضعی لوغەویدا، نەك استنباطی عەقلّیدا.

(٢)بەمەرج نەگیراوە گونجاوی لەنێوان لەفظ و مانادا هەبێ لەکاتی دانانی لەفظێك بەرامبەر مانایێك، چونکە ئەولەفظەی دانراوە بۆ دوو واتای دژ بەیەك گونجاونیە لەگەلّ هەردوکیاندا، وەك: وشەی (جون) دانراوە بۆ رەشیش و بۆ سپیش، بەلاّم عەبادی صەیمەری جیاوازە، ئەو گونجاوی سەلماندووە لەنێوان هەموو لەفظ و مانایەکدا و وتویەتی: جا ئەگەر گونجاوی و خزمایەتی لەنێوانیاندا نەبێ بۆچی تەنها ئەو لەفظە بۆ ئەو مانایە دانراوە و تایبەتە پێیەوە؟. (٣)هەندێك وتویانە: بۆیە صمیری وای وتووە چونکە ئەو ئەو خزمایەتیو گونجاویە پالّ ئەنێ بەدانەرەوە ئەو لەفظە بۆ ئەو مانایە دابنێ، لەسەر شێوازو ئەندازەی ئەو خزمایەتیە، هەر بۆیە پێویستی بە وضع هەیە وەك لەپێشەوە وترا: تعرف بالنقل تواتُراً...الخ

(٤)هەندێکی‌تر وتویانە نەخێر بەلّکو تەنها گونجاوی و خزمایەتیەکە بەسە بۆ

{واللفظُ} الدالُّ على معنىً ذهنيٍ خارجـيٍ اي لهُ وجودٌ في الذّهنِ بالإدراكِ ووجود في الخارجِ بالتحقّقِ كالإنسانِ بخلافِ المعدوم فلا وجود لـهُ في الخارجِ كبحرِ زئبـقٍ {موضوعٌ للمعنى الخارجيِّ لا الذهنيِّ خلافاً للإمامِ} الرّازي في قولِه بالثّاني: قال: لانّا إذا راينا جسماً من بعيدٍ وظننّاهُ صخرةً سمّيناهُ بهذا الإسم، فإذا دنونا منهُ وعرفنا انّهُ حيوانٌ لكن ظنناهُ طيراً سمّيناهُ بهِ فإذا إزداد القربُ وعرفنا

انَّهُ إنسانٌ سمّيـناهُ بهِ فاختلف الإسم لإختلافِ المعنـــى الذهـنيّ وذلك يـدلُّ على أن الوضع له"[1]

دەلاَلــەت کردنی لەفظەکە لەسەرماناکەی، لەبەر ئەوە ئیتر پێویست بە وەضع ناکات ئەو گونـــجاوی و خزمایەتیەش کەسێ ئەیزانێ کە خوا ئەو بەهرەیەی پی‌بەخشیبی وەك قیافەنـــاس نیعمـەتیکی تایبەتی‌یـە هـەندێ کـەس ئـەیزانن، خـــەڵکانی‌تریش لەوەوە فێرئەبن. قرافی گەڕاندویەتەوە کە هەندێ کەس إدعای ئەوەیـــان کردوە هەر بـــەبـــیســـتنی ناو. ناوەڕۆکو مانایان زانیوە،جا پێی وتراوە ئاذغاغ چی‌یـــە؟ - وشەیـــەکە لـەزاراوەی هـۆزی بەبـەر- ئـەویش وتوویـەتی وشکـیەکی تونـدی تیـــ ئەبینـــم و وائـــەزانم ناوی بەرد بێ هەروەهاش بووە، ئەصفەهانیش وتویـەتی قیلی دووەم صەحیحە لە عبادەوە، واتە مناسبە کەکافی بێ.

(١)ئەو لەفظەی دەلاَلەت ئەکـــا لەسەر مانایێك کە ئەو مانایە بە هۆی إدراکــــەوە لە ذهندا هەیە، وە بـــەهۆی تحققەوە لە خارج و واقعدا هەیە، وەك ئادەمیـــزاد. بـــەلاَم بە پێچەوانەی لەفظێك دەلاَلـەت بکا لەسەر مانایـەکی معــــدوم و نـەبوو، چـــونکـــە ئەوە لەخارج و واقـــعدا بوونی‌نیە، وەك دەریـای جیوە ، ئەو لەفظـە دانـــراوە بـــۆ مـــانایەك کە لـــەخارج دا بونەکـەی هەیـە، نـەك بـۆ مانـایێك کـە هـەر لـە ذهنـــدا هەبێـــت، بەلاَم ئەم قســـە جیاوازە لەگەڵ بۆچونی ئیمامی رازیدا کە رای لەگـــەڵ دووەمـــدایە ئـــەڵێ: ئـــەگەر ئێمـە لە زۆر دوورەوە تارمایيـــەکمان بینیو وامـــان زانـی بـــەردە نـاوی ئـەنێین بـــەبەرد، جـا ئەگـەر کـەمێك نزیـك بوینـەوە لێـی و زانـــیمـــان گیانلەبـــەرە نـاوی ئـەنێین بـاڵندە، جـا ئەگـەر زیـاتر نزیـك بوینـەوە و زانـــیمـــان ئادەمـــیـــزادە، ئـــەوە ناوی ئەنێین بە مرۆڤ، کەوابوو نـاوو لەفظەکە گۆڕانکـــاری بەسەردا هـــات، بەهـــۆی گۆڕانکاری بەسەر مانا ذهنیەکەدا، چونکە خۆ واقعەکە نەگـــۆڕاوە ئا ئـــەوە دەلاَلـــەت ئەکا لەسەر ئەوە کە لەفظ دائەنرێ بۆ مانا ذهنیەکە نەك بۆ خارجیـەکە.

وأُجيبَ بأنّ إختلافَ الإسمِ لإختلافِ المعنى في الذّهنِ لظنِّ انَّهُ في الخارجِ لا لمجرَّدِ إختلافهِ في الذّهنِ فالموضوعُ لهُ ما في الخارجِ، والتَّعبيرُ عنهُ تابعٌ لإدراك الذّهنِ لهُ حسبَ ما ادركَهُ.[1] {وقال الشيخُ الإمام} والد المصنِّف: هو موضوعٌ {للمعنى من حيثُ هو} اي من غيرِ تعبيرٍ بالذّهني او الخارجيّ، فإستعمالُهُ في المعنى في ذهـنٍ كـانَ او خـارجٍ حقيقيٌّ على هذا دون الأولين[2] والخلافُ كما قـالَ المصنِّـف في إسمِ الجنسِ اي في

النَّكرَةِ لأنَّ المعرِفَةَ مِنْهُ ما وضِعَ للخارجيِّ و مِنْهُ ما وضِعَ للذهنيِّ كما سياتي[٢] {وليس لكلِّ معنىً لفظٌ بل} اللفظُ {لكلِّ معنىً محتاج الى اللفظ} فإنّ انواع الروائحِ مع كثرَتِها جداً ليس لها الفاظٌ لعدَمِ إنضباطِها ويدلُّ عليها بالتقييدِ كرائِحَةِ كذا فليسَتْ مُحتاجَةً الى الألفاظِ وكذلكَ انواعُ الآلام[٤]

---

(١)وەڵام دراوەتەوە کە گۆڕینی ناو بەهۆی گۆڕینی مانایە لە ذهندا،، لەبەر ئەوەیە وای زانیوە لە واقع و خارجیشدا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. نەك تەنها لەبەر ئەوەی لە ذهندا گۆڕاوە، کە وابوو مەوضوع لەو لەفظ بۆ دانراوەکە ، ئەوەیە کەلە خارج و واقعدایە، تەعبیرو گەیاندنی ئەوەی لەدەرەوەی ذهندایە هەموو کات شوێن کەوتەی إدراك و ذهنە، ذهن چۆنی دەرك بکا و چۆنی بزانێ دەرەوەیش رەنگی ئەوە ئەداتەوە.

(٢)باوکی دانەر وتویەتی: لەفظ دانراوە بۆ خودی مانا ئیتر بێ‌ئەوەی ذهنی یاخارجی پێوە بلکێنرێ، کەوابوو لەسەر ئەم بۆچونە بەکارهێنانی لەفظ لە بۆ مانای خۆی ، ئەو مانایەش لە ذهندا یا لەخارجدا بێ، ئەوە إستعمال و مانایەکی حەقیقی خۆیەتی، نەك ئەو دوو بۆچونەکەی پێشوو ، چونکە ئەوان یەکێکیان وتی: بۆ مانای خارجیە، ئەویان وتی بۆ مانای ذهنیە.

(٣)ئەم جیاوازیە وەك دانەر دەڵێ لە ئسمی جنسی بەمانا نەکیرەدایە، چونکە مەعرفە بێگومان هەندێکی دانراوە بۆ مانایەکی خارجی، وە هەندێکی دانراوە بۆ مانایەکی ذهنی، وەك لەمەودوا دێت-علمی شەخص دانراوە بۆ معینێك لە خارجدا، علمی جنس دانراوە بۆ معینێك لە ذهندا، هەردووکیان مەعریفەن، هەموو معارف بۆ معینی فی الخارج دانراوە، جگە لە ئەلی حەقیقەت و جنس نەبێ ئەمانە بۆ معینی ذهنین- (٤) لەفظ بۆ هەموو مانایێك نیە، بەڵکو لەفظ بۆ هەموو مانایێك هەیە کەپێویستی بەلەفظ بێ،چونکە جۆرەکانی بۆن لەگەڵ زۆری و بێ‌ئەندازەییشدا بۆ هەریەکەیان لەفظێك دانەنراوە، چونکە لەبەر زۆریان ضبط ناکرێن لەفظێك ئەکرێ بەنیشانە لەسەریان کە ناوەکەی خۆیەتی لەگەڵ بەستنەوەی بە وشەی بۆن، وەك ئەڵێت: بۆنی ریحانە، لەبەر ئەوە پێویستیان بە لەفظێکی تایبەت نیە، هەموو

وبلْ هاهنا إنتقالِيّةٌ لاإبطاليّة[١] {والمُحكَمُ} منَ اللفظِ {المُتَّضِحُ المعنى} من نصٍ او ظاهرٍ.[٢]

{والمتشابِهُ منهُ ما إستأثر اللهُ} اي إختصّ {بعلمِهِ} فلم فلمْ يتَّضحْ لنا معناهُ، {وقدْ يُطلِعُ} اي اللهُ {عليهِ بعضَ اصفيائهِ} إذ لامانع من ذلك[٢] منْهُ الآيات و الأحاديثُ في ثبوتِ الصّفاتِ للهِ المشكِلَةِ على قولِ السَّلَف بتفويضِ معناها اليهِ تعالى كما سيأتي،

مع قولِ الخلَف بتأويلِها في أصولِ الدّينِ وهذا الإصطلاحُ مأخوذٌ من قولِه تعالى: ﴿ منه آياتٌ محكماتٌ هنَّ أمُّ الكِتابِ و آخرُ متشابِهات ﴾[4]

{قال الإمام} الرّازي في المحصولِ {واللفظ الشائعُ} بينَ الخواصِ و العوامِ {لايجوزُ أن يكونَ موضوعاً لمعنىً خفيِّ إلاّ على الخواصِ} لإمتناعِ تخاطُبِ غيرِهِم من العوام بماهو خفيٌّ عليهم لايدركونَهُ[5]

---

جۆرەكانی ئێش و ئازاریش هەروەك بۆنیان لەگەڵدا ئەكرێ، ژانەسەر و ژانەسك.

(١)وشەی بل لێرەدا بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستێكەوە بۆ مەبەستێكی‌تر، نەك بۆ پوچەڵ كردنەوەی پێش خۆی بێت. (٢)لەفظی موحكەم ئەوەیە ماناكەی رون بێ و هەموو كەس بیزانێ، ئیتر كەیفی خۆیەتی نص یاخود ظاهر بێ، واتە یەك مانای هەبێ یاخود دوو مانای هەبێ.

(٣)لەفظی متشابهیش ئەوەیە خوا بۆ خۆی هەڵی بژاردووەو تایبەتە بە عیلمی خواوە، لەبەر ئەوەیە بۆ ئێمە رون نەبوەتەوە، بەڵام جاری واهەیە خوا هەندێ لەبەندە پاكەكانی ئاگادار ئەكا لەو مانایە، چونكە ئەگەر خوا كەسێك ئاگاردار بكا هیچ مانع ورێگرێك نیە-بێگومان ئەمە بەشێكی متشابهە، بەشەكەی تری نەمەلائیكەو نەپێغەمبەران نایزانن- (٤)هەندێ لە لەفظی متشابه ئەو چەند ئایەت و حەدیسەیە كەظاهیرەكەیان موشكیلەیە و لەبارەی ثبوتی صیفاتی خواوە باس دەكەن، ئەو ئیشكالە زانایانی سەلەف و چەرخی یەكەم و دووەم و سێهەم بەوە شیتەڵیان كردوە وتویانە ماناكەیان ئەزانین بەڵام چۆنیەتیەكەیان ئەدەینەوە دەست عیلمی خوای گەورە خۆی، وەك لەمەودوا دێت لەگەڵ راوبۆچونی چەرخی دوای ئەواندا، وتوویانە ئەو هەموو ئایەت و حەدیسە تەئویل دەكرێن و مانایەكی تریان بۆ لێ‌ئەدرێتەوە،ئەمەش لەبەشی (اصول الدین)ی ئەم كتێبەدا باسەكەی دێت، ئەم زاراوەی موحكەم و متشابهە لەم ئایەتەوە وەرگیراوە كە دەفەرموێ: هەندێ قورئان چەند ئایەتێكی موحكەمن كە زۆربەی قورئانن، ئەوانی‌تریش متشابهن. (٥)رازی لە كتێبی(المحصول)ی خۆیدا وتویەتی: لەفظێك كە بڵاوبێ لەنێوان خاص و عامدا دروست نیە دابنرێ بۆ مانایێك

{كما يقول} من المتكلّمين {مثبتوا الحال} اي الواسطة بينَ الموجودِ والمعدوم، كما سيأتي في أواخرِ الكتاب معنى {الحركَةِ معنىً توجِبُ تحرُك الذّات} اي الجسم فإنّ هذا المعنى خفيُّ التعقُّلِ على العوامِ، فلايكونُ معنى الحركةِ الشائعُ بينَ الجميع ، والمعنى الظاهِر لهُ تحرك الذّات.[1]

{مسئلةٌ: قال إبن فورك والجمهور: اللغاتُ توقيفيّةٌ} اي وضعها اللهُ تعالى فعبّروا عن وضعه بالتوقيفِ لإدراكه به[٢] {علمها اللهُ} عبادَهُ {بالوحي} الى بعضِ اوليائه {او خلقِ الأصوات} في بعضِ الأجسام بأن يدلَّ من يسمعها من بعضِ العبادِ عليها {أو} خلق {العلم الضروريّ} في بعضِ العبادِ بها[٣] والظّاهر من هذهِ الإحتمالاتِ اوّلها لأنّهُ المعتادُ في تعليم الله تعالى[٤]

مەبەستێکی شاراوە لەسەر عام و تەنها هەندێکی تایبەت بیزانن، چونکە ناکرێ گفتوگۆ لەنێوان عەوامدا بکرێ بەلەفظێك ماناکەی شاراوەبێ بە لایانەوە نەیزانن، جگە لە هەندێکی تایبەت نەبێ ، بۆ شتی واهەیە؟ بەڵێ.

(١)وەك هەندێ لەزانایانی کەلام دەڵێن کەسەلمێنەری حاڵن -واتە واسطەو قۆناغی مام ناوەندی نێوان بوون و نەبوون- وەك لە کۆتایی ئەو م کتێبەدا باسەکەی دێت، ئەمانە ئەڵێن حەرەکە بریتیە لە مانایێك کە داخوازی بزوتنی ذات و جەستەو لاشە دەکات، دە بەڕاستی ئەم مانایە حاڵی بوون و لێك گەیشتنی بۆ عەوام زۆر پەنهان و گرانە روون نیە، کەوابوو ئەم مانا پەنهانیە نابێ بکرێتە ماناو مەبەستی ئەو حەرەکەی کە بلأوە لەنێوان هەمواندا، مانای ظاهیری لەفظی حەرەکەش کە بریتیە لە بزوتنی خودی جەستەو لاشە.

(٢)مەسئەلە: إبن فورك و جمهور وتویانە: هەرچی لۆغەو زاراوەی ئادەمیزاد هەیە هەموویان تەوقیفین و ئەزانرێن-سەبەبی وتووە مەبەستی مسبەبە-. (٣)خوای گەورە ئەو لۆغانەی فێری بەندەکانی کردووە بەیەکێ لەم شێوازانە: ا-بەناردنی وەحی‌و نیگا بۆ هەندێ پێغەمبەران. ب-یاخود بەدروست کردنی دەنگەکان لە هەندێ لاشەدا، بەم شێوەئەو بەندانەی ئەو دەنگانە ئەبیسن ئەبنە رێبەر بۆ سەر هەموو لۆغەکان و ماناکانیان. ج-یاخود لەرێی دروست کردنی عیلمێکی ضروری بەو لۆغانە لە هەندێ بەندەکانیدا، لەوانیشەوە خەڵکانی‌تر فێریان بوون.

(٤)ئەم سێ شێوازە هەڵئەگرێ بەلأم یەکەمیان دیارە و ئەبێ خوا بەمەیان خەڵکی فێرکردبێ، چونکە خوا هەرکات ویستبێتی خەڵك فێری شتی بکات لەرێگەی وەحیەوەیە بوو.

{وعزّي} اي القولُ بأنّها توقيفيّةٌ {الى الأشعري} و محقّقوا كلامِه كالقاضي ابي بكر الباقلاني وإمام الحرمين و غيرهما لم يذكروهُ في المسألة اصلاً، واستدل لهذا القول بقولِه تعالى :﴿ وعلّمَ آدمَ الأسماءِ كلّها﴾ اي الألفاظ الشاملةَ للأسماءِ والأفعالِ والحروفِ لأنّ كلاً منها إسمٌ اي علامةٌ على مسمّاهُ

وتخصيص الإسم ببعضها عُرفَ طرا وتعليمُهُ تعالى دالٌ على أنه الواضِعُ دونَ البَشرِ.[1]

{و}قال {اكثر المعتزِلَة} هي {إصطلاحيَّةٌ} اي وضعها البشر واحداً فاكثر {حصل عرفانُها} لغيرِه منهُ {بالإشارَةِ والقرينَةِ كالطفل} إذ يعرفُ لغةَ {ابويه} بهما واستدل لهذا بقولِه تعالى: ﴿ وما ارسلنا من رسولٍ إلاّبلسانِ قومِه ﴾ اي بلغتهم فهي سابِقَةٌ على البعثةِ ، ولو كانت توقيفيّة والتعليمُ بالوحي كما هو الظاهرُ لتأخّرتْ عنها[2]

---

(١)ئەو قەولە كە ئەڵێ هەرچی زاراوە هەیە هەموویان تەوقیفین نیسبەت دراوە بۆ ئەشعەری ، بەلاّم محققینی کەلامی ئەشعەری وەك باقلانیو إمام الحرمين و زانایانیتریش شێخی ئەشعەریان لەم مەسئەلەدا باس نەکردووە، بەڵگە هێنراوەتەوە بۆ ئەم قەولە بەئایەتی: خوا ئادەمی فێری ناوەکان کرد هەر هەموویان، واتە هەموو لەفظەکان کە ئیتر گشتگیرە بۆ هەموو ناو و فیعل و حەرفێك، چونکە هەریەك لەم سیانە إسمی بەمانا نیشانەیە لەسەر ناوەڕۆکەکەی بەلاّم ئێستە إسم تایبەت کراوە بە هەندێکیانەوە، ئەوە عورفێکی تازە پەیدا بووە، خوای گەورەش کە خۆی ئادەمی فێر کردووە، دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوە کە خۆیشی واضع و دانەری لوغەتەکانەو تەوقیفیشیان سەلمێنرا.

(٢)زۆربەی زانایانی موعتەزیلە وتویانە: لۆغەکان هەموویان إصطلاحین واتە: ئادەمیزاد دایناون یەکێك یان زیاتر، ئیتر لەو تاکە کەسەوە خەڵکیتر فێر بوون بەهۆی ئاماژەو قەرینەوە، وەك منداڵ ، چونکە لۆغەی باوك و دایکی بەهۆی إشارەو قەرینەوە فێر ئەبێ، بەڵگە هێنراوەتە بۆ ئەم قەولە بەم ئایەتە: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە بەزمانی گەلەکەی خۆی نەبێ، واتە بە لوغەتی خزمەکانی ، کەوابوو لۆغەت پێش ناردنی پێغەمبەران و پەیامی خوایی بووە، ئەگەر تەوقیفی بونایە فێرکردنی خەڵك بۆیان لەرێگەی وەحیەوە بوایە -وەك ظاهر هەر وایە- ئەو کاتە لۆغەکان لەدوای ناردنی پەیامە خواییەکانەوە ئەبوو.

{و}قال {الأستاذ} ابو إسحق الإسفراييني: {القدْرُ المحتاجُ} إليهِ منها {في التعريف} للغيرِ {توقيفٌ}، يعني توقيفيٌّ لدعاءِ الحاجَةِ اليه، {وغيرُهُ محتملٌ لهُ} لكونهِ توقيفياً او إصطلاحياً[1] {وقيلَ عكسُهُ} اي القدرُ المحتاجُ في التعريفِ إصطلاحيٌّ، وغيرُهُ محتملٌ لهُ وللتوقيفيّ، والحاجَةُ الى الأوّل تندَفعُ بالإصطلاحِ.[2]

{وتوقّفَ كثيرٌ} منَ العُلَماءِ عنِ القولِ بواحدٍ من هذه الأقوال لتعارُضِ ادلّتها[٣] {والمختارُ الوقفُ عنِ القطع} بواحدٍ منها لأنَ ادلّتها لاتُفيدُ القطع[٤] {وانَّ التوقيف} الذي هوَ اولها {مظنونٌ} لظهورِ دليلهِ دون دليل الإصطلاح فإنَّهُ لايَلزَمُ من تقدُّم اللغَة على البعثَة أن تكونَ إصطلاحيّةً لجوازِ أن تكونَ توقيفيّةً، ويتوسّطُ تعليمُها بالوحي بينَ النُبوّةِ و الرسالَة.[٥]

{مسئلَةٌ: قال القاضي} ابوبكر الباقلاني {وإمام الحرمين والغزالي والآمدي: لاتثبتُ اللُغَةُ قياساً، وخالَفَهُم ابي سريج وإبنُ ابي هُريرة و ابو إسحق الشيرازي و الإمام} الرّازي فقالوا: تثبَتُ فإذا إشتَمَلَ معنى إسمٍ على وصفٍ مُناسبٍ للتسميَة كالخَمرِ أي المُسكرِ من ماءِ العنَبِ لتخميرهِ أي تغطيَتهِ للعقلِ[٦]

---

(١)إسفراییني وتویەتی: ئەو ئەندازەی پێویستی هەیە پێی لەزاراوەکان بۆ ناساندنی شتێ بەغەیر ، ئەوە تەوقیفە چونکە حاجەو پێویستی خەڵك داوای ئەوە ئەکا، بەلآم ئەویتر کە پێویستمان پێی نیە هەڵئەگرێ تەوقیفی بێ یاخود إصطلاحی بێ. (٢)وتراویشە پێچەوانەی بۆچونەکەی إسفراییني، واتە ئەو ئەندازەی پێویستمان پێی هەیە بۆ ناساندنی شت بەیەکتر ئەوە إصطلاحیە، ئەوەش پێویستمان پێی نیە، هەڵئەگرێ إصطلاحی بێ یاخود تەوقیفی بێ، پێویستمان بۆ لای تەوقیفی بە إصطلاحی دەردەچێ.

(٣)زۆربەی زانایان وەستاون لەقول کردن بەیەکێ لەم قەولانە، چونکە بەڵگەکانیان دەچنەوە بەگژیەکداو رێ لەیەکتر دەگرن. (٤)رایەك لەنێوان هەموویاندا هەڵبژێردرێ ئەوەیە کە بوەستێ تائەوەی بێگومان ئەبێ کەیەکێکیانە، چونکە بەڵگەکانیان بێگومانی ناگەیەنن. (٥)وە تەوقیفیش موختارە کە یەکەمی قەولەکانە جێگومانە، چونکە بەڵگەکەی ئاشکراو دیارە. نەك بەڵگەی إصطلاحەکە، چونکە پێش کەوتنی لۆغە بەسەر ناردنی پێغەمبەراندا لازم ناکا کە إصطلاحی بێ، چونکە دروستە کە تەوقیفی‌بێ، فێرکردنی خەڵکیش بە لۆغەکان لەرێی وەحیەوە کەوتبێتە نێوان پێغەمبەرایەتی‌و پەیام دا. (١)باقلاني و ئیمام الحرمین و غەزالی و ئامێدی وتوویانە: لۆغەو زاراوە لە رێگەی قیاسەوە ناچەسپێ و ثابت نابێ، بەلآم (إبن

ووجد ذلكَ الوصفُ في معنىً آخر كالنبيذِ اي المُسكرِ من غيرِ ماءِ العنَبِ ثبَتَ لَهُ بالقياسِ ذلكَ الإسم لغةً فيُسمّى النبيذُ خمراً، فيَجِبُ إجتنابُهُ بآيَةِ ﴿ إنّما الخمرُ والميسرُ﴾، لا بالقياسِ على الخمرِ، وسواءٌ في الثُبوتِ الحقيقَةُ والمَجازُ[١] وقيلَ {تثبتُ الحقيقَةُ لا المجازُ} لأنَهُ اخفضُ رتبَةً منها[٢] {ولفظُ القياس} فيما ذُكِرَ {يُغني عن

قولكَ} اخذاً من ابن الحاجب {محل الخلافِ ما لم يثبُتْ تعميمُهُ بإستقراءٍ} فإنّ ماثبت تعميمُهُ بذلِك من اللغَةِ كرفعِ الفاعلِ ونصبِ المفعولِ لاحاجةَ في ثبوتِ مالم يسمع منهُ لَوْ القياسِ حتّى يختلف في ثبوته[٢]

سريج) و(إبن ابي هريرة) و شيرازى و رازى پێچەوانەى ئەمانەيان وتووە، ئەلێن لەرێى قياسەوە زاراوە ئەچەسپێ و پابت ئەبێ، كەوابوو ئەگەرواتاى ناوێك وەصفێكى ئەگرتەوە كە گونجاوو خزمايەتى هەبوو بۆ ناو نانەكە، وەك خەمر واتە ئەو سەرخۆشكەرەى كە لە ئاوى ترێ دروست دەكرێ، بۆيە پێى ئەوترێ خەمر چونكە ژيريى مرۆڤ داگير ئەكاو دايئەپۆشێ. (١)وەهەر ئەو وەصفە لەماناى ناوێكى تردا دەست دەكەوێت، وەك نەبيذ و شەراب واتە ئەو سەرخۆشكەرەى كە لەغەيرى ئاوى خورما دروست بكرێ، ئەوە بەهۆى قياسەوە ئەو ناوەى بۆ ثابت ئەبێ هەر خودى زاراوەكەى بەسەردا ئەبڕرێ لەبەر ئەوە شەراب ناو ئەبرێ بەخەمر، كەوابوو بە ئايەتى: ﴿ إنَّما الخمر والميسرُ ﴾ واجب ئەبێ لەشەراب دوركەوتنەوە نەك بەقياس لەسەر خەمر ئيتر كەيفى خۆيەتى و چون يەكە حەقيقى بێ ياخود مەجازى‌بێ ئەو زاراوە بەقياس ئەچەسپێ و ثابت ئەبێ..

(٢)وتراويشە زاراوەى حەقيقى بە قياس ثابت ئەبێ و ئەچەسپێ، بەلام مەجازى نابێ چونكە مەجاز پلەى نزمترو نەوى‌ترە لە حەقيقەت. (٣)لەفظى قياس لەو رستەى باسكراوە وتمان: لا تثبت اللغة إلاّ قياساً ، بێ ئيحتياجت ئەكا لەوەى بڵێيت: ئەوەش لە ئيبن حاجبەوە وەرگيراوە، شوێنى جياوازى زانايان لە شوێنێكدا ئەبێت، گشتگيرى و تەعميمەكەى بۆ هەموو ئەفرادەكان بەهۆى استقرائەوە نەچەسپى بێ، و پابت نەبووبێ چونكە ئەوەى گشتگيريەكەى بۆ هەموو ئەفرادەكان چەسپى بێ، بەهۆى استقرائەوە لە لوغەدا -وەك: رەفعەى فاعيل و نەصبەى مەفعول- ئەوە ئيتر هيچ پێويستەيك نيە بە قياس بۆ چەسپاندنى فەردى ئەو عمومەى كە نەبيسراوە، تابگاتە ئەوەش كە جياوازى بكرێت لە چەسپاندنى ئەو فەردە نەبيستراوەدا.

واشار كما قال بذكر قائلي القولينِ الى إعتدالِهما خلافَ قولِ بعضِهِم انّ الأكثر على النّفي، و بذكر القاضى من النافين الى انّ من ذكرَهُ من المثبتين كالآمدي لم يحرِّر النقلَ عنْهُ لتصريحِهِ بالنفي في كتابِهِ التقريب[١]

{مسئلة: اللفظُ والمعنى إن إتّحدا} اي كان كلُّ واحدٍ منهما واحداً {فإنّ منع تصوُّرُ معناهُ} اي معنى اللفظِ المذكورِ {الشَّرْكَةَ} فيهِ من إثنينِ مثلاً {فجزئيٌّ}، اي فذلك اللفظ يسمّى جزئياً كزيد[2] {وإلاّ} اي وإن لم يمنع تصوُّرُ معناهُ الشَّرْكَةَ فيهِ {فكلّيٌّ} سواءٌ إمتنعَ وجودُ معناهُ كالجمعِ بينَ الضدّينِ او امكن ولم يوجَد فردٌ منهُ، كبحر زئبقٍ، او وجدَ وامتنعَ غيرُهُ كالإلهِ اي المعبودِ بحقّ، او امكنَ ولم يوجَدْ كالشمسِ اي الكوكبِ النّهاريِّ المضيئ ، او وجد كالإنسانِ اي الحيوانِ النّاطقِ[3] وماتقدَّمَ من تسميةِ المدلولِ بالجزئيِّ والكليِّ هوالحقيقةُ وما هنا مجازٌ من تسميةِ الدالِّ باسمِ المدلولِ[4]

(١)دانەر ئاماژەی کردوە بەهۆی ناوبردنی بوێژی هەردوو قەولەکەوە بۆ هاوتایی و هاوپلەیی هەردوو قەولەکە، زیادو کەم نین لەیەکتر، بە پێچەوانەی هەندێکیان کە وتوویانە: بێگومان زۆربەی زانایان لەسەر نەفی کردنی لۆغەتن لەرێی قیاسەوە. دانەر بەناوبردنی قازی لە زنجیرەی ئەوانەدا نەفیان کردوە ، ئەو ئاماژەی کردوە بۆ ئەوە کە ئەوەی لە زنجیرەی ئەرێدا ناوی هێناوە، وەك ئامێدی، ئەوە ئەو نەقڵە لە قازیوە نەقلیکی پاك و پاڵفتەکراو نیە، چونکە خۆی لە کتێبی(التقریب) دا کە هی خۆیەتی بەرونیو رەوانی وتویەتی: لۆغە بەقیاس ناچەسپێ و ثابت نابێ.

(٢)ئەگەر لەفظ یەکێ بوو ماناش هەر یەك مانای تێبینی کرا، ئەوە ئەگەر تصوری مانای ئەو لەفظە تاکە شیرکەتی لەو مانادا قبوڵ نەئەکرد و مەنع ئەکرا لەدوان زیاتر، ئائەو لەفظە ناونەبرێ بە جوزئی وەك زەید. (٣)بەڵام ئەگەر تصوری مانای ئەو لەفظە قبوڵی شیرکەتی ئەکرد لەو مانایەدا قەدەغەی نەئەکرد، ئەوە ئەو لەفظە کولییە ، ئیتر کەیفی خۆیەتی: ا-مومتەنع بێ فەردی هەبێ وەك لە کۆکردنەوەی دوو دژو هاوەڵ بۆ خوا. ب-یاخود ئەگونجێ فەردێ هەبێ بەڵام تائێستە دەست نەکەوتبێ، وەك دەریایەك لەجیوە. ج-یاخودتاکە فەردی هەبێ بەڵام جگە لەو فەردیتر مەحاڵ بێ وەك خوای تاك و تەنهای پەرستراوی بەحەق.د-یاخود ئەگونجێ جگە لەو فەردەش هیتر هەبێ، بەڵام ئێستە دەست نەکەوتووە، وەك رۆژ واتە ئەو هەسارەی لە رۆژدا هەڵدێو بوونەوەر روناك دەکاتەوە. ه-یاخود چەندەها ئەفرادیتریش دەست کەوتووە، وەك ئادەمیزادی بەواتای گیانلەبەرێکی گۆیا لە روی زێریەوە. (٤)-کولی و جوزئی لەمەوپێش لەبەشی مانادا باسمان کردن، بەڵام لێرە کوللی وجوزئی کرانە بەشی لەفظ

{متواطئ} ذلكَ الكليّ {إن استوى} معناهُ في افرادِهِ كالإنسانِ فإنّهُ متساوي المعنى في افرادِه من زيدٍ وعمرو و غيرهما سمّيَ من التواطئ اي التوافق لتوافق افراد معناه فيه[1] {مشكك إن تفاوتَ} معناهُ في افرادِهِ بالشدَّةِ او التقدُّم كالبياضِ، فإنّ معناهُ في

الثَّلج اشدُّمنْهُ في العاجِ والوجود فإنّ معـــناهُ في الواجبِ قبلَـهُ في الـــممكن[٢] سمّـي مشككاً لتشكيكِه الناظرِ في انّهُ متواطِئٌ نظراً الى جـــهةِ إشـتراكِ الأفـــرادِ في أصـل المعنى، او غيرِ متواطئٍ نظراً الى جهَةِ الإختلافِ[٣] {وإنْ تعـــدَّدَا} اي الـــلفظُ والمعنى كالإنسانِ والفرَسِ {فمتبـاينٌ} ، اي فأحدُ اللفظينِ مثلاً معَ الآخـــَرِ متبايـــنٌ لتبايُنِ معناهما[٤]

---

بۆ وایە؟- ئەوەی پێشوو حەقیقەتەو جێی خۆیەتی کە مەدلولی ناوبراوە بە جوزئی و کوللی، بەلاَم لێرە بە ئیعتیباری مەجازی مورسەلە،دالت ناوبردووەو مەدلولت مەبەستە، کەوابوو لەویَ بەئیعتباری حەقیقەتە لێرە بەئیعتباری مەجازە، بۆیە قسەی ئەویَ و ئێرە دژ بەیەك نین.

(١)جا ئەو کوللیەی کەباسمان کرد ئەگەر ماناکەی بەیەکسانی ئەبڕا بەسەر ئەفرادەکانیدا بەبیَ جیاوازی ئەوە (متواطئ)ی پیَ دەلَێن، وەك ئینسان چونکە مانای ئینسان لە ئەفرادەکانیدا یەکسانە ، ئەو فەردانەش وەك زید و عمرو و غەیری ئەمانیش، پێشی ئەوتریَ(متواطئ) بە واتای متوافق، چونکە هەموو ئەفرادەکانی لە ماناکەیدا هاوتەریب و یەکسانن. (٢)بەلاَم ئەگەر ئەو کوللیە ماناکەی لەناو ئەفرادەکانیدا هەبوو، بەوەی لە هەندێکیان تۆخو توند و تۆلَ بوو، یاخود بەهۆی پێشکەوتنی بوونی هەندێکیان، وەك سپیایەتی ، چونکە مانای سپیایەتی لە بەفرد. تۆخ ترە لە سپیایەتیەك لە عاجدایە، یا وەك: بوون، چونکە ماناکەی لە خوادا لەپێش بونێکەوە کەلە دروستکراودا هەیە.

(٣)ناونراوە بە مشکك چونکە ئەوەی وردبـــێتەوە لە لەفظە کوللیەکە ئەکەوێتە گومانەوە لەوەدا کە دوو دیوی هەیـــە، لە دیـــوێکیەوە ئەبینیَ هەمـــوو ئەفرادەکانی لە ئەصلی ماناکەیدا شەریکن واتە ئەزانیَ کوللێیـــکی(متواطئ)ە، لە دیوەکەی تریەوە لێی ئەکۆلَێتەوە ئەبینیَ ئەفرادەکانی جیـــاوازن لە پلەی تـــۆخی و پێش و پاشدا، وائەزانیَ (متواطئ) نیە. (٤)ئەگەر لەفظەکە یەك لـــەفظ نەبـــوو. ماناکەشی یەك مانا نەبوو، وەك ئینسان و فەرەس، ئەوە ئەو لەفظە کوللـــێکی مـــوتەباینە، واتە ئەم لەفظە لەگەلَ لەفظەکەی تردا دژ بەیەکن و لەیەك جیان. چـــونکە ماناکەیان لەیەك جیایە.

{وإن إتّحدَ المعنى دون اللفظِ} كالإنسانِ والبشرِ {فمترادفٌ} اي فأحدُ اللفظَينِ مثلاً مع الآخَرِ مترادِفٌ لترادفِهما اي تواليهما على معنىً واحد[١] {وعكسُهُ} هو ان يتّحِدَ اللفظُ و يتعدّدَ المعنى كأن يكون للفظِ معنيانِ، {إن كان} اي اللفظُ {حقيقـةً فيهما} اي

في المعنيينِ مثلاً كالقُرءِ للحيضِ والطهر {فمشتَرَكٌ} لإشتراكِ المعنيينِ فيه[٢] {وإلاّ فحقيقةٌ و مجازٌ} كالأسَدِ للحيوانِ المفترِسِ و للرجلِ الشُجاعِ، ولم يقُلْ او مجازان ايضاً مع انَّهُ يجوزُ انْ يتجوزُ في اللفظِ من غيرِ ان يكونَ لهُ معنىً حقيقي كما هو المُختار الآتي كأنَّهُ لأنّ هذا القسم لم يثبت وجودهُ[٣]

{والعلمُ ما} اي لفظٌ {وضِعَ لمعيّنٍ}، خرجَ النكرة {لايتناول} اي اللفظُ {غيرَهُ} اي غير المعيّنِ، خرجَ ماعدا العلمِ من اقسامِ المعرفة، فإنّ كلاً منها وضِعَ لمعيّنٍ، وهو اي جزئيّ يستعملُ فيه و يتناولُ غيرَهُ بدلاً عنهُ فأنتَ مثلاً وضِعَ لما يستعملُ فيهِ من ايّ جزئيّ، ويتناولُ جزئياً آخر بدلَهُ، وهلُمَّ و كذا الباقي[٤]

---

(١)وەئەگەر مانایەك مانا بوو، بەلاّم لەفظ چەند لەفظێك بوون، وەك ئینسان و بەشەر ، ئەوە کوللێکی موتەرادفە، واتە ئەم لەفظ لەگەڵ ئەو لەفظ دا مترادفن، چونکە هەردوکیان بەرودوا ئەچنەوە سەریەك مانا. (٢)پێچەوانەی مترادف، کە بریتییە لەوەی یەك لەفظ بێ جەند مانایێکی هەبێ، وەك ئەوەی یەك لەفظ دوو مانای هەبێ، جا ئەگەر لەفظەکە حەقیقەت بێ لە هەردوو ماناکەدا وەك ووشەی: قرء بۆ حەیزو بۆ پاکیش بەکارهاتووە ئەوە پێی ئەڵێن مشترك ، چونکە هەردوو ماناکە لەو لەفظەدا شەریکن. (٣)ئەگەر لەفظەکە لە هەردوو ماناکەدا حەقیقەت نەبوو، ئەوە ئەو کاتە حەقیقەت ئەبێ لە یەکێکیاندا و مەجاز ئەبێ لەوی تریاندا وەك: أسد حەقیقەتە لە گیاندارێکی دوڕندە و مەجازە بۆ پیاوێکی ئازا، دانەر نەیوت: یاخود لەفظێك دوو مانای مەجازی هەبێ، لەگەڵ ئەوەش دروستە لەفظ دوو مانای مەجازی هەبێ بێئەوەی مانای حەقیقی هەبێ، وەك ئەوەش رای هەڵبژاردەیە وەك لەمەودوا دێت، بۆ نەیوتوە؟ چونکە وای داناوە هەر وەك ئەم بەشەی نەبێ و بوونی نەچەسپیبێ و ثابت نەبووبێ.

(٤)عەلەم، ناو، نیشانە، بریتییە لە لەفظێك دانرابێت بۆ شتێ یا کەسێك بەلای گوێگرەکەوە زانراوو ناسراوو بینراوبێ، –بەوشەی ناسراوو بینراو نەکیرە لەم پێناسە چووە دەرەوە– وە نابێ ئەو لەفظە جگە لەعەلەم شتیتر بگرێتەوە، واتە جگە لەکەسە دیارەکە بگرێتەوە، بەوەش هەموو جۆرەکانی مەعریفە جگە لەعەلەم چونەدەر، چونکە هەموو ئەوانیتر هەر یەك بۆ دیاریکراوێك دانراوە، بەلاّم ئەو

{فإن كان التعيينُ} من المعيَّنِ {خارجياً فعَلَمُ الشَّخصِ} فهو ما وضِعَ لمعيَّنٍ في الخارجِ لايتناولُ غيرَهُ من حيثُ الوضعِ لهُ، فلا يخرُجُ العلَمُ العارضيُّ الإشتراك كزيدٍ مسمّىً به كلٌ من جماعةٍ[١] {وإلاّ} اي وإن لم يكنِ التعيينُ خارجياً بأن كان ذهنياً {فعلمُ الجنس}،

فهو ما وضعَ لمعيَّنٍ في الذّهنِ اي ملاحَظِ الوجودِ فيهِ، كأسامة علمٌ للسبُع اي لماهيَة الحاضِرَةِ في الذّهنِ[١] {وإن وُضِعَ} اللّفظُ {للماهيَّةِ من حيثُ هيَ} اي من غيرِهِ انْ تعيّر في الخارجِ او الذّهنِ {فإسمُ الجنسِ}، كأسد إسمٌ للسبعِ اي لماهيَّته[٢]

دیاریکراوه بریتیه له هەر جوزئێك كە ئەو مەعریفەیەی تیا بەکاربێت جگە لەعەلەم وە بۆ غەیری ئەو جوزئیەش بەکاردێت، وە ئەیگرێتەوە . بەلاّم لەباتی ئەو جوزئیە بێت، واتە بۆ ئەم بەکاری هێنا نابیٚ لەعەینی کاتدا بۆ ئەویشی بەکاربهێنی، بۆ وێنە وشەی (انت) تـۆ ، داناوە بۆ ئەوەی بەکارئەهێنرێت تیایدا، ئیتر هەر جوزئێك بێت لە گوێگران، بەلاّم لەگەڵ ئەوەش جوزئێکیتـرو گوێگرێکی تریش ئەگرێتەوە، بەلاّم بەبەدەل لە جوزئیەکەیتر ، هەروەها بۆ سێهەم و چوارەمیش ئەگرێتەوە مەعریفەکانی تریش: إشارە و ضمیر و ...هتد هەروەك انت و انا.

(١)کەوابوو ئەگەر دیاریکردنی دیاریکراوەکە لەدەرەوی ذیهنەوە بوو، ئەوە علم الشخص و ناوی تاکی دیاری پیٚ ئەوترێ، بەم شێوەش پێناسە ئەکرێ: بریتییە لە لەفظێك دانرابیٚ بۆ دیاریکراوێك لە دەرەوی ذیهندا، جگە لەو دیاریکراوەش نەگرێتەوە، وەئەبیٚ لەروی وضع و دانانیشەوە هەر بۆ ئەو شخصە دیارییە دانرابیٚ. بەم شێوە کەوابوو ناوێکی تریش پەیدا ئەبیٚ هەروەکو ئەم وایە لەم پێناسە ناچێتە دەرەوە ، وەك: زەید کرابیٚ بەناو بۆ چەند کەس و کۆمەڵێك، دەئەوە هەر عەلەمەو لە عەلەمیەت دەرناچیٚ.

(٢)بەلاّم ئەگەر دیاریکردنەکەی لەدەرەوەی ذیهندا نەبوو، واتە دیاری کردنەکەی تەنها لەذیهندا بوو، ئەوە عەلەمی جینسە، بەم شێوەیە پێناسە ئەکرێت، عەلەمی جینس بریتیە لە لەفظێك دانرابێت بۆ دیاری کراوێك لە ذیهندا، واتە: بوونەکەی هەر لە ذیهندا تێبینی ئەکرێ وەك اسامە، عەلەمە بۆ ماهیەت و حەقیقەتی دوڕندەیەك کە لە ذیهندا –بە عەلەم جینس – ئەبیٚ ملاحظەی ماهیەتیش بکرێ و لە ذیهندا بیٚ، بەلاّم ئیسمی جینس وەك: اسد هەر تەنها ملاحضەی ماهیەت ئەکرێ. (٣)وەئەگەر لەفظێك دانرا بۆ حەقیقەت و ماهیەتێك ، تەنها لەو بارەوە کە ماهیەتە، ئیتر ئەبیٚ ئەوەی دیاری بکرێ لە ذیهندا، وەك اسامە ئەوا اسمی جینسە، وەك اسد شێر ناوە بۆ ماهیەتی دوڕندەو بەس، بیٚ ئەوەی تێبینی ذیهن و دەرەوەی تێدا بکەیت.

وإستعمالُهُ في ذلكَ كأن يُقالَ اسد اجرا من ثُعالة كما يقال اسامةُ اجرا من ثعالة، والدّالُ على إعتبار التعيينِ في علمِ الجنسِ إجراءُ الأحكام اللفظيّةِ لعلمِ الشّخص عليهِ حيثُ منع الصّرفِ مع تاءِ التأنيثِ واو قع الحال منهُ نحو هذا اسامةُ مقبِلاً ومثلُهُ في

لتعيّن المعرَّف بلام الحقيقة نحو: الأسدُ اجرا من الثعلب[1] كما انّ مثلَ النّكرةِ في لإبهامِ المعرَّف بلامِ الجنسِ بمعنى بعضٍ غيرِ معيَّن نحو إنْ رايتُ الأسَدَ، اي فرداً منهُ ففرَّ منه[2] وإستعمالُ علَمِ الجنسِ او إسمُهُ معرَّفاً او منكَّراً في الفردِ المعيَّنِ او المبهَم من حيثُ إشتمالِه على الماهيَّةِ حقيقيٌّ نحو هذا اسامَةُ او الأسَدُ او اسدٌ، او إنْ رايتَ سامَةَ او الأسَدَ او اسداً ففرَّ منه،[3]

(١)بەکارهێنانی اسمی جینس بۆ ماهیەت وەك ئەوەی بوترێ اسد شێر، ئازاترە ەماهیەتی ڕێوی مێ، هەروەك ئەوترێ اسامە ئازاترە لە مـاهیەتی ڕێوی، واتە وەك بۆ عەلەمی شەخص دروستە بۆ عەلەمی جینسیش دروستـە، بەڵگە چی‌یە کە عەلەمی جینس و اسمی جینس وەك یەکن؟ بەڵام لەوا دیاری‌کـردن هەیەو لەمدا نیە؟ ئەڵێ ئەوەی دەلالەت ئەکا لەسەر ئیعتیبارکردنی دیاری کردن لە ذیهندا لە عەلەمـی جینسدا، ئەو ئەحکامە لەفظیانەی هی عەلەمی شەخصین تەطبیق کردنیانە بەسـەر عەلەمی جینسدا، چونکە ئەگەر تـێی تەئنیسی لەگەڵدا بـێ ئـەوە ئەبێ (غیر منصرف) هەروەها عەلەمی جینسیش تـێی تەئنیسی لەگەڵـدا بێت ئەبێ بە (غیر منصرف) یاخود وەك عەلەمی جینس ئەبێ بە (ذي الحال)،ئیسـمی جینسیـش ئەبێ بە (ذي الحال) وەك: (هذا اسامةُ مقبلاً)، ئیسمێك بەهۆی لامی تـەحقیق و ماهیەت ئوبێ بە مەعریفە ئیسمی جینسیش وەك ئەو وایە لە دیاری کردنـدا، وەك: الأسد اجرا من الثعلب.

(٢)وەك اسـمێك بەهـۆی لامی جیـنسەوە بوبێ بە مەعریـفە وەك نەکیرە وایە لـە ئیبهامدا، – ئەم لامـە لامـی عەهـدی ذیـهنـیە بەمانا هەندێکـی نـادیارە– وەك: هەر فەردێکی (الأسـد)ت بینی لـێی ڕاکە. (٣)بـەکـارهێنانی عەلەمی جیـنس و اسمـی جینس چ مەعریفە بێ یا نەکـیرەبێ لەیەك فەردی دیـاری‌دا یاخـود نادیـاردا، چونکە ئـەو فـەردە مشـتمەلە بەسـەر مـاهیەتدا ، ئـا ئـەو بەکارهێنـانە بەکارهێنانێکـی حەقیقی‌یـە، وەك ئەمـە اسامەیـە بـۆ –عەلـەمی جینسـە (الأسـد) اسـم جـینسـی مەعریفـەیە (أسد) اسم جینسی نـەکرەیە– یاخود: ئەگەر اسامە یا الأسد یا اسـدت بینی لێی ڕاکە، دو میسال یەکەمیـان بۆ خەبەر و دووەمیان بۆ مەفعول.

وقيلَ إسمُ الجنسِ كاسَد و رجل وضعَ لفردٍ مبهَمٍ، كما يُؤخذُ من تضعيفه مما سيأتي انّ المطلقَ الدالَّ على الماهيَّةِ بلا قيدٍ، و إن منْ زعمَ دلالَتَهُ على الوحدَةِ الشائعَةِ توهمَهُ النكرة فالمعبَّرُ هنا بإسمِ الجنسِ هو المعبَّرُ عنْهُ بما سيأتي بالمطلَقِ، نظراً الى المقابلِ في الموضعينِ[1] وما يُؤخذُ من هذا الآتي من إطلاقِ النّكرةِ على الدالِّ على واحدٍ غيرِ

معيَّن والمعرفة على الدالِّ على واحدٍ معيَّن صحيحٌ،كالمأخوذِ مما تقدَّمَ صدرَ المبحث من إطلاق النَّكِرَةِ على الدالِّ على غيرِ المعيَّنِ ماهيَـة كان أو فرداً، والمعرفة على الدال على المعيَّن كذلك[٢]

{مسئلةٌ: الإشتقاقُ} من حيثُ قيامهِ بالفاعلِ {ردُّ لفظٍ الى} لفظِ {آخر} بأن يحكمَ بـ الأول مأخوذٌ من الثاني اي فرع منه {ولو} كانَ الآخرُ {مجازاً}[٣]

(١)وتراويشه إسمى جينس وەك اسد و رجل ، بۆ تاكه فەردێكى ناديار دانراوه نەك بۆ ماهيەت، وەك وەرئەگيرێ– لەگەڵ ئەوەش لاوازكراوه– لەوەی لەمەودوا دێت. كە ئەڵێ: مطلق ئەوەیە دەلالەت بكا لەسەر ماهيەت بەبێ قەيدیترو لكاندنی شتی تر پێيەوه ، وەئەوەی وایزانیوه مطلق دەلالەت لەسەر تاكه فەردێك دەكا، كەوا بلاوه ئەوه وایزانیوه نەكیرەیە، ئەوەی بە ئیسمی جینس لێره ناو ئەبرێ، هەر ئەوه لەداهاتوودا بە مطلق ناوئەبرێ، چونكە لە هەردوو شوێنەكەدا لێرەو لەوێ تەماشای بەرامبەرەكەی كراوه، لێره ئیسمی جینسه بەرامبەر عەلەمی جینسە، لەوێ مطلقە بەرامبەر مقيده.

(٢)ئەوەی وەرئەگيرێ لەوەی كە لەمەودوا دێت، كە بريتی‌يە لە: نەكيره بەسەر لەفظێك دا ئەبڕێ كە دەلالەت بكا لەسەر فەردێكی دياری نەكراو لای گوێگرو مەعريفەش بەسەر لەفظێكدا ئەبڕێ كەدەلالەت بكا لەسەر فەردێكی دياری كراو لای گوێگر، ئەم وەرگيراوه شتێكی دروست و راستە، وەك ئەوه وایە كە لەپێشەوه وەرگيراوه لەسەرەتای باسەكەوه، كە نەكيره بڕاوه بەسەر ئەو لەفظەدا كە دەلالەت ئەكا لەسەر ناديارێك، ئيتر كەيفی خۆيەتی ماهيەت بێ ياخود فەردێكی ناديار بێ. مەعريفەش بريتيه لە لەفظێك دەلالەت ئەكا لەسەر دیارێك و زانراوێك، ئيتر ماهيەت ياخود فەردە.

(٣)ئيشتقاق مصدره، هەموو كات مصدر يا بەمانا فاعيله يا بەمانا مەفعوله، جا لەو بارەوه لێرەدا بەمانا فاعيل بێ --بريتيه لە گێڕانەوەی لەفظێك وەك: ضرب بۆ لای لەفظێكیتر وەك: ضربُ بەم شێوەیە بڕياربدرێو حوكم بكرێ كەيەكەمەكە لە دووهەم وەرگيراوه،واته يەكەم لق و پەڕو پۆی دووهەمە، هەرچەند دووەمەكەش مەجازبێ.

{لمناسبَةٍ بينهما في المعنى} بأن يكونَ معنى الثاني في الأولِ {والحروف الأصليَّة} بأنْ تكونَ فيهما على ترتيبٍ واحد، كما في الناطقِ من النطقِ بمعنى التكلُّم حقيقةً وبمعنى الدّلالَةِ مجازاً ، كما في قولِك: الحالُ ناطِقَةٌ بكذا، اي دالّة عليه[١] وقدْ لايشتقُّ من المجازِ كما في الأمرِ بمعنى الفعلِ مجازاً، كما سياتي ، لايُقالُ منهُ آمر و لا مأمورٌ

مثلاً بخلافِهِ بمعنى القولِ حقيقةٌ[٢] ولايلزَمُ من قولِ الغزاليِّ وغيرِهِ انّ عدمَ الإشتقاقِ من الفظِ من علاماتِ كونِهِ مجازاً انّهم مانعون الإشتقاقَ منَ المجازِ كما فهِمَهُ عنهم المصنِّفُ، واشار بلو كما قال اليهِ لأنَّ العلامَةَ لايلزمُ إنعكاسُها فلايلزمُ من وجودِ الإشتقاقِ وجودُ الحقيقَةِ [٣]

(١)ئیشتقاق لەکاتێکدا ئەکرێ لەنێوان لەفظی یەکەم و دووهەمدا گونجان و خزمایەتیەکیان هەبێ: أ-لەمانادا واتە مانای لەفظی دووەم کە ئەصلەکەیە لە یەکەمدا هەبێ، کە فەرع و لقەکەیەتی. ب-لەپیتە ئەصڵیەکانیاندا، واتە پیتەکانیان لەسەر یەك تەرتیب بن لە بەرودوادا، وەك وشەی ناطق لە وشەی نطقەوە وەرگیراوە ، کە مانای حەقیقی خۆی گفتو ۆکردنەو مانای مەجازیشی رێبەرێ کردن و پەلکێش کردنە، وەك ئەڵێت: الحالُ ناطقة بكذا، واتە دەستت ئەگرێ و ئەتبات بۆ سەر ئەوشتە.

(٢)بەلاّم جاری واهەیە ئیشتقاق لە مەجاز ناکرێ و دروست نیە، وەك وشەی امر، دوومانای هەیە: أ-مەجازیە کە بەمانی کارە بارە وەك: وشاورهم في الأمر ، وەك لەمەودوا دێ ئەوە نابێ بوترێ: ( آمر ) اسمی فاعل ، یا (مأمور) اسمی مفعول لە ئەمری بەمانا کاروبار دروست بووە سەرچاوەیەتی.ب-حەقیقەیە کە بەمانای داواکردنی ئەنجام دانی کارێکە ، ئەمەیان جیاوازە لەوەی پێشوو چونکە ئامرو مەئموری لێدروست دەکرێ.

(٣)غەزالی و غەیری غەزالی کە وتویانە ئیشتیقاق نەکردن لە لەفظێك نیشانەی ئەوەیە کە لەفظەکە مەجازە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوان ئیشتقاقیان لە مەجاز قەدەغەکردبێ، وەك دانەر خۆی وایان لێحاڵی بووە لە قسەکەیاندا گەیوە، چونکە دانەر بە وشەی (لو) لە رستەی (ولو کان مجازاً) ئاماژەی بۆ ئەو لێ حاڵی بوونەی خۆی کردوە وەك لە (منع الموانع)دا وتویەتی، چونکە عەلامە و نیشانە لازم ناکا هەموو کاتێ طەرد و عەکسی بێ، باطەردیشی هەبێ هەرکات عەلامە هەبوو با خاوەن عەلامەکە هەبێ، بەلاّم لازم ناکات هەرکات خاوەن عەلامە بوو، عەلامە هەبێ، واتە هەرکات عدم ئیشتقاق بوو ئەبێ مەجاز هەبێ ئەوە لازم ناکا، بۆیە لەبوونی ئیشتقاق دا لازم ناکا بوونی حەقیقەت.

ثمّ ما ذكرُ تعريفٌ للإشتقاقِ المُرادِ عندَ الإطلاقِ، وهو الصغيرِ، امّا الكبيرِ فليس فيهِ الترتيب كما في الجبذِ و جذَبَ، و الأكبر ليسَ فيهِ جميعُ الأصولِ كما في الثّلمِ و ثلبَ ، و يُقالُ ايضاً اصغر و صغير و كبير و اصغر و او سط و اكبر[١] {ولابدَّ} في تحقُّقِ الإشتقاقِ {من تغييرٍ} بين اللفظينِ تحقيقاً كما في ضَرَبَ منَ الضّربِ ، و قسمَهُ في المنهاج

خمسةَ عشر قسماً، او تقديراً كما في طلبَ مــن الــطلبِ فيقدَّرُ انّ فتحةَ اللامِ في الفعلِ غيرها في المصدَرِ، كما قدّرَ سيبـــويهِ انّ ضمَّـــةَ النُّـــونِ في جنُبْ جمعا غيرُها فيه مفرداً، ولو قالَ تغيَّر فيهِ بتشديدِ الياءِ لــكانَ انسب.[٢] {وقـــدْ يطـــرِدُ} المشتقّ {كإسمِ الفاعلِ} نحو: ضارب لكلِّ واحدٍ وقعَ منـــهُ الــضّرب ، {وقـــد يختـصُّ} ببعضِ الأشــياءِ {كالقارورَةِ} منَ القرارِ للزجاجةِ المعروفَةِ دونَ غـــيرها مما هو مقرٌ للمائعِ كالكوزِ[٣]

---

(١)ئیشتقاق سێ پێناسەی هەیە: صغیر و کبیر و اکبر ، ئەو پێناسەی کەباسکراوە بۆ ئیشتقاق ، کە هەر ئەویش مەبەستە کاتێ کە بوترێ: ئیشتقاق ئەوە پێناسەی صغیری پێ ئەوترێ، بەلاّم کەبیر تەنها تەرتیبی پیتەکانی تیادا نیە، وەك جبذ و جذب پیتی بێکان پێش و پاشیان تێدایە، اکبریش هەموو پیتە ئەصلیەکانی تێدا نیە، ثلم ثلب یەکێ میمە و یەکێ بێ کۆتاییەکەی، ئەو پێناسانەی پێشیان ئەوترێ اصغر و صغیر و کبیر، وەك اصغر و اوسط و اکبریشیان پێ ئەوترێ.

(٢)بۆ جیٚبەجیٚکردن و هێنانەدی ئیشتقاق پێویستە گۆڕان و جیاوازی هەبێ لەنێوان هەردوو لەفظەکەدا ، ئیتر ئەو گۆڕانە محقق بێ و لەبەر چاوبێ ، وەك: (ضربَ) کەلە (ضربْ)ە دانەر لە (المنهاج) دا ئیشـــتقاقی کردوەتە پانزە بەش ، یاخود ئەو گۆڕانکاریە مقدّربێ و بەروونی لەبەرچاو نەبێ، وەك: (طلبَ) لە (الطلب)دروست کراوە ، وای بۆ دائەنرێ فەتحەی لام لە فیعلەکەدا ئەو فەتحە نیە کە لە مەصدەرە کەیدایە. وەك سیبەوەیهی داینـاوە کە ضمەی نونی جنب، کە بۆ جەمع و کۆیە غەیری ئەو ضەممەیە کە لە موفرەد دایە، ئەگەر دانەر لەباتی تغییر کە بۆ شەخصەکەیە بیوتایە: (تغیُّر) بەگرتنی یێەکەی گونجاوترو نزیکتر بوو، چونکە ئەم بۆ لەفظەکەیە.

(٣)جارو بارێ مشتق طردیو گشتگیر ئەبێ، وێنەی إسمی فاعل وەك ضارب بۆ هەموو کەسێك و شتێك کە لێدان لێوەی رویدا بێ، بۆ سەر کەسێ بەکار دێ، بەلاّم جاری واش هەیە تایبەت ئەکرێ بەهەندێ شتەوە، وەك وشەی قارورە کە لەوشەی قەرارەوە وەرگیراوە، ئەمە تایبەتە بۆ شوشەیێك کە ئەیزانین ئاو یا دەرمانی تیابێ، نەك بۆ شتێکی تر کە ئاو تیا گل بخواتەوە، وەك کۆزە، دەخۆ قارورە لەبەر ئەوەی لە

---

{ومن لمْ يقم بـــهِ وصفٌ لم يجزْ ان يُشـتقَّ لـهُ منـهُ} اي من لفـــظهِ {إسمٌ خلافـاً للمعتزِلَةِ} في تـــجويزِهِم ذلك من حيـثُ نفـوا عـنِ اللهِ تعـالى صفاتِـهِ الذاتيّـــة كـالعلمِ والقدرَةِ ، ووا فقــوا على انّهُ عالمٌ قادرٌ مثلاً لكن قـالوا بذاتِـهِ لابصفـاتٍ زائدةٍ عليـــها، متكلمٌ بمعنـى انّـهُ خـالِقٌ للــكلامِ في جسمٍ كالشّجرَةِ اللــتي سمع منـها موسـى عليـهِ

الصلاةُ والسـّلام بناءً على أنّ الكلامَ ليس عندَهم إلاّ الحروف و الأصواتَ الممتنعَ إتّصافُهُ تعالى بها[1] ففي الحقيقةِ لم يخالفوا فيما هنا لأنّ صفةَ الكلامِ بمعنى خلقه ثابتةٌ لـهُ تعالى، وبقيّةُ الصفاتِ الذاتيّةِ لايسعُهُم نفيها لموافقتِهِم على تنزيهه تعالى عن أضدادها.[2]

قەرار بوو ، ئەبوایە هەموو شتێك ئاو تیا قەراری بگرتایە قاروورەی پیٛ بوترایە، بەلاّم ناوتریٛ چونکە تایبەتە.

(١)کەسێك حەقیقەتەن صیفەتەکەی پێوە نەبیٛ دروست نیە لەو صیفەتە إسمی فاعیل یا مفعول یا صفەی مشبهەی بۆ بیچڕیو بۆی دروست بکەی –کەسێك واقیعەن عیلمی نەبیٛ دروست نیە بڵێی عالمە– بەلاّم موعتەزیلە جیاوازن و ئەڵێن ئەوە دروستە، هەر لەبەر ئەوەیە هەموو صیفاتی زاتی خوایان نەفی کردوە ، وەك عیلم و قودرەت بەلاّم هاو قسەیان کردوین لەوەدا کە خوا عالم و قادر و زانا و بەتوانایە، بەلاّم وتویانە بەهۆی زات و خودی خۆیەوە زاناو بەتوانایە، نەك بەهۆی چەند صیفەتێکەوە کە لە زاتەکەی زیادن –ئەمە بۆ بابەتێکی ذیهنی نەبیٛ نەك بۆ بابەتێکی دەرەوەی ذیهنی چونکە زاتی بیٛصفەت لە خارجی ذیهنەوە وجودی نیە– خوا متکلم و گۆیایە بەلاّم بەو مانایەی کە خوا بەدیهێنەری کەلامە لەناو جەستەو لاشەیەکدا، وەك ئەو دارەی موسا پێغەمبەر(ﷺ) گفتوگۆی خوای لێوە بیست ، بۆ ئەو مانایەیان بۆ داتاشیوە؟ چونکە کەلام بەلای ئەوانەوە تەنها بەپیت و دەنگە ، دەخۆ بێگومان خوای گەورەش وەصفدار ناکریٛ پێیان.

(٢)کەوابوو لەراستیدا موعتەزیلە لەم قاعیدەیەدا جیاوازیان نەکردووە، چونکە صیفەتی کەلام بەواتا مەجازیەکەی کە صیفەتی خەلق و دروست کردنی کەلامە ، ثابت و سەلمێنراوە بۆ خوای گەورە، صیفەتە ذاتیەکانی تریش بۆیان ناکریٛ نەفیان بکەن چونکە ئەوانیش موافقی ئێمەن کە خوای گەورە پاکەو دوورە لە دژی هەموو صیفەتە ذاتیەکان، وەك کەڕی و کوێری و نەتوانایی....هتد.

وما هنا انسَبُ بالمقصودِ مما في شرحِ المختَصَر لا على وجهِ البِناءِ من انَّهُم إتَّفقوا علي انّ إسماعيل غيرُ مذبوحٍ اي غير مزهَقِ الرّوحِ[1] وعندَما لم يجرِ الخليل آلَتَهُ على محلِّه من إبنِهِ لنسخِهِ قبلَ التمكنِ منهُ لقولِهِ تعالى: ﴿ وفديناهُ بذبحٍ عظيم ﴾ والجمهور على انَّهُ إسماعيل كما ذكرَهُ لا إسحق.[2]

{فإن قامَ بهِ} اي بالشيئِ {ما} اي وصفٌ {لهُ اسمٌ وجبَ الإشتقاقُ} لغةً من ذلكَ الإسم لمن قامَ بهِ الوصفُ كإشتقاقِ العالمِ من العلمِ لمن قامَ بهِ معناهُ[3] {او} قامَ بالشيئِ {ما ليسَ لهُ إسمٌ كانواعِ الرّوائحِ} فإنّها لم توضَعْ لها اسماءٌ إستغناءً عنها بالتقييدِ كرائحة كذا وكذلك انواعُ الآلام اي {لمْ يجبْ} اي الإشتقاقُ لإستحالتِهِ وعدلَ عن نفي الجواز المُرادُ الى نفي الوجوبِ الصادقِ بهِ رعايةً للمقابَلَةِ[4]

---

(١)ئەوەی لێرەدا دارێژراوە گونجاوترو نزیکترە بە مەبەستەوە، تا ئەو دارشتنەی کە لە شرح المختصردا هەیە، چونکە ئەوەی ئەویٚ لەسەر ئەو وەجهە بینانیە، وەك ئێرە نیە کە وتمان: (ومن بنائهم على التجويز إتفاقهم...الخ) بەڵکو هەر ئەڵێ: موعتەزیلە موتەفیقن کە ئیسماعیل مەذبوح نیە، بەواتای گیانی دەرنەهاتووە، جیاوازیشیان بووە ئایا ئیبراهیم قاطع و برندەی بووە؟ کەوا بوو ئەوەی ئێرە و ئەویٚ گەیاندویەتی یەك شتە، کە بریتیە لەوە ئایا قطع إلتأم بووە بەبیٚ دەرچوونی گیان. یاخود ئەصلەن هەر برین نەبووە (٢)بەلای ئێمەوە ئیبراهیمی خەلیل ئامێری سەربرینەکەی هەر نەهێناوە بەسەر جێگەی سەربرینی کوڕەکەی‌دا، چونکە نەسخ بووەتەوەو سڕاوەتەوە پێش ئەوەی تواناى ئەنجام دانی هەبیٚ-قوربانی کاتی تایبەتی هەیە کاتەکەی نەهاتبوو- چونکە خوای گەورە دەفەرمویٚ: لەباتی ئەو قۆچێکی زۆر بەرێزمان کردە قوربانی، جمهور لەسەر ئەوەن ئەو کوڕە ئیسماعیل بووە نەك ئیسحاق، وشەی (بُنَيَّ)بەصیغەی تەصغیر ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئیسماعیل بووە ، چونکە برای بچوك بووە.

(٣)جا ئەگەر صیفەتێك قیامی هەبوو بەکسێکەوە یا شتێکەوە، ئەو صیفەتیشە إسمی فاعیل یا إسمێکی تری هەبوو، ئەوە واجبە لەو إسمە ئیشتقاق بکریٚ -واجبە لەروی لۆغەتەوە- بۆ کەسیٚ ئەو وەصفە قیامی پێوە هەبیٚ، وەئیشتقاقی عالم بکریٚ لە عیلم بۆ کەسیٚ ماناى عیلم قیامی هەبیٚ پێیەوە. (٤)یاخود ئەگەر وەصفێك قیامی هەبێت بەشتێکەوە، بەلام ناوێکی تایبەتی نەبیٚ، وەکوو جۆرەکانی بۆن چونکە ئەوان ناویان بۆ دانەنراوە، لەبەر ئەوە بۆنەکە ئەدرێتە پاڵ بۆندارەکە ، پێویستی نەبووە بەناو وەك ئەڵێن: بۆنی گوڵ، هەروەك ئەمان وایە هەموو جۆرە ئازارو دەردێك ، مادام ناوی نیە ئیتر واجب نیە ناوی لیٚشەق بکەیٚ، چونکە مەحاڵە لەنەبوو دروست کردنی،

{والجمهورُ} من العلَماء {على إشتراطِ بقاءِ} معنى {المشتقِّ منهُ} في المحلِّ {في كونِ المشتقِّ} المطلَقِ عليهِ {حقيقةً إنْ امكنَ} بقاءُ ذلكَ المعنى كالقيام[1] {وإلاّ فآخَرُ جزءٍ} اي وإنْ لم يمكن بقاءُهُ كالتكلُّمِ لأنَّهُ بأصواتٍ تنقضي شيئاً فشيئاً ، فالمشترطُ بقاءُ آخَر جزءٍ {منهُ} فإذا لم يبقَ المعنى او جزؤهُ الأخير في المحلِّ يكونُ المشتقُّ المطلَقُ عليهِ مجازاً كالمطلقِ ، قبلَ: وجودُ المعنى نحو: إنَّك ميت.[2] وقيل: لايُشترَطُ بقاءُ ماذُكرَ فيكونُ المشتَقُّ المطلَقُ بعدَ إنقضائه حقيقةً إستصحاباً للإطلاقِ[1] {وثالثُها} اي الأقوالُ {الوقفُ}عنِ الإشتراطِ وعدَمِه لتعارضِ دليلِهما،وإنَّما عبَّر بالبقاء الذي هو استمرارُ الوجودِ دونَ الوجودِ الكافي في الإشتراطِ لتتأتى لهُ حكايَةَ مقابله، وإنَّما اعتبَرَ في القسمِ الثاني اخر جزءٍ لتمام المعنى به، وفي التعبيرُ فيه بالبقاء تسمّحٌ[2]

دانەر لای داوە لەوە بڵێ: دروست نیە، کەئەمەش مەبەستە ، بۆ ئەوە وتی: واجب نیە ، کە دروست نیە کەشت ئەگرێتەوە، چونکە چاوی لەبەرامبەرەکەی بڕیوە، لەپێشەوە ووتی: (وجبَ) لێرەش ئەڵێ (لمْ يجبْ).

(١)جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن بەمەرج گیراوە مانەوەی مانای ئەو سەرچاوە کە ئیشتقاقەکەی لێکراوە، لە محەل و شوێنەکەیدا ئەو مانایە لەمشتەقەکەیدا مابێتەوە حەقیقەتەن، ئەگەر گونجاو بوو مانەوەی ئەو مانایە، وەك: قیام و هەستان.

(٢)بەڵام ئەگەر نەگونجا مانەوەی ئەو مانایە ئەوە مەرجە کۆتا بەشی کاتەکەی مابێ، وەك تەکەلوم و گفتو گۆ چونکە گفتو گۆ بەهۆی دەنگەکانەوە دێتەدی وەئەم کات و هەوایە ئەڕواو ئەوی‌تر دێتە شوێنیو هەروەها، کەوابوو بەمەرج گیراوە کە مانەوەی کۆتا بەشی دەنگەکەیە، بۆیە ئەگەر نەمانەکەی مایەوە، وەنەبەشی کۆتایی ماناکەی مایەوە لەشوینەکەی خۆیدا، ئەوە ئەو کاتەبڕینی ئەو شوێنە بەسەر ئەو مشتەقەدا مەجاز ئەبێ ، وەك دابڕینی مانایەك هێشتا نە هاتووەتەبوون، وەك: إنك ميت، واتە بێگومان تۆ مردویت ، ئەمە مەجازە بە ئیعتیباری ماسیکون .

(١)هەندێکیش وتوویانە: هیچێ لەوانەی کەوتران مەرج نەگیراوە، کەوابوو ئەوەی شەق کراوەو براوە بەسەر مەسەلەکەدا، دوای تەواو بوونی ماناکەی ، ئەومانا برانە بەسەر مانادا حەقیقەتەو حەقیقیە ملاحظەی إستصحاب ئەکرێ ، کۆن لێدان و ضرب هەبووە، ئێستەش پێی ئەڵێم ضارب بەئیعتیباری ئەو لێدانە کۆنەیە. (٢)سێهەم قەول: وەستان و وەقفە لەمەرج گرتن و مەرج نەگرتن، چونکە بەڵگەکانی دوانەپێشوەکە ئەچنەوە بەگژیەکداو رێ لەیەکتر ئەگرن، هەردوکیان بەهێزن، لەبەر ئەوە ناتوانیێەکێکیان هەڵبژێری، ئەی بۆ لە جیاتی بەقاء وجودی نەووت؟ بێگومان بۆیە

وما حكاهُ الآمدي من عدم الإشتراطِ فيه دونَ الأولِ بحثٌ ذكرَه في المحصول و رفعه بأنْ لم يقلْ به احدٌ، فلذلك ترك المصنِّف، خلافَ إبن الحاجبْ وذكَرَ بدَلَهُ الوقفَ {ومنْ ثمَّ} اي من هنا وهو إشتراطُ ماذُكِر اي من اجلِ ذلكَ {كان إسمُ الفاعلِ} في جملة المشتَقِّ {حقيقةً في الحال اي حالَ التَّلَبسِ} بالمعنى او جزئه الأخير {لا} حالِ {النطق}[1] {خلافاً للقرّافي} في قولِه بالثّاني حيثُ قالَ في بيانِ معنى الحالِ في المشتَقِّ ان يكونَ التَّلبسُ بالمعنى حالَ النطقِ به، وبنى على ذلك سؤالَهُ في نصوصِ ﴿ الزانية والزاني فاجلدوا....﴾ و ﴿ السّارقُ والسّارقةُ فاقطعوا..﴾ ﴿ فاقتلوا المشركين..﴾ ونحوها، إنّما تتناولُ من إتّصفَ بالمعنى بعدَ نزولشها الذي هو حال النطقِ مجازاً. والأصلُ عدَمُ المجازِ، قال: والإجماعُ على تناولها لهُ حقيقةً[2]

مەرجەکەی بەبەقا دربڕی ، کە بریتی‌یە لەبەردەوامی لەبووندا، بوونی نەووت کە ئەمیش بەس بوو بۆ دەست کەوتنی مەرجەکە، بۆ ئەوەی رازو نیازی بەرامبەرەکەی دەرکەوێ، ئەگەر وانەبوایە ئەبوایە بۆ دوو قیلەکە بیوتایە : قیلێك وتویەتی: وجود مەرجە و قیلێکیش وتویەتی: وجود مەرج نیە، بێگومان کەسیش وای نەووتوە هەموو کەلامێك دوو زەمانی هەیە: أ-زەمانی نیسبەت کە زەمانی ثبوتی محکوم بە بۆ محکوم علیە. ب-زەمانی ئیثباتی نیسبەت کەبریتی‌یە لە زەمانی گفتو گۆکردن، ناو ئەبرێ بەحاڵی حوکم ، بۆیە لەبەشی دوهەمیشدا کۆتا بەشی ئیعتیبار کردوە، چونکە ماناو مەبەست بەو تەواو ئەبێ، جا ئەگەر کۆتابێ بەقای چی؟ لەوەی کە کۆتا جوزئی بەبەقا لێکداوەتەوە چاوپۆشی مەجازی هەیە.

(١)ئەوەی ئامێدی گێراویەتەوە کە لە دووهەمدا بەقا مەرج نیەو بەلاّم نەك لە یەکەمدا، ئەوە باسێکە رازی لە المحصول دا کردویەتی نەك قەولە، وە پاڵی پێوە ناوە بۆ دەرەوەی ئەم بابەتە بەم شێوەیە دەڵێ: ئەو باسە قەولی هیچ کەسێك نیە و هیچ کەسێك قەولی پیٚنەکردووە، کەوابوو لەبەر ئەوەیە دانەر تەرکی کردووە، بەلاّم دانەر جیاوازە لەگەڵ إبن الحاجب دا لە (المختصر المنتهی)دا هێناویەتی، وەدانەر لەباتی ئەم حکایەتی ئامێدیە باسی وەقفی کرد، کە قەولی سێهەمە. (٢)لێرەدا کە بریتیە لە بەمەرج گرتنی ئەوەی باسکرا ، واتە لەبەر ئەوە إسمی فاعیل- کە یەکێکە لەدروست کراوەکان- حەقیقەتە لەحاڵدا، نەك زەمانی گفتوگۆکە، واتە کاتی ئەنجام دانی کارەکە، یاخود بەشی کۆتایی کردنی کارەکە-واتە کاتی نیسبەتەکە- (٣)بەلاّم قەڕافی بەپێچەوانەوە وتوویەتی: لەزەمانی گفتوگۆکەدا، چونکە خۆی لە لێکدانەوەی مانای حاڵدا وتویەتی: تلبسی محەلەکە بەماناکەوە ئەبێ لەکاتی تلفظ کردن بێ بەو مشتقە-

واجابَ بأنّ المسألَةَ في المشتقِّ المحكومُ بهِ نحو زيدٌ ضاربٌ، فإن كان محكوماً عليهِ كما في الآياتِ المذكورةِ فحقيقة مطلقاً[1] وقال المصنِّف تبعاً لوالدِهِ في دفع السؤال:إنّ المعني بالحال حالَ التلبّسِ بالمعنى، وإن تأخّر عن النطقِ بالمشتقِّ فيما إذا كان محكوماً عليه لاحال النّطقِ به الذي هو حال التّلبسِ بالمعنى ايضاً فقط فأبقيا المسألةَ على عمومها وغيرهما كالأسنوي سلم للقرّافي تخصيصها[2]

{وقيلَ: إنْ طرا على المحلِّ} للوصفِ {وصفٌ وجوديٌّ يناقضُ} الوصفَ {الأول} كالسوادِ بعدَ البياضِ والقيام بعدَ القعود، {لم يُسَمَّ} المحلُّ {بالأولِ} اي بالمشتقِّ من إسمهِ {إجماعاً} والخلافُ في غيرذلكَ ، و الأصحُّ جريانُهُ فيه إذْ لايظهرُ بينَهُ وبينَ غيرِهِ فرقٌ[3]

---

نەلەپێشیەوە بێ نە لەدوایەوە بێ- قەرافی لەسەر ئەو بۆچونەی خۆی پرسیارەکەی خۆی بەرپاکردوە لەم دەقانەدا: ﴿ الزانيةُ والزاني فاجلدوا....﴾ إسم فاعیلەکانی تریش ، ئەڵێ: ئەو دەقانە مەگەر بە مەجاز ئەو کەسە بگرێتەوە کە لەدوای دابەزینەکان ئەو کارە بکا، ئەصلیش لەکەلامدا ئەوەیە مەجاز نەبێ، ئەمجا ئەڵێ: خۆ بە ئیجماعی هەموو زانایان حەقیقەتەن ئەیگرێتەوە، نەك مەجازەن، هەر بۆخۆیشی...

(١)وەلامی دراوەتەوە کەئەوە بۆ مەسەلەیەك ئەبێ ئیسمە فاعیلەکە تیایدا خەبەرە، وەك: زید ضارب چونکە ئەگەر مبتدا بوو وەك: ئەو ئایەتانەی باسکران، ئەوە بە مطلق حەقیقەتە، چ لە حاڵی تلبسدا بێ ، یا لە حاڵی نطق و تلبسدا بێ.

(٢)دانەر شوێنی باوکی کەوتووە لە دەفعی ئەم پرسیارو رەخنەدا وتوویەتی: بێگومان مەبەست بە حالْ کاتی تلبسی محەلەکەیە بەماناکەوە، -کاتی ئەنجامدانی دزەکەیە، بۆ دزیەکە مثلا- هەرچەند پیش و پاشی هەبێ بە تلفظ کردن دا بە موشتەقەکە، لەوەدا کەموشتەقەکە مبتدا بێ مثلا نەك مەبەست ئەوەبێ کاتی تلفظ کردنی بە موشتەقەکە بێ و بەس -وەك رای قەرافی لێی حاڵی بووە- کە ئەویش هەر کاتی تلبسە بەماناکەی، بۆیە دانەر و باوکی مەسئەلەکەیان لەسەر عمومیەتی خۆی هێشتەوە، واتە مبتدا بێ یاخەبەر بێ، بەڵام غەیری ئەم دوانە تەسلیمی قەرافی بوون لە تایبەت کردنی ئەم مەسئەلەیە بەخەبەرەوە و بەس.

(٣)هەندێکیش وتوویانە: ئەگەر وەصفێکی وجودی دژ بە وەصفی یەکەم پەیدا بوو هاتە سەر شوێنی وەصفی یەکەم -وەك: ئەم کاغەزە سپیەو رەش بکرێ، جا لەباتی وەصف بەدانیشتنەوە وەصفدار بکرێ بە وەستانەوە- ئەوە خاوەن وەصفە تازەکە بەوەصفی یەکەم ناونابرێ بەئیجماع،ئەو جیاوازیەی نێوان جمهورو قەرافی لەغەیری

{وليس في المشتقّ} الذي هو دالٌ على ذاتٍ متّصفةٍ بمعنى المشتقّ منهُ كالأسود {إشعارٌ بخصوصيَةِ} تلكَ {الذّات} من كونِها جسماً او غيرَ جسمٍ، لأنّ قولك مثلاً الأسود جسمٌ صحيح، ولو اشعر الأسود فيه بالجسميَّةِ لكان بمثابَةِ قولِكَ: الجسمُ ذو السّوادِ جسمٌ، فهو غيرُ صحيحٍ لعدَم إفادَته[1]

{مسئلةٌ: المترادفُ} وهو كما تقدَّمَ اللفظُ المتعدِّدُ المتحِّدُ المعنى {واقعٌ} في الكلام {خلافاً لثعلب} و إبن فارس في نفيهما وقوعَهُ {مطلقاً} قالا: ومايظنُّ مترادفاً كالإنسانِ والبشَرِ فمتبايِنٌ بالصفَةِ الأوّلِ بإعتبار النسيانِ او انَّهُ يأنِسُ، والثاني بإعتبار انّهُ بادي البَشَرَةِ اي ظاهرُ الجلدِ ، وإنّما صرَّح بالمخالفِ الذي ابهَمَهُ غيره لغرابَةِ النقلِ عنهُ كما قال[2]

---

ئەمەدايە، بەلاّم اصح ئەوەیە ئەو خیلاف و جیاوازیەش لێرە ئەبێ، چونکە هیچ فەرقێك لەنێوان ئێرەو شوێنێکیتردا نیە. (١)ئەو مشتقەی کە دەلاّلەت دەکا لەسەر ذاتێك کە وەصف دار ئەکرێ بەمانای مشتق منەکەوە -وەك: اسود- ئیشعارو هەست بزواندنی تێدا نیە کە ئەو مشتەقە تایبەتە بەو ذاتەوە، تایبەتیەکەش لەوەی ئەو ذاتە جیسم بێ یان جیسم نەبێ، چونکە کە تۆ ئەڵێیت: الأسود جسمٌ ، ئەوە رستەیەکی صەحیح و دروستە بەلاّم بیستنی وشەی الأسودجیسمیەتی بدایە بەگوێی گوێگردا. ئەوە ئەبوایە لەباتی ئەو رستە ئەمە دروست بوایەو بیوتایە: الجسم ذوالسوادِ جسمٌ. ئەوەش رستەیەکە صەحیح نیە چونکە سودێك بە گوێگر نادا ، خەبەرەکە لە مبتداکەوە وەرئەگیرێ، مشتق دووبەشە: ا-دانرابێ بۆ ذاتێکی دیاریکراو بەوەصفێکی دیاریکراو، وەك ئیسمی زەمان و مەکان و ئالەت. ب-دانرابێ بۆ ذاتێکی نادیاری بەوەصفێکی دیاری، ناو ئەبرێ بە صیفەت، مەبەست لێرەدا بە مشتق ئەمەی دووەمیانە.

(٢)مترادف -وەك لەپێشەوە رابورد بریتیە: لە چەند وشەیێك لەفظیان لەیەك جیایەو لەمانادا یەك مانایان هەیە-لەناو گفتوگۆدا هەیە بەلاّم بە پێچەوانەی ئیبن ثعلب و إبن فارسەوە کە هەردووکیان نەفی بوونیان کردووە لەکەلامدا بە مطلقی، ئیتر لە کەلامی شەرعیدابێ یاخود لە کەلامی غەیری شەرعیدا، هەردووکیان وتوویانە: ئەوەی گومان ئەبرێ مترادف بێ متباین و لەیەك جیان، بەلاّم بەذات نا بەڵکو بەهۆی صیفەتەوە لەیەك جیان، وەك: ئینسان و بەشەر، جا زیدو عەمر لەلاێکۆ پێیان ئەوترێ ئینسسان کە شتیان لەبیر دەچێتەوە، یاخود ئولفەت ئەگرن بەیەکۆ، وەکە پێیان دەوترێ: بەشەر بەو ئیعتیبارە کە پێستی لاشەکەیان بەدەرەوەیە، وەك ئاژەڵ

{و}خلافاً {للإمام} الرّازي في نفيهِ وقوعَهُ {في الأسماءِ الشرعيَّةِ}، قال: لأنَّهُ ثبتَ على خلافِ الأصلِ للحاجَـةِ إليـهِ في النظـمِ والسـجعِ مثـلاً وذلـكَ منتَـفٍ في كـلام الشّـارعِ[1] واعترض عليهِ المصنِّف كالقرّافي بالفرضِ والواجِبِ وبالسّنَةِ والتطوّعِ ، ويُجابُ بأنّها أسماءٌ إصطلاحيّةٌ لاشرعيَة، والشرعيَّةُ ما وضعها الشارعُ كما سيأتي[2]

{والحدُّ والمحدودُ} اي كالحيوانِ الناطقِ والإنسانِ {ونحو: حسن و بسن} اي الأسم وتابِعُهُ كعطشان و نطشان، غير مترادفين اي غير متّحدَي المعنى {على الأصحِّ}، امّا الأوّل فلإنّ الحدَّ يدُلُّ على اجزاءِ الماهيَّةِ تفصيلاً، والمحدود اي اللفظ الدالّ عليه يدّل عليها إجمـالاً، والمفصّـل غـيُر المجمَلـو مُقـابِلُ الأصـحِّ يقطـعُ النَّظـر عـنِ الإجمـالِ و التفصيلِ[3]

---

دانەپۆشراوە، ئەی بۆ بەرروونی ناوی موخالەفەی و جیاوازی هێناوە؟ بۆیە بەڕونی ناوی هێناون ، وەك خەڵكیتر نەیوتووە: هەندێك جیاوازن، چونكە زۆر غەریبە نەقلّ لەو موخالەفەوە بكرێ، وەكدانەر خۆی لە منع الموانع دا وتوویەتی.

(١)وە بەپێچەوانەی رازی كە نەفی بوونی مترادف ئەكا لەناوە شەرعیەكاندا، رازی وتویەتی: مترادف ثابتەو سەلمێنراوە –بەلام بەپێچەوانەی ئەصلن، كە ئەصل ئەوەیە هەموو لەفظێك مانایێكی هەبێ– پێویستی پێی ئەبێ لەكاتی هۆنراوەو سەجعدا، حاجەو پێویستی لەكەلامی شاریعدا نیە، چونكە خوا پێویستی بە هیچ شتێك نیە.

(٢)دانەر وەك قەرافی رەخنەیەكی لەسەر ئەو رای ئیمام رازیيە گرتووە، بەوشەی فرض و واجب، وەبە سنەو تطوع، ئەمانەهان لەشەرعداو مترادفیشن، لەباتی رازی وەلام دراوەتەوە كە ئەمانە چەند ناوێكی ئیصطلاحین نەك شەرعی چونكە ناوە شەرعیەكان ئەوانەن شارع خۆی داینابن، بەلام ئەمانەزانایانی شەرع دایان ناون.

(٣)پێناسە وەك: حیوان ناطق، پێناسەكراو وەك ئینسان و ناوو پاشكۆكەی، وەك حسن وبسن و عطشان و نطشان، ئەمانە متراف نین لەسەر قەولی اصح چونكە ماناكەیان یەك نیە: یەكەمیان كە پێناسەو پێناسەكراوە أ–لەفظیحەددو پێناسە دەلالەت دەكا بە تەفصیل لەسەر هەموو جوزئو بەشەكانی ماهیەت و حەقیقەت. ب– محدود و پێناسەكراو ئەو لەفظەی دەلالەت دەكا لەسەری دەلالەتیش دەكا لەسەر هەموو جوزئەكانی ماهیەت، بەلام كورت و پوخت، دەخۆ مفصل و مجمل لەیەك جیان پێناسەیێك بەدرێژی بكرێ جیاوازە لە پێناسەیێك بەكەم و كورتی بكرێ. دووەمیان: قەولی بەرامبەر اصحەكە گوێ بە ئیجمال و تەفصیل نادا، هەر ماصدقیان یەكەو ئەمە حیساب ئەكا.

وأمّا الثاني فلأنّ التابعَ لا يُفيدُ المعنى بدونِ متبوعِه، ومنْ شأنِ كلِّ مترادفينِ إفادة كلّ منهما المعنى وحدَهُ، والقائلُ بالمترادفِ يمنعُ ذلك[1]

{والحقّ إفادةُ التابعِ التقويةَ} للمتبوعِ ، وإلاّ لم يكنْ لذكرِه فائدةٌ ، فالعربُ لحكمتِها لاتتكلّمُ بما لافائدةَ فيه، ومقابِلُ هذا كما اشار إليه البيضاوي: والتابعُ لايفيدُ عقب قولِه: والتأكيدُ بمعنى المؤكد يقوي الأوّلَ وكأنّهُ أراد مافي المحصول: إنّ التابعَ وحده لايفيدُ اي المعنى، يعني بخلافِ كلٍ من المترادفينِ ، فهو على هذا ساكتٌ على إرادة التقويةِ لانافٍ له[2] {و}الحقُّ {وقوعُ كل من الرديفينِ} اي اللفظينِ المتّحدي المعنى {مكان الآخر إنْ لم يكنْ تعبُدٌ بلفظِه} اي يصحُّ ذلك في كلِّ رديفينِ بأنْ يؤتى بكلٍّ منهما مكان الآخَرِ في الكلامِ إذ لامانعَ من ذلك[3]

---

(١)دووەمیان کە (حسـن و بسـن)ە، ئـەمیش لەبـەر ئـەوە مـترادف نـین، چونکـە پاشکۆکەی بەبێ متبوعەکە، واتە بەسەن بەبێ حەسەن هیچ مانایێك ناگەیەنێ، دەخۆ کاروباری هەریەك لەو دوو لەفظە مترادفە ئەبێ خۆی تەنها مانا بگـەیێنێ، ئـەوەش کەئەڵێ: مترادفن، ئەوە ئەوەی قبولْ نیە کە ئەڵێن: مترادف ئـەبێ هـەر یـەك مانـای سەربەخۆ بگەیێنێ.

(٢)قسـەی حـەق ئەوەیە پاشـکۆ کـەڵکی سودی ئەوەی هەیە کە مەتبوعەکە بـەهێز ئەکا، ئەگەر وانەبێ هێنانەکەی هیچ سودێکی نەئەبوو، عەرەبیش لەبەر ئەوەی قسەیان بەجێیە ناگونجێ قسەیەك بکەن سودی تیانەبێ، قەولێك بەرامبەر ئەم قـەولی حەقـەبێ –وەك دانەر لـەمنع الموانع دا ئاماژەی پێکردووە، ئەمە گلەییـیە لەدانـەر– بریتییـە لەقەولی بیضاوی کە ئەڵێ: پاشکۆ سودو کەڵکێك ناگەیەنێ ، ئـەم رستـەیە دوای ئـەم قسە کـە ئـەڵێ: تـأكيد واتـە مؤكـد یەکەمەکـە بـەهێز دەکـا، وتوویـەتی: وەك ئـەوەی بیضاوی مەبەستی ئەوەی (المحصول) بێ کە ئەڵێ: پاشکۆ خۆی تەنها مانا ناگەیەنێ ، واتـە بە پێچەوانـەی هەریـەك لـە لەفظـە مترادفەکـە، کـەوابوو بیضـاوی لەسـەر ئـەم شـێوازە بـێدەگ بـووە لـەوەی: ئایـا پاشـکۆو تـابع بـەهێزکردنی یەکـەم ئەگەیـەنێ، نەفیشی نەکردوە –ئەمە طەعنێکە لەدانەر کەواحاڵی بووە قسـەکەی بیضـاوی موافقـی قسەکەی خۆیەتی ، کەواش نیە– چونکە دوای تقویە وتوویەتی: دانـەر لەبـەر ئـەوەی وای زانیوە بۆیە زۆر جێی گلەیی نیە.

(٣)قولی حەق ئەوەیە دانیشتنی هەریەك لە دوو لـەفظ –واتە لەفظیان جیاو مانایان یەك– لەجێی ئەویتردا دروستە و هەیە ئەگەر بەو لەفظـەی یەکەم داوای پەرستش نەکرابێ، –واتە بـەخوێنـدنەوەکەی– یانـی دروستە ئەو جـێگۆڕکێیە لە هەموو

{خلافاً للإمام} الرّازيِ في نفيهِ ذلكَ {مطلَقاً} اي من لغتينِ او لغةٍ، قال: لأنك لو اتيت مكان من في قولكَ مثلاً: خرجتُ من الدّارِ بمرادفِها بالفارسيّةِ اي از بفتحِ الهمزة و سكون الزاي لم يستقم الكلام لأنّ ضمَّ لغةٍ الى اخرى بمثابةِ ضمِّ مهملٍ الى مستعملٍ قالَ: وإذا عقلَ ذلكَ في لغتينِ فلم لا يجوزُ مثلُهُ في لغة اي لامانعَ من ذلك، وقال إنّ القولَ الأول اي الجواز الأظهرُ في اولِ النّظر ، والثّاني الحقّ[1] {و}خلافاً {للبيضاوي و}الصّفيّ {الهنديّ} في نفي ما ذُكِرَ {إذا كانا} اي الرَّديفان {من لغتينِ} لما تقدَّمَ[2] امّا ما تعبّدَ بلفظهِ كتكبيرةِ الإحرام عندنا للقادرِ عليها، فلايقومُ مرادفُهُ مقامَهُ لعروض التعبُّدِ[3] ويكن قال المصنّف تامّةً فتعبدٌ بلفظ المصدرِ فاعلها و ضمير بلفظه للآخر[4]

---

لەفظێکی مترادفدا ، بەم شێوەیە لە گفت و گۆدا ڕەوایە هەریەکەیان لەجێی ئەویتردا بهێنرێ و دابنرێ، چونکە هیچ شتێك نیە ئەوە قەدەغە بکا و ڕێی لێ بگرێ.

(١)ڕازی جیاوازە لەگەڵ قەولی حەقدا ئەم هەر بە مطلقی نەفی دەکا، چ لە دوو لوغابێ یاخود هەریەکەیان لە یەك لوغەدابێ هەر دروست نیە چونکە وتوویەتی: ئەگەر لە جێی (من)ی عەرەبی ئەزی فارسی بەکاربهێنی، وەك: (خرجتُ من الدّارِ) بڵێیت: ئەز دار ، ڕستەکە ڕێکو پێك نابێت چونکە لکاندنی زاراوەیێك لە زبانێکدا وبیگوێزیتەوە بۆ زبانێکی‌تر بکرێ بە ڕستەیێك، وەك ئەوە وایە وشەیەکی بێ‌مانا بلکێنی بە وشەیەکی ماناداڕەوە، یاخود بیخەیتە ناو ڕستەیێکەوە ، ڕازی ئەڵێ: جا ئەوە بۆ تێکەڵکردنی دوو زبان خەڵك وا لێی حاڵی دەبێ قەیناکا، بەڵام ئەی بۆ لەیەك زباندا دروست نیە؟ واتە هیچ شتێك ڕێ لەوە بگرێ، جا ڕازی ئەڵێ: قەولی یەکەم کە ئەڵێ دروستە، لەڕواڵەتدا و لەیەکەم بینینیدا-اظهر و دیارە ، بەڵام قەولی دووەم-کەئەڵێ دروست نیە- حەقە و ڕاستە. (٢)بەڵام جیاوازی بە بیضاوی و هیندی بۆ جمهور لەوەدایە ، کە نەفی دانانی مرادفێك لەجێی خۆیدا کاتێك دەکرێ کە هەریەك لەزبانێکدا بن، وەك ئەزی فارسی منی عەرەبی ، لەبەر ئەو هۆیەی لە پێشەوە ڕابورد.

(٣)بەڵام ئەو لەفظەی تەکلیف کراوەو بەوتنەکەیو پەرستشە، وەك: الله اكبر ی نوێژ دامەزراندن بەلای ئیمەی شافعی مەزهەبەوە واجبە لەسەر کەسێ توانای بشکێ بەسەریدا، کەوابوو مرادیفەکە جێی ئەوە ناگرێتەوە- خوا گەورترە- چونکە وەصفێك کە تەکلیفە بە گوێڕایەڵی وتنی لەفظە کەیە، نایەڵێ شتی‌تر لە جێیدا دانیشێ.

(٤)دانەر وتوویەتی: يكن فیعلی ناقص نیە، تاممەیە، تعبد مصدەرەو فاعلەکەیەتی، ضمیری بلفظه ئەگەڕێتەوە بۆ للاخر ، واتە إن لم يوجد تعبدٌ بلفظِ الآخَرِ.

{مسئلةٌ: المشترك} وهو كما تقدَّمَ اللفظُ الواحدُ المتعدد المعنى الـحقيقي، {واقعٌ في الكلامِ جوازاً[1] {خلافاً لثعلبَ والأبهري و البلخي} في نفيهم وقوعه {مطلقاً}.[2]

وقالوا وما يظنُّ مشتركاً فهو إمّا حقيقةٌ و مجازٌ او متواطئٌ، كالعينِ حقيقةً في الباصرةِ، ومجازيٌّ في غيرها، كالذَّهَبِ لصفائهِ والشَّمسِ لضيائها، وكالقُرءِ موضوعٌ للقدرِ المشتَرَكِ بينَ الحيضِ والطُّهرِ، وهو الجمعُ من قراتُ الماءَ في الحوضِ جمعتُه فيه والدَّمُ يجمعُ في زمَنِ الطُّهرِ في الجسَدِ، وفي زمـنِ الحيضِ في الرَّحمِ، وما هنا عن الثَّلاثةِ اقربُ مما في شرحي المختصر و المنهاج انَّهم احالوهُ.[3] {و}خلافاً {لقومٍ} في نفيهم وقوعَهُ {في القرآنِ وقيلَ: و الحديثِ} ايضاً، قالوا: لو وقع في القرآنِ لوقعَ إمّا مبيَّنٌ فيطولُ بلا فائدة، او غيرَ مبيَّنٍ فلا يفيدُ، والقرآنُ يُنزَّهُ عن ذلك، ومن نفى الوقوعَ في الحديثِ يقولُ مثل ذلكَ فيه.[4]

---

(١)مشترك-وەك لەپێشەوە رابوورد بریتییە لە: یەك لەفظ و چەند مانایێكی حەقیقی هەبێ- دروستە لە كەلام و گفتوگۆدا هەبێ. (٢)بەڵام ثەعلەب و ئەبهەری و بەڵخی جیاوازن لەگەڵ جمهوردا، ئەمانە نەفی هەبوونی مشترك دەكەن بەمطلقی چ لە قورئاندا و چ لە غەیری قورئاندا.

(٣)جا وتوویانە ئەوەی خەڵك واگومان ئەباو وائەزانێ مشتركە ، ئەوە مشترك نیە بەڵكو حەقیقەت و مەجازە یاخود متواطئە وەك وشەی عەین مانا حەقیقیەكەی یانی چاوو دەزگای بینین، چەند مانایەكی تری هەن هەمووی مەجازین ، وەك ئاڵتون لەبەر بێگەردی ، یەكێكی‌تر لەماناكانی بەمانا رۆژە لەبەر رۆشناییەكەی ، یاخود وەك وشەی: قرء دانراوە بۆ ئەو ئەندازەیەی كە مشتركە لەنێوان حەیز و پاكیدا، ئەو ئەندازە كۆكرنەوەیە چونكە قرء لە (قراتُ الماءَ في الحوضِ) یەوە هاتووە ، یانی ئاوەكەم لە حەوزەكەدا كۆكردەوە، خوێنیش لەكاتی پاكیدا لە لاشەی ئافرەتدا كۆدەبێتەوە، وەلەكاتی حەیزیشدا لە رەحم و منداڵدانیدا كۆ دەبێتەوە. ئەوەی لێرەدا نەقڵ كراوە لەو سێ زاناوە نزیكترە لە جمهورەوە، لەو نەقڵەی كراوە لێیانەوە، لەهەردوو شەرحی المختصر و المنهاج دا، گوایە ئەوان هەر بەمەحاڵیان زانیوە بوونی مشترك. (٤)وەگەلێكی‌تر جیاوازن لەگەڵ جمهوردا ئەوان تەنها نەفی مشترك دەكەن لە قورئاندا، هەندێكی‌تریش وتوویانە هەم لەناو فەرموودەشدا وتویانە: ئەگەر مشترك لە قورئاندا هەبێ، یا ئەبێ راڤەو رون كرابێتەوە، ئەوەش ئەبێ بە درێژەپێدانێكی بێ كەڵك، یائەبێ روون نەكرابێتەوە، ئەو كاتە مشتركەكە سودێك نابەخشێ، قورئانیش پاك ومونەزەهو دورە لەوە كەلامی بێ‌سودی تیاهەبێ،ئەوەش كەئەڵێ:لەفەرموودەشدا

واجيب بإختيار انّهُ وقع فيهما غير مبينٍ. ويُفيدُ إرادةَ احد معنييه مثلاً الذي سيبيّنُ وذلك كافٍ في الإفادة ، ويترتّب عليه في الأحكام الثّوابُ والعقابَ بالعزم على الطاعة او العصيانِ بعد البيان فإنْ لم يبيّن حمل على المعنيين كما سيأتي[1] {وقيل:} هو واجب الوقوع لأنّ المعاني اكثرُ من الألفاظ الدّالّة عليها واجيب بمنع ذلك إذ مامن مشتركٍ إلاّ ولكلٍ من معنييه مثلا لفظٌ يدل عليه {وقيل.} هو ممتنعٌ لإخلاله بفهم المراد المقصود من الوضع ، واجيب بأنّهُ يفهم بالقرينة. والمقصودُ من الوضعِ الفهم التفصيلي او الإجمالي المبين بالقرينة. فإنْ إنتفتْ حُمل على المعنيين كما سيأتي[2] {وقال الإمام} الرّازي: هو {ممتنعٌ بين النّقيضين فقط} كوجود الشيئ وإنتفائه. إذْ لو جاز وضعُ لفظٍ لهُما لم يفد سماعه غير التردد بينهما وهو حاصل في العقل واجيب بأنهُ قدْ يغفل عنهما فيستحضرهما بسماعه ثم يبحثُ عن المراد منهما

---

نیه هەر ئەوە ئەلی ئەمەی پێشوو وتی ١ وەلام دراوەتەوە بەهەڵبژاردنی ئەگەری دووەم کە بوونی مشترەکە لە هەردووکیاندا بی ئەوەی بەیان و روون کرابێتەوە. وإفادەی ویستی یەکی لەماناکانی ئەگەیەنی کە روون ئەکرێتەوە لەکاتی پێویستیشدا، ئەو إفادەشە بەسە لە سوود گەیاندنی مشترکدا. لە ئەحکامدا مشترکی بەیان نەکرابێ ترتیبی پاداشت و تۆڵەی دێتە سەر. بەهۆی عەزم کردن لەسەر گوێرایەڵی، یاخود سەرپێچی کردن دوای روون کردنەوە. وە ئەگەر بەیانیش نەکرا ئەوە ئەبرێ بەسەر هەردوو ماناکانیدا، وەك لەمەودوا دێت.

(٢)وتراویشە: مشترك واجبە لەکەلام و گفتوگۆدا هەبی. چونکە ئەو ماناو مەبەستانەی لە دڵدان زیاتر لەو لەفظانەی دەلالەت ئەکەنە سەریان، وەلام دراوەتەوە ئەوە نابێ وابێ ، چونکە هیچ مشترکێك نیە بۆ هەریەك لەماناکانی لەفظێکی تایبەتی نەبێ و دەلالەت نەکا لەسەری. (٣)هەندێك وتوویانە: مشترك هەر قەدەغەیە هەبی، چونکە نوقصانی ئەگەیەنی بەحاڵی بوونی ئەو مەبەستەی نیازکراوە لەکاتی وەضع ودانانیدا، وەلام دراوەتەوە: کە ئەو مەبەستەی نیازکراوە لە کاتی وضعدا بەهۆی قەرینەوە ئەزانرێ، ئەو مەبەستەی کاتی وەضعەکە بە لەفظەکە کراوە. یا فەهمێکی تەفصیلیە وەك لە غەیری مشترکدا وایە، یاخو فەهمێکی إجمالیە بەهۆی قەرینەوە روون ئەکرێتەوە، بەلام قەرینە نەبی ئەو کاتە ئەو مشترکە ئەبرێ بەسەر هەموو ماناکانیدا، وەك لەمەودوا دێت. (٤)پێشەوا رازی وتوویەتی: مشترك تەنها لەنێوان دوو نەقیضدا قەدەغەیە، هەبێ-نەك دوو ضددا-وەك بوونی شتێك و نەبوونی، چونکە ئەگەر دروست بی دانانی لەفظێك بۆ هەردوکیان-نقیضەکان بیستنی ئەو لەفظە --

{مسئلةٌ: المشتركُ يصحُّ} لغةً {إطلاقُهُ على معنييهِ} مثلاً {معاً} بأن يُرادَ بهِ من متكلّمٍ واحدٍ في وقتٍ واحدٍ كقولِكَ عندي عينٌ وتريدُ الباصرةَ والجاريَةَ مثلاً، وملبوسي الجونُ و تُريدُ الأسودَ و الأبيضَ، واقرأتْ هندٌ وتريدُ حاضتْ و طهُرَتْ، {مجازاً} لأنَهُ لم يُوضع لهُما معاً، وإنّما وضعَ لكلّ منهما من غير نظرٍ الى الآخرِ، بأنْ تعدَّدَ الواضعُ. أو وضعَ الواحدُ نسياناً للأوّلِ.[1] {وعنِ الشافعيِّ و القاضي} ابي بكر الباقلاني {والمعتزِلَة} هو {حقيقةٌ} نظراً لوضعهِ لكلّ منهما، {زاد الشافعيُّ و ظاهرٌ فيهما عند التجرُّدِ عنِ القرائنِ} المعينةِ لأمرهما كالمصحوبِ بالقرائنِ المعمِّمَةِ لهما {فيحمل عليهما} لظهوره فيهما.[2]

---

جگە لە تردد نەبێ لەنێوانیاندا هیچ سودێکی تری نیە، ئەو تردده‌شە پێش بیستنەکەش لە عەقڵدا هەر هەبوو، وەڵام دراوەتەوە: جاری واهەیە ئینسان بێ‌ئاگ ئەبێ لێیان، بەڵام بەهۆی بیستنی مشترەکەکەوە لە ذیهندا ئامادەیان ئەکاتەوە و پاشان ئەگەڕێ بەشوێن مەبەستەکەیاندا.

(١)مشترك لە رووی لوغەوە صەحیحە بیبڕێ بەسەر هەردوو ماناکەیدا مثلا . بەیەکەوە-بەڵام مەجازەن نەك بەحەقیقەت- بەم شێوەیە یەك قسەکەر لەیەك کاتدا تلفظ دەکات بە مشترك مەبەستی هەموو ماناکانی بێت، وەك ئەڵێت: عندی عین. مەبەست دەزگای بینینی بێت و کانیاویش بێت، یائەڵێت: ملبوسی الجون، مەبەست رەش و سپی بێت ، یا ئەڵێت: اقرات هند، مەبەستت ئەوەبێ بڵێیت: کەوتوەتە حەیزەوە یا پاك بووتەوە،بۆیە ئەڵێن مەجازە چونکە پێکەوە ئەو لەفظە مشترکە بۆ هەردوکیان دانەنراوە، بەڵکو دانراوە بۆ هەر یەکێکیان بێ ئەوەی چاو لەوی تر بکرێ. بەم شێوە چەند دانەرێك دایناوە یاخود دانەر یەکێك بووە بەڵام کاتێ دووەم مانای داناوە مانای یەکەمی بیر نەبووە.

(٢)لە شافعی و باقلانی و موعتەزیلەوە نەقڵ کراوە: بڕینی مشترك لەروی لوغەوە بەسەر هەردوو ماناکانیدا ئەوە حەقیقەتە نەك مەجاز، چونکە مشترك دانراوە بۆ هەر یەك لەو دوو مانایانەدا، ئەمانەسەیری ئەو وەضعەیان کردوەو چاویان لەوە بڕیوە، جگە لەوەش شافعی شتێکی‌تری زیاد کردووە وتوویەتی: بەکارهێنانی مشترك بۆ هەردوو ماناکانی شتێکی روون و دیارە لەکاتی نەبوونی قەرینەیێك کە بەکارهێنانی مشترەکەکە دیاری‌بکا بۆ یەکێ لەماناکانی، وەك مشترەکێك قەرینەی لەگەڵدابێ کە ئەو لەفظە عامە و گشت گیرە بۆ هەموو ماناکانی، کەوابوو ئەو لەفظە مشترکە ئەبڕێ بەسەر هەردووماناکانیدا چونکە بەکارهێنانی لە هەردوو ماناکانیدا روون و دیارە.

{وعنِ القاضي} هو عند التَّجرُّدِ عنِ القرائنِ المعيَّنَةِ والمعمِّمَةِ {مجملٌ} اي غيرُ متضحٍ المُرادِ منهُ، {ولكن يُحمَلُ عليهما إحتياطاً}[1] {وقال ابو الحسين} البصري {والغزالي يصحُّ أن يُرادَ} بهِ ماذُكرَ من معنييهِ عقلاً {لاأنَّهُ} اي مايرادمن معنييه {لغةً} لا حقيقةً ولا مجازاً لمخالَفَتهِ لوضعهِ السابقِ إذْ قضيَّتُهُ أن يستعملَ في كلٍّ منهما منفرداً فقط، وعلى هذا النَّفي البيانيون و غيرهم[2]

{وقيلَ: يجوزُ} لغةً أن يُرادَ بهِ المعنيان {في النَّفي لا الإثباتِ}، فنحو لاعينَ عندي، يجوزُ أن يُرادَ بهِ الباصرة والذَّهب مثلاً، بخلافِ عندي عينٌ ، فلايجوزُ أن يرادَ بهِ إلاّ معنىً واحد، وزيادَةُ النَّفي على الإثباتِ معهودَة كما في عمومِ النكرةِ المنفيَّةِ دونَ المثبتة.[3]

(١)لەقازیشەوە نەقڵ کراوە کە مشترك لەکاتی نەبوون و روتبوونی لەقەرینەیێك کە ماناکەی دیاریبکا، یاگشتگیری بکا بۆ هەموو ماناکانی ئەو کاتە ئەو مشترکە مجمل ئەبێ، واتە مەبەستی متکلم روون نیە بەلاّم لەبەر ئیحتیاطی و کار مەحکەمی حەمل ئەکرێتە سەر هەردوکیان، -کەوابوو بەلای شافعیەوە ظاهیرە بەلای قازیەوە مجملە-

(٢)بەصری و غەزالی وتوویانە: دروستە هەردوو مانای مشترك ئیرادەبکرێن بەلاّم لەرێی عەقڵەوە نەك لە رێی لوغەت و حەقیقەت و مەجازەوە، چونکە هەموو ماناکانی مشترك بەکۆمەڵ جیاوازن بۆ وەضع و دانانە پێشوەکەی، لەبەر ئەوە قضیەی وەضعە پێشوەکەی ئەوەیە مشترك تەنهابەتاکی لەهەردووکیاندا بەکاربهێنرێ، زانایانی عیلمی بەیان و غەیری ئەوانیش وەك حەنەفیەکان لەسەر ئەم نەفیەن کە-لا إنَّه لغة-.

(٣)وتراویشە لەروی لوغەوە دروستە مشترك لەرستەی نەفیدا ئیرادەی هەردوو ماناکەی، بەلاّم لەرستەی مثبت دا دروست نیە، بۆ وێنە: لاعين عندي ئەو عەینە دروستە مەبەست پێی دەزگای بینین بێ و ئاڵتونیش بێ، چونکە مەنفیە، بەلاّم عندي عين ، ئەم عەینە ئەبێ تەنها یەك مانای پێ مەبەست بێ، بۆ نەفی و ئیثبات فەرقیان چیە؟ چونکە رستەی مەنفی زیادەی مەعلوم وزانراوە کە هەیەتی بەسەر ئیثبات دا، بەقیاس لەسەر نەکیرە لەرستەی نەفیدا بۆ گشتی و عموم ئەبێ، بەلاّم نەکیرەی مثبت ئەوە ناگەیەنێ.

وفي نسخَةٍ بدل، يجوز، يصحّ، وهو انسبُ. والخلافُ فيما إذا امكنَ الجمعُ بين المعنيـ كما في الأمثِلَةِ المذكورَةِ ، فإن إمتنع كما في إستعمالِ صيغَـةِ إفعَلْ في طلَـبِ الفعـل و التهديدِ عليهِ، على ما سيأتي مرجوحاً انّها مشتركةٌ بينهما فلا يصحُّ قطعاً، ولظهو ذلك سكتَ المصنِّف عنِ التنبيهِ عليه[1]

{والأكثر} من العلماءِ {علىانّ جمعَهُ بإعتِبار معنييه} كقولك: عندي عيونٌ، وتريـ مثلاً باصرَتين و جارية، أو باصرَةَ و جارية و ذهباً، {إن ساغَ} ذلك الجمعُ وهو مـ رجّحهُ إبن مالك وخالفهُ إبن حيّان {مبنيٌّ عليه} اي في صحَّةِ إطلاقهِ على معنييهِ كما ـ المنعِ مبنيٌّ على المنعِ و الأقلّ على انّهُ لايُبنى عليه فيها فقط، بل يأتي على المنعِ ايضاً، لأنّ الجمعَ في قوّةِ تكريرِ المفرداتِ بالعطفِ، فكانّهُ استعمل كلّ مفردٍ في معنىً

(١)لە نوسـخەيەكیتردا لـەباتی: يجـوز، يصـح نوسـراوە ئەمـەش صەحيحـە، ئـەم جياوازيـە لەنێوان زانايـاندا، لـە مشـتركێكدا ئـەبێ، جـەمع و كۆكردنـەوەی ماناكـانی گونجاوبێ، وەك ئەو ميثالانەی باسكران، خۆ ئەگـەر گونجـاو نـەبێ كۆبوونـەوەيان وەك بـەكارهێنانی وشـەی إفعـل، لـەداواكردنی كـارێكداو لەهەڕەشـەكردن لەسـەر كردنـی ئەمـەش لەئـەوەی كەلەمـەودوا دێـت وەرگـيراوە، كەوشـەی إفعـل مشـتركە لـەنێوان هەردوكياندا. بەڵام مرجوحاً ئەوە بێگومان دروست نيە ، ئەی بۆ ئيمكانی ئەو جەمع و غەيری جەمعە باس نەكراوە؟ لەبەر روون و ئاشكرايی ئەوە دانەر باسـی نـەكردووەو بێ دەنگ بووە لێی و كەسی ئاگادار نەكردووە لەسەری.

(٢)زۆرتر لە زانايان لەسەر ئەوەن كە لەفظی مشـتركی موفرەد جـەمع دەكرێتـەوە بـە ئيعتيباری هەردوو ماناكەی –وەك دەڵێن: زيدون ئـەبێ سـێ زيـد هـەبێ– كـە دەڵێيت: عنـدی عيـون مەبەسـت پێـی دوو دەزگـای بينـين و كانيـاوێكی جاريـە –كەسـێ ئەكات– ياخود دەڵێيت: عندی عيونٌ مەبەستت يەك چاو، يەك كانی و ئاڵتونە ، جا ئەگەر ئەو جەمعە دروست بێ كە ئيبن مالك تەرجيحی داوە، وە ئـەبو حـەييان پێچەوانـەی ئـەوی كردوە، ئەوە لەسەر ئەوە دروست دەبێ كە صەحيحـە دابڕينـی لەفظی مشترك لەيـەك كاتدا بەسەر هەردوو ماناكانيدا، وەك دروست نەبوونەكـەی لەسـەر دروسـت نـەبوونی. دابڕينەكەيەتی بەسەر هەردوو ماناكانيدا. بەرامبەر بە زۆربەی زانايان هەندێكی كەمتر لەسەر ئەوەن كە ئەو جەمعە تەنها بينا ناكرێ لەسەر لەفظێكی مشترك كە دروست بـێ بيـبڕێ بەسـەر هـەردوو ماناكـانيدا، بـەڵكو هـەم دروسـتە لـەوەش كەمەنعـە بـبڕێ بەسەريشيدا چونكە جـەمع ئەو هێزەی هەيـە كـە چـەند موفرەدێـك بـەهۆی حـەرفی عەطفەوە هەيانە، وای بەسەر دێ: وەك ئەوە وايە هەرماناييێك وەك موفـرەدێك وايە،

ولو لم يقُلِ المصنِّف إنْ ساغَ المزيدُ على إبنِ الحاجب وغيرِه كان المعنى إنّ الجمع مبنيٌّ على المفردِ صحّةً و منعاً ، وقيلَ: لا بل يصحّ مطلقاً ، فمؤدى العبارتين واحد والزيادَةُ اصرحُ في التنبيهِ على الخلاف[1] {وفي الحقيقةِو المجازِ} هل يصحُّ ان يُرادا معاً باللفظِ الواحدِ كما في قولك: رايتُ الأسدَ وتريدُ الحيوانَ المفترسَ والرَّجل الشّجاع[2] {الخلافُ} في المشتركِ {خلافاً للقاضي} ابي بكر الباقلاني في قطعِه بعَدَم صحّةِ ذلك ، قال لما فيهِ من الجمعِ بينَ متنافيينِ حيثُ أُريدَ باللفظِ الموضوعِ لهُ اي اولاً وغيرُ الموضوعِ لهُ معاً واجيبَ بأنّهُ لاتنافي بين هذينِ[3]

---

سیٚ مانای هەیە یەکسانە بەسیٚ موفرەدەکەی، ئەمیش یەکسانە بە جەمع.

(١)گەر دانەر نـــەیوتایە: إن ساغ ، ئەگەر دروســـت بیٚ، -کەزیاد کراوە لەسەر ابن الحاجب و غەیری ئەو- ئەو کاتە واتاکە ئـــاوا ئەبـــوو، جەمع لە موفرەد دروست دەکـریٚ ئیتر ئـەو موفـرەدە ئـــەگەر دروسـت بـیٚ اطـــلاق بکـریٚ بەســەر هــەردوو ماناکانیدا لەیـەك کـاتدا ئـەو جەمعـە دروســــتە، وەئەگـەر درو ستیش نـەبیٚ ئـــەو جەمـعـە دروست نابیٚ، وتراویشە: نا، لەسەر ئەوە دروســـت نابیٚ بەڵکو ئەو جەمعە صەحیحە بە مطلقی ، دروست بیٚ بیبڕی بەسەر هەردوو مـــاناکەیدا یا دروست نەبیٚ، هەر جەمعەکە دروستە ، کەوابوو ناوەڕۆکی هـەردوو عیبارەتـــەکە یـەك شــــتە، -إن ساغ، وعدمە- بەڵام وشەی إن ساغ کە زیادکراوە و زیاتر بەروونـــی گوێی ئاگـــادار ئەکا و رایئەچڵەکێنیٚ لەسەر خلاف و جیاوازی نێوان زانایان تیایدا.

(٢)ئایـا دروســـــتە بەیـەك لـەفظ حەقیقـەت و مـەجاز پێکـــــەوە ئـیرادە بکرێـن - حەقیـــقەت یانی ئـــیرادەی مانای موضـوع لـە، مـەجاز یـانی ئیـــرادەی مانای غەیر موضوع لـــە- وەك دەڵێـــیت: رایت الأسد مەبـــەست پێی ئەو گیانلەبەرە دوڕندەیە بیٚ و ئەو پیاوە ئازایـــەش بیٚ، ئەوە ئـــەو جیاوازیـــەی لەبارەی مشـــترکەوە هەبوو لێرش هەیە.

(٣)بەڵام باقلانی جیاوازە لەگەڵ ئەو بۆچونەدا، ئەم دەڵیٚ: بێگومان کە دروست نیـە بەلـەفظ ئیرادەی مانای حەقیقیشی لیٚبکـەیت وئیرادەی مانـای مەجازیشی لیٚبکـەیت ، چونکە ئەمە کۆکردنەوەی دوو دژە لەیەك لەفظدا چونکە لەیەك کاتدا ئیرادە کراوە بەو لەفظە ئەو مانایە کەیەکەم جار بۆی دانراوە، وغەیرە مەوضوع لەکەشی ئیرادە کراوە لەگەڵیدا، وەڵام دراوەتەوە : کە دژایـەتی لـەنێوانیاندا نیـە -کـاتیٚ ئـەبیٚ، کەهــەردوو ماناکە بۆیـەك موضـوع بن ولەیـەك رویشـەوە، لێرە وانیە ١-موضـوع لـە وەصفـە بـۆ حەقیقی ٢- غەیر موضوع لە وەصفە بۆ مەجازی.

وعلى الصحّةِ يكونُ مجازاً او حقيقةً و مجازاً بغعتبارين على قياسِ ماتقدَّم عن الشافعي وغيرِه ، ويحملُ عليهما إن قامت قرينةٌ على إرادةِ المجازِ مع الحقيقةِ كما حمل الشافعيّ الملامَسَةَ في قولِه تعالى: ﴿ او لامستُمُ النِّساءَ ﴾ على الجسِّ باليدِ والوطء[1]

{ومن ثَمَّ} اي من هنا وهو الصحَّةُ الرَّاجحةُ المبني عليها الحملُ عليهما اي من اجل ذلكَ {عمَّ نحو وافعلوا الخيرَ، الواجبَ والمندوبَ} حملاً لصيغةِ إفعل على الحقيقةِ و المجازِ من الوجوبِ والنَّدبِ بقرينَةِ كونِ متعلَّقها كالخيرِ شاملاً للواجبِ والمندوب {خلافاً لمن خصّهُ بالواجبِ} ، بناءً على انّهُ لايُرادُ المجازُ مع الحقيقةِ ، {ومن قال هو {للقدرِ المشترَكِ} بينَ الواجب والمندوبِ اي مطلوبِ الفعلِ بناءً على القولِ الآتي إن الصيغَةَ حقيقةٌ في القدرِ المُشترَك بينَ الوجوبِ والنّدبِ اي طلَبِ الفعلِ.[2]

---

(١)ئايا بڕینی لەفظێك بەسەر مانای حەقیقی و مەجازی‌دا بەكارهێنانێكی مەجازیە یا چیە؟ ئەڵێ: وتمان خیلافی تیایە، ئەگەر وتمان صەحیحە ئەو لەفظە ئیرادەی مانای هەردوو مانای حەقیقی و مەجازی لێ‌بـــكرێ ، ئەو ئیطلاق و بڕینـە مەجازی ئەبێ یاخود حەقیقی و مەجازی ئەبێ، بەگرتنی دوو ئیعتیبار لەسەر قیاسی ئەوەی پێشوو كە نەقڵ كرا لە شافیعی و غەیری شافعیە كە لەفظی مشترك ئیرادەی هەردوو ماناكەی لەیەك كاتدا دروستە ، لەفظەكە ئەبڕێ بەسەر هەردوكیاندا، ئەگەر قەرینەیەك بەرپا بوو لەسەر ئەوە كە مەجاز مەبەستە ، وەك شافیعی حەملی لەفظی ملامسەی كردووە لەسەر هەست كردن چ بەدەست بێ ، یابە خستنە ژێرو جیماع بێ لە ئایەتی: او لامستم النساء دا.

(٢)لەبەر ئەوەی كە صیحەت راجیحە كە ئەو لـەفظەی بیناكراوە لەسەر صیحەت چونكە حـەمل كراوە لەسەر هەردوو ماناكەی ، لەبـەر ئەوە إفعلوا الخیر ، واجبیش ئـەگرێتـەوە و مەندوبیـش ، چونكە لـەفظی: إفعل حەمل دەكرێ لەسەر حـەقیقی و لەسەر مـەجازیش ، كە وجوب و نەدبە، بەبەڵگەی بوونی متعلقی إفعل، وەك : (الخیر)یش واجب و مندوبیش دەگرێتەوە. (٣)بەپـێچەوانەی ئەوانـەی كەتەنـها تایبـەتیان كردوە بەواجبەوە، لەسـەر ئەوەش ئەو بڕیارەیـان داوە كەلەگەڵ حـەقـیقەتدا مـەجاز ئیرادە ناكرێ وەبەپێچەوانەی ئەوەشەوە كە وتویـەتی: تایبـەتە بە ئەو ئـەندازەوە كە موشتەرەكە لە نێوان واجب و مندوبدا كە مطلوبـی فیعلەكەیە ، ئەمەش بۆیە وائەڵێ: چونكە رەئیەك هەیە ئەڵێ: وشەی إفعل حەقیـقەتەن بۆ ئەو قـەدەرە موشتـەرەكەیە لەنێوان واجب و نەدبدایە، كە طەلەبی فیعلەكەیە.

{وكذا المجازانِ} هل يصحُ أن يُرادا معاً باللفظِ الواحدِ كقولِكَ مثلاً واللهِ لااشتري وتريدُ السّومَ و الشّراءَ بالوكيلِ، فيهِ الخلاف في المشترَكِ وعلى الصحَّةِ الرَّاجحةِ يحملُ عليهما إن قامتْ قرينةٌ على إرادتهما أو تساويافي الإستعمالِ ولاقرينةً تبيّنَ أحدُهما، وإطلاقُ الحقيقةِ والمجازِ على المعنى كما هنا مجازيٌّ من إطلاقِ اسم الدالِّ على المدلولِ[1]

{الحقيقَةُ لفظٌ مستعملٌ فيما وضعَ لهُ إبتداءً} فخرجَ عنها اللفظ المهمل، وما وضعَ ولم يُستعملْ والغلطُ كقولِكَ خذ هذا الفرسَ مشيراً الى حمارٍ والمجازُ[2] {وهي لغويَّةٌ} ، بأنْ وضعها اهل اللغة بإصطلاحٍ أو توقيفٍ كالأسد للحيوان المفترس[3] {وعرفيَّةٌ} بأنْ وضعها أهل العرف العام كالدّابّةُ لذواتِ الأربعِ كالحمارِ ، وهي لغةً لكلِّ مايدبُّ على الأرضِ ، أو الخاصُ كالفاعلِ للأسم المعروفِ عندَ النحاة[4]

---

(١)ئايا دروستە دوو مانای مەجاز ئیرادە بکرێن بەیەك لەفظ؟ وەك ئەڵێیت: والله لااشتري مەبەست پـێ‌ی مامەڵەو کرینە بەهۆی وەکیلەوە، ئەوە ئەو خیلافەی لە موشتەرەکدا هەبووە لێرەشدا هەیە، لەسەر صیحەت و دروستی کە قەولی راجیحە حەمل دەکرێ لەسەر هەردوکیان، ئەگەر قەرینە هەبوو لەسەر هەردوکیان ، یاخود هەردوکیان یەکسان بوون لەبەکارهێنانیاندا، هیچ قەرینەیەکیش نەبوو یەکێکیان دیاری بکات، وشەی حەقیقی و مەجاز بۆ لەفظ بەکاردێ، ئێستە لێرە بۆ مانا بەکارهاتوون مەجازیە، ئەمە تلفظ بەدالە و مەبەست مەدلولە.

(٢)حەقیقەت بریتیە لە لەفظێك بەکارهاتبێ لەو مانادا کە لەسەرەتاوە بۆی دانراوە، کەوابوو لەفظی بێ‌مانا لە خەقیقەت دەرچوو، وەئەوەش دانراوە بۆ مانییێك و لەو مانایەدا بەکارنەهاتووە، وەك ئیسمی ئیشارە حەقیقەتەن بۆ ئامارژەبۆکراو دانراوەو تیایدا بەکارنەهاتووە، هەروەها غەڵەتیش چووەدەر وەك تۆ ئامارژە بکەیت بۆ ئەسپێك و بڵێیت: ئەم کەرە بگرە، لەوەدا کە بۆی دانراوە بەکارنەهاتووە، هەروەها مەجازیش چووەدەر چونکە لەمانای دووەمدا بەکاردێ. (٣)حەقیقەت سێ‌بەشە: ا–حەقیقەتی لوغەوی بەم شێوەیە ئەهلی ئەو زوبانە هەموویان رێك کەوتبن ئەو لەفظە بەرامبەر ئەو مانایە دابنێن، یاخود خوا فێری کردون، ئەو لەفظە بۆ ئەو مانایە وەك لەفظی: أسد، شێر دانراوە بۆ گیانلەبەرێکی درندەی ناسراو. (٤)ب–حەقیقەتی عورفیە ، بەم شێوە ئەهلی عورفی عام، واتە کۆمەڵێکی زۆری نادیار دایان ناوە بۆ مانایێك، وەك وشەی: (دابّة) تایبەت کراوە بە چوار پێوە، بەڵام لە لوغەتدا بۆ هەموو گیانلەبەرێك بچێ بەسەر زەویدا ، یاخود عورفێکی تایبەت داینابێ، وەك وشەی فاعیل، لەلوغەتدا

{وشرعيَّةٌ} بأن وضعها الشّارعُ كالصّلاةِ للعبادةِ المخصوصةِ[1] {ووقع الأوّليان} ني اللغويّة والعرفيَّة بتسميتها جزماً، وفي خط المصنِّف الأولتان بالفوقانيّة مثنى الأوّلة وهي لغةٌ قليلةٌ جرت على الألسنةِ والكثيرُ الأولى، كما ذكر النووي في مجموعه، فمثنّاه الأوليان بالتحتانيّة مع ضمِّ الهمزة[2] {ونفى قومٌ إمكان الشرعيَّة} بناءً على انّ بين اللفظ و المعنى مناسبةً مانعةً من نقله الى غيره[3] {و}نفى {القاضي} ابوبكر الباقلاني {وابن القشيري وقوعها} قال: ولفظُ الصّلاةِ مثلاً مستعملٌ في الشرع في معناهُ اللغوي أي الدّعاء بخيرٍ لكن إذا إعتبرَ الشارعُ في الإعتدادِ به إموراً كالركوع وغيره.[4]

{وقال قومٌ : وقعتْ مطلقاً وقومٌ:} وقعت {الا الإيمان} فإنّهُ في الشّرعِ مستعملٌ في معناهُ اللغويّ اي تصديقُ القلبِ وإن إعتبر الشارعُ في الإعتدادِ به التلفظَ بالشهادتينِ من القادرِ، كما سيأتي[5]

---

بەواتای ئیشکەرە، بەلاّم بەلای نەحویەکانەوە بە ئیسمێك ئەلّێن فعل یا شبهە فعلی بدرێتە پالّ. (١)حەقیقەتی شەرعیە بەم شێوەیە شارع ئەو لەفظەی دانابیّ بەرامبەر بەو مانایە، وەك نوێژ دانراوە بۆ چەند قەول و فیعلێکی تایبەت. (٢)دووەم و یەکەمەکەیان کە حەقیقەتی لوغەوی و عورفیە بیٚگومان هەن لەناو گفتوگۆی زبانی عەرەبیدا، دانەر بەخەتی خۆی نوسیویەتی: الأولتان لەباتی یێ بەتیٚ نوسیویەتی بۆ مثنی و بۆ دووە. تاکو مفرەدەکەی الأولە، ئەوەش زاراوەییێکی زۆر کەمە هاتووە بەسەر زباندا. لەهجەیەك کە زۆر بەکاربیٚ یەکەمیانە –الأوليان– وەك نەوەوی لە مەجموعەکەیدا باسیکردووە، مثناکەی: الاوليان ، بەییٚ یە نەك بەتیٚ، لەگەلّ بۆرەی هەمزەکەی.

(٣)کۆمەلّێك ئەلّێن حەقیقەتی شەرعی هەر ئیمکانی نیە، ئەم بۆچونەیان لەسەر ئەوە بنیات ناوە کەلەنێوان لەفظ و مانادا خزمایەتی و موناسەبەیەك هەیە کە نایەلّیٚ ئەو لەفظە نەقلّ بکریٚ بۆ ماناییێکیتر. (٤)باقلانی و قوشەیری نەفی بوونی حەقیقەتی شەرعیان کردووە، نەك ئیمکانی، وتوویانە: لەفظی صەلاتیش کەلە شەرعدا بەکارهاتووە هەر لەمانا لوغەویەکەیدا بەکار هاتووە کەبەمانا دوعایەو پاڕانەوەیە و بانگ کردنی چاکەیە، بەلاّم شارع چەند شتێکی بۆ داناوە ئەم ئیعتیباری پیٚکردووە، وەك رکوع و شتیتر .

(٥)کۆمەلّێکی زۆر وتویانە حەقیقەتی شەرعی بە مطلقی هەیە چ دینی بیٚ و چ فەرعیبیٚ ، وەکۆمەلّێکیتر وتویانە: حەقیقەتی شەرعی هەیە تەنها لە ئیماندا نیە، چونکە ئیمان لەشەرعدا هەر بۆ مانا لوغەویەکەی بەکارهاتووە، واتە بڕوا کردنی دلّ هەرچەند شارع کاتیٚ ئیعتیباری پیٚدەکات ئەبیٚ تلفظ بکرێت بەهەردوو شەهادەت،

{وتوقّف الآمدي} في وقوعها[1] {والمُختارُ وفاقاً لأبي إسحق الشيرازي والإمامين} إمام الحرمين والإمام الرّازي، {وابن الحاجبِ وقوعُ الفرعيَّةِ} كالصّلاة {لا الدينيَّةِ} كالإيمانِ فإنّها مستعملةٌ في الشّرعِ في معناهُ اللغويّ[2] {ومعنى الشّرعيّ} ، الذي هو مسمّى ماصدق الحقيقةُ الشرعيّةُ، {ما} اي شيئٍ {لم يستفِد إسمهُ إلاّ من الشَّرع} كالهيئةِ المُسمّاةِ بالصّلاة[3]

{وقدْ يطلَقُ} اي الشرعيُّ {على المندوبِ والمباحِ} من الأولِ قولُهم من النّوافلِ ماتُشرَعُ فيه الجماعَةُ اي تندَبُ كالعيدَينِ، ومن الثاني قول القاضي حسين لو صلّى التراويحَ اربعاً بتسليمةٍ لم تصح، لأنّهُ خلافُ المشروعِ و في شرحِ المختصر بدل المباحِ الواجب، وهو صحيحٌ ايضاً، يُقالُ شرعَ اللهُ الشيئَ اي اباحَهُ ، وشرعَهُ اي طلبَهُ وجوباً او ندباً ، ولايخفى مجامعَةُ الأوّلِ لكلّ من الأطلاقات الثّلاثة[4]

---

لەلایەن کەسێکەوە توانای بەسەردا بشکێ ، وەك لەمەوداوديێت. (١)ئامێدی وەستاوە لەر :دا کەدان بنێ بەبوونی حەقیقەتی شەرعیدا. (٢)بەلام ئەو قەولەی هەڵبژاردە لەناو هەموياندا -کە موافقی شیرازی‌و ئیمام الحرمين و رازی‌و إبن لحاجب بێ- ئەوەیە کەحەقیقەتی شەرعی لە فەرعی دیندا هەیە، وەك (صلاة) نوێژ بەلام لە مەسئەلەی دینی و عەقیدە تێدا نیە وەك : ئیمان وبڕوا ، چونکە مەسەلەی عەقیدەتی لەشەرعدا هەر لە مانا لوغەویەکەیدا بەکارهاتووە. (٣)مانای شەرعی کە ناوەڕۆکی ماصدقی حەقیقەتی شەرعی‌یە، بریتی‌یە لە: مانایەك و ناوەڕۆکێك ناوەکەیو لەفظەکەی تەنها لەشەرعەوە وەرگیرابێ، وەك ئەو شێوەو دیمەنەی ناوئەبرێ بە صلاة و نوێژ.

(٤)کەم جارانێ لەفظی شەرعی ئەبرێ بەسەر مندوب و مباحیشدا، وێنە بۆ ئەوەی بەمانا مندوب بێ وەك ئەڵێن: (من النّوافلِ ماتشرع فيه الجماعة)، واتە هەندێ سوننەت هەن کە بەجەماعەت کردنیان مەندوبە، وەك هەردوو جەژنەکە، بۆ دووەمیان وەك قازی حسين دەڵێ: ئەگەر نوێژی تەراویح بکرێ بەهەر چوار رکاتی سەلام دانەوەیەکی تیادا بێت، ئەوە صەحیح نی‌یە، چونکە پێچەوانەی مەندوب و مەشرع و مەباحە، لە (شرح المختصر)دا لەباتی مەباح واجبی هێناوە ، ئەمیش هەر صەحیحە چونکە دەوترێ: (شرعَ اللهُ الشيئَ) یانی مەباحی کردووە، وشرعه یانی داوای کردنی کردووە، چ بەواجب بێ یا بەنەدب، شتێکی شاراوە نیە شەرعی کەلە شەرع وەرگیراوە، شەرعیش لە شاریعەوە، ئەم مانایە لە هەر سیانیاندا هەیە، کە وجوب و نەدب و ئیباحەیە.

والمجازُ المُرادُ عندَ الإطلاقِ وهو المجازُ في الإفـــرادِ {اللفظُ المستعملُ} فيما وضعَ له لغةً او عرفاً او شرعاً {بوضعٍ ثانٍ} خرجَ الحـــقيـــقةُ {لعلاقَةٍ} بين ما وضعَ له اولاً و مـ و ضعَ له ثانياً خرجَ العلم المنقولُ كفضل، ومـــن زاد كالبيانيين مع قرينَةٍ مانعَةٍ عن إرادَةِ ما وضعَ له اولاً مشى على انَهُ لايصحُ ان يـُـرادَ باللــفظِ الحقيقَةُ والمجازُ معاً.

{فعلمَ} من تقييـــدِ الوضعِ دونَ الإستعمالِ بالثَّاني {وجـوبُ سبقِ الوضـعِ} للمعنـى الأوّلِ {وهو} اي وجوبُ ذلكَ {إتفاقٌ} اي متّفقٌ عليهِ في تحقّقِ المجازِ {لاالإستعمالِ} في الـمعنـــى الأوّلِ، فلا يجـبُ سـبقُهُ في تحـــقّقِ المجازِ، فـلا يســتلزِمُ المجـازُ الحقيقـةَ كالعكسِ[2]

---

(١)مەجازێك كەمەبەستە لەكاتی تلفظ پیٚكردنی بریتیە لەو مەجازەی لە إفرادا بیٚ نـەك لـە تـەركیب دا، ئـەوە لفظیكـە بـەكاردیٚ لـەماناییٚكدا بـۆی دانـراوە، چ لـەڕوی لوغەوەبیٚ، یا لە ڕوی عورفەوە بیٚ، یا لـە ڕوی شـەرعەوە بیٚ، بـەلاٚم بەهۆی وەضـع و دانـانیٚكی دووەمـەوە بیٚ ئـەو مانایـە، كەوتت بە وەضعـی دووەم حەقیقـەت دەردەچـیٚ چونكە ئەم بە وەضعـی یەكـەم بـەكاردیٚ، بۆیـە لەمانـــای دووەمـدا بـەكاردیٚ چونكـە عەلاقەو پەیوەندی هەیە لە نیٚوان مـــانای یەكـەم -كە حەقیـقەتە- و دوەمدا، بەمەش ناوی گوێزراوە -علمی منقول- چووەدەری پیٚناسەی مەجاز وەك: فـــەضل ، ناویٚكە گویٚزراوەیە، كراوە بەناو ، بیٚ ئەوەی لـەنیٚوان مانـای ئیٚسـتە و كۆنیـدا پەیوەنـــدی هەبیٚ، هەندیٚك لەزانا بەیانیەكان ئەمەشیان لەسەر پیٚناسەی مەجاز زیاد كردوە: ئەبیٚ قەرینەیەكیشی لەگەڵدا بیٚ ڕیٚبەری گـــویٚگر بكا كـە مەبەسـتی مانـای یەكـەمی ئـەو لـــەفظە نیە، ئەوە بـــۆ زیادیـان كـردووە؟ چونكـە لەســـەر ئـەو بۆچونـە ڕۆشـتون كـــە دەڵیٚ: صحـــیحە نیە تلفظ بـە لفظـیٚ بكـریٚ و مەبەســـتیش پـیٚی مانـا حـەقیقی و مەجـــازیش بیٚ پیٚكەوە.

(٢)لەمەی كە وشەی وەضع مانـای دووەمـی پیٚوە لكاوەو بیٚئەو نەووتراوە، بـــەلاٚم وشەی إستعمال مانای دووەمی پیٚوە نەلكاوە، لەمەوە ئەزانـــریٚ كە لەپـــیٚشـــا وەضع هەبووە بۆ مانای یەكەم ، ئەوە شتیٚكە هـەموو زانـــایان متفق و یەكڕان لەسـەری كە مـەجاز بەبیٚ ئەوە نایەتـەدی بەلاٚم ئیستعمالی ئەو لەفظە و بەكارهیٚنانی لـەو مـــانای یەكەمەدا واجب نیە لەپیٚشا لەودا بەكارهاتبیٚ، ئەمـــجا مەجازی، تیا دروست ئەبـــیٚ و یەتەدی، كەوابوو لازم ناكا بۆ جیٚبەجیٚ بونی مـــەجـــازیش حەقیقەت هـــەبیٚ، وەك لازم ناكا بۆ پەیدا بوونی حەقیقەت مەجاز هەبیٚ.

{وهو} اي عدمُ الوجوبِ {المختارِ} إذ لامانعَ من ان يتجوّزَ في اللفظِ قبلَ إستعمالهِ لهُ فيما وضعَ لهُ اولاً[1] وقيلَ: يجبُ سبقُ الإستعمالُ فيهِ وإلاّ لعرى الوضعُ الأوّلُ عن الفائدة، وأُجيبَ بحصولها بإستعماله فيما وضعَ لهُ ثانياً[2] وماذُكرَ من انهُ لايجبُ سبقُ الإستعمال {قيلَ: مطلقاً}[3] {والأصحُّ} تفصيلُ المصنِّف إختارهُ مذهباً كما قال في شرحِ المختصرِ، وهو انهُ لايجبُ {لما عدا المصدرِ} ، ويجبُ لمصدرِ المجازِ فلا يتحقّقُ في المشتقّ مجازاً إلاّ إذا سبقَ إستعمالُ مصدرهِ حقيقةً، وإنْ لم يُستعمل المشتقُّ حقيقةً كالرّحمن لم يستعمل إلاّ لله تعالى وهو منَ الرّحمة وحقيقتها الرّقّة والحنو المستحيلُ عليهِ تعالى وامّا قولُ بني حنيفةَ في مُسَيلمة رحمان اليمامة وقول شاعرهم فيهِ: سموتَ بالمجدِ يابنَ الأكرمين اباً * وانتَ غيثُ الورى لازلتَ رحماناً اي ذا رحمةٍ[4]

---

(١)ئەوەی کەلە پێشا بەکارنەهاتبێ لەمانای یەکەمدا وواجب نەبێ، ئەوە قەوڵێکی هەڵبژاردەو موختارە، چونکە هیچ مانع و ڕێگریەك نیە لەوەدا لەفظێك لە مەجازدا بەکاربهێنرێت پێش بەکارهێنانی لەمانای یەکەمدا. (٢)وترویشە واجبە لە پێشدا لەمانای یەکەماد بەکارهاتبێ، ئەگەر وانەبێ وەضع ودانانی یەکەم خاڵی ئەبێ لە سودو بێکەڵك دەبێ، وەلآم دراوەتەوە سودو کەڵکی لەوەدا بۆ پەیدا دەبێ کە بەکارهاتووە لەو مانا دووەمەدا بۆی دانراوە. (٣)ئەوەی کەباسکرا وترا واجب نیە لە پێشدا بەکار بهێنرێ، هەندێك وتویانە: بەمطلقی واجب نیە، واتە نەلە مصدر دا و نەلە غەیری مصدر دا.

(٤)ئەم باسە درێژە پێدانێکی ئەوی کە دانەر پێی هەڵساوە و بەمەذهەبێك و بۆچونێکی هەڵبژاردووە، لەهەموو بۆچونەکانی تر صەحیح ترە، وەك لە (شرح المختصر)دا وتوویەتی: ئەوەش بریتیە لەوە: کە لەپێشا بەکارهێنانی و ئیستعمالی واجب نیە لە بۆ هیچ شتێك جگە لە مصدر نەبێ، بەلآم مصدرێك کە بۆ مەجاز بەکار بێ، ئەبێ لە پیشا بەکارهێنرابێ لەمانای یەکەمدا ، کەوابوو مەجاز لە شتێکدا نایەتەدی مەگەر کاتێ مەصدەرەکەی لە پێشدا بۆ مانا حەقیقیەکەی بەکارهاتبێ، باوەکو ئەو موشتەقەش لە حەقیقەتدا بەکار نەهێنرابێ، وەك الرحمن تەنها بۆ خوا بەکارهاتووە، وشەی الرحمن لە رەحمەتەوە هاتووە، حەقیقەتی رەحمەتیش دڵ نەرمی و غەم خواردنە ، دڵیش بۆ خوا مەحاڵە جا چۆن (الرحمن) هەر بۆ خوا بەکارهاتووە، ئەوەنیە هۆزی حەنیفە بەموسەیلەمەی درۆزنیان وتووە: رحمان الیمامە میهرەبانەکەی یەمامە یاخود شاعیرێکی لەو

قال الزمخشري في تعنُّتِهم في كفرهم، اي إنّ هذا الإستعمالَ غير صحيحٍ دعاهُم إليه لجاجهم في كفرهم بزعمهم نبوّةَ مسيلمة دون النبيّ ﷺ كما لو إستعمل كافرٌ لفظةَ الله غير الباريءُ من آلهتهم، وقيلَ شاذٌ لاإعتدادَ بهِ، وقيلَ إنّهُ معتدٌ بهِ، والمختصُ بهِ المعرَّفُ بالّلام[1] {وهو} اي المجازُ {واقِعٌ} في الكلام {خلافاً للأستاذ} ابو إسحاق الإسفراييني {و}ابي علي {الفارسي} في نفيها وقوعَهُ {مطلقاً}، قالا وما يظنُّ مجازاً نحو: رايتُ اسداً يرمي، فحقيقةٌ {و}خلافاً {للظاهريَةِ} في نفيهم وقوعَهُ {في الكتاب والسّنَة} قالوا: لأنّهُ كذب بحسبِ الظّاهرِ كما في قولكَ في البليدِ: هذا حمارٌ وكلامُ الله ورسوله منزّةٌ عن هذا الكذب، وأُجيبَ بأنّهُ لاكذبَ مع إعتبار العلاقةِ وهي فيما نحن المشابهةُ في الصِّفَة الظاهرَة اي من عدمِ الفهمِ[2]

بارەیەوە دەڵێ: بەهۆی گەورەیی باپیرانەوە لەناو خەڵکدا بەرز بووەتەوە ئەی کوڕی بەڕێزترین کەس لەباوکەوە ، تۆ وەك باران بۆ خەڵکی بەسودی، دەك هەر بەمیهرەبانی بمێنیتەوە، (١)زمخشری لە وەڵامدا وتوویەتی: بەکارهێنانی رەحمان بۆ مسیلمە لەبەر ئەوە نەبووە عەرەب بۆ غەیری خوایان بەکارهێناوە، بەڵکو ئەوە لە کەللە رەقی و رۆچونیانەوە لەبێ باوەڕیدا، ئەوەیان وتووە ، واتە ئەم بەکارهێنانەیان صەحیح نیە ئەوە پاڵی پێوە ناون بۆ ئەو بەکارهێنانە هەر زۆر لە سنور لادانیانە لەبێ باوەڕیدا بەهۆی ئەوەوە کە بێبەڵگە باوەڕیان هەبوو بە پێغەمبەرایەتی موسەیلەمەو باوەڕیان نەبوو بە پێغەمبەر ﷺ هەندێکیش وتوویانە: ئیعتیباری پێئەکرێ بەلام ئەمە وەك ئەوە وایە کافرێك الله بەکاربێنێ بۆ غەیری خوا ، بۆ یەکێ لەبتەکانی بەکاربهێنێ هەندێکیش وتوویانە: بەکارهێنانی رحمان لە غەیری خوادا شاذە و هەر ئیعتباری پێناکرێ. هەندێکی تریش وتوویانە: ئیعتباری پێئەکرێ بەلام ئەوەی تایبەتە بەخواوە، ئەوەیە کە ئەلف و لامی بەسەرەوەیە نەك رەحمان بێ ئەل.

(٢)مەجاز لەناو کەلام و گفتو گۆدا هەیە، ئەم قسەش جیاوازە بۆ اسفراییینی و فارسی، کەئەم دووانە ئەڵێن مەجاز بە مطلقی هەر نەبووە چ لە کتاب و سوننەدا و چ لەغەیری ئەوانیشدا، هەردوکیان وتویانە: ئەوەی خەڵك وائەزانێ مەجازە، وەك: شێرێکم بینی، ئەوە حەقیقەتە، چونکە ئەو لەفظە بۆ ئەوەش بەکارهاتووە، وەبە جیاوازیشە بۆ ئەو زانایانە تەنها ظاهیر و رواڵەت دەخوێننەوە، دەڵێن: مەجاز تەنها لەکیتاب و سوننەدا نیە، چونکە مەجاز بەگوێرەی رواڵەت درۆیە وەك دەڵێن: بە گێلێك ئەم کەرە، دەخۆ کەر ئەبێ بە چوار لاق بڕوا ئەمیش وانیە، کەوابوو مەجاز درۆیە، دەخۆ کەلامی خوا و پێغەمبەر ﷺ دورە لەدرۆ ، وەلام دراوەتەوە: کە درۆ نیە

{وإنّما يعدلُ إليه} اي الى المجازِ عنِ الحقيقةِ الأصلِ {لثقَلِ الحقيقةِ} على اللسانِ كالخنفنيق إسمٌ للداهيّة يعدل عنهُ الى الموت {او بشاعتها} كالخراةِ يعدلُ عنها الى الغائطِ و حقيقتُهُ المكانُ المنخَفِض ، {او جهلها} للمتكلّم او المخاطَبِ دونَ المجازِ {او بلاغَتِهِ} نحو زيدٌ اسدٌ فإنَّهُ ابلغُ من شجاع، {او شهرتِهِ} دونَ الحقيقةِ {او غير ذلك} كإخفاءِ المُرادِ عن غيرِ المخاطبينَ الجاهلِ دون الحقيقةِ و كإقامةِ الوزنِ والقافيةِ والسَّجع بهِ دونَ الحقيقةِ[1] {وليس} المجازُ {غالباً على اللغات خلافاً لإبن جني} بسكون الياء معرب كني بينَ الكافِ و الجيم في قولهِ: إنَّهُ غالبٌ في كلِّ لغةٍ على الحقيقةِ اي ما من لفظٍ إلاّ و يستعملُ في الغالبِ على مجازٍ تقولُ مثلاً: رايتُ زيداً وضربتُهُ و المرئيُ والمضروبُ بعضهُ وإن كان يتألم بالضرب كلّه[2]

لەو کەلامەدا ئیعتیباری عەلاقەو پەیوەندی پەیوەندی رەچاو کرابێ تیایدا، لێرەشدا پەیوەندیە کە بریتیە: لەشت حاڵی نەبوون، هەردووکیان چون یەکن لەم صیفەتەدا، بەگوێرەی ظاهیرو رواڵەت، نەك چون یەکن لە ئەندامی لاشەیاندا.

(١)بێگومان هەتا بۆمان بکرێ هەر ئەبێ لەفظی حەقیقی بەکاربهێنین، چونکە ئەصل و بنەڕەتی گفتو گۆ لەسەر ئەوە بەرپا بووە، کاتێ لەو ئەصلە لائەدەین ئەبێ یەکێ لەم هۆیانە هەبێ: ١-لەبەر ئەوەی لەفظە حەقیقیەکە بەسەر زوبانەوە گران بێ، وەك: خەنفەنیق، دەڵێت: رجل میت. ٢-یالەبەر ئەوەی قسەکەر حەقیقەتەکە نازانێ بەڵام مەجازەکە دەزانێ. ٣-قسە لەگەڵ کراوەکەش وایە. ٤-یاخود حەقیقەتەکە ناشیرینەو روی مەجلیسی نیە، وەك وشەی: گوو لەباتی ئەم وشە لائەدەیت بۆ وشەی غائط لە حەقیقەتدا واتە جێگەیەکی نزم و نەوی. ٥-یاخود مەجازەکە زیاتر مەبەستەکەت دەگەیەنێ وەك: زید شێرە، زۆر مەبەست بۆ تۆ دەگەیەنێ بەرامبەرەکە ئەوەیە ئەیەوێ بڵێت: زەید ئازایە. ٦-یاخود مەجازەکە بە ناوبانگترە لە حەقیقەتەکە. ٧-یاخود غەیری ئەمانە وەك: شاردنەوەی مەبەستت لەگوێگران، هەر ئەبێ بەرامبەرەکەت تێبگا، کە ئەوانیتر مەجازەکە نازانن بەڵام حەقیقەتەکە ئەزانن. ٨-یاخود بەمەجازەکە وەزن و قافیەو سەجع دروست ئەبێ،بەڵام بە حەقیقەتەکە دروست نابێ.

(٢)لەناو هەموو زوبانەکاندا مەجاز زیاتر نیە لە حەقیقەت، بەپێچەوانەی إبن جنی -ئەم وشە عەرەبی نیە کراوە بەعەرەبی ئەصلەکەی گیتیە بەشێوەیێ بخوێنرێتەوەلەنێوان کاف و جیمدا بێ-ئەڵێ لە هەموو زمانەکاندا مەجاز لە حەقیقەت زیاترە، واتە هیچ لەفظێك نیە کە بە زۆری لەمەجازدا بەکار نەهێنرێ، بۆ وێنە ئەڵێ : زەیدم بینیو لێم دا، دەخۆ بینراوو لێدراو هەندێکی زەیدە،خۆ هەموو

{ولامعتمداً حيثُ تستحيلُ الحقيقَةُ خلافاً لأبي حنيفة} في قولِه بذلكَ حيثُ قال فيمن قال لعبدِه: الذي لايُولدُ مثلُهُ لمثلِه: هذا إبني إنّه يعتق عليه، وإن لم ينوي العتقَ الذي هو لازمٌ للبنوّةِ صوناً للكلام عنِ الإلغاء و الغيناهُ كصاحبيه إذْ لاضرورة الى تصحيحِه لما ذُكر، امّا إذا كان مثلُ العبدِ يولَدُ لمثلِ السّيدِ فإنّهُ يعتق عليه إتفاقَ إن لم يكنْ معروف النسَّبِ من غيرِه[1] وإن كان كذلكَ فأصحّ الوجهينِ عندنا كقولهم إنّهُ يعتقُ عليهِ مؤاخذةً باللازمِ وإنْ لم يثبتْ الملزوم[2] {وهو} اي المجاز {والنقلُ خلافُ الأصلِ} فإذا إحتمل اللفظُ معناهُ الحقيقَةَ والمجازيَّ او المنقول عنهُ و إليه فالأصل أي الرّاجحُ حملُهُ على الحقيقيِّ لعدم الحاجَّةِ فيه الى قرينَة، او على المنقولِ عنه استصحاباً للموضوعِ لهُ اولاً[3]

---

زەیدت نەبینیوە، یا لە هەموو لاشەی زەیدت نەداوە ، کە وابوو ئەبێ مەجاز بێ هەرچەند هەموو لاشەی ئازار ئەخوا بەهۆی لێدانەکەوە.

(١)مەجاز پشتی پێ نابەسرێ لەو شوێنەی حەقیقەت تیایدا مەحاڵە، بەلام ئەبی حەنیفە جیاوازە لەگەڵ ئەم بۆچونەدا، ئەم پشتی پێ بەستوە لەم جێیەدا، کەدەڵێ: کەسێ وتی بەبەندەکەی: ئەمە کورمە، کە تەمەنیان زۆر جیاواز بوو نە ئەگونجا کوری بێ، چونکە بە باپیری ئەم ئەشێ، ئەوە ئەو بەندەی لەسەر ئازاد ئەبێ، هەرچەند نیازی ئازادبوونیشی نەبێ، کە ئازاد بوون لازمی کوڕایەتیە، بۆیە ئازاد ئەکرێ چونکە کەلام و گفتوگۆی پێ ئەپارێزرێ لە پوچەڵ بوونەوە، چۆن ئەبێ نەمەجازبێ نەحەقیقەت بێ، بەلام ئێمەیش وەك دوو قوتابیەکەی ئەو کەلامە پوچەڵ دەکەینەوە، چونکە هیچ ضەرورەتێك نیە بۆ ئەوەی بەو شێوەی پێشوو راستی بکەینەوە، بەلام ئەگەر تەمەنی بەندەکە گونجاوبێ بۆ ئەوەی بەکوڕی ئەم بشێ ، ئەوە بەڕای هەموان ئازاد ئەبێ بەمەرجی ئەوە رەچەڵەکی ئەو بەندە نەزانرێ کەلەیەکێکی ترە (٢)خۆ ئەگەر وانەبوو ئەوە صەحیح ترین وەجە بەلای ئێمەوە، وەك بۆچوونی حەنەفیەکان: کە هەر ئازاد دەبێ، چونکە لازمەکەی لێ ئەگرین کەئازادبوونە، هەرچەند مەلزومەکەی نەسەلمێنراوبێ کە کوڕایەتیەکەیە.

(٣)ئەصل لەکەلامدا حقیقیە، بەلام مەجاز و نەقڵ خیلافی ئەصلە، کەوابوو ئەگەر لەفظێك ماناکەی بگونجێ بۆ حەقیقی و مەجازی، یاخود هەڵگرێ بڕێ بەسەر نەقڵ لێکراوەکەو نەقڵ بۆ لاکراوەکە، ئەوە ئەصل وایە، واتە راجح وایە ئەو لەفظە بڕێ بەسەر مانا حەقیقیەکەیدا، چونکە ئەم پێویستی بە قەرینە نیە، یاخود راجح ئەوەیە حەمل بکرێتە سەر نەقڵ لێکراوەکە، لەبەر ئەوەی بمێنێتەوە وەهاوڕێو هاو جوتی

مثالُها رايت اليومَ اسداً وصليتُ اي حيواناً مفترِساً، ودعوتُ بخيرٍ اي سلامةٍ منهُ ويحتمِلُ الرجلُ الشجاعُ و الصلاةُ الشرعيّة[1]

{و}المجاز والنقلُ {اولى من الإشتراكِ} فإذا إحتمل لفظٌ هو حقيقة في معنىً ان يكون في آخر حقيقةً و مجازاً ، او حقيقة و منقول فحملُهُ على المجازِ، او المنقولِ اولى من حمله على الحقيقَةِ المؤدى الى الإشتراكِ لأنّ المجازَ اغلبُ من الإشتراكِ بالإستقراء، والحملُ على الأغلبِ اولى، والمنقولُ لأفراد مدلوله قبلَ النّقلِ وبعدَهُ لايمتنعُ العملَ به والمشتركُ لتعدُّدِ مدلولِه لايعملُ به إلاّ بقرينةٍ تعيِّن احدُ معنييه مثلاً إلاّ إذا قيلَ بحمله عليهما، ومالايمتنعُ العمَلَ بِهِ اولى من عكسِه فالأولُ كالنكاحِ حقيقَةً في العقدِ مجازٌ في الوطء ، وقيلَ العكس، وقيلَ مشتركٌ بينهما فهو حقيقة في احدِهما، محتمل الحقيقَةِ والمجازُ في الأخيرِ [2]

---

ئەو یەکەم مانایەبێ لەیەکەم جارا بۆی دانراوە، (١)وێنە بۆ هەردوکیان: رایت الیوم اسداً وصلیتُ ، واتە گیانلەبەرێکی دورندەم بینی و دوعای خێرم کرد کە خوا سەلامەتم کا لەو شێرە، ئەمە مانای حەقیقی و نەقلْ کراوەکەیە، هەڵئەگرێ مەبەست پێی پیاوێکی ئازابێ و نوێژێکی شەرعی بێ.

(٢)مەجاز و نەقلْ چاکترن لە ئیشتراك، کەوابوو ئەگەر لەفظێك خۆی مانایەکی حەقیقی هەبوو، بەلاّم نە ئەگونجا مانایەکی تری هەبێ ئەم مانای دووەمە دروست بوو ناوی بنێی مانای حەقیقی –ئەوکاتە ئەبوو بە مشترك– وەبە مەجازیش یاخود مانای دووەمیش حەقیقی بێ، –لەگەڵ یەکەم ئەبێ بە مشترك– یا نەقلْ کراو بێ، ئەوە ئەو لەفظە حەمل بکرێتە سەر مانای مەجازی ، یاخود سەر مەنقولەکەی باشتر و چاکترە لەوەی حەمل بکرێ لەسەر مانا حەقیقیەکەی کەسەر ئەکێشێ بۆ ئەوەی ببێ بە مشترك ، چونکە مەجاز لە مشترك زۆرترە ، بەگوێرەی ئیستیقراء و خوێندنەوەی ئەوەی بەرچاو کەوتووە، حەمل کردنە سەر زۆر چاکترە، نەقلْ کراویش کارپێکردنی قەدەغەنیە چونکە نەقلْ دوای نەقلْ هەریەك تاکە مانای خۆی هەیە، بەلاّم مشترك لەبەر ئەوەی چەند مانایەکی هەیە کاری پێناکری، مەگەر قەرینەیەك هەبێ یەکێك لەماناکانی دیاریبکا، مەگەر کاتێ نەبێ لەسەر قەولی ئەوانە بێ کە دەڵێن: مشترك حەمل دەکرێ لەسەر هەردوو ماناکانی بەبێ قەرینە، دەخۆ ئەوەی کارپێکردنی قەدەغە نەبێ چاکترە لەوەی کارپێکردنی قەدەغە بێ، یەکەمیان کە بریتی‌یە لەو لەفظەی‌مانایکی حەقیقی هەبێ، لەمانایێکی تریدا حەقیقی یامەجازی بێ وەك:نکاح حەقیقەتە لە عەقددا مەجازە لە جیماعدا، بە پێچەوانەش وتراوە، واتە:حەقیقەتە

والثّاني كالزّكاةِ حقيقَةٌ في النّماءِ اي الزّيادَةِ محتملٌ فيما يخرجُ من المال لأنْ يكو حقيقَةً ايضاً اي لغويةً ومنقولاً شرعياً.[١]

{قيلَ} والمجازُ والنقلُ اولى {من الإضمار} فإذا احتمل الكلام ان يكون فيه مجازٌ و إضمار ، او نقلٌ و إضمار ، فقيلَ: حملُهُ على المجازِ او النقلِ اولى من حمله على الإضمارِ لكثرَةِ المجازِ وعدَمِ احتياجِ النّقلِ الى قرينة، وقيلَ: الإضمارُ اولى من المجا لأنّ قرينتَهُ متصّلةٌ والأصحُّ انّهما سيّانِ لإحتياجِ كلٍّ منهما الى قرينة ، وان الأضمار اولى من النقلِ لسلامَتِه من نسخِ المعنى الأوّلِ . مثالُ الأوّلِ قولَهُ بعدُهُ الذي يولَدُمثله لمثلِه المشهور النّسب من غيرِهِ هذا إبني اي عتيقٌ ، تعبيراً عنِ اللازم بالملزوم فيعتق او مثلُ إبني في الشّفقَةِ عليه فلا يعتقُ، وهما وجهانِ عندَنا كما تقدَّمَ[٢]

---

لەجیماعدا مەجازە لە عەقددا ، وەهەندێکیش وتویانە: مشترکە لەنێوان عەقد و جیماعدا کەوابوو بەڕای هەموان لەیەکێکیاندا حەقیقەتە، بەلاّم لەماناکەی تر ئەگونجێ حەقیقەتیش بێ و مەجازیش بێ، جا لێرەدا حەمل بکرێتە سەر مەجاز بەلای ئێمەوە چاکترە. (١)دووەمیان کە مانایەکی حەقیقی هەبێ و بگونجێ دانرابێ بۆ مانایەکی‌تر ، یانەقلٌ کرابێ، وەك زەکات ئەمە حەقیقەتە لە گەشە کردندا و زیاد بووندا، وەهەڵئەگرێ حەقیقەتیش بێ لەوەدا دەرئەهێنرێ و جیائەکرێتەوە لەماڵ و دەدرێ بە خەڵك ، واتە حەقیقەتێکی لوغەوی بێو نەقلٌ کراوێکی شەرعیش بێ.

(٢)وتراویشە مەجازو نەقلٌ باشترەو چاکترەو نزیکترە لە شاردنەوەو حەذف و لابردن، کەوابوو ئەگەر کەلامێك بگونجێ مەجازو شاردنەوەی تێدابێ، یاخود نەقلٌ و شاردنەوەی تێدابێ، ئەوە هەندێ وتویانە: حەمل کردن لەسەر مەجاز ، یاخود لەسەر نەقلٌ چاکترو نزیکترە لەوەی حەمل بکرێتە سەر شاردنەوەو حەذف، چونکە مەجاز لەناو گفتو گۆدا زۆرەو نەقلیش پێویستی بەقەرینە نیە، هەندێکی‌تر وتویانە: شاردنەوە چاکترو نزیکترە لەمەجاز ، چونکە قەرینەی ئیضمار لێی جیانابێتەوە، چونکە ڕاستکردنەوەی ڕستەکە داوای دەکا ، قەولی ڕاستتر ئەوەیە هەردوکیان چون یەکن لەبەر ئەوەی هەریەکێکیان بێ قەرینە نابێ و پێویستی پێی هەیە، بەلاّم شاردنەوە چاکترە لە نەقلٌ ، چونکە شاردنەوە سەلامەتە لە سڕینەوەی مانای یەکەم .{وێنە بۆ یەکەم} کەسێکی تەمەن چل ساڵە بە بەندەیێکی چوارساڵەی خۆی دەڵێ- وەبەرەچەڵەکیش بەناوبانگە کە هی یەکێکی ترە -: ئەوە کوڕمە، واتە ئازادە تلفظ بەملزوم دەکا -کوڕیەتیە- مەبەست پێی لازمە-کە ئازاد بوونە ، ئەمە مەجازە- یاخود وەك کوڕم وایە لەخۆشەویستیدا، دە ئەوە ئازاد نابێ، چونکە ئیضمارە ، ئەمانە دوو

ومثالُ الثّاني قولُهُ تعالى: ﴿ وحرّم الرِّبا ﴾ فقال الحنفي اي اخذهُ وهو الزيادةُ في بيعِ درهمٍ بدرهمينِ مثلاً ، فإذا إسقطتْ صحَّ البيعُ و ارتفعَ الإثم وقال غيرُهُ: نقلُ الرِّبا شرعاً الى العقدِ فهو فاسدٌ وإن اسقطَتِ الزيادةُ في الصَورةِ المذكورةِ مثلاً والإثمُ فيها باقٍ.[1]

{والتخصيصُ اولى منهما} اي منَ المجازِ والنقلِ فإذا إحتملَ الكَلامُ لأن يكونَ فيه تخصيصٌ و مجازٌ ، او تخصيصٌ ونقل فحملُهُ على التخصيصِ اولى. امَّا في الأوّلِ فلتعيينِ الباقي من العامِ بعدَ التخصيصِ . بخلافِ المجازِ فإنَهُ قد لايتعيَّنُ بأن يتعدَّدَ ولا قرينَة تعيّن، وامّا الثّاني فلسلامَة التخصيصِ من نسخِ المعنى الأوّلِ بخلاف النَقلِ، مثالُ الأوّلِ قولُهُ تعالى: ﴿ ولاتأكلوا مما لمْ يُذكر إسمُ اللهِ عليهِ ﴾، فقال الحنفيَّةُ اي مما لم يُتلفَّظ بالتَّسميةِ عند ذبحِهِ، وخصَّ منهُ الناسيَ لها فتحلُ ذبيحَتَهُ[2]

---

وەجهێن و دوو بۆچونن بەلای ئێمەوە. (١) {وێنە بۆ دووەم} خوا گەورە دەفەرموێ: ﴿وحرَّمَ الرِّبا﴾ ئەمە نەقلٚ و ئیضمارە واتە : (وحرَّمَ أخذ الزيادَة) ئەخذەکە ئیضمارەو شاراوەتەوە ، الربا بەواوی زیادەیە، واتە نەقلٚ کراوە، جا حەنەفی دەڵێ: خوای گەورە سود وەرگرتنی حەرام کردووە، کەبریتیە لە زیادەیێك کە دینارێك بە دوو دینارە، کەوابوو ئەگەر زیادەکەی وەرنەگرت بەیعەکە دروستەو گوناهەکەی نامێنێو رزگاری ئەبێ، بەڵام غەیری حەنەفی دەڵێت: الربا نەقلٚ کراوە لەلایەن شەرعەوە بەواتای عەقدە، کەوابوو خودی عەقدەکە فاسدە، هەرچەند زیادەکەش لابرێت، بەڵام گوناهەکەی هەرباقیەو ماوەتەوە –ئەمە ئیضماری تیادا نیە تەنها نەقلی تیایە–.

(١)تەخصیص و دەرکردنی هەندێ لەئەفرادی عام و تایبەت کردنی عامێك چاکترو نزیکترە، لەمەجازو نەقلٚ، یاکاتێك کەلامێك بۆ ئەوەی تخصیص و مەجازی تیاهەبێ، یاخود تخصیص و نەقلی تیادا هەبێ ئەوە حەمل کردنی لەسەر تخصیص چاکترە لە مەجاز، چونکە دوای تایبەت کردنی عامەکە ئەوەی ماوەتەوە دیاری‌یە، بەڵام بەپیچەوانەی مەجازەوە چونکە ئەم دیاری نیە، بۆیە لەدووەمدا تخصیص چاکترە لە نەقلٚ، چونکە تخصیص سەلامەتە لە سڕینەوەی مانای یەکەم ، بەپێچەوانەی نەقلەوە ئەم لە مانی یەکەم ئەسڕێتەوە، وێنە بۆ یەکەم: واتە کەلامێك تخصیص هەڵگرێ و وتایبەت کردنی باشترە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ولاتأكلوا مما لمْ يُذكر إسمُ اللهِ عليهِ ﴾ واتە: نەخۆن لەوەی ناوی خوای بەسەرەوە نەهێنرابێ، جا حەنەفی دەڵێن: واتە لەوەی (بسم الله) تلفظ نەکرابێ بەسەریەوە لەکاتی سەربڕینی‌دا، کەوتی: مما ، لەوەی ، لەفظێکی عامە، بۆ کەسێك ئەبێ بە عەمدی (بسم الله)ی نەکردبێ، کەوابوو

وقال غيرُهُ اي مما لم يُذبح تعبيراً عن الذّبح بما يقارنُهُ غالباً من التّسمية فلا تحلُ ذبيحتُهُ المتعمِّد لتركها على الأولِ دونَ الثّاني[1] ومثالُ الثاني قولُهُ تعالى: ﴿ واحلَّ اللهُ البيعَ ﴾ فقيلَ هو المبادَلَةُ مطلقاً و خصَّ منهُ الفائدَةَ لعدَم حله وقيلَ نقلَ شرعاً الى المستجمع لشروطِ الصحَّة، وهما قولانِ للشافعي مما شكَ في إستجماعه لها و يحلُ و يَصحُ على الأوّلِ لانّ الأصلَ عدمُ فساده دونِ الثّاني لانّ الأصلَ عدمُ إستجماعه لها ويؤخذُ مما تقدَّمَ من اولويَةِ التخصيصِ من المجازِ الأولى منَ الإشتراكِ والمساوي للإضمارِ انّ التخصيصَ اولى منَ الإشتراكِ والإضمارِ ، وانَّ الإضمارَ اولى منَ الإشتراك ومن ذكرَ المجازَ قبلَ النقلُ اولى منهُ ، والكلُ صحيحٌ[2]

---

ئەوەی لەبیری چوبێ سەربڕاوەکەی دەستی حەڵاڵە ، بەکورتی لای حەنەفی ئەم تخصیصە باشترە لە مەجاز (١)کە غەیری ئەو ئەڵێن: مەجازە، نەك تخصیص، واتە مما لم یذکر یانی مما لم یذبح، چونکە لەباتی ذبح ، شتێك وتراوە کە زۆربەی کات بەراوردی ئەکا لەگەڵیایەتی، کە (بسم الله) کردنە، لەبەر ئەوە سەربڕاوی کەسێك بەعەمدی (بسم الله) ی نەکردبێ حەڵاڵ نیە، چونکە (بسم الله) نەکردووە، بەڵام بەلای قەولی دووەمەوە حەڵاڵ نابێ، چونکە مەجاز باشترە لە تخصیص بەلای ئەمانەوە.

(٢)وێنە بۆ دووەم کە کەلامێکە تخصیص و نەقڵ هەڵئەگرێ ، ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: خوا بەیعی حەڵاڵ کردووە، جا هەندێ وتوویانە بەیع بریتی‌یە لە ئاڵ و وێڵ کردن بە مطلقی، بەیع لەفظێکی عامە گشت ئاڵ و گۆڕێك دەگرێتەوە، بەڵام کڕین و فرۆشتنی فاسد ناگرێتەوە، لەبەر ئەوەی حەڵاڵ نیە، بۆیە لەو عامە جیاکراوەتەوە، تەنها تایبەتە بەئاڵو وێڵیکی حەڵاڵ، هەندێکی‌تر وتویانە: لەمانا لوغەویەکەوە نەقڵ کراوە بۆ کڕین و و فرۆشتنێ هەموو مەرجەکانی دروستی بەیعی کۆکردبێتەوە، ئەم دوو قەولە هەردوکیان هی شافعین، ئەم جیاوازیە چ سودێکی هەیە؟ جا ئەوەی گومانی هەبێ لە بوونی هەموو مەرجەکانی دا حەڵاڵە و صحیحە لەسەر قەولی‌یەکەم ، چونکە ئەصل ئەوەیە بەیع فەساد نەبێ، بەڵام بەلای دووەمەوە حەڵاڵ نیە و صحیح نیە، چونکە ئەصل ئەوەیە بەیع هەموو مەرجەکانی تیادابێ.

(٣)ئەوەی لەوەی پێشوو وەرئەگیرێ کە بریتی‌یە: لە تخصیص چاکترە لەمەجاز، کە ئەمیش باشترە لە ئیشتراك، مەجازیش یەکسانە بۆ ئیضمار - تخصیص باشترە لە ئیشتراك و ئیضمار، و ئیضماریش باشترە لە ئیشتراك، وەلەباس کردنی مەجاز پێشی نەقڵ ئەوە وەرئەگیرێ کە مەجاز باشترە لە نەقڵ.

ووجهُ الأخيرِ سلامَةُ المجازِ من نسخِ المعنى الأوّلِ قيلَ: النقلُ أولى منهُ ، وقد تمَّ بهذهِ الأربعة العشرة اللتي ذكروها في تعارضٍ ما يخِلُّ بالفهم[1] مثالُ الأوّلِ قولُهُ تعالى: ﴿ ولاتنكحوا ما نكحَ آباؤكم من النّساءِ ﴾، فقال الحنفيّ: اي ما وطئوهُ ، لأنّ النكاحَ حقيقَةٌ من الوطءِ فيحرُمُ على الشخصِ مزنيَّةُ ابيهِ وقال الشافعي: اي ماعقدوهُ عليهِ فلاتحرم، ويلزمُ الأوّلُ الإشتراكَ لما ثبتَ من انَّ النِّكاحَ حقيقَةٌ في العقدِ لكثرَةِ إستعمالِهِ فيهِ ، حتّى انَّهُ لم يَرِدْ من القرآنِ لغيرِهِ، كما قالَ الزمخشري اي من غيرِ محلِ النِّزاعِ نحو: ﴿ حتّى تنكحَ زوجاً غيرَه ﴾،﴿ فانكحوا ما طابَ لكم ﴾ ويلزَمُ الثّاني التخصيص حيثُ قالَ تحلُّ للرَّجُلِ من عقدَ عليها ابوهُ فاسداً بناءً على تناولِ العقدِ للفاسدِ كالصّحيحِ و قيلَ لايتناولُهُ[2]

---

(١)بەڵگەی کۆتایەکەیان-مەجاز چاکترە لە نەقڵ- ئەوەیە مەجاز سەلامەتە لە سڕینەوەی مانای یەکەم، بەڵام نەقڵ وانیە ئەم مانای یەکەمی ئەسڕێتەوە. بەبەیان کردنی ئەم چوارە ، ئەو دەشوێنەی زانایان باسیان کردوون تەواو ئەبن ، کەباسکراون بەگژیەکداچوون و خەلەل و نوقصانی پەیدا ئەکەن لە حاڵی بوون و تیگەیشتنی مرۆڤدا، ١-بەگژیەکدا چوونی مەجاز و ئیشتیراك. ٢-نەقڵ و ئیشتیراك.٣-مەجازو ئیضمار. ٤-نەقڵ و ئیضمار. ٥-تخصیص و مەجاز. ٦-تخصیص و نەقڵ. ٧-تخصیص و ئیشتیراك. ٨-تخصیص و ئیضمار. ٩-ئیضمار و ئیشتیراك. ١٠-مەجازو نەقڵ.

(١)وێنەی جۆری یەکەم -تخصیص باشترە لە ئیشتراك-لەو چوار جۆرە، خوای گەورە دەفەرموێ: مارەی مەکەن ئەو ژنەی باوکتان نیکاحی کردووە، جا حەنەفی دەڵێ: مانکح یانی ماوطئوە، ئەو ژنەی باوکتان جیماعی لەگەل کردووە، چونکە نیکاح حەقیقەتە لە جیماعدا، کەوابوو ئەو ژنەی باوکی زینای کردووە لەگەڵی حەرام ئەبێ لەسەری ، چونکە باوکی جیماعی لەگەڵ کردووە، بەڵام شافعی دەڵێ: مانکح یانی ما عقدوا علیە ، ئەو ژنەی مارەکردبێ و عەقدی کردبێ نەك جیماع ، کەوابوو ئەوژنەی باوکی زینای لەگەڵ کردووە حەرام نابێ، چونکە مارەی نەکردووە ، ئەبێ قەولی یەکەم بڵێ: نکاح لەفظێکە مشترەکە ، چونکە سەلمێنراوە وەك حەقیقەتە لە جیماعدا حەقیقەتیشە لەعەقددا، لەبەر ئەوەی کە زۆر بەکار هاتووە لە عەقددا ، هەتا لە قورئاندا بۆ غەیری عەقد نەهاتووە-وەك زمخشری ئەڵێ- واتە دەڵێ: جگە لەم جێگەیە نەبێ کەجێ کێشەی زانایانە، وەك ئەم دوو ئایەتەش ، ئەوانیش جێی کێشەن: ﴿ حتّى تنكحَ زوجاً غيرَه ﴾ ﴿ فانكحوا ماطابَ لكم ﴾ ، وەنەبێ قەولی

ومثالُ الثّاني قولُهُ تعالى: ﴿ ولكم في القِصاصِ حياة ﴾ اي من مشروعيّتِهِ، لأنّ بهِ يحصلُ الإنكفاف عنِ القتلِ فيكون الخطابُ عاماً ، او في القصاصِ نفسِهِ حياةٌ لورثة القتيلِ المُقتصِّين بدفعِ شرِّ القاتلِ الذي صارَ عدواً لهم، فيكونُ الخطابُ مختصاً به ومثالُ الثّالثِ قولُهُ تعالى: ﴿ واسئلِ القريَةَ اي اهلَها ﴾ وقيلَ القريَةُ حقيقةً في الأهلِ كالأبنيَةِ المجتَمعَةِ لهذهِ الآيَةِ وغيرِها نحو: فلولا قريَةٌ كانتْ آمنتْ.[٢] ومثالُ الرّابعِ: قولُهُ تعالى: ﴿ واقيموا الصّلاةَ ﴾ اي العبادةَ المخصوصةَ فقيلَ هي مجازٌ فيه عنِ الدّعاء بخيرٍ لإشتمالِها عليه، وقيلَ نقلَتْ إليها شرعاً[٣]

---

دووەم بڵێ: نیکاح لەفظێکە تخصیص کراوە، چونکە ئەڵێ: ئەوژنەی باوکی بەغەڵەت مارەی کردووە حەڵاڵە بۆی ئەم قسەیە لەسەر ئەوەدروست کراوە کە عەقد گشتگیرە بو عەقدی غەڵەتیش،وەك عەقدی صەحیحیش دەگرێتەوە، هەندێکیش وتویانە عەقدی غەڵەت و فاسید ناگرێتەوە.

(١)وێنە بۆ دووەمی چوارەمەکان کە تخصیص و ئیضمارە-تایبەت کردن و شاردنەوە- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ولكم في القِصاصِ حياة ﴾ ژیانتان لە کوشتنەوەی بکوژدایە، واتە هەندێ دەڵێ: شاردنەوەی تێدایە، بەم شێوەیە في مشروعيةِ القصاصِ کردنی بەدەستور ، چونکە کوشتنەوەی مجرم کرا بەدەستور . وازهێنان و ڕێگرتن لە کوشتن دروست دەبێ، کەوابوو وشەی (لكم) بۆ کەس و کاری کوژراوەکە نیە، بەڵکو ڕوو لەهەموو کەس ئەکا ، یاخود ژیانتان لە خودی کوشتنەوەکەدایە ، بەڵام (لكم) تایبەتە بەکەس و کاری کوژراوەکەوە کە کوشتنەوەیان بەدەستە، ژیان بەهۆی لابردنی شەڕی ئەو بکوژەی بووە بە دوژمنیان ، کەوابوو ئەم فەرموودەیە تایبەتە بەوان. (٢)سێهەم لە چوار جۆرەکە کە ئیضمار و ئیشتراکە واتە شاردنەوە ئیشتراك، ، خوای گەورە دەفەرموێ: واسئلِ القريَةَ، پرسیار لە دانیشتوانی ئەو دێ بکە، واتە بە ئیضمار کردنی وشەی ، اهل، وەهەندێکیش وتوویانە وشەی قریە حەقیقەتە لە دانیشتوانیدا، وەك حەقیقەتیشە لەچەند خانو بەرەیەکی بەدەم یەکەوە بوودا، کەوابوو قریە مشترکە بەڵگەش ئەم ئایەتەیەو ئایەتی تریش وەك: ﴿فلولا كانتْ قريَةٌ آمنتْ ﴾.

(٣)وینە بۆ جۆری چوارەم لەچوار جۆرەکە ئەم ئایەتەیە دەفەرموێ: ﴿ واقيموا الصلاة﴾ واتە: ئەوبەندایەتیەی کەتایبەتە بەهەندێ قەول و گوفتار و ڕەفتاری تایبەتەوە-نوێژ- بەرپای بکەن ، ئەمە مەجازە ، بۆیە هەندیك وتویانە: نوێژ مەجازە لەوعیبادەتە تایبەتەدا، لەدوعاو داوای بەخەیرەوە هاتووە، چونکە نویژ

{وقدْ يكونُ} المجازُ من حيثُ العلاقةُ {بالشكلِ} كالفـرسِ لصورَتهِ المنقوشَةِ[1] {او صفة ظاهرةٌ} كالأسَدِ للرجُلِ الشّجاعِ دون الرّجلِ الأبخَرِ لظهورِ الشّجاعَةِ دونَ البُخرِ في الأسَدِ المفترِسِ[2] {او بإعتبارِ ما يكونُ} في المستقبَلُ {قطعاً} نحو: إنّك ميّتٌ[3] {او ظنّاً} كالخمرِ للعصيرِ[4] {لاإحتمالاً} كالحرّ للعبدِ فلا يجوزُ[5] امّا بإعتبار ماكان عليه قبلُ كالعبدِ لمنْ عُتقَ، فتقَدّمَ في مسألَةِ الإشتقاقِ[6] {وبالضدِّ} كامازة للبريَّةِ المهلكَةِ،[7] {والمجاورَةِ} كالرّاويَةِ لظَرفِ الماءِ المعروفِ، تسميَةً لهُ باسمِ مايحملُهُ من جملٍ او بغلٍ او حمارٍ[8]

---

دوعای خەیریش دەگریتەوە ، وەهـەندێکیش وتویانـە : صـلاه ، نویـژ ، نـەقل کـراوە لەدوعای بەخـەیرەوە بۆخـواپەرستیەکی تایبەتی بەنەقڵێکی شەرعی، ئەمەش نەقڵە.

(١)جاری واهەیە مـەجاز لـەروی عەلاقـەو پـەیوەندیـەوە لەیەك ئەکـەن لـە شـکڵدا وەك وێنـەی ئەسپێك بەسـەر دیوارێکـەوە نـەخش بکریٚ ئـەم وێنـە مـەجازە ، ئەشـوبهیٚ بـە ئەسپە حەقیقیەکەوە لـە شـکڵدا. (٢)جـاری واهـەیە پـەیوەندی نێوان مانـای حـەقیقیو مانای مەجازی بەهی سیفەتێکەوە کە دیارەو لە دوورەوە خەڵـك هەستی پیٚ دەکـات، وەك شێر دەوترێـت بۆ پیاوێکی ئازاو دلێر ، نەك بۆ پیـاوێك بۆنی دەمی بیٚ چونکە دلـێری سـیفەتێکی دیـارە، بـەلاّم بۆنـی دەم دیـار نیـە ، هەردوکیـان لـە شـێری درندەداهەن.

(٣)جاری واهەیە پەیوەندیەکەیان بە ئیعتیباری صیفەتێك کەلـە مـەودوا دەبێـت، جا ئیتر ئەو صیفەتە بێگومان دێتە دی وەك: ﴿ إنّك ميّتٌ ﴾ئـەی پێغەمبەر ﷺ بێگومـان تۆ مردویت. (٤)یاخود لەوانەیە بێتە دی وەك بە گوشراوێك بوتریٚ خەمر ، عەرەق، کە لەوانەیە بکریٚ بە عـەرەق. (٥)نـەك بە خـەیالٚ بلـیٚ لەوانەیە و هیـچ بەڵگەیـەکی نـەبیٚ ، وەك بەبەندەیێك بلٚیٚ: ئازاد ، ئەمە مـادام قطعی نیـە ١٠٠/١٠٠ یاظنی‌نیە ٥٠/١٠٠ ، بەڵکو ئیحتمالی هەیە ٢/١ ئەمە دروست نیە ئەم بەکارهێنانە.

(٦)بەلاّم ئەگەر بەگوێرەی رابوردوو ببێت، وەك بەکارهێنانی وشەی بەندە بۆ کەسێك کە پێشتر بـەندە بوویـیٚ ئـازاد کرابـیٚ، ئـەوە لەباسـی ئیشـتقاقدا پێشـتر بـاس کـرا، (٧)یـاخود عەلاقەکـەیان دژایەتیـە وەك بـەکارهێنانی وشـەی (مفـازة) بـۆ دەشـت و سارایەکی کوشندە (مفازة) خۆی بەمانای جیٚی رزگاریە، بەلاّم ئێستە بۆ جێگایـەکی فەوتێنـەر بەکاردیٚ، بۆ تفاؤل وایان وتـوە، وەك سلیم بۆ مـاران گـاز بـەکار دەهێنـن. (٨)یـاخود پەیـوەندیەکەیان دەراوسـیٚ بوونـە وەك بـەکارهێنانی وشـەی راویـە ، بـۆ کونەی ئاو دەبیٚ، بۆیە پێشـی دەوتریٚ: (راویە) چونکە بەهۆی هەڵـگرەوەکەیەتـی،

{والزيـادّة} نحو ﴿ ليس كمثلِه شيئ ﴾ كالكاف الزائـدَة ، وإلاّ فـهي بمعنـى مثـل. فيكون له تعالى مثل وهو محالٌ والقصدُ في هذا الكلام نفيُهُ[1] {والنقصان} نحو ﴿واسأل القريَةَ ﴾ اي اهلَها فقدْ تجوزُ اي توسعُ بزيادَةِ كلمَةٍ او نقصِها و إن لم يصدُق على ذلك حدُّ المجازِ السابقِ وقيلَ يصدُقُ عليه حيثُ إستعمَلَ نفيُ مثل المثلِ في نفي المثل وسؤالُ القريَةِ في سؤالِ اهلِها وليسَ ذلكَ من المجازِ في الإسناد[2] {والسَّبَبُ للمسَّبب}. نحو: للأميرِ يدٌ اي قدرةٌ فهي مسببَةٌ عنِ اليدِ بحصولِها بها[3] {والكلُّ للبعضِ} نحو: ﴿ يجعلون اصابعهم في آذانهم ﴾ اي اناملهم[4]

---

مانا حەقیقیەکەی وشتر یا هێستر یا گوێدرێژەکەیە هەڵی دەگرێ، مانا مەجازیەکەشی کونەو تەنەکە ئاوەکەیە. (١)یا مەجازەکە بەهۆی زیادەوە دەبێ وەك: ﴿ ليس كمثله شيئ ﴾ هیچ شتێك وێنەی خوا نیە کەوابوو کافەکە زیادەیە، چونکە ئەگەر زیادەنەبێ ئەو کاتە کافەکە بەمانای مثلە واتە خوا مثلی مثلی نیە، بەڵام مثلی هەیە، دەخۆ مثلیش بۆ خوا مەحاڵە مەبەستەکە بەم رستەیە نەفی وێنەو مثلی خوایە –وتی مثلی مثلی نیە، واتە خوا نیە، چونکە مثلی مثلەکە خوایە–

(٢)یامەجازەکە بەهۆی ناتەواوی رستەکەیە بەوشەیێك یا چەند وشەیێك ، ﴿ واسألِ القريَةَ ﴾ واتە پرسیار لە دانیشتوانی ئەو ئاواییە بکە، ئێستە وشەی اهل، نوقصانە، لەم دوو مەسئەلەدا، زیادەو نوقصاندا هەموو وشەیەکیان لەمانای خۆیان دا بەکارهاتوون، دەخۆ مەجاز ئەوەیە لەمانای حەقیقەتدا بەکار نەهاتبێ، چونك جاری واهەیە فراوانییەك لەمەجازدا دەگیرێتە بەر بەهۆی زیادکردنی وشەیەك یاخود بەهۆی نوقصانی وشەیەك، هەرچەندە پێناسەی پێشوی مەجاز بەسەر ئەم زیادەو نوقصانەدا نابڕێ، هەندێك وتویانە: ئەو پێناسە دەبڕێ بەسەریدا ، چونکە نەفی مثلی مثلی بەکارهێناوە لەنەفی مثلدا وەپرسیاری لەدێ بەکارهاتووە لەپرسیار لە دانیشتوانیدا، ئەمە مەجازی مرکبە ، ئێمەیش باسمان لە مەجازی ئیفرادە ؟ ئەمە مەجازی ئیسناد نیە چونکە هەموو شتێك بۆ خۆی بەکارهاتووە.

(٣)جاری واهەیە پەیوەندی نێوانیان، وتنی هۆیەو مەبەست پێی مسببەب و سەبەب کارەکەیەتی، وەك دەڵێیت: ئەمیر دەستی هەیە واتە توانای هەیە، چونکە توانا مسببە لە دەستەوەو بەهۆی دەستەوە پەیدا دەبێ، بەکورتی سەبەب وتراوەو مسبب مەبەستە، (٤)یاخود عەلاقەکەیان عەلاقەی نێوان کل و بعضە، واتە تلفظ بە کل دەکەیت و مەبەست پێی هەندێکیەتی ، وەك پەنجەکان ئەئاخنە ناو گوێیان خۆ هەموو پەنجەکانیان ناکەن بەناو گوێیاندا، بەڵکو هەر پەنجەیەکیان.

{والمتعلّقُ} بكسرِاللام {للمتعلَّق} بفتحها،﴿ هذا خلقُ اللهِ ﴾ اي مخلوقهُ، ورجلٌ عدلٌ اي، عادلٌ[1] {وبالعكوسِ} اي المسبَّبِ للسّببِ كالموتِ للمرضِ الشّديدِ لأنـهُ مسبَبٌ لـهُ عادةً، والبعضُ للكلّ نحو: فلانٌ يملكُ ألف راسٍ من الغنمِ و المتعلّقُ بفتحِ اللّامِ للمتعلِّقِ بكسرِاللّامِ نحو: ﴿ بأيّكم المفتون ﴾، اي الفتنةِ، وقم قائماً اي قياماً[2] {وما بالفعلِ على ما بالقوّةِ} كالمسكرِ للخمرِ في الدنّ[3] {وقد يكونُ} المجازُ {في الإسنادِ} بأن يسنَدَ الشيئُ لغيرِ من هوَ لـهُ للملابَسَةِ بينَهما نحو: قولِه تعالى: ﴿ وإذا تليَتْ عليهم آياتُـهُ زادتهم إيماناً ﴾ اسندَت الزّيادةُ وهي فعلُ الله تعالى الى الآياتِ لكونِ الآياتِ المتلوَّةِ سبباً لها عادةً[4]

---

(١)یاخود تلفظ بە متعلق دەکەیت مەبەست پێی متعلقەکەی، وەك ﴿ هـذا خلـق الله﴾ واتە مەصدەرەکە بەمانای مەخلوقە ، یارجلٌ عدلٌ بەمانای عادیلە ، مەبەست بە تعلق یانی متعلقەکە بکرێ بە وەصف ، ماناکەی قیامی بەوەوە بێ.

(٢)یاخود بە پێچەوانەی ئەمانەوە هەمە :یان واتە مسبب ئەڵێیت مەبەست سەبەبە، وەك بەکارهێنانیمردن بۆ نەخۆشیەکی کوشندە، چونکە زۆرکات مردن بەخۆی نەخۆشیەوە ئەبێ، یا تلفظ بە جوزء دەکەیت و مەبەست پێی کوللە وەك: فلانەکەس هەزار سەر مەڕی هەیە، لێرە سەر وتراوە مەبەست مەڕەکە هەموویەتی، یـا متعلـق دەڵێیت و مەبەست پێی متعلقە وەك: مەفتونی بەکامتانەوەیە ، ئەم مەفتونە مەبەست پێی فتنەیەکە بەمانا شێتە، ئەمە بۆ ئیسمی مەفعول، بەڵام وقم قائما ئیسمی فاعیلی بەمانا مەصدەرەواتە قائماً حالٌ نیە، بەڵکو مەفعولی مطلەقە. (٣)یاجاری واهەیە تلفظ بالفعل دەکەیت و مەبەست بالقوەیە ، وەك: بەکارهێنانی وشەی مسکر بۆ شەرابێك هێشتا لە کوپەکەدایە ، چونکە ئیستعدادی ئەوەی هەیە بێ بە مسکر ، ئەمە لەگەڵ ئیعتباری ماسیکون جیاوازە، چونکە ماسیکون بەخودی خۆی بەیەکەم هەنگاو ئەبێ، بەڵام ئەمە ئیسکار ناکا، بەڵکو قۆناغێکی تری هەیە کە ئەبێ بخورێتەوە،

(٤)تائێرە مەبەستی مەجاز موفرەد بوو، لەمەوداو باسی مرکبە، دەڵێ: جاری واهەیە مەجاز لە ئیسناد دایە، بەم شێوە شتێك بدرێتە پاڵ کەسێك لە حەقیقەتدا نەدرێتە پاڵ ئەو ، بۆیە ئەدرێتە پاڵیشی لەبەر ئەوەی لە حەقیقەتدا پەیوەندیەك هەیە لە نێوان ئەو شتەو ئەو کەسەدا، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر کاتێ ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ئەو ئایەتانە ئیمانیان زیاد دەکەن، چونکە عادەت وایە خوێندنەوەی ئایات هۆی زیاد بوونی ئیمانە، واتە ئایات و ئیمان عەلاقەیان هەیە.

{خلافاً لقومٍ} في نفيهم المجازَ في الإسناد، فمنهم من يجعلُ المجازَ فيما يذكرُ منه في المسنَد ومنهم من يجعلُهُ في المسنَدِ اليهِ ، فمعنى زادتهم على الأوّلِ إزدادوا بها، وعلى الثّاني زادهم اللهُ تعالى إطلاقاً للآياتِ عليهِ تعالى لإسنادِ فعلهِ إليها.[1]

{و}قد يكونُ المجازُ {في الأفعالِ والحروفِ وفاقاً لإبن عبد السلام و النقشواني} مثاله في الأفعالِ ، ﴿ ونادى اصحابَ الجنَّةِ ﴾ اي يُنادي ﴿ واتبعوا ماتتلوا الشياطينُ ﴾ اي تلتْهُ ، وفي الحروفِ ﴿ فهل ترى لهم من باقيَة ﴾[2]

{ومنع الإمام} الرّازي {الحرفَ مطلقاً} اي قال: لايكونُ فيهِ مجاز إفرادٍ لا بالذّات و لابالتتبُعِ لأنَهُ لايُفيدُ إلاّ بضمّهِ الى غيرِهِ ، فإن ضمّ الى ماينبغي ضمُّهُ اليهِ فهو حقيقةٌ او الى ما لاينبغي ضمُّهُ اليه فمجازٌ تركيبٍ،[3]

(١)بەڵام بەپێچەوانەی تاقمێك كە نەفی مەجاز دەكەن لە ئیسنادو مركبدا، جائەم تاقمەش هەندێكیان وەك ئیبن حاجب ئەو كەلامەی مەجازی تیابێ مەجازەكە لە موسنەددا دروست دەكەن، وە هەندێكی تریشیان وەك سكاكی مەجازەكە نە موسنەدو ئیلەیهیەكەدا دروست دەكەن، كەوابوو مانای ئایەتەكە بەگوێرەی بۆچونی بەشی یەكەم: (زادتهم) ،یانی (إزدادوا بها)، لەسەر بۆچونی دووەمیش (زادتهم) ،یانی (زادهم اللهُ)، ئیبن حاجب و پێرەكەی زادەی متعدی بەلازم مانا دەكەن، سەكاكی وپێرەكەی ئایەت بە خوا مانا دەكەن، مەبەست بە ئایات خوایە، چونكە قەرینەكەش فعل و كاری خوایی زادەیە دراوەتە پاڵ ئایەتەكان.

(٢)جاری واهەیە مەجاز لە فیعل و حەرفیشدا ئەبێ، موافقە لە بۆ قەولی ئین و عەبدوسەلام و نەقشەوانی ، مەجاز لە فیعل دا وەك:﴿ ونادى اصحابَ الجنَّةِ ﴾ نادی فیعلی ماضیە هێشتا نەچوەتە ناو بەهەشت، دەئەمە مەجازە بۆ مانای خۆی بەكارنەهاتووە، بەڵكو بەمانا ینادی یە، بەڵام میثالی مضارع بەمانا ماضی بێ وەك:﴿واتبعوا ماتتلوا الشياطينُ ﴾ تتلوا واتە: ئەیخوێننەوە خۆ ئەوان شوێنی شتێك كەوتوون كە خوێنراوەتەوە، نەك ئەخوێنرێتەوە، كەوابوو تتلوا بەمانا تلتە ، مەجاز لە حەرفیشدا وەكو: ﴿ فهل ترى لهم من باقيَة ﴾ ئەم هەلە لەمانای خۆیدا بەكار نەهاتووە، بەڵكو بەمانای مای نافیەیە، ئیستفهامی ئینكارییە. (٣)رازی مەجازی لە حەرفدا قەدەغەكردوە بەمطلقی ، واتە وتویەتی مەجاز لە موفرەدو حەرفدا نابێ، نەئەصل ئەبێ و نەبە پاشكۆیی ئەبێ، چەنكە حەرف خۆی تەنها سود نابەخشێ مەگەر بیلكێنی بە شتێكیترەوە، چونكە ئەگەر بلكێ بە شتێكەوە كە پێویست بێ بلكێ پێیەوە ئەوە حەقیقەتە ، یاخود بلكێ بە شتێكەوە كە پێویست نەبێ بلكێ

قال النقشواني من اينَ انهُ مجازٌ تركيبٍ بل ذلكَ الَضمُّ قرينةُ مجازِ الإفرادِ نحو: قوله تعالى: ﴿ ولأصلبنَّكم في جذوعِ النَّخلِ ﴾ اي عليها[1] {و}منع ايضاً {الفعلَ والمشتقَّ} كإسمِ الفاعلِ فقال: لايكونُ فيهما مجازٌ {إلاّ بالتَّبَعِ} للمصدرِ اصلهما، فإن كانَ حقيقةً فلا مجازَ فيهما. واعترض عليهِ بالتجوزِ بالفعلِ الماضي عنِ المستقبَلِ والعكس كما تقدّمَ من غيرِ تجوزٍ في اصلِهما ، و بأنّ الأسمَ المشتقَّ يُرادُ بهِ الماضي والمستقبَلَ مجازاً كما تقدّمَ من غيرِ تجوزٍ في اصلِه، وكأنّ الإمام فيما قالَهُ نظر الى الحدَثِ مجرداً عن الزمان[2]

---

پێوەلکاندنی، ئەوە مەجازی مرکبە، (١)نەقشەوانی وتوویەتی: لە کوێوە ئەو کەلامەی حەرفی تیادابێ ناوت نایە مەجازی مرکب، ،نەخێر بەڵکو ئەو لکاندنە قەرینەیە لەسەر ئەوە کە مەجازی موفرەدە ، وەك: خوا دەفەرموێ: سوێند بەخوا هەمووتان هەڵدەواسم بەسەر دارخورماوە، لەم ئایەتەدا في حەرفە حەرفیش نەئەبێ بە مسند، نەئەبێ بە مسند الیە، في بۆ ظرفیەتە بەڵام لێرەدا بۆ ئیستعلاء بەکار هاتووە، لەبەر پەیوەندییەك لە نێوانیاندا هەیە، کە بریتی‌یە لە چەندێ ظرف بەسەر مظروفەکەدا زاڵە، ئەوانیش ئەوەندە زاڵن بەسەر هەڵواسینیاندا، کەوابوو (في) لەمانای خۆیدا بەکارنەهاتووە، چونکە جذوع نایەڵێ.

(٢)دووبارە رازی لە فیعل و موشتەقیشدا مەجازی قەدەغە کردووە، وەك: ئیسمی فاعیل بەم شێوە وتویەتی: لەهەر دووکیاندا مەجاز نیە مەگەر بکرێن بەپاشکۆ بۆ ئەصلەکەیان کە مەصدەرە ، جا ئەگەر مەصدەرەکەیان لە حەقیقەتدا بەکار هاتبوو ئەوە فیعل و موشتەقەکەش مەجازیان تیادا نیە، وەئەگەر مەجازی بێ ئەوانیش مەجازیان تیا ئەبێ، رازی لەسەر ئەم قسەیە رەخنەیەکی لێگیراوە ، کە فیعلی ماضی لەباتی مضارع وتراوە بەمەجاز، وەبە پێچەوانەشەوە، وەك لەپێشەوە رابورد ، بێ ئەوەش مەجاز لە مەصدەرە ئەصلەکەیاندا دروست بێ -واتە نادی بەمانا ینادی بووە بەڵام مەجازیش لە نداء دا نەبوو- وە ئیسمێك دروست کرابێ لە ئەصلێك وەك ئیسمی فاعیل ، مەبەست پێی بەمەجاز ماضی یا داهاتوو بێت، وەك کەمێك لەمەوپێش رابوورد، بێ ئەوەیش ئەصلەکەی مەجازی تیادا بێت، -وەڵامی رەخنەکە- رازی ئەوەی کە ووتی: وای داناوە و چاوی هەر لە حدث وکارەکە بێ ، بێ ئەوەی بیری لە نیسبەت و زەمانەکە کردبێ، حدثی روت لە زەمان ، ئەو قسەی رازیەی بەسەردا دەبڕێ و بەس.

{ولايكونُ} المجازُ {في الإعلام} إنَّها إن كانت مُرتَجلَةً اي لم يُسبقْ لها إستعمالٌ في غيرِ العلميَّةِ ، كسعاد، او منقولَةً لغيرِ مناسَبَةٍ كفضل فواضحٌ او لمناسبَةٍ كمن سمّى ولده بمبارك لماظنَّهُ فيه من البركَةِ فكذلكَ لصحَّةِ الإطلاقِ عندَ زوالِها.[1]

{خلافاً للغزالي في متلمَّحِ الصِّفَةِ} بفتحِ الميمِ الثّانيَةِ ، كالحرثِ فقالَ إنَّهُ مجازٌ لأنّه لايُرادُ منهُ الصفة ، وقد كان قبلَ العلميَّةِ موضوعاً لها، وهذا خلافٌ في التسميَةِ وعدمه اولى[2] {ويعرَفُ} المجازُ اي المعنى المجازي للَّفظِ {بتبادُرِهِ غيرِه} منهُ الى الفهم ، {لولا القرينَةُ} ومن المصحوبِ بها المجازُ الرّاجِحُ ، وسيأتي ، ويؤخَذُ مما ذُكر انّ التبادُرَ من غيرِ قرينَةٍ تعرَفُ به الحقيقةُ[3]

---

(١)،روست نیه مەجاز لە عەلەم و ناوەکان دا هەبێ –بە ئیعتباری عەلەمیەتەکەی نەك بە ئیعتبارێکی تر– چونکە عەلەم ئەگەر مرتجل بوو واتە بەکارنەهاتبێ بۆ شتێکیتر جگە بۆ ناو نەبێ، وەك: سوعاد یاخود ناوێکە لەشتێکی ترەوە نەقل کراوە. بەڵام لەنێوان مانای کۆن و تازەدا، هیچ عەلاقەو پەیوەندییەك نەبێ، وەك فەضل ئەوە شتێکی رووتە ونابێ مەجازیان تیادا هەبێ، لە یەکەمدا بۆ مانایێکیتر دانەنراوە دووەمیشیان عەلاقەو قەرینە نیە، یاخود کە نەقڵ کراوە عەلاقەو قەرینەی موناسەبەیەکیان هەیە، وەك کەسێك کورەکەی ناوناوە موبارەك لەبەر ئەوەی گومانی بەرەکەتی لێبردووە،ئەمەش هەروەك ئەو دووانەکە مەجازی تیادا دروست نیە، چونکە کاتێ بەرەکەتیشی نەبێ هەر صەحیحە وشەی مبارك ببڕێ بەسەریا، دوای نەمانی پیوەندی نامێنێ لەنێوانیاندا.

(٢)بەپێچەوانەی غەزالیەوە لە عەلەمێکدا کە شاراوەو ئاماژە تیادا هەبێ بۆ صیفەتێك وەك حرث، ئەوە غەزالی وتوویەتی: مەجازە چونکە صیفەتەکە مەبەست نیە. لەگەڵ ئەوەش پێش ئەوەی بکرێ بەناو بۆ ئەو صیفەتی حەرث و تۆو وەشاندنە دانراوە ، ئەمە تەنها لەناو ناوەکەی دا جیاوازی هەیە ئایا متلمح الصفە ناوبنرێ مەجاز یاخود ناونەنرێ، لەناوەرۆکدا جیاوازیان نیە، ناونەنانەکەی باشترە–ئەگەر ئیعتیباری عەلاقە بکرێ ئەوە مەجازە ، بەڵام بێگومان کەکرا بەناو ئەو عەلاقە نیە–

(٣)مانای مەجازی لەفظ بەهۆی چەند شتێکەوە دەزانرێ:ا–ئەگەر قەرینە نەبێ غەیری مانای مەجازی لەفظەکە بەرەوە ذیهن دەڕواو ئینسان حاڵی ئەبێ، بەڵام ئەگەر قەرینەی لەگەڵدابێ مەجازی لەگەڵدابێ مەجاز زووتر بەرەوە ذیهن دەڕواو راجیحترە، ئەم مەجازەش لەمەودوا دێت باسەکەی ، لەوەی دانەر باسی کرد وەرئەگیرێ ئەو مانایەی زووعەقڵ لەو لەفظە وەری ئەگرێ بێ قەرینە لێی حاڵی ئەبێ،بەمەش

{وصحةُ النَّفي} ، كما في قولِكَ في البليدِ، هذا حمارٌ فإنَّهُ يصحُّ نفي الحمارِعنه[1] {وعدمُ وجوبِ الإطّرادِ} فيما يدُلُ عليهِ، بأن لا يطّرِدَ كما في واسئلِ القريَةَ اي أهلها فلا يُقالُ: واسئلِ البساطَ اي صاحبهُ، او يطرّدَ لا وجوباً كما الأسدِ للرجلِ الشجاعِ فيصحُّ في جميعِ جزئياتِه من غيرِ وجوبٍ ، لجوازِ أن يعبّر في بعضِها بالحقيقةِ بخلافِ المعنى الحقيقي فيلزَمُ إطّراد مايدلُ عليهِ من الحقيقةِ في جميعِ جزئياتهِ لإنتفاءِ التعبيرِ الحقيقي بغيرِها {وجمعُهُ} اي جمعُ اللفظِ الدالِّ عليهِ، {على خلافِ جمعِ الحقيقةِ} كالأمرِ بمعنى الفعلِ مجازاً يجمعُ على امور، بخلافهِ بمعنى القولِ حقيقةً فيجمعُ على اوامره[2]

---

حەقیقەت ئەناسریٚ. (١)ب-مەجاز ئەناسریٚ بە هۆی ئەوەوە کەدروستە نەفی مانا حەقیقیەکەی لیٚبکریٚ وەك: بەگیٚلیٚك ئەلیٚیت: ئەمە کەرە، بەلاّم بەمانای حەیوانی ناطق، دەدروستە نەفی مانای کەری -کە حەیوانی ناهقە- لیٚبکەیت، چونکە جواڕیی نیە.

(٢)مەجاز ئەناسریٚتەوە بەهۆی ئەوەوە کەطرد واجب نیە لەماناییٚکدا کە لەفظە مەجازیەکە دەلاّلەت ئەکا لەسەری ، واتە هەرکات قەرینەکە هەبوو ئەو لەفظە لەوەدا بەکاربهیٚنی ، یا بەو لەفظە ئەو مانایە بگەیەنیٚ، بەلاّم مانای حەقیقی طردی تیا واجبە، هەر ئەبیٚ بەو لەفظە ئەو مانا بگەیەنیٚ، مەجاز طردی تیا واجب نیە، واجب نیە بە پیاویٚکی ئازا بلیٚیت : شیٚرە، دەتوانی بلیٚیت: دلیٚرە، جورئەتّ دارە، واجب نەبوونی إطراد بە دوو جۆر دەبیٚ: أ-ئەوەیە هەر لە ئەصلا نەبیٚ وەك واسئل القریة واتە پرسیار لە دانیشتوانەکە بکە، بەکارهیٚنانی قریة لە دانیشتواندا بە ئیعتباری (حال و محله) لە هەر جیٚیەکدا حالیەت و محەلیەت بوو ئەو طردە نیە، بۆیەناوتریٚ: واسأل البساط واتە: پرسیار لەخاوەنی ئەو قاڵیە بکە، هەرچەند حال و محل هەبیٚت، ب-یاخود طرد هەبیٚ بەلاّم واجب نەبیٚ وەك: لەفظی اسد ، بەکاربهیٚنی بۆ پیاویٚکی دلیٚر ، دەئەوە دروستە لەفظی اسد لەهەموو جوزئیاتی پیاودا(رجل) بەکاری بهیٚنی بیٚ ئەوەی واجب بیٚ، چونکە دروستە لیٚرەدا هەندیٚك لەو جوزئیاتانە لەفظیٚکی حەقیقی بەکاری بهیٚنی، وەك: بلیٚیت: زید شجیعە، بەلاّم بەپیٚچەوانەی مانای حەقیقی ، چونکە واجبە بەکارهیٚنان إطرادی ئەو لەفظەی دەلاّلەت لەسەر ئەو مانا حەقیقەتە دەکات، لە هەمو جوزئیاتی ئەو مانا حەقیقیەدا ، لەبەر ئەوەناکریٚ دەربرینی مانای حەقیقی بیٚ لەفظی حەقیقی ناتوانی لەباتی لەفظی زەید شتیٚکیتر بۆ خاوەنی ناوەڕۆکی بەکاربهیٚنی جگە لە لەفظی زەید نەبیٚ. مەجاز دەناسریٚتەوە بەهۆی جەمعەکەیەوە

{وبالتزام تقييدهِ} اي تقييدِ اللفظِ الدالِّ عليهِ كجناحِ الذُّلِ اي لينِ الجانبِ ونارِ الحرب اي شدَّتُهُ، بخلافِ المشترَكِ من الحقيقةِ فإنَّهُ يقيَّدُ من غيرِ لزومٍ كالعينِ الجاريةِ {وتوقّفه} في إطلاقِ اللفظ عليهِ {على المسمَّى الآخَرِ} نحو: ﴿ ومكروا ومكر الله ﴾ أي جازاهم على مكارهم حيثُ تواطئوا وهم اليهود على ان يقتلوا عيسى عليه السلام بأنْ القى شبهَهُ على من وكّلوا به قتلهُ ورفعَهُ الى السّماء فقتلوا الملقى عليه الشبه، ظناً انه عيس ولم يرجعوا الى قوله انا صاحبكم، ثمَّ شكوا فيه لمّا لم يروا الآخر، فإطلاقِ المكرِ على المجازاةِ عليه متوقفٌ على وجودهِ بخلافِ إطلاق اللفظ على معناه الحقيقي فلا يتوقّفُ على غيره(٢)

چونکە جەمعی لەفظێك دەلالەت بکا لەسەر مانا مەجازی‌یەکەی،وەك ئەو لەفظە نیە کەدەلالەت بکا لەسەر مانای حەقیقی، وەك: وشەی امر ، ئەگەر بەمانا کارو رەفتاربێ ئەوە مەجازی‌یە ، جەمعەکەی امورە ، بەلام ئەگەر بەمانا قەول بێ کە مانای حەقیقیەتی، ئەوە جەمعەکەی اوامرە. (١)مەجاز ئەناسرێتەوە بەهۆی ئەوەوە کە: ئەو لەفظەی دەلالەت دەکا لەسەر مانا مەجازیەکەی واجبە تقیید بکرێ و لە (مضاف الیه) یەکە نەکرێتەوەو نەکنرێتەوە، وەك: جناحِ الذُّلِ جەناح کاتێ مەجازە وشەی (الذُّل) ی لەگەڵدابێ، ئەمجا بەمانا میهرەبانی‌یە و نەرم ونیانیە، ئەگەر وانەبێ بەمانا باڵە. یاخود وەك: نار الحرب، واتە گەرمەی شەڕو جەنگ کەلە ئەوپەڕی توندی دابێ، ئەگەر وشەی حەربی لەگەڵدابێ، وە ئەگەر نەیبێ مانا حەقیقیەکەی خۆی دەگرێتەوە کە ئاگرە، بەلام مشترك وانیە ئەمیش تقیید دەکرێ و دەلکێ بە وشەیەکی‌ترەوە بەلام واجب نی‌یە، وەك: العین الجاریە ، ئەشتوانی هەر بڵێیت: عین هەر یەك ماناش دەگەیەنێ.

(٢)مەجاز ئەناسرێتەوە بەهۆی ئەوەوە کەبرینی لەفظێك بەسەر مانا مەجازیەکەدا بەسراوە بەوەوە کە خودی ئەو لەفظە لە پێشەوە لەمانا حەقیقیەکەدا بەکارهاتبێ ، وەکو: ﴿ ومکروا ومکر الله ﴾ جولەکەکان فێڵیان کردو خوایش پاداشی فێڵەکەی دانەوە، چونکە ئەوان هەمویان رێك کەوتبوون لەسەر ئەوە عیسی پێغەمبەر عليه السلام بکوژن خوای گەورە دیمەن و لەش و لاری عیسای کرد بەسەر ئەو پیاوەدا کە کوشتنی عیسایان پێسپاردبوو، لەبەر دوڕندەییەکەی ئەمیان خستە پێش خۆیان، چووە ژورەوە عیسی عليه السلام بکوژێ ، خوا عیسای بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و کابرای دوڕندە هاتەدەر ، بەلام بەدیمەنی عیساوە ئەمان تێی بەربوون، و بەهەموویان کوشتیان هەرچەند وتی من عیسا نیم، وەهاوەڵەکەی خۆتانم سودی نەدایە، ئەمان

{والإطلاقُ على المستحيلِ} نحو: واسألِ القريَةَ فإطلاقُ المسئولِ عليها المأخوذ من ذلك مستحيلٌ لأنها الأبنيَةُ المجتمِعَةُ ، وإنّما المسئولُ اهلُها[1] {والمختارُ إشتراطُ السّمعِ في نوعِ المجازِ}، فليسَ لنا ان نتجوَّزَ في نوعٍ منهُ كالسّبَبِ للمسبَّبِ إلاّ إذا سمعَ من العرَبِ صورةٌ منهُ مثلاً ، وقيلَ لايُشترطُ ذلكَ بل يكتفي بالعلاقةِ التّي نظروا اليها، فيكفي السّماءُ في نوعٍ لصحّةِ التّجوّزِ في عكسِهِ مثلاً[2] {وتوقّفَ الآمدي} في الإشتراطِ وعدَمِهِ ولايشترَطُ السماعُ في شَخصِ المجازِ إجماعاً بأنْ لايستعملَ إلاّ في الصورِ التّي استعملتْهُ العربُ فيها[3]

---

وايان زانی عیسایە پاشان کەوتنە گومانەوە لەو کوژراوە ، کاتـــێ کە ئەو هاوەڵەی خۆیانیان نەبینیەوە ، کەوابوو بڕینی وشەی مکر بەسەر پاداش لەسەر فێڵ و مەکر ، بەسراوە لەسـەر بوونـی لـەفظی مـەکر ، بـەمانا حەقیقیەکـەی خـۆی کـە فێڵـە، بـەڵام بەپێچەوانەی لەفظێك بەسەر مانا حەقیقیەکەیدا ئەم نەبەسراوە بەوەی کە بەکارهاتبێ بۆ مانای مەجازی.

(١)مـەجاز دەناسرێتـــەوە بـەهۆی ئـەوەوە کـە بڕینـی لەفظەکـە بەسـەر مانـا حەقیقیەکـەیدا مـەحاڵ بـێ، وەك: پرسـیار لـەو دێ، القریـە بکـە، دەخـۆ بڕینـی لێپرسراویەی بەسەر دێ‌دا ، کە لەو رستەیەوە وەرگیراوە شتێکی مەحاڵە، چونکە دێ بریتیە لە چەند خانو بەرەییێك بەدەم یەکەوە بن، لێپرسراو تەنها دانیشتوانەکەیەتی.
(٢)قەولی هـەڵبژاردەو چاکی نـاو هـەموو قەولـەکان ئەوەیـە بـە مـەرج گـیراوە جـۆری مەجازەکە ئەبێ بیســرابێ کەوابـوو ئێمە بۆمان نیە جۆرە مەجازێك دروست بکـەین و بیکەین بە مەجاز –وەك سەبەب بڵێیـت و مەس پێی مسببەب بێ– مەگەر کاتێ نـەبێ دیمەنێکی ئەو جۆرە مەجازە لەعەرەبەوە بیسرابێ، وتراویـشە ئەوە بەمـەرج نـەگیراوە بەڵکو اکتـفا ئەکرێ بەو عـەلاقەی چاویـان لێ‌بـڕیوەو بەمەرج نـەگیراوە ، ئەمـەم بەدڵ نیە بۆیە بەبیســتنی جـۆرێکی مەجاز بەسە بۆ دروستی مەجاز لە عەکسەکەیدا ، واتە لەمەدا کە نەبیسراوە.

(٣)بەڵام ئامـێدی لەبەمەرج گرتنی جـۆری مـەجاز و نەبیستنی دا توقفی کـردووەو وەستاوە بەڵام بەڕای هـەمووان بۆ هـەموو فەردێکـی مـەجاز بیستن و سـەماع بەمـەرج نەگیراوە ، بەم شـێوە مـەجاز دروسـت نـەبێ بەکاربـهێنرێ جگە لـەو وێنـە و نمونانـە نەبێ عەرەب مەجازی تیا بەکارهێـناون.

{مسئلةٌ: المعرَبُ لفظٌ غيرُ علمٍ استعملتهُ العربُ في معنىً وضع لهُ في غيرِ لغتهم وليس في القرآنِ وفاقاً للشافعي وإبن جرير والأكثر} إذ لوكان فيه لإشتمل على غيرِ عربيٍ. فلايكونُ كلُهُ عربياً ، وقد قال تعالى: ﴿ إنَّا انزلناهُ قرآناً عربيّاً ﴾[1] وقيلَ إنّهُ فيه كإستبرق فارسيَّة للديباجِ الغليظ ، وقسطاس روميَّة للميزانِ ومشكاة هنديَّة لكوَّة اللّتي لاتنفذُ[2] وأُجيبَ بأنّ هذه الألفاظُ ونحوها إتفقَ فيها لغةُ العربِ وغيرِهم كالصّابون ولا خلافَ في وقوعِ الأعجميّ في القرآنِ الكريم كإبراهيم وإسماعيل ويحتمِل ان لايُسمّى معرباً كما مشى عليهِ المصنِّف هنا حيثُ قالَ: غير علم، وإن يسمّى كما مشى عليهِ في شرحِ المختصَر حيثُ لم يقُلْ ذلكَ ثمَّ نبَّهَ على أنَّ العلم متّفقٌ على وقوعِه وعقبَ هنا المجازَ بالمعربِ لشبهِهِ بهِ حيثُ إستعمَلَتْهُ العرَبُ فيما لم يضعوهُ لهُ كإستعمالهم المجازَ فيما لم يضعوهُ له إبتداءً[3]

---

(١)مەسئەلە: معرب وشەیەكی غەیری عەرەبیە كراوە بەعەرەبی بریتیە لە لەفظێك عەلەم و ناو نەبێ عەرەب لەو مانایەدا بەكاریان هێنابێ، كەیەكەم جار بۆی دانراوە لەناو عەجەمدا، معرب لەقورئاندا نیە، شافعی و ئیبن جەریرو زۆربەیتری زانایان هەمان رەئیان هەیە، چونكە قورئان ئەگەر معربی تێدا هەبێ ئەو كاتە غەیرە عەرەبی ئەگرێتە خۆی ، واتە هەندێكی عەرەبی نەئەبوو، وەهەمووی نەئەبوو بەعەرەبی، كەچی خوای گەورە فەرمویەتی: بێگومان ئێمە قورئانێكی بەزوبان عەرەبیمان دابەزاندووە.

(٢)هەندێك وتویانە معرب لە قورئاندا هەیە ، وەك وشەی إستبرق فارسیەو بەمانای روبەرێكی پارچەیێكی درشتە، یاقسطاس، رۆمیە بەمانا ترازوە، یا مشكاە بەمانا تاقێكە دیوی روی دەرەوەی نەبێ ، هیندیە.

(٣)وەلامی ئەم قیلە دراوەتەوە كە ئەم لە فظانەو وێنەی ئەمانە لەزاراوەی عەربدا بۆ ئەو مانایە دانراون، كەلە زاراوەكانی تردا بۆی دانراون وەك وشەی صابون لەناو عەرەب و غەیرە عەرەبدا هەربۆ یەك مانا دانراون، بە وەضع ودانانێكی جیا بەلام ئیتفاقا هەر بۆ یەك مانایان داناوە، هیچ جۆرە جیاوازیەك نیە كە عەلەم و عەجەمی لە قورئاندا هەیە، وەك: إبراهیم، إسماعیل، ئەشگونجێ وناوئەبرێ بە معرب وەك دانەر لێرەدا لەسەر ئەو شێوازە چووە، كە وتی: معرب حیساب نیە ، وەك ئەگونجێ عەلەمی عەجەمی ناو ببرێ بە معرب، وەك دانەر لە(شرح المختصر) دا وتویەتی: بەلام لەشەرحدا بەصەراحەت نەیوتوە عەلەمی عەجەمی ناو نەبرێ بە معرب، پاشان دانەر ئاگاداریەكی داوە ، كە عەلەم بێجیاوازی نێوان زانایان لە قورئاندا هەیە، دانەر لێرەدا دوابەدوای مەجاز معربی هێنا بەشوێنیا، چونكە معرب ئەشوبهێ بە مەجازەوە،

{مسئلَةٌ: اللفظُ} المستعمَلُ في معنىً ، {إمّا حقيقَةٌ} فقط {او مجازٌ} كالأسَدِ للحيوانِ المفترِسِ او للرَجُلِ الشّجاعِ[1] {او حقيقَةٌ ومجازٌ بإعتبارينِ} كأن وضعَ لغةً لمعنىً عام ثمَّ خصَّهُ الشرعُ او العرفُ بنوعٍ وكالصَّومِ في اللغَةِ للإمساكِ خصَّهُ الشرعُ بالإمساكِ المعروفِ، والدّابَّةُ في اللغَةِ لكلِّ مايدُبُّ على الأرضِ، خصّها العرفُ بذواتِ الحوافِرِ، واهل العراق بالفرَسِ فإستعمالُهُ في العام حقيقَةٌ لغويَّة مجازٌ شرعي او عرفي وفي الخاصِّ بالعكسِ[2] ويمتنعُ كونُهُ حقيقَةً و مجازاً بإعتبار واحد، للتنافي بينَ الوضع إبتداءً و ثانياً، إذْ لايصدق انّ اللَفظَ المستعملَ في معنىً موضوعٍ لهُ إبتداءً و ثانياً[3]

---

چونکە عەرەب ئەو لەفظانەیان بەکارهێناوە بۆ مانایێك خۆیان بۆیان دانەناوە، وەك لەفظی مەجاز بەکاریان هێنا لە مانایێکدا کەیەکەم جار ئەو لەفظە بۆ مانایەیان دانەناوە.

(١)لەفظ کە بەکاردێ لەمانایەکدا بۆی دانراوە: أ-تەنها یا حەقیقەتە وەك: بەکارهێنانی لەفظی اسد بۆ گیانلەبەرێکی دوڕندە. ب-یاتەنها مەجازە وەك بەکارهێنانی اسد بۆ پیاوێکی ئازا. (٢)یا حەقیقەتە بە ئیعتبارێك و مەجازیشە بە ئیعتبارێکیتر ، وەك ئەوەی لەفظێك دانرابێت لەڕوی لوغەوە بۆ مانایەکی عام و گشت گیر، پاشان شارع تایبەتی ئەکا بەیەکێك لە ئەفرادی ئەو عامەوە، یاخود عورف تایبەتی ئەکا بەیەکێك لە ئەفرادی ئەو عامەوە، وەك وشەی صوم لە لوغەتدا دانراوە بۆ مطلقی دەست گرتنەوە ، بەلام شەرع تایبەتی کردوە بە دەست گرتنەوەیەکی تایبەتی، واتە لەوانەی ڕۆژویان پێئەشکێ، یا وشەی دابە لە لوغەتدا بە هەموو گیانلەبەرێکی چوارپێ دەڵێن: بچێت بەسەر زەویدا، بەلام عورفی گشتی تایبەتی کردووە بە چوارپێیەکەوە کە سمی هەبێ، وەخەڵکی عێراقیش تایبەتیان کردوە بە ئەسپەوە، کەوابوو بەکارهێنانی لەفظ لەیەك مانای عامدا حەقیقەتێکی لوغەویە و مەجازێکی شەرعیە-ئەمە لە صوم دا- حەقیقەتێکی لوغەویە و مەجازێکی عورفیە وەك : دابە کە بەلام لە خاص و تایبەت دا بەپێچەوانەوەیە، واتە حەقیقەتی شەرعی یا عورفیە، بەلام مەجازی لوغەویە

(٣)قەدەغەیە لەفظێك بەکاربێ لە یەك مانادا بەیەك ئیعتبار حقیقیبێ و مەجازیش بێ، چونکە دژایەتی و مونافات هەیە لەنێوان وەضع و دانانی یەکەمدا، لەگەڵ وەضع و دانانی دووەمدا، چونکە گونجاو نیە بڵێیت: ئەم لەفظە بەکارهاتووە لە مانایەکدا دانراوە بۆی بە وەضعی یەکەم و دووەمدا، چونکە مەحاڵە کۆکردنەوەی یەکەم و دووەم ، یا ئەبێ یەکەم بێ یا ئەبێ دووەم بێ.

{والأمرانِ} الحقيقَةُ والمجازُ {منتفيانِ} عنِ اللفظِ {قبلَ الإستعمالِ} لأنَهُ مأخوذٌ في حدِّهما، فإذا إنتفى إنتفيا، {ثمَّ هو} اي الّفظُ {محمولٌ على عرفِ المُخاطَبِ} بكسرِ الطاءِ الشارع و اهل العرف اواللغة(١) {ففي} خطابِ {الشّرعِ} المحمولِ عليهِ المعنى {الشرعيُّ لأنَهُ عرفهُ} اي لأنّ الشرعيَّ عرف الشرعَ، لأنّ النبيّ ﷺ بعثَ لبيان الشرعياتِ(٢) {ثمَّ} إذا لم يكنْ معنىً شرعي او كان و صرفَ عنهُ صارماً فالمحمولِ عليهِ المعنى {العرفيّ العام} اي الذّي يتعارفه جميعُ النّاسِ بأن يكونَ متعارفاً زمن الخِطابِ واستمرَّ لأنّ الظاهرَ ارادتهُ لتبادرِهِ الى الأذهانِ(٣) {ثمَّ} إذا لم يكنْ معنىً عرفي عام، أو كان وصرف عنهُ صارفٌ فالمحمولُ عليهِ المعنى {اللغويَ} لتعيُّنِه حينئذٍ فحصل من هذا انّ مالَهُ مع المعنى الشّرعيّ معنىً عرفيّ عام، أو معنىً لغويّ وهما يحمل اولاً على الشّرعيّ ، و انّ مالَه معنىً عرفيّ عام و معنىً لغويّ يحمل اولاً على العرفيّ العام(٤)

---

(١)لەفظ پێش ئەوەی بەکاربێ نەحەقیقیە نەمەجازی، چونکە بەکارهێنان لە پێناسەی هەردووکیانەوە وەرگیراوە، کەوابوو کاتێ ئیستعمال و بەکارهێنان فەوتا حەقیقەت و مەجازیش دەفەوتێن، پاشان دوای بەکارهێنانی ئەو لەفظە حەمل دەکرێ لەسەر عورفی قسەکەرەکە، ئەگەر شارع بوو پێی دەوترێ شەرعی، وەئەگەر ئەهلی عورف بوون ئەوترێ عورفی، وەئەگەر ئەهلی بوون پێی دەوترێ لوغەوی.

(٢)کەوابوو ئەگەر لەفظەکە لەناو قسەی گفتو گۆی شەرعدا بوو، ئەوە ئەو مانایەی حەمل دەکرێتە سەری ماناو مەبەستی شەرعی‌یە، چونکە مانای شەرعی عورف و عادەتی شەرعە، لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺلەبەر روون کردنەوەی کارە شەرعیەکان نێرراوە. (٣)پاشان ئەگەر ئەو لەفظەی مانای شەرعی نەبوو، یا هەیبوو بەڵام جڵەو گیریەك جڵەوگیری ئەگرت و نەی ئەهێشت بیبڕێ بەسەر مانای شەرعیدا، ئەو کاتە حەمل ئەکرێ بەسەر مانای عورفی عام، ئەی عورفی عام چیە؟ ئەوەیە کە هەموو کەس ئەیزانێ لەکاتی گفتوگۆکە دا زانراوبێ و ئێستەش هەر زانراوە. چونکە وادەردەکەوێ ئەو لەفظە شەرعیە مانای عورفی عامی مەبەست بێ، لەبەر ئەوە زوو بەرەو ذیهنی ئینسان ئەڕواو لێی حاڵی دەبێ. (٤)پاشان ئەگەر مانای شەرعی نەبوو یا هەبوو بەڵام جڵەوگیرێك نەیئەهێشت ئەو مانایەی بکەی، ئەو کاتە ئەو لەفظە لەگفتوگۆی شەرعیدا حەمل دەکرێ سەر مانای لوغەوی، چونکە تەنها مانای لوغەوی ماوە ئەو دووانەکەی‌تر نەبوون، لەمەی وتمان ئەم کورتەمانە بۆ پەیدا ئەبێو دەست دەکەوێ: لەفظێك لەگەڵ مانا شەرعیەکەیدا مانایەکی عورفی عامی هەبوو، یاخود مانایەکی

{وقال الغزالي والآمدي} فيما لهُ معنىً شرعيّ معنىً لغوي محملهُ {في الإثباتِ الشّرعيّ} وفق ما تقدَّمَ {وفي النّفي} و عبارتهما النّهي وعدلَ عنهُ مع إرادته لمناسَبَةِ الإثبات، قال {الغزالي}: اللفظ {مجملٌ} اي لم يتّضحِ المرادُ منهُ إذ لايمكنُ حملُهُ على الشّرعيّ لوجودِ النّهي ولاعلى اللغويّ لأنّ النبيّ ﷺ بعثَ لبيان الشّرعيّاتِ[1] {و}قال {الآمدي} محمله {اللغويَ} لتعذُّرِ الشرعيّ بالنهي ، وأجيبَ بأنّ المراد بالشرعيّ مايُسمّى شرعاً بذلكَ السمُ صحيحاً كان او فاسداً ، يُقالُ صومٌ صحيحٌ و صومٌ فاسد، ولم يذكرا غيرَ هذا القسم[2]

---

لوغەوی هەبوو، یاخود لەگەڵ مانا شەرعیەکەیدا هەردوو ماناکەی تریشی هەبوو، ئەوە ئەو لەفظە یەکەم جار حەمل دەکرێ لەسەر مانا شەرعیەکەی ، وەئەو لەفظەی مانایەکی عورفی عام و لوغەوی هەبێ ئەوە یەکەم جار حەمل دەکرێ لەسەر مانای عورفە عامەکە. (١)غەزالیو ئامێدی وتویانە لەفظێك مانای شەرعی هەبێ و مانای لوغەویشی هەبێ، ئەوە ئەگەر ئەو لەفظە لە رستەیەکی ئەرێدا بوو، ئەوە حەمل دەکرێ لەسەر مانای شەرعی وە ئەگەر لە رستەیەکی نەرێدا بوو، عیبارەتی هەردوکیان وتویانە: ئەگەر نەهی بوو، بەلاّم دانەر لەباتی نەفی نەهی نەقڵ کرد لێیانەوەو لەگەڵ ئەوەش دانەریش مەبەستی بە نەفی هەر نەهیە، ئەڵی ئەو لەفظە لەفظێکی موجمەل و کورتە واتە مەبەستەکەی رون نەکراوەتەوە ، چونکە ناکرێ حەمل بکرێتە سەر مانایەکی شەرعی چونکە نەهی هەیە ، کە وتت شەرعی یانی صەحیحە، نەهیش یانی صەحیح نیە، کەوابوو پێکەوە ناگونجێن، وەگونجاویش نیە حەمل بکرێنە سەر مانای لوغەوی ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆیە نێرراوە بۆ روون کردنەوەی مانای وشە شەرعیەکان نەك بۆ راڤەکردنی مانا لوغەویەکان.

(٢)ئامێدی وتویەتی: لەفظێك کە مانایەکی شەرعی و مانایەکی لوغەوی هەبێ لە رستەیەکی مەنفیدا بێ ئەوە حەمل دەکرێتە سەر مانای لوغەوی و چونکە رێگر هەیە بۆ ئەوەی حەمل بکرێتە سەر مانای شەرعی بەهۆی بوونی نەهیەکەوە، وەلاّم دراوەتەوە مەبەست بەمانای شەرعی ئەوەیە ئەو ناوە شەرع ناوی نابێ، -نەك مەبەست ئەوەیە موافقی شەرع بێ یا حەلاّڵ بێ - ئیتر کەیفی خۆیەتی ئەوەی شەرع ناوی بردوە صەحیح یا فاسد بێ و بەتاڵ بێ، چونکە لە شەرعدا دەوترێ صوم صەحیح و صوم فاسد، غەزالی و ئامێدی تەنها ئەم بەشەیان باس کردووە، دوو بەشەکەیتریان باس نەکردووە: ا-ئەو لەفظەی مانای شەرعی هەبێ و مانای عورفی هەبێ. ب- لەفظێك هەرسێ ماناکەی هەبێ.

مثالُ الإثباتِ منــــهُ حديــثُ مسلم عـن عائِشــةَ رضــي اللهُ عنـها قـالتْ: دخـل علـيّ النبيّ ﷺ ذات يومٍ فقال: هــل عندكم شيئ ؟ قلنا: لا فقال: فإنّي إذاً صائم، فيحمل على الصوم الشّرعيّ فيفـيدُ صحّتهُ، وهـو نفلٌ بنيَةٍ من النّهار[1] ومثالُ النّهي منهُ حديثُ الصحيحينِ انّهُ ﷺ نهى عن صيام يومينِ يوم الفطرِ ويوم النحرِ، وسيأتي في مبحث المجملِ خلافٌ في تقدير المجاز الشّرعيّ على المسمّى اللغوي[2] {وفي تعارُضِ المجازِ الرّاجح والحقــيقةِ المرجوحَةِ} بأن غلــبَ إستعمال المجاز علـيها، {اقوالٌ} قــال أبو حنيفة الحقيــقـــةُ أولى مـن الحمـلِ لأصـــالتها و أبـو يوسـف: المجـــازُ أولى لغــلَبته. {ثــالثُها المختارُ} اللّفــظُ {مجملٌ} لايحـــمل على احدِهما إلاّ بقرينَـةِ الرّجـــحانِ كـلّ منهما من وجه[3]

---

(١)غەزالی و ئامێدی ئەو لەفظەی مانای شەرعی و مانای لوغەوی هەبێ، ئەگەر لە رستەیەکی موثبەتدا بێ جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لەرستەیەکی مەنفیدا بێ ، جاوێنە بۆ ئەوەی لە موثبەتدا بێ ، ئەو فەرموودەیە کە مسلم لە عائیشـەوە ئـەی گەڕێنێتەوە ئەڵێت: رۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ هاتەوە بۆ لام و فـەرمووی: هیـچ خواردنێکتـان لایـە؟ ئێمەیش وتمـان : نـەخێر پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: کـەوابوو مـن بـەرۆژوم -صـائم- وشەی صائم حەمل دەکرێتە سەر صومی شەرعی نەك لوغەوی ئەو فەرموودەیە ئەوە ئەگەیەنێ و رۆژوو ئەگەر سوننەت بێ لە رۆژدا نیەتی بۆ بێنێ صحیحە.

(٢)وێنە بۆ لەفظەی مانای شەرعی هەبێ و مانای لوغەوی هــەبێ لـە رستەیەکدا نەهی تێدا بێ وەك ئەم فەرمودەیە ، مسلم و بوخاری ریوایەت دەکەن ، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە رۆژوی -صیام- ی دوو رۆژ ، رۆژی جەژنی رەمەزان و رۆژی جەژنی قوربان. لەمەودوا لەباسی مجملدا دێت کە باسی ئەو جیاوازیە ئەکرێت ، لەبارەی پێش خستنی مەجازی شەرعی بەسەر مانای لوغەویدا.

(٣)مەجازێکی راجح و حەقیقەتێکی مەرجوح چون بەگژیەکدا بەم شێوە مەجازەکە لە حەقیقەتەکە زیاتر بوو، ئایا بەکامیان ئەو لەفظـە مانـا لێبدەینـەوە؟ ئەمـە چـەند قـەولێکی تیایـە: أ-ئـەبو حەنیفـە دەڵـێ: باشـتر ئەوەیـە حـەمل بکرێتـە سـەر مانـا حەقیقیەکەی چونکە ئەصل لە ماناداا مانای حەقیقیە. ب-أبو یوسف دەڵێ: حـەمل دەکرێتە سەر مانای مەجازیەکەی ، ئەم باشترە چونکە مەجاز زۆرتـرە لـە حەقیقـەت، ج-سێیەمیان هەڵبژاردەی هەمووانە ئەوەیە ئەو لەفظە لـەفظێکی موجمەل و کورتە، لەبەر ئەوەی روون نەکراوەتەوە حەمل ناکرێتە سەر یەکێکیان تا قەرینە نەبێ، چونکە هەر یەك لە رویەکەوە لەویتر چاکترە.

مثالُهُ: حلفَ لايشربُ من هذا النَّهرِ، فالحقيقَةِ المتعاهدة الكرع منْهُ بفيهِ كما فعَلَ كثيرٌ من الّرعاءِ ، والمجازُ الغالبُ الشّربُ بما يغترفُ منهُ كالإناءِ ولم ينو شيئاً فهل يحنثُ بالأوّلِ دونَ الثّاني أو العكسِ ، او لايحنثُ بواحدٍ منهما الأقوال[1] فإن هجرتَ الحقيقةَ قدّم المجازُ عليها إتفاقاً، كمن حلفَ لايأكلُ من هذهِ النخلَةِ فيحنثُ بثمرها دونَ خشَبِها الذي هوَ الحقيقةِ المهجورةُ حيثُ لانيةَ وإن تساويا قدّمتِ الحقيقةُ إتفاقاً كما لو كانت غالبةً[2] {وثبوتُ الحكمِ} بالإجماعِ مثلاً {يمكنِ كونهُ} اي الحكم {مراداً من خطاب} لكن يكونُ الخطابُ في ذلكَ المراد ، {مجازاً لايدلُ} الثبوت المذكور{على انّهُ} اي الحكم هو {المُرادُ منهُ} اي من الخطابِ {بل يبقى الخطابُ على حقيقَتِهِ} لعدَمِ الصّارفِ عنها[3]

---

(١)وێنە بۆ ئەم بەگژیەکدا چونە: کەسێ سوێندی خوارد لەم جۆگە ئاو ناخواتەوە، جا مانای حەقیقی ئاو خواردنەوە عادەت وایە ، ئەوەیە کە بەدەمی تێبخاو بیخواتەوە، وەك زۆربەی شوانەکان وا دەکەن، مانای مەجازیەکەشی غالب وایە ئەوەیە بیخواتەوە بەهۆی شتێکەوە ئاوەکەی تیابگرێتەوە، وەك دەست و جام و گلاس، بەلاّم ئەم نیەتی هیچیانی نەبووە، جا ئایا ئەم پیاوە دەمی تێبخا سوێنەکەی دەکەوێ نەك بە گلاس، -وەك ابو حنیفە وتی- یاخود بە گلاس بیخواتەوە، سوێنەکەی ئەکەوێ نەك بەدەم-وەك ابو یوسف وتی- یاخود سوێندی ناکەوێ بە یەکێکیان؟ ئەوە ئەو سێ قەولەی تێدایە.

(٢)کەوابوو ئەگەر مانا حەقیقیەکەی وازی لێهێنراو بوو، ئەوە مانا مەجازیەکەی پێشی ئەکەوێ بەسەر مانا حەقیقەکەیدا بەڕای هەموان، وەك کەسێ سوێندی خوادووە، لەم دارخورمایە نەخوا، ئەوە بەهۆی خواردنی بەرەکەی سوێندەکەی ئەکەوێ، نەك بە خواردنی دارەکەی خۆی کە مانای حەقیقی دارە، بەلاّم وازی لێهێنراوە ، ئەوەش لە جێیەکدا ئەبێ سوێند خۆرەکە نیەتی مانا حەقیقیەکەی نەبێ، وەئەگەر مانای حەقیقی و مەجازی یەکسان بوون ئەوە بەڕای هەموان مانا حەقیقیەکەی پێش دەخرێت وەك چۆن ئەگەر غالب بوو هەر پێش ئەکەوێ.

(٣)حوکمێك بە ئیجماع ثابت بووبێ-لەوانە بێ ئەو حوکمە مەبەستی ئەو ئایەتە یا ئەو فەرموودە بێ ، بەلاّم ئەو خیطابە لەو مانایەدا مەجازی دەبێ- دەلالەت ناکا لەسەر ئەوە ئەو حوکمە ئیجماعە مەبەستی ئایەتەکەیە یافەرموودەکەیە، نەخێر بەلکو ئەو خیطابە لەسەر مانای حەقیقی خۆی ئەمێنێتەوە، چونکە جلەو گیرو ڕێگرێك نیە لەوەی کەمانای حەقیقی نەمێنێتۆ.

{خلافاً للكرخي} من الحنفيَّةِ {والبصري} أبي عبد الله من المعتزلة في قولهما: يدل علي ذلك، فلا يبقى الخطابُ على حقيقته، إذا لم يظهَرْ مستندٌ للحكم الثَّابت غيره[١] مثالُهُ و جوبُ التيَمُّم على المجامع الفاقد للماء إجماعاً ، يمكن كونهُ مراداً من قوله تعالى: ﴿ او لامستمُ النِّساءَ فلم تجدوا ماءً فتيمَّموا ﴾ لكن على وجه المجازِ لأنَّ المُلامسةَ حقيقةٌ في الجسِّ باليَدِ مجازٌ في الجماع، فقالا المرادُ من الجماع، لتكونَ الآيَة مستندُ الإجماع ، إذ لامستندَ غيرهما، وإلاّ لذُكرَ، فلا تدلُّ على انَّ اللّمسَ ينقض الوضوءَ[٢] واجيبَ بانَّهُ يجوزُ ان يكونَ المستندُ غيرَها ، واستغنى عن ذكره بذكر الإجماع كما هو العادةُ، فاللّمسُ فيها على حقيقته فتدلُّ على نقضه الوضوءَ وإن قامتْ قرينةٌ على إرادة الجماع إيضاً بناءً على الرّاجح انَّهُ يصحُّ انْ يُراد باللفظِ حقيقته و مجازه معاً دلّتْ على مسألة الإجماع ايضاً، [٤]

(١)ئەو بۆچونە جیاوازە بۆ كەرخی لە حەنەفیەكان و بەصری لەموعتەزیلەكان كەدەڵێن: ثابت بوونی حوكمێك بە ئیجماع دەلالەت دەكا لەسەر ئەوە كەمەبەستی ئەو خیطابەیە، كەوابوو ئەو خیطابە لەسەر حەقیقەتی خۆی نامێنێتەوە، بەڵكو مەجازە چونكە بەڵگەیەكی‌ترو شتێكی‌تر نیە پاڵپشتی ئیجماع بێ بۆ سەلماندنی حوكمەكە.

(٢)وێنە بۆ ئەو حوكمەی كەبە ئیجماع ثابت بووبێ: كەسێ جیماعی‌كردبێو ئاوی دەست نەكەوێ واجبە لەسەری بە ئیجماع تەیەموم بكات، ئەم واجب بوونە ئەگونجێ مەبەستی ئەم ئایەتە بێ كە دەفەرموێ: یاخود ملامەسەی ژنانتان كردو ئاوتان دەست نەكەوت، ئەو كاتە تەیەموم بكەن، بەلام لەڕوی مەجازەوە ئەو حوكمە مەبەستی ئایەتەكە بێ، چونكە (ملامسە) مانا حەقیقیەكەی دەست لێدانەو مەجازیەكەی جیماعە، لەبەر ئەوە كەرخی و بەصری هەردوكیان وتویانە: مەبەستی ئەم ملامەسەیە جیماعە، بۆ ئەوەی ئەم ئایەتە ببێتە پاڵپشتی ئیجماعەكە، چونكە جگە لەم ئایەتە پاڵپشتی نیە، ئەگەر بوایە باس ئەكراو ئەوترا، كەوابوو ئەگەر ئاوا مانا بكرێ، دەستدان بەژنەوە دەست نوێژ ناشكێنێ. (١)وەلام دراوەتەوە كە ئەگونجێ پاڵپشتی ئەو ئیجماعە شتێكی تربێ غەیری ئەو ئایەتە بەهۆی وتنی ئیجماعەكە، ئیتر پێویستی نەكردوە بەیان بكرێ وەك عادەت هەر وایە، لەبەر ئەوەی ئیجماع خۆی حجەو بەڵگەیە هەر ئیجماعەكە باس دەكرێ و بەڵگەكەی ناوترێ، كەوابوو ملامسە لەم ایەتەدا لەسەر مانای حەقیقی خۆیەتی، كەوابوو ئەم ئایەتە دەلالەت دەكا لەسەر شكاندنی دەست نوێژ بەدەستدان بەژنانەوە. وەئەگەر قەرینەیەك بەرپا بوو لەسەر ئەوە كەملامسە وەك دەست پێوەدان دەگەیەنێ جیماعیش دەگەیەنێ، -ئەم بۆچونە لەسەر ئەوە دروست

وقد قال الشّافعيّ بدلالتهما عليهما حيثُ حمل المُلامسَةُ على الجسّ باليَدِ والوطءِ[1]

{مسئلَةٌ: الكنايَةُ لفظٌ استعمل في معناهُ مراداً منهُ لازم المعنى}، نحو: زيد طويلُ النّجادِ مراداً منهُ طويلُ القامَةِ ، إذ طولُها لازمٌ لطولِ النّجادِ، اي حمائِلُ السّيفِ {فهي حقيقَةٌ} لإستعمالِ اللفظِ في معناهُ و إنْ اريدَ منهُ اللازم[2] {فإن لم يرد المعنى} باللّفظ {وإنّما عبّرَ بالملزوم عنِ اللازم فهو} اي اللفظ حينئذٍ مجازٌ لأنهُ استعمل في غير معناهُ الأوّل[3] {والتعريضُ لفظٌ استعملَ في معناهُ ليلوحَ} بفتحِ الواوِ اي للتلويحِ{بغيرِه}كما في قولِهِ تعالى حكايةً عن الخليل ﷺ بل فعلَهُ كبيرهم هذا نسبَ الفعلَ الى كبيرِ الأصنام المتّخذَة آلهةً، كأنّهُ غضبَ أن تعبدَ الصّغارَ معهُ تلويحاً لقومهِ، العابدينَ لهابأنّها لاتصلُحُ أن تكونَ آلهةً لما يعلمون إذا نظروا بعقولِهم عن عجز كبيرِهاعن ذلك الفعل اي كسرِ صغارِها فضلاً عن غيرهِ ، والإله لايكونُ عاجزاً {فهو} اي التعريضُ {حقيقةٌ ابداً} لأنّ اللفظَ فيه لم يستعمل في غيرِ معناهُ بخلافهِ في الكنايَةِ كما تقدّمَ[4]

---

بكرێ كە لەپێشەوە وتمان: دروستە لەفظێك پێكەوە مانای حەقیقی‌ومەجازیشی لێ بگرێ- ئەو كاتە دەلاڵەتیش دەكا لەسەر ئیجماعەكەش (١)شافعیش فەرمویەتی: ئەم ئایەتە دەلاڵەت دەكا لەسەر ئیجماعیش و لەسەر شكاندنی دەست نوێژیش، چونكە ملامسە لەم ئایەتەدا حەمل دەكرێتە سەر دەست پێوە تلان بەدەست بێ یابەجیماع.

(٢)كفایە دوو بەشە: لەفظێك لەمانا حەقیقیەكەیدا بەكارهێنرابێ بەڵام مەبەست بەو مانایە لازمی ئەو مانایەبێ، وەك زەید كێلانەكانی درێژن، واتە بالای بەرزە، چونكە بالای بەرز لازمی ئەوەیە قایشو حەماڵی شمشێرەكەی درێژبێ -وشەی نجاد لەمانای حەقیقی خۆیدا بەكارهێنراوە بەڵام مەبەست لازمی‌ماناكەیەتی ئەگەر ئاوا بوو ئەوە كینایەیێكی حەقیقیە، چونكە لەفظ لەماناكەی خۆیدا بەكارهاتووە، هەرچەند لازمەكەی مەبەستە. (٣)وەئەگەر بەو لەفظە مانا حەقیقیەكەی مەبەست نەبوو بەڵكو لەباتی لازمەكە مەلزومەكە دەوترێ، ئەوە ئەو لەفظە لەم كاتەدا مەجازە ، نەك كینایەیە، چونكە لەمانای یەكەمیدا بەكارنەهاتووە -لەم مەجازەی ئێرەدا لەفظەكە هەر لەمانای حەقیقیدا بەكار نەهاتووە، یەكسەر لەمانای دووەمدا بەكارهاتووە بەڵام لەكینایەی حەقیقی‌دا لەپیشدا لەمانای حەقیقیدا بەكارهاتووە ئەمجانەقلْ كراوە-.

(١)تەعریض بریتیە لە لەفظێك كە بەكارهاتبێ لەمانای یەكەم و حەقیقیەكەیدا، بۆ ئەوەی ئامازەی پێبكرێ بۆ شتێكی‌تر جگە لەمانا حەقیقیەكەی -بەم شێوە درۆ جیا دەكرێتەوە- وەك خوای گەورە لەناو گەڕانەوەی سەرگوزەشتەی ئیبراهیمی خەلیل دا دەفەرموێ: نەخێر ئەم گەورەیان كردویەتی، ئیبراهیم كردنەكەی داوەتە پاڵ گەورەی

## {الحروف}

اي هذا مبحثُ الحروفِ اللّتي يحـــتاجُ الفقيهُ الى معرفَة معانـــيها لكثرَةِ وقوعِها في الأدلّة، لكن سيأتي منها اسماءٌ، ففي التعبير بها تغليبٌ للأكثرِ، وفي خطّ المـــصنّف عدَّها بالقلَم الهنديّ إختصاراً في الكتابَة، وفي بعضِ النسَخ بالقلَم المعتاد ولنمـــش عليه لوضوحه(١)

{أحدها: إذَنْ} من نـــواصبِ المضارعِ، {قال سيبويه: للجواب والجزاء الخ، قال الشلوبين:دائماً و}(٢)

---

ئەو بتانەی بە خوا کراون وای داناوە ئەم بتە گەورەتربێ لەوەی ئەم بتە بچکۆلانانە لەگەڵ ئەودا ئەپەرسترێن، ئەوەی کردوە بە ئاماژە بۆ ئەو گەلەی ئەم بتانە ئەپەرستن کە شیاوی ئەوەنین بکرێن بە خوا چونکە ئەگەر بەعەقڵیان بیر بکەنەوە عەقڵیان بخەنەکار دەزانن بتی گەورەکە نەتوانێ بتانی بچوك بشکێنێ ئەوە هەر توانای شتی تری نیە، وەك دروست کردنی ئاسمان و زەوی ، خۆ ئەبێ خوا نابێ ناتەواو نابێ، کەوابوو تەعریض هەموو کات لە حەقیقەتدا بەکاردێ، چونکە ئەو لەفظەی لە تەعریضدا بەکاردێ جگە لەمانای حەقیقیدا نەبێ تەعریضەکە بەکارنەهاتووە، بەڵام کینایە جیاوازە لەگەڵ تەعریضدا، وەك لەپێشدا رابورد.

## الحروف

(١)ئەمە باسی ئەو حەرف و پیتانەیە ئینسانی شەرع زان پێویستی ئەبێ بە زانینی ماناکانیان، لەبەر ئەوەی لەناو بەڵگەکانی شەرعدا زۆرن و زۆر دێنە پێش چاو، بەڵام لەمەودوا دێت هەندێ لەوانە ئیسمن، حەرف نین، ئەوانیشم خستونەتە سەر دێری باسەکە کە بە حەرف ناوم بردون، حەرف زۆرن و ئیسم کەمن، هەر ناوی زۆرەکەم بردووە، لەو نوسخەی بەخەتی دانەر خۆی نوسراوەتەوە ژمارەی حەرفەکان بەژمارەی هیندی ژمێرراون بەم شێوە: (١) (٢) (٣) تا کۆتایی، چونکە بەم شێوە کورتترە تا بەحەرف بنوسرێن، بەمەی بڵێت: الأول، الثاني، تا کۆتایی، وەلە هەندێ نوسخەی تردا بەژمارەی عادەتی واتە بەحەرف نوسراون، لەبەر روون و دیاری حەرفەکە ژمارەکان تێکەڵ نابن، بالێمەش لەسەر ئەوە برۆین.

(٢)یەکەمیان (إذن) یەکە لەوانەی مضارع مەنصوب دەکەن، سیبەوەیهی وتویەتی: (إذن) بۆ وەڵامی ئەو قسەیە لەگەڵتا دەکرێ، وە بۆ پاداشتی کردەوەی ئەوکەسەشە کردەوەکە دەکا، شەلوبین وتویەتی: هەموو کات بۆ جەواب و جەزایە .

قال {الفارسي:} غالباً ، وقدْ تتمحّضُ للجوابِ فإذا قلتَ لمنْ قالَ: ازورُكَ إذن اكرمُكَ، فقدْ اجبتَهُ وجعلتَ إكرامَكَ جزاءَ زيارَتِهِ ، اي إن زرتني اكرمتُكَ، وإذا قلتَ: لمن قالَ احبُكَ: إذاً اصدّقكَ فقدْ اجبتَهُ فقط عند الفارسي، ومدخولُ إذنْ فيهِ مرفوعٌ لإنتفاءِ إستقبالهِ المشروطِ في نصبِها ويتكلّفُ الشلوبينَ في جعلِ هذا مثالاً للجزاءِ ايضاً اي إن كنتَ قُلتَ ذلكَ حقيقةً صدقتُكَ، وسيأتي عدُّها من مسالكِ العلّةِ لأنّ الشرطَ علّةٌ للجزاءِ[1]

{الثاني: إن} بكسرِ الهمزةِ وسكونِ النون { للشرطِ} اي لتعلقِ حصولِ مضمونِ الجملةِ بحصولِ مضمونِ اخرى نحو:﴿ إن ينتهوا يُغفرْ لهم ما قد سلف ﴾[2] {والنّفي} نحو:﴿ إن الكافرون إلاّ في غرور ﴾﴿ إن اردنا إلاّ الحسنى ﴾ اي ما[3] {والزيادةُ} نحو: ما إن زيدٌ قائمٌ ، ماإن رايتُ زيداً[4]

---

(١)فارسی وتویەتی: زۆربەی کات وایە جاروبارێکیش تەنها بۆ جەواب دەبێ، بۆ وێنە ئەگەر وتت بەکەسێ کە دەڵێ: یەم بۆ لات، إذن اکرمك ئەوە وەڵامیشت داوەتەوە و رێز لێنانیشی ک.دوەتە پاداشتی هاتنەکەی واتە وەك وتبێتت: إن زرتنی اکرمك، ئەگەر بێیت بۆ دیدەنم لە پاداشتتا رێزت لێ‌ئەنێم، بەڵام ئەگەر کەسێ وتی: تۆم خۆش ئەوێ، تۆش دەڵێیت: إذن اصدقك، کەوابوو منیش بڕوات پێ‌دەکەم ، ئەوە تەنها وەڵامت داوەتەوە، بەلای رای فارسیەوە ئەو فیعلە مضارعەی (إذن)ی وەڵام دەڕواتە سەری مەرفوعە، چونکە فیعلەکە زەمانی داهاتووی تێدا نیە، مەرجی کارکرنی (إذن)یش ئەوەیە بۆ داهاتوو بێت، شەلوبین گیرنەخوا لێرەدا ئەبێ زۆر لە خۆ بکا، تا جەزاو پاداشتیش لەم وێنەدا دەسازێنێ دووبارە، واتە تۆ ئەگەر ئەوەت بەڕاست وتبێت منیش لە پاداشتا بڕوات پێ‌دەکەم و بەدرۆزنت نازانم ، لەمەودوا دێت کە (إذن) یەکێکە لەو رێیانەی ئەمان گەیەنن بە عیلە و هۆ ، چونکە شەرط عیلەت و هۆیە بۆ جەزاو پاداشت.

(٢)دووەم: إن بۆ ا-شەرطە و مەرج گرتنە، واتە هاتنەدی و پەیدا بوونی مانا و ناوەڕۆکی رستەیەك ، بەسراوە بەپەیدا بوون و هاتنەدی ماناو رستەیەکی تر، وەك: ١-ئەگەر ئەوان لەگوناهی گەورە کۆتایی پێ‌بهێنن. ٢-چاوپۆشیان لێ‌ئەکرێ لەوەی کە رابوورد-لێرەدا کاتێ رستەی دووم دێتەدی کە رستەی یەکەم هاتبێتەدی-.

(٣)ب- إن هاتووە بەواتای نا، وەك کافر و بێ‌باوەڕ نیە لەناو فێڵ خەڵەتاندندا نەبێ، ئەمە بۆ ئیسمە، ئێمە جگە بەرەو چاکتر نەبێ نیازمان نەکردووە، ئەمەش بۆ ئەوەیە إن چوەتە سەر فیعل، ئەم دووانە لەجێی ما دانیشتون، (٤)ج-إن ی زیادەیش هەیە چ لە رستەی ئیسمیدا چ لە رستەی فیعلیدا.

{الثالثُ: او} من حروفِ العطفِ أ- {للشكِّ} من المتكلِّم نحو: ﴿ قالوا لبثنا يوماً او بعض يوم ﴾[1] {والإبهام} على السّامع نحو: ﴿ اتاها امرنا ليلاً او نهاراً ﴾[2] {والتخيير} بينَ المعطوفينِ سواءٌ إمتنعَ الجمعُ بينهما نحو: خُذ من مالي ثوباً او ديناراً ، ام جاز نحو: جالسِ العلماء او الوعّاظ، و قصر إبن مالك و غيرَهُ التمييزَ على الأوّلِ و سمّو: الثاني بالإباحَةِ[3] {ومطلقُ الجمعِ} كالواوِ نحو:

وقدْ زعمتْ ليلى بأنّي فاجرٌ * لنفسي تقاها او عليها فجورها   أي وعليها[4]

{والتقسيم} نحو: الكلمَةُ إسمٌ وفعلٌ و حرفٌ اي مقسَّمَةٌ الى الثلاثة تقسيم الكلّي الى جزئياتِه فيصدُقُ على كلٍّ منها[5] {وبمعنى الى} فينصبُ بعدها المضارعُ بأن مضمره نحو: لألزمنَّك او تقضيني حقّي، اي الى ان تقضينيه[6]

---

(١)سیٚهەم او یەكێكە لە پیتەكانی عەطف و پەیوەند بەستنی پاش و پێشی . بۆ چەند مانایەك هاتووە: أ- بۆ گومان لەلایەن قسەكەرەوە ، وەك دەڵێن: رۆژێكی تەواو لە گۆڕدا ماوینەتەوە یان هەندێك رۆژ، نازانین كام ئەندازەیە.

(٢)ب-یاخود بۆ ئەوەیە شتەكە لە گوێگر گوم بكا وەك: فەرمانی عەزابی ئێمەیان بۆ هات لەشەودا یاخود لەرۆژدا، قسەكەرەكەی خۆی ئەیزانێت بەلاّم لە گوێگرەكەی ون دەكات. (٣)بۆ سەرپشك كردنی قسە لەگەڵ كراوەككە لەگەڵ پێش و پاشی (او) ەكەدا، ئیتر كەیفی خۆیەتی قەدەغەبێ هەردوكیان كۆبكرێنەوە ، وەك: كراسێك، یاخود دینارێك لەماڵی من وەرگرە. تەنها مۆڵەتی یەكێكیانیداوە، یاخود دروستە هەردوكیان كۆبكرێنەوە، وەك هام نشینی زانایان بە یاخود ئامۆژگاری كەران بە، ئەتوانی لەگەڵ هەردوكیان هام نشینی بی، إبن مالك و زانایانی تریش سەرپشكی یەكەمیان قەبوڵ بووە و بەس، سەرپشكی دووەمیانبە تخییر ناو نەبردووە، بەڵكو بە إباحە ناویان ناوە

(٤)د-هەروەك واو بۆ كۆیپێشو و پاشیخۆیەتی ، بیٚ ئەوەی لەپێشا ئەمیان یا ئەویان، وەك بێگومان لەیلا وتویەتی: من خراپەكارم بیٚبەڵگە ، بەخەڵك چی، چاكەی خۆم سودی بۆ خۆم دەبیٚ و خراپەی خۆیشم زیانی هەر بۆ سەر خۆم دەبیٚ، ئەم ئەوە. بەواتای واوە. (٥)هـ-هاتووە بۆ دابەش كردن وەك : كەلیمە -وشە- یا ئیسمە یاخود فیعلە یاخود حەرفە، واتە دابەش دەكریٚ بۆ ئەو سیٚ بەشە، بە دابەش كردنی كوللی بۆ جوزئەكانی ئەك -كولل بۆ جزء- كەوابوو كەلیسە دەبرِیٚ بەسەر هەریەك ئەو سیانەدا. (٦)و-جاری واهەیە (او) بەمانا (الى) یە ئەو كاتە فیعلە مضارع لەدوایەوە مەنصوب دەبیٚ، بە ئەنێكی شاراوە ، وەك سوێند بە خوا جێت ناهێڵم تاماڤی خۆم بۆ جیٚبەجیٚ ئەكەیت.

{والإضرابِ كَـبلْ } نحو: ﴿ وارسلناهُ الى ماةِ الفٍ او يزيدون، اي بل يزيدون ﴾[1] {قـال الحريـري: والتقريب نحو: ما ادري اسلمَ او ودَّعَ} هـذا يقالُ لمن قصـر سـلامه. كالوداع فهو من تجاهُلِ العارف ، والمرادُ تقريبُ السلام لقصرِهِ من الـوداع، ونحـوه مـا ادري اأذن، اواقامَ ، يقالُ لمن اسـرَعَ في الأذانِ كالإقامـةَ[2] {الرابعُ: اي بـالفتح} للـهمزَةِ {والسكون} للياءِ {للتفسيرِ} بمفرَد نحو: عندي عسجَدٌ اي ذهـبٌ، وهـو عطف بيانٍ او بدلٌ او بجملةٍ نحو: وترميننى بالطَرفِ اي انتَ مُذنبٌ * وتقلينني لكن إيّاك لااقلي

فانتَ مذنبٌ تفسيرٌ لما قبلَهُ ، إذ معناهُ تنظـرُ الي نظر مغضبٍ، ولايكونُ ذلك إلاّ عن ذنبٍ ، واسم لكن ضميرِ الشـأنِ، وقـدّمَ المفعـولَ مـن خبرهـا لإفـادَةِ الإختصـاصِ اي لااتركك بخلاف غيرك[3]

---

(١)ز–جاری واش هەیە (أو) بەمانا (بل)ە ، بۆ ئینتیقالـە لە یەکەمەوە بۆ دووەم ، وەك: یونس ﷺ پێغەمبەرمان نارد بۆ صەد هەزار کەس –یەکەم جار ئەگەر یەکێ ببیبسێ وادەزانێ صەد هەزار کەس، بەڵام لە واقیعدا لە صەد هەزاریش زیاتر ئەبوون– یەکەم پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵکز هەواڵەکە لـە گومـانی خەڵکـەوە ئەگوێزرێتـەوە بـۆ راسـتی و بێگومـان. (٢)ج–جـاری واهەیـە (أو) بـۆ ئەوەیـە پێـش و پاشـی خـۆی لەیـەك نزیـك بکاتەوە وەك: نازانم سڵاوی یاخوا حافیزی کرد –واتـە نـازانم سەلامی هـاتنی کرد یـا سەلامی خوا حافیزی کرد–چونکە عادەت وایە لەکاتی هاتندا سڵاو هەر دەکری– ئەمە ئەوترێ بۆ کەسێ کەسەلامی هاتن و مانەوەی بەئەندازەی سەلامی خوا حافیزی بووە، کەوابووئەوەی وا دەڵێ وادائەنێ کە نـازانێ، چونکە ئەزانێ لە راستیدا چەند بـووە ماوەتەوە، مەبەستی ئەوەیە هاتنەکەی لەبەر کەمی و کورتی نزیك بکاتـەوە لەسـەلامی بەخێر چوون ، وەك ئەمەی پێشەوە وایە ئەم رستەیە: نـازانم بـانگی‌دا یـاخود قامـەتی کـرد، ئئەمـەش بۆ کەسێ دەوترێ بەپەلە پـەل بـانگ بڵـێ وەك قامـەت –چونکە بـانگ ئەبێ لەسەر خۆ بێ، بەڵام قامەت بەپەلە–

(٣)ح–چوارەم (اي) ا– یا بۆ راڤە و مانـا کردنـی یەك وشەیە بەیـــەك وشـە، وەك: (عسجد) م لاهەیە، واتە ئاڵتونم لاهەیـە، ئەوەی ئەکەوێتە دوای اي یا عەطــفە بەیانـە، یا بەدەلە، یا بۆ راڤەکردنی رستـــەیەکە بە رستەیەك، وەك: بەلاچاو تەقەم لێدەکــەی واتـە من گوناهبارم، تۆ قین لـەمن هەڵئـەگرێ بـەڵام مـن لـە تـۆ قـین هـەڵناگرم، واتـە بەچـــاوی تـوڕەوە بۆم دەڕوانـی ، ئـەوەش تەنـها بـۆ گوناهبـار دەبـێ، ئیسـمی لکنـە ضمیری شأنە، مفعول لەبەر إختصاص پێــشکەوتووە.، واتـە مــن تەنـها واز لـەتۆ ناهێنم بۆ خەڵکی‌تر وانیـــم.

{ولِنداءِ القريبِ او البعيدِ او المتوسطِ اقوالٌ} ويـدُلُ للأوّلِ ما في حديثِ الصحيحين في آخر اهلِ الجنَّة دخولاً و ادناهم منزلَـةً، فيقولُ اي ربِّ اي ربِّ وقد قالَ تعالى: ﴿ فإنّي قريب ﴾ وقيلَ لايدلُ لجوازِ نداءِ القريبِ بما للبعيدِ توكيداً[1] {الخامسُ: اي} بالفتحِ و {بالتشـديد} إسمٌ {للشـرطِ} نحـو: ﴿ ايَّمـا الأجلـين قضيـتُ فـلا عـدوانَ علـيَّ ﴾[2] {والإستفهامُ} نحو: أيُّكم زادتْهُ هذه إيماناً[3] {وموصولةً} نحو: ﴿ لننزعنَّ من كلِّ شيعةٍ أيُّهم اشدُّ ﴾ اي الذي هو اشدُّ[4] {ودالةً على معنى الكمالِ} بأن تكونَ صفةً لنكرةٍ او حالاً من معرفَـةٍ نحـو: مـررتُ برجـلٍ اي رجـلٍ او بعـالمٍ اي عـالمٍ اي كـامل في صفـات الرجوليَّةِ او العلمِ ومررتُ بزيدٍ اي رجلٍ او اي عالمٍ اي كـاملٍ في صـفات الرجوليّـة او العلمِ[5]

---

(١)اي: هاتووه بۆ بانگ کردنی کەسێك زۆر لەنزیکەوە بێ، یا زۆر لەدوورەوە بێ یاخود مام ناوەندي بێ، بۆ هەریەکێ قەولێ هەیە، بەڵگە لەسەر ئەوە کە بۆ بانگ کردنی کەسێ کە زۆر لەنزیکەوە بێ، ئەو وتەیە کە لە فەرمودەیەکدا بەخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە لەناو ئەو فەرموودەدا : ئەوەی لەدوای هەموو بەهەشتیەکان دەچێتە بەهەشت و جێی لەهەموان نزمترە دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ، ئەی پەروەردگارم... خوای گەورەش دەفەرموێ: بێگومان من زۆر نزیکم ، کەوابوو ئەو ئەیە بۆ زۆر نزیکێك بەکاردێ، وتراویشە ئەم فەرمودەیە دەلالەت ناکا لەسەر ئەوە کەوابوو بۆ هاوار لە نزیکێکە، چونکە دروستە بانگ لەنزیکێك بکرێ بەوەی بانگی دوورێکی پێدەکرێ، لەبەر دوپات بوونەوە، –واتە بەئەندازەی هاوار بۆ دوورێك بانگت کردوە لەوە نزیکە– (٢)٥–(ايّ) وە، ا– ئیسمە، حەرف نیە، وەك ئەوانەی پێشوو، بۆ شەرط و مەرج گرتنە، وەك: ئەگەر هەریەك لەو دووماوە دیاریکراوەم جێبەجێ کرد، ئەوە هیچ ستەم و دەستدرێژێکم بەسەردا دانانرێ. (٣)ب–بۆ داوای حاڵی کردنە، وەك: کێ لە ئێوە ئەم ئایەتانە ئیمان وبڕوای زیادکردووە. (١)ج–جاری واهەیە موصولەیە وەك: سوێند بە خوا لە هەموو تاقمێك کامیان توندترو کەللەرەق تر بووە دای ئەڕنێز لەتاقمەکەی و جیای ئەکەینەوە،اي، بەمانا ،الذي..

(٢)د–جاری واهەیە اي بۆ ئەوەیە دەلالەت بکا لەسەر مانای کەماڵ، بەم شێوە پێشەکەی نەکیرەبێ و ببێ بەصیفەتی، یاخود پێشەکەی مەعریفە بێ و ببێ بەحاڵ بۆی، وەك: دام بەلای پیاوێکدا تەواو پیاو بوو، یاخود بەلای زانایەکدا تەواو زانا بوو، واتە هەموو صیفەتی پیاوەتی تێدا بوو ، یاخود هەموو صیفەتی زانایی تێدا بوو، یاخود دام بەلای زەیددا لەکاتێکدا تەواو پیاو بوو، واتە هەموو صیفەتێکی پیاوەتی

{وصلَةً لنداء مافيهِ ال} نحو: ﴿ ياايها النّاسُ ﴾[1] {السادس: إذ إسمٌ} للماضي ظرفاً نحو: جئتُكَ إذ طلعتِ الشّمسُ اي وقت طلوعِها، {ومفعولاً بهِ} نحو: ﴿ واذكروا إذ انتم قليلاً فكثّرَكُمْ ﴾ اي واذكروا حالكم هذه، {وبدلاً من المفعولِ به} نحو: ﴿واذكروا نعمةَ اللهِ عليكم إذ جعل فيكم انبياءَ ﴾ إلخ اي واذكروا النعمةَ اللّتي هي الجُمَلُ المذكور[2] ومضافاً اليها إسم زمانٍ نحو: ﴿ ربَّنا لاتُزغْ قلوبنا بعدَ إذ هديتنا ﴾[3] {وللمستقبَلِ في الأصحِّ} نحو: ﴿ فسوفَ يعلمون إذ الأغلالُ في اعناقهم ﴾ وقيلَ: ليستْ للمستقبلِ واستعمالُها فيهِ في هذهِ الآيةِ، لتحقّقِ وقوعِهِ كالماضي[4] {وترد للتعليلِ حرفاً} كاللامِ او {ظرفاً} بمعنى وقت، والتعليلُ مُستفادٌ من قوَّةِ الكلامِ قولانِ: نحو: ضربتُ العبدَ إذ اساءَ، اي لإسائتِهِ ، او وقتَ إساءَتِهِ وظاهر انّ الضربَ وقتَ الإساءةِ لأجلِها[5]

---

تێدا بوو، یادام بەلای زەید دا لەکاتێکدا تەواو زانا بوو، واتە هەموو صیفەتێکی زانایی تێدا بوو. (١)ھ-جاری واش هەیە بۆ ئەوەیە ئیسمێك کە ئەلی هابەسەرەوە ئەتوانێ بانگی بکەی، دەخۆ یا بۆ تەعریفە نابێ بۆ ئیسمێك ئەلی پێوە بێ، ایُّ ئەخرێتە بەینیانەوە بۆ ئەوەی بانگەکەی بکەیت وەك ئەو میثالە.

(٢)٦-شەشەم:إذ ئیسمە حەرف نیە، بۆ کاتی رابوردوو چەند حالەتێکی هەیە، ا- جاری وا هەیە مفعول فیە وەك: هاتم بۆ لات لەکاتێکدا، رۆژ هەڵهات. ب-ئەبێ بەمفعول بە وەك: یادی ئەو حالەتان بکەن کەم بوون و زۆری کردن. ج-ئەبێتە بەدەل و جێنشینی مەفعول بە ، وەك: یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ، کە بریتیە لەوەی چەند پێغەمبەرێکی لەناو ئێوەدا دروست کرد. (٣)د-جاری واش هەیە ئەبێتە مضاف الیەبۆ ئیسمی زەمان، وەك: ئەی پەروەردگارمان لامان مەدە لەڕاست دوای کاتی رێنمویی بونمان.

(٤)جاری واش هەیە بۆ داهاتوو دەبێ بەلای قەولی ئەصەحەوە، وەك: جا خۆ لەمەولا دەزانن کاتێ کۆت و زنجیرەکان لە نێو گەردنیاندا ئەبێ و دەستیان دەبەسرێتەوە بەملیانەوە، وتراویشەکە: إذ بۆ داهاتوو نابێ، بەڵام لەم ئایەتەدا کە بەکارهاتووە بۆ داهاتوو بەهۆی وشەی: سوف، ئەوە لەبەر ئەوەیەکە ئەو روداوە بێگومان دێتەدی، واتە إذ بۆ رابودوو ئەبێ بەڵام یا بەحەقیقی بۆ ماضی ئەبێ یا بەتەئویل یا بۆ تەئویلە. (٥)و-جاری واهەیە بۆ ئەوەیە ئەبێتە بەڵگە بۆ پێش خۆی ، ئیتر ئەو کاتە بەحەرف حیساب بکرێ وەك لام ، یاخود ظەرف بێ بەمانا کات بێ واتە لەجێی وشەی وقت دابنیشێ، قەولی یەکەم دەڵێ: بەمانا لامە، قەولی دووەم دەڵێ:

{وللمفاجَاةِ} بان تكونَ بعدَ بينا او بينما {وفاقاً لسيبويه} حرفاً كما إختارَهُ إبن مالك، وقيلَ ظرفُ مكان وقال ابو حيَّان ظرفُ زمانٍ واستغنى المصنِّف عن حكايَةِ هذا الخلاف بحكايَةِ مثلِه في إذا الأصليَّة في المفاجأة مثالُ ذلك بينا او بينما انا واقفٌ إذ جاءَ زيدٌ، فاجأ مجيئَهُ وقوفي مكانَهُ او زمانَهُ، وقيلَ ليستْ للمفاجأةِ وهي في ذلك زائدةٌ لإستغناء عنها كما تركها كثيرٌ من العرب[1]

{السابعُ إذا للمفاجئة} بأن تكون بين جملتينِ ثانيهما إبتدائيّة ، {حرفاً وفاقاً للأخفشِ و إبن مالك وقال المبرِّد و إبن عصفور ظرفُ مكانٍ والزّجاج و الزمخشري ظرف زمانٍ} مثالُ ذلكَ خرجتُ فإذا زيدٌ واقفٌ، اي فاجأ وقوفهُ خروجي او مكانهُ او زمانهُ ومن قدر على القولينِ الأخيرينِ ففي ذلكَ المكانِ او الزمانِ وقوفُهُ إقتصر على بيانِ معنى الظرف وترك معنى المفاجأة وهل فيها زائدةٌ لازمة او عاطفةٌ قولانِ[2]

---

بەمانا وەقتە، لەم کاتا کە وەك: لەو منداڵەم دا لەبەر ئەوەی کاری خراپە ئەنجام ئەدا، یاخود لەکاتی ئەنجامدانی کارە خراپەکەیدا لێم دا، ئاشکراشە لێدان لەکاتی خراپەکردندا هەر لەبەر کارە خراپەکەیە. (١)جاری واهەیە هاتووە بۆ ئەوەی پێشوو پاشەکەی کتوپڕ بەیەك بگەیەنێ،ئەمەش کاتێ دەبێ لەدوای وشەی بینا یا بینما ،وەبێ ، سیبەوەیهی موافقی ئەمەیە کە إذ بۆ ئەم مانایە، ئیتر کەیفی خۆیەتی بە حەرف حیساب بکرێ وەك إبن مالك ئەم قەولەی هەڵبژاردوە، هەندێکیش دەڵێن:ظەرفی مەکانی ابو حیانیش وتویەتی: لەم کاتا ظەرفی زەمانە، دانەر بەپێویستی نازانێ جیاوازی زانایان باس بکات لێرەدا ، چونکە لەباسی (إذا) دا باسیان دەکا، (إذا)ش ئەصلە لەم مانایەدا وێنەی ئەمەش وەك: لەکاتێکدا من وەستا بووم کتوپڕ زەید هات، واتە هاتنی زەیدو وەستانی من موفاجئەی بەکتریان کرد، یاخود موفاجئەی مەکانەکەی کرد، یا زەمانەکەی کرد، هەندێك وتویانە إذ بۆ موفاجئە نابێ ، ئەی چی دەکا لەم میثالەو چەندەهایتر؟ لەمانەدا زیادەن چونکە پێچویستت نابێ پێیان، چونکە زۆربەی عەرەب هەر لەو میثالانەدا نەیان وتووە ، هەر وتوویانە: بینما انا واقفٌ جاءَ زيدٌ، ئیتر (إذ)یان نەوتووە.

(٢)حەوتەم (إذا)یە هاتووە بۆ چەند مانایەك: أ- بۆ مفاجەئەو کتوپڕیو بەیەکا هەڵتەقین بەم شێوەیە لەنێوان دوو رستەدا بێ، بەڵام دووەمیان رستەیەکی سەربەخۆ سەرەتایی بێت، ئەم (إذا)ی موفاجەئە حەرفە، ئەخفەش و ئیبن مالك موافەقەیان لەسەر کردووە، مبردو ئیبن عصفور وتوویانە: ظەرفی مەکانە، زەجاج و زەمەخشەری وتوویانە: ظەرفی زەمانە، وێنەی ئەوەش: هەر چوومە دەرەوە وەستانی زەید کتوپڕ

{وترد ظرفاً للمستقبلِ مضمنةً معنى الشرطِ غالباً} فتجابُ بما يصدرُ بالفاءِ نحو: ﴿إذا جاء نصر اللهِ..﴾ الآية والجوابُ ﴿فسبِّحْ...﴾ الخ وقد لاتضمن معنى الشرطِ نحو: آتيكَ إذا إحمرَّ البسرُ أي وقتَ إحمرارِه[١] {وندر مجيئُها للماضي} نحو: ﴿وإذا راو تجارةً او لهواً﴾ الآية فإنها نزلت بعدا الرؤيةِ و الإنفضاض[٢] {والحال} نحو: ﴿واللليلِ إذا يغشى﴾ فإنّ الغشيانَ مقرن الليلِ[٣]

{الثامن الباءُ للألصاقِ حقيقةً} نحو بهِ داءٌ اي الصق به {و مجازاً} نحو: مررتُ بزيدٍ اي الصق مروري بمكان يقربُ منه[٤]

---

هەڵتەقی بە دەرچوونەکەمەوە، بەڵام کەســـانێك هەن لەســـەر دوو قەولە دواینەکە ئەم رستەیە تەقدیر دەکەن چوومە دەرەوە لەو شوێنا یا لەو کاتا، زەید راوەستابوو، ئەوە تەنها مانای ظەرفەکەی کردووە مانـــای موفاجەئەکەی وازلێهێناوە، ئەی ئایا ئەو فیٚ هابەسەر (إذا) کەوە زیادەیەو هەر دەبیٚ ببیٚ؟ یاخود فیٚی عاطیفەیە، ئەوە دوو قەولە یەکێکیان دەڵیٚ: زائیدەیە ئەویشیان دەڵیٚ: عاطیفەیە -قەولی ئەصەح ئەوەیە (إذا)ی موفاجئە بۆ مشارەکەیە، واتە بۆ مفاجئەو کتوپرینە وەك مەکان و زەمانیشی تێدایە- (١)جاری واهەیە دێت ئەبیٚ بە ظەرف بۆ داهاتوو مانای شەرط دەگرێتە خۆی، زۆربەی کات وایە جا ئەو (إذا) وەڵام دەدرێـــتەوە بەرستەیەك سەرەتاکەی دەبیٚ بەفیٚ دەست پیٚ بکا، وەك: ﴿إذا جاء نصر اللهِ..﴾، ﴿فسبِّحْ...﴾ وەڵامەکەیەتی جاری واش هەیە مانای شەرط ناگرێتە خۆی، وەك: دێم بۆ لات (إذا إحمرَّ البسرُ) واتە کاتی سور بوونی خورما.

(٢)ج- بەکەمی (إذا) دێت بۆ کاتی رابوردوو وەك: کاتێك کە چاویان کەوت بەبازرگانێك یاخود بەلەهـــوێك، تاکۆتایی ،لێرەدا بۆ رابردووە، چونکە ئەم ئایەتە دوای بینینی گەڕانەوەی کاروانـــە بازرگانیەکەو بڵاوبوونەوەی یاران هاتووەتە خوارەوە. (٣)د-هـــەروەها بەکەمیش هاتووە بـــۆ زەمانی حاڵیش، وەك سـوێن بەشەو کاتیٚ کە بەشیٚ لە دونیا دا ئەپۆشیٚ چونکە داپۆشینی مقارن و هاوتایی شەوە، شتێك شتێکیتر دائەپۆشیٚ ئەبیٚ هاوتای یەك بن، نابیٚ ســـەرەکە لـــەگەڵ سەرپۆشەکەدا پێکەوە بن.

(٤)هەشتەم بێیە بێش بۆ چەند مانایەك هاتووە: أ-بۆ نوساندنی پێش و پاشی خۆیەتی چ پێوە نوساندنی حەقیقی بیٚ وەك: (بە داءٌ) واتە: دەردی پێوە نوساوە، وەچ پێوە نوساندنی مەجازی بیٚ وەك: (مررتُ بزیدٍ) واتە تێپەڕینەکەم نوساند بە شوێنێکەوە نزیك بوو لەزەیدەوە.

{والتعديةُ} كالهمزةِ نحو: ﴿ ذهب اللهُ بنورهم ﴾ اي اذهبَهُ[1] {والإستعانةُ} بأن تدخل علـى آلـةِ الفعـلِ نحـو: كتبـتُ بـالقلم[2] {والسـببيّة}: ﴿ فكـلاً اخذنـا بذنبِـه ﴾[3] {والمصاحبة} نحو: ﴿ قد جاءكم الرّسولُ بـالحقِّ ﴾ اي مصاحبـاً لـهُ[4] {والظرفيَّـة} الزمانية او المكانية نحو: ﴿ ولقد نصركم اللهُ ببدرٍ ﴾﴿ نجّيناهم بسحَرٍ ﴾[5] {والبدليّة} كما في قول عمر ﷺ: إستأذنتُ النبيَّ ﷺ في العمرةِ فأذنَ وقـالَ: لاتنسـانا يـااخي مـن دعائك، فقالَ كلمةً مايسرُّني انَّ لي بها الدنيا اي بدلَها رواهُ ابوداود و غيرَهُ واخي ضبط بضمِّ الهمزةِ مصغراً لتقريبِ المنزلَة[6] ج-{والمقابلة} نحو: إشتريتُ الفرسَ بألف. ط-{والمجاوزَةُ} كعن نحو: ﴿ يومَ تشقّقُ السماءُ بالغمامِ ﴾ اي عنـهُ، ي-{والإستعلاء} نحو: ﴿ وإنّ من اهلِ الكتابِ منْ إن تأمنـهُ بقنطارٍ ﴾ اي عليـهِ، ك{والقسمُ} نحـو: بالله لأفعلنَّ كذا، ل-{والغايةُ} كإلى نحـو: ﴿ وقد احسنَ بـي ﴾ اي اليَّ، م-{والتوكيد} نحـو: ﴿ وكفى باللهِ شهيداً ﴾﴿ وهزِّي اليكِ بجذعِ النّخلَةِ ﴾ والأصلُ كفى اللهُ و هزيّ جذعَ[7]

(١)ب-جارانێکیش هاتووە بۆ ئەوەی فیعلی لازم بکا بە متعدی ، وەك هەمزە چۆن ئەیکا، ﴿ ذهب اللهُ بنورهم ﴾ (٢)ج-هاتووە بۆ کۆمەکی کردنی ئەنجامدانی کارێك واتە بڕواتە سەر ئامێری فیعلەکە نەك داخوازی کەری فیعلەکە وەك: بەقەڵەم نوسیم.

(٣)د-جاری واهەیە (بیٚ) بۆ ئەوە ئەبیٚ دواکەی خۆی بکا بەهۆ بۆ پێشەکەی خۆی ، وەك هەموو یەکێکمان گرت بە هۆی گوناهیەوە (٤)هـ-جارانێکیش هاتووە بۆ ئەوەی پێشەکەی بکات بەهاوڕێی پاشەکەی، واتە: دروست بیٚ لەباتی (بیٚ) (مع) دابنرێت، یاخود دروست بێت مەجرورەکەی بکەیت بە حاڵ، وەك بێگومان ئەم پێغەمبەرەتان بۆ هاتووە لەگەڵ حەقدا و هاوڕێیەتی، (٥)و-جار جارێکیش هاتووە بۆ ظەرفیەت چ ظەرفی مەکان و شوێن بیٚ، وەك: بێگومان خوا ئێوەی سەرخست لە ناوچەی بەدردا، وە چ ظەرفی زەمان بیٚ، ئێمە رزگارمان کردن لەبەرە بەیاندا.

(٦)جاریواش هەیە بۆئەوە هاتووە ئەگەر وشەی بەدەل لەجیٚکەیدا دابنێیت دروستە وەك ئەڵێ مۆڵەتم خواست لە پێغەمبەرﷺ بۆئەوەی عومرەیێك بکەم ، ئەویش مۆڵەتی فەرموو، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئێمەت لەبیر نەچیٚ برا بچکۆلەکەم لەبەشێکی پارانەوەکەتدا، جاعومەر فەرمووی: ئەم فەرمودەی پێغەمبەر؛ وشەیەکە شادمانم ناکا لەباتی ئەو وشە هەموو دنیام هەبیٚ ، اخیَّ، هەمزەکەی مضمومە و بچوك کراوەتەوە لەبەر نزیك کردنەوەی برای بچوك بەبرای گەورە (٧)ج-جاری واش هەیە بۆ بەرامبەر پێکردنە وەك ئەم ئەسپەم کری بەرامبەر بە هەزار ط-جاری واش هەیە بۆ موجاوەزەو

{وكذا التبعيض} كمنْ {وفاقاً الأصمعي والفارس وإبن مالك} ﴿ عيناً يشربُ بها عباد الله ﴾ أي منها ، وقيلَ: ليست للتبعيضِ و يشربُ في الآيةِ بمعنى يروي او يلتذُّ مجازاً و الباءُ للسببيّة[1]

{التاسعُ :بلْ للعطف} فيما إذا وليها مفردٌ سواءٌ اوليتَ موجباً ام غيرَ موجبٍ ففي الموجَبِ نحو: جاء زيدٌ بلْ عمرو، واضربْ زيداً بلْ عمرواً ، تنقلُ حكمُ المعطوفِ عليه فيصيرُ كأنّهُ مسكوتٌ عنهُ الى المعطوفِ وفي غيرِ الموجَبِ نحو: ماجاء زيدٌ بلْ عمرو، ولاتضربْ زيداً بلْ عمرواً تقرَّرَ حكمُ المعطوف عليه و تجعلُ ضدَّهُ للمعطوف[2]

---

لێجیابوونەوەیە، وەك (عن) وەك: لەرۆژێكدا ئاسمان دەردەكەوێ لەهەور، هەوری لێلائەبرێ و ئاسمان دەرئەكەوێ. ی-جاری واش هەیە بەمانا (على)یە بۆ بەسەرەوە بوونە وەك: هەندێك لە كەسانی پەیامدار ئەگەر بیكەی بە ئەمیندار بەسەر كوپەیێك ئاڵتون بۆت ئەگەڕێنێتەوە. ك-جاری واش هەیە بۆ سوێنە وەك: سوێن بەخوا ئەو كارە دەكەم، ل- جاری واش هەیە بۆ غایە و كۆتایی مەبەستە، وەك: بێگومان هەر چاكەی كردووە تا بەمنیش گەیشتووە، م-جاری واش هەیە بۆ دوپات كردنەوەو گرنگی دانە بەو شتەی تیایدا زیادكراوە، جاری وا هەیە لە فاعیلدا زیادكراوە، جاری واش هەیە بۆ بەسەر مەفعولەوە زیادكراوە.

(١)جار جارێ بۆ جیاكردنەوەی هەندێ ئەبێ لە هەندێكیتر ، واتە (بێ) لەباتی هەندێ ئەبێ وەك (مِنْ) یش وایە، ئەو سێ زانایە رایان وایە، وەك: (یشربُ بها) واتە: هەندێكی لێ دەخواتەوە، كۆمەڵێك وتوویانە: (بێ) بەمانا هەندێ نەهاتووە، بەڵام یشربُ لەم ئایەتەدا مانایەكیتری مەجازی هەیە و بەوە لێك دەدرێتەوە بەمانا تێر ئاوكردنە، یابەمانا لەزەت و تامی لێوەردەگرێ، كەوابوو لەوكاتەدا (بێ) بۆ هۆكارییە و سەبەبە،

(٢)نۆهەم لەو حەرفانە (بلْ) بەلیش بۆ چەند مانایەك هاتووە: أ- بۆ عەطفە لەرستەیەكدا كە موفرەدی بەشوێندا هاتبێ، ئیتر كەیفی خۆیەتی ئەو رستەی تیایەتی موجەب و نەرێیە، یاخود غەیرە موجەب و نەرێیە، بل لەرستەی موجەبدا حوكمی معطوف علیه ئەگوێزێتەوە بۆ لای معطوفەكە، وای لێدێ كە بێدەنگەی لێكرابێ، وەك: زید هات، نەخێر حەقم بەسەر زەیدەوە نیە هاتبێ یا نەهاتبێ عەمر هاتووە ، یا بدە لە زەید، نەخێر حەقم بەسەر زەیدەوە نیە لێی دەدەی یا لێی نادەی لە عەمر بدە، وەلە رستەی غەیرە موجەبدا حوكمی معطوف علیە ئەسەلمێنێت و ثابتی دەكات، وە پێچەوانەو دژی ئەو حوكمە دەدرێت بە معطوفەكە ، وەك: زەید نەهاتووە، عەمر

{والإضرابُ} فيما إذا وليها جملةٌ {إمّا للإبطال} لما وليتهُ نحو: ﴿ ام يقولونَ به جِنَّة، بلْ جاءهم بالحقّ ﴾ فالجائي بالحِّ لاجنونَ به[1] {او للإنتقالِ من غرضٍ الى آخر} نحو: ﴿ ولدينا كتابٌ ينطقُ بالحقّ وهم لايظلمون بلْ قلوبهم في غَمرة من هذا ﴾ فما قبل بل فيهِ على حالهِ[2] {العاشرُ بيدَ} إسمٌ ملازمٌ للنصبِ و الإضافةِ الى ان وصلتها {بمعنى غير} ذكرهُ الجوهري وقال: يُقالُ: إنّهُ كثيرُ المالِ بيدَ إنّهُ بخيلٌ[3] {وبمعنى من اجل} ذكرهُ ابو عبيدة وغيرُهُ {وعليه} حديثُ : (انا افصحُ منْ نطقَ بالضّادْ {بيدَ انّي من قريشْ)} اي الذينَ هم افصحُ من نطقَ بها وانا افصحهم و خصّها بالذّكرِ لعسرها على غيرِ العربِ والمعنى انا افصحُ العربِ و بهذا اللفظ الى آخر ماتقدّم اوردهُ اهلُ الغريبِ، قيلَ: إنّ بيدَ فيه بمعنى غيرَ و انّهُ من تأكيد المدحِ بما يشبهُ الذمّ[4]

---

هاتووه، له زەید مەده له عەمر بده، -له غەیره موجەبیشدا پێش و پاشی یەك مەطلوبه، له موجەب و غەیره موجەبدا میثالی هێناوەتەوه یەكێكیان بۆ خەبەریە ئەویشیان بۆ ئینشائیه- . (۱)-لەم كاتەدا بەل حەرفی (ابتدائیة) نەك عاطفە- (إضراب) یانی لێهەڵگەڕاندنەوەو پشت كردن لەشتێ -جاری واش هەیە (بلْ) بۆ (إضراب)ە، ئەویش كاتێ ئەبێ كە جوملەیێك و رستەیێك بێ بەشوێنیا- ئەگەر موفرەدی بەشوێنا هات (بل) عاطیفەیە، ئەگەر جوملە بەشوێنیا هات بۆ(إضراب)ە، جا (بل)ی (إضراب) بۆ دوو مانایە: أ- یابۆ پوچەڵ كردنەوەی پێشەكەی خۆیەتی بەوەی دوای خۆی دەكاتە بەڵگەی پوچەڵ بوونەوەی پێش خۆی، وەك: یاخود دەڵێن: شێتایەتیەكی پێوەیە، نەخێر وانیە چونكە حەقی بۆ هێناون، ئەوەی حەق بێنێ هیچ جۆرە شێتایەتیەكی نابێ تیابێ، (۲)ب-یاخود بۆ گواستنەوەیە لەمەبەستێكەوە بۆ مەبەستێكیتر ، وەك: لامانە ئەو كیتابەی كە بەحەق دەدوێ لەبارەی كردە كارەكانیەوە، وەئەوان ستەمیان لێناكرێ نەك هەر ئەوە بەڵكوو دڵەكانیان لەبارەی ئەم زیندو بوونەوەیە لەناو سەختی سەرەمەرگدان، -ئەمە سێهەواڵە- كەوابوو ئەوەی لەپێش (بلْ)ەكەوەیە هەر لەسەر حاڵی خۆیەتی.

(۳)دەهەم (بیدَ)یە ئیسمە هەمیشە ئەبێ منصوب بێ و ئیضافە بكرێ بۆ لای إنَّ و إسم و خەبەرەكەی، بەمانا غەیرە، ئەم مانایە جەوهەری باسیكردووەو وتوویەتی: ئەوتریێ فلانەكەس ماڵی زۆرە، بەڵام ئەوەندە هەیە جگە ئەوەنەبێ زۆر بەخیلە. (٤)وەبەمانا (من اجلِ)، لەبەر ئەوەیە، ئەبو عبیدەو غەیری ئەبو عبیدەش ئەم مانایان باسكردووە، لەبەر ئەو مانایە ئەم فەرموودەیە ماناكراوە: من رەوانبێژترین كەسم لەنێوان ئەوانەی كە تلفظ بەضاد دەكەن، چونكە من لە قورەیشم، واتە ئەوانیش

{الحادي عشر ثمَّ حرفُ عطفٍ للتشريك} في الإعرابِ والحكم {والمهلَةِ على الصحيح}[1] {وللترتيبِ خلافاً للعبادي} تقولُ: جاءَ زيدٌ ثمَّ عمرواً إذا تراخى مجيئ عمروٍ من مجيئ زيد، وخالفَ بعضُ النّحاةِ في إفادَتها الترتيبَ كما خالَفَ بعضُهم في إفادَتها المهلَةَ قالوا: لمجيئها لغيرِهما كقولِه تعالى: ﴿ هو الذي خلقكم من نفسٍ واحدَةٍ ثمّ جعل منها زوجها ﴾ والجعلُ قبلَ خلقنا ، وكقولِ الشاعر:

كهزِّ الرديني تحتَ العجاجِ * جرى في الأنابيبِ ثمَّ إضطرب

و إضطراب الرّمح يعقبُ جري الهزِّ في انابيبه[2] واجيبَ بأنّهُ توسعَ فيها بإيقاعها موقع الواوِ في الأوّلِ والفاءَ في الثّاني و تارةً يُقال إنّها في الأوّلِ ونحوه للترتيب[3]

رەوانبێژترین کەسن کە تلفظ بەضاد دەکەن، منیش لە نێوان ئەواندا لە هەموویان فەصیح ترم، پێغەمبەر ﷺ لەناو پیتەکاندا ئەمەی بەتایبەت باس کرد، چونکە ئەوەی عەرەب نەبێ گرانە لەسەر زوبانی تلفظ پێ بکا، ماناکەی بەکورتی وای لێدێ: من فەصیحترین کەسم لەناو عەرەبدا بەم شێوەش -لەناو عەرەبدا- تا کۆتایی فەرموودەکە زانایانی فەرموودە کە تایبەتمەندن لە فەرموودەی غەریبدا واش ریوایەتیان کردووە، کۆمەڵێك وتوویانە: بید لەو فەرموودەیەدا بەمانا غەیرەیە، کەوابوو لەم فەرموودەیەدا بۆ بەهێزکرنی مەدحەکەیە، بەلاّم بەشتێ لە دیمەنی زەمدا بێ وەك زەم وابێ، -من فەصیحترین کەسم غێر من لە قورەیشم، واتە دواکەی پێشەکەی ئەسەلمێنێ-

(١)یانزەهەم (ثمّ)یە ، هاتووە بۆ عەطفی پاشەکەی بۆ پێشەکەی بۆ ئەوەی هەردوکیان بکا بەشەریك چ لەئیعرابدا و چ لەحوکمیشدا، بەلاّم ئەوەندە هەیەمۆڵەت و زەمانێکی لەنێوانیاندا هەیە لەسەر قەولی صەحیح.(٢)وەهاتووە بۆتەرتیبی پێش و پاشەکەی واتەیەك لەدوای یەك، بەلاّم عەببادی رای‌جیاوازە، وەك دەڵێن: زەید هات و پاشان عەمریش ، کاتێ هاتنی عەمر دوای زەید کەوتبێ، هەندێ لەزانایانی نەحو بەپێچەوانەی ئەمان وتوویانە: (ثمّ) تەرتیب ناگەیەنێ ، وەك هەندێکی تریش بۆ چونیان وابووە مۆڵەت ناگەیەنێ، وتوویانە بۆ غەیری ئەم دووانە هاتووە وەك خوا دەفەرموێ: خوا ئەو خوایە کەئێوەی دروست کرد لەیەك نەفس پاشان هەر لەونەفسە تاکەکەی تری بۆ دروست کرد، دەخۆ بێگومان دروست کردنی تاکەکەی لەپێش ئێمەوە درروست بووە، لەگەڵ ئەوەش لە ئایەتەکەدا کەوتووەتە دواوە مانای وایە بۆ تەرتیب نیە، یا وەك: شاعیر دەڵێ: وەك جولاّنی رم لەژێر تۆزو غوبارەوە، ئەچێ بەناو قەفەکانیدا پاشان ئەجولێ لەرزاندنی رمەکە دێت بەشوێن رۆشتنی جوڵکە بەناو

وامّا مخالفةُ العبادي فماخوذةٌ من قولِه كما في فتاوى القاضي الحسين عنه في قول القائلْ: وقفتُ هذهِ الضيعَةَ على اولادي ثمَّ على اولادَ اولادي بطناً بعدَ بطن، إنَّهُ للجمع كما قالَهُ هو و غيرُهُ فيما لو اتى بدلَ ثمَّ بالواوِ قائاينَ إنَّ بطناً بعدَ بطن، فيه بمعنى ماتناسلوا اي للتعميمِ و إنْ قالَ الأكثر إنَّهُ للترتيب[1]

{الثاني عشر: حتّى لإنتهاءِ الغايةِ غالباً} وهي حينئذٍ إمّا جارة لأسمٍ صريح نحو: سلامٌ هي حتّى مطلع الفجر او مصدرٌ مؤولٌ من ان و الفعل نحو: ﴿ لَنْ نَبرَحَ عليهِ عاكفِينَ حتّى يرجعَ إلينا موسى﴾ اي الى رجوعهِ و إمّا عاطفةٌ لرفيعٍ او دنيءٍ نحو: مات النّاسُ حتّى العلماء. وقدمَ الحجّاجُ حتّى المشاة، وإمّا إبتدائيةٌ بأن يبتدأ بعدها جملةٌ إسميّة نحو: فمازالتِ القتلى تمجُ دمائَها * بدِجلةَ حتّى ماءُ دجلَةَ اشكلُ او فعليّةٌ نحو: مرض فلان حتّى لايرجونَهُ[2]

---

قەفەكاندا. (١)وەلام دراونەتەوە: ئەوە فراوانی تیادا كراوە واتە: ئەو مەجازە لەئایەتەكەدا لە جێی واو دانراوە، وەلە شیعرەكەدا لە جێی فێ دانراوە كە بۆ یەكسەر بەشوێندا هاتنی معطوفەكەیە بۆ معطوف علیەكە، جاری واش هەیە ئەوترێ: لەیەكەم و هاو وێنەكانیدا بۆ تەرتیبی ذیكریە ، واتە تەنها بۆ ئەوەیە باسەكان یەك لەدوای یەك بۆت باس بكرێ، نەك ئەمەیان پێش ئەوەیان هاتۆتە بوونەوە.

(١)بەلام جیاوازیەكەی عیبادی وەرگیراوە لەو قسەیەی كە قازی حسین نەقلی كردووە لێیەوە، لەفەتاواكەیدا لەبارەی ئەم شێوە وەقفی كابراێكەوە دەڵێ: ئەم زەویەم وەقف كرد لەسەر منداڵەكانم، پاشان لەسەر منداڵی منداڵەكانم سك لەدوای سك، دەڵێ: ئەم (ثمّ)بەمانا واوە بۆ كۆكردنەوەی پێش و پاشەكەیەتی ، وەك عیبادی و غەیری عیبادی دەڵێن لەسەنەدێكدا: ئەگەر لەباتی (ثمّ) واوی وت: ئەوە دەڵێن: وشەی سك لە دوای سك لەو سەنەدەدا بەواتای: هەتا ئەوان وەچە بخەنەوە، واتە بۆ ئەوەیە هەموویان بگرێتەوەو هەرچەند زۆربەیان دەڵێن: (ثمَّ) بۆ تەرتیبە.

(٢)دوانزەهەم (حتّی)یە: هاتووە بۆ چەند مانایەك: أ-بۆ كۆتا هێنان بۆ نیازو مەبەست، ئەو (حتّی)یە لەم كاتەدا، یا ناوێك صەریح مەجرور دەكات، وەك: ﴿حتّی مطلع الفجر ﴾یا مەصدەرێك مەجرور دەكا كە ئەنیكی شاراوە فیعلەكە دەباتە تەئویلی مەصدەرەوە وەك: ﴿ حتّى يرجعَ إلينا موسى ﴾ واتە حتّی رجوعە یاخود (حتّی) عاطیفە ئەبێ عەطفی بەرز بۆ نزم، وەك: حتّى العلماء. یا عەطفی نزم بۆ سەر بەرز ، وەك: (حتّى المشاة)، حاجیان گەڕانەوە حتّی ئەوانەش كە بەپێ چوون بۆ حەج. یاخود (حتّی) سەرەتایی ئەبێت بەم شێوەیە رستەیەكی ئیسمی دێت بە شوێنیا،

{و للتعليلِ} نحو: اسلِمْ حتَّى تدخلِ الجنَّة اي لتدخلَها [1] {وندرَ للإستثناءُ} نحو:

ليسَ العطاءُ منَ الفضولِ سماحةً * حتَّى تجودَ وما لديكَ قليلٌ

اي إلا ان تجودَ و هو إستثناءٌ منقطِعٌ و يؤخذُ من صنيعِ المصنِّف انّ مجيئها ليس بغالبٍ ولانادر[2]

{الثالث عشر: ربَّ للتكثيرِ} نحو: ﴿ ربَّما يودُّ الذين كفروا لو كانوا مسلمين ﴾ فإنَّه يكثُرُ منهم تمنّي ذلكَ يومَ القيامَة إذا عاينوا حالَهم و حالَ المسلمين[3] {و للتقليلِ}:

الا ربَّ مولودٍ وليسَ لهُ ابُ * وذي ولدٍ لم يلْدَهُ ابوان

اراد عيس وآدم عليهما السلام[4] {ولا تختصُ بأحدِهما خلافاً لزاعم ذلكَ} زعم قومٌ انّها للتكثيرِ دائماً وكأنّهُ لم يعتدَّ بهذا البيتِ و نحوِهِ و آخرُ انّها للتقليلِ دائماً و قرَّرَهُ في الآيَةِ بأنّ الكفّار تدهشهم اهوالُ يومِ القيامَةِ فلا يفيقون حتّى يتمنّوا ماذُكرَ، إلاَ في احيانٍ قليلَة وعلى عدمِ الإختصاصِ قال بعضُهم: التقليلُ اكثرُ و إبن مالك نادر[5]

---

وەك: گ/ژراوەکان هەر مابوونەوە خوێنەکەیان لە دیجلەدا شەپۆلی دەدا * تاوای لێهاتبوو ئاوی دیجلە رەنگاو رەنگ بوو. پارستەیەکی فیعلی دێت بەشوێنیا وەك: فلأنەکەس نەخۆش کەوت تاوای لێ هات بەتەمای نەمان، (۱)ب-دواکەی ئەکا بەهۆ بۆ پێشەکەی، وەك:و دیندار بە بۆ ئەوەی بچیتە بەهەشت. (۲)ج-بەکەمیش هاتووە بۆ ئیستیثنا وەك: بەخشین لە مالّی زیادە سەخاوەت نیە، مەگەر سەخاوەت هەبێ و کەمیش مالّت نەبێ، ئەم (حتَّى)یە بەمانا(لکن)، لەم شێوە دارشتنەی دانەر وەردەگیرێ کە (حتَّى) بۆ تەقلیل بێ نەغالّبەو نەنادرە، چونکە بۆ ئیستیثنا وتی: نادرە، بۆ غایە وتی: غالّبە، بەلام بۆ تەعلیل هیچ کامیانی نەووت.

(۳)سیانزەهەم لەو حەرفانە (ربَّ)یە ئەمیش هاتووە بۆ: أ-زۆرکردن و زۆر پیشاندانی داواکەی خۆی وەك: زۆر پێیان خۆش ئەبێ ئەوانەی کافر بوون ئەگەر موسولّمان بوایێن، چونکە لەوانەوە ئاواتی زۆر دەخوازن موسولّمان بونایە ، لەو رۆژەدا زیندوو ئەبنەوەو حالّی خۆیان و موسولّمانان ئەبینن، ئەو ئاواتە ئەخوازن. (٤)زۆر کەم منداڵ هەیە باوکی نەبێ و زۆر کەم خاوەن منداڵ هەیە باوك و دایکی نەبووە، مەبەست بەیەکەم عیسی یە وەبە دووەم ئادەمە (علیهما السلام).

(٥)(ربَّ) تایبەتی نابێ بە یەکێکیانەوە ، بەپێچەوانەی ئەوەی بێبەلّگە ئەوەی وتووە، کۆمەلّێك وتوویانە: هەموو کات بۆ زۆرکردنی ئەوە ئەبێ ئەچێتە سەری ، وادائەنێن ئەم شیعرەو وێنەی ئەویش بەبەلّگە دانانێن، کۆمەلّێکیتر وتوویانە: (ربَّ)هەموو کات بۆ کەمکردنەوەی ئەوە ئەبێ چووەتە سەری، لە ئایەتەکەشدا هەر بۆ

{الرابع عشر: على الأصحِّ انّها قد تكونُ} بقلّةٍ {إسماً بمعنى فوق} بأن تدخل عليها من نحو: غدوتُ من على السطحِ اي من فوقِهِ[1] {وتكونُ} بكثرةٍ {حرفاً للإستعلاءِ} حساً نحو: ﴿ كلُّ مَنْ عليها فان ﴾ او معنىً نحو: ﴿ فضّلنا بعضهم على بعض ﴾[2] {والمصاحبَةِ} كمعَ نحو: ﴿ وآتى المالَ على حبِّهِ ﴾ اي مع حبِّهِ[3] {والمجاوزة} كعن نحو: رضيتُ عليهِ اي عنهُ[4] {والتعليل} نحو: ﴿ ولتكبّروا اللهَ على ماهداكم ﴾ اي لهدايَتِهِ إيّاكم[5] {وللظرفيَّةِ} كَفي نحو: ﴿ ودخلَ المدينَةَ على حينِ غفلَةٍ من اهلِها ﴾ اي في وقتِ غفلَتِهِم[6] {والإستدراك} كلكنّ نحو: فلانٌ لايدخُلُ الجنَّةَ لسوءِ صنيعِهِ على انَّهُ لاييأسُ من رحمَةِ الله اي لكنَّهُ[7]

---

کەمکردنەوەی داناوە، بەم شێوە کە کافران ئاهەمواری ڕۆژی قیامەت لە هۆشیان ئەبات ، ناییێنۆ بەخۆیاندا تا ئاوات بخوازن موسوڵمان بوونایە، مەگەر چەند کاتێکی کەم نەبێ، بەڵام لەسەر ئەو بۆچوونە کە (ربَّ) تایبەت نیە بەهیچ کامیانەوە هەندێك وتوویانە: بۆ کەمکردنەوەکەبێ زۆرترە، ئیبن مالك وتوویەتی: نادروەو زۆر کەم دەست دەکەوێت بۆ کەمکردنەوە بێ.

(١)(علی)یە قەولی ئەصەح ئەوەیە جاری واهەیە بەکەمی ئیسم ئەبێ لەباتی وشەی فوق، ژوور ئەبێ، بەم شێوە کە (مِنْ) بچێتە سەری ، وەك: ئێوارەم کردەوە لەسەر ئەم بانەوە، (٢)بەڵام بەزۆری )(علی) حەرف دەبێت و بۆ چەند مانایەکیش دێت: ا-بۆ بەرزیو بڵندییە ، چ بەرزیەك بەچاو ببینرێ، وەك: هەرچی کەس هەیە بەسەر دونیاوە نامێنێ، یاخود بەرزی ماددی نەبێ مەعنەوی بێ، وەك: زیادە فەضڵیکمان دان هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریانا. (٣)جاری واهەیە (علی) بەمانا یاوەرییەو لەجێی(معَ)یە، لەگەڵ، وەك : ماڵ ئەبەخشێ لەگەڵ ئەوەش خۆشی دەوی، کاتێ ضمیرەکە بۆ المال بگەڕێتەوە بەڵام ئەگەر ضمیرەکە بۆ خوا بگەڕێتەوە ناگونجێ بەمانا(مع) لەگەڵ بێ، ئەوکاتە بەمانا (مِنْ) یا لامی عیلەت دەبێ. (٤)جاری واهەیە بەمانا (عنْ)ە و بۆ لەیەك جیابوونەوە دەبێ، وەك رازی بووم لێی. (٥)جاری واش هەیە بۆ ئەوە دواکەی دەکا بە عیلەت وهۆ بۆپێشەکەی وەك: بۆ ئەوە الله اکبر بکەن چونکە ڕێنمونی کردون. (٦)جاری واهەیە بەمانا(فی)یە، بۆ ظرفیەت دەبێ وەك: چووە شارەکەوە لەکاتی بێئاگای دانیشتووەکانی (٧)هاتووە بۆ ئەوەی گوێگر لە گوفتارێکە پێش(علی)گومانێکی بردووە، قسەکەر بە(علی) بەمانا(لکن)فریای دەکەوێ ، بەلابردنی ئەو گومانەوراستکردنەوەی بۆی، وەك:فلانە کەس ناچێتە بەهەش تەوە لەبەر خراپی کردەکەی، بەس ئەوەندە هەیە نابێ بێئومێدبێ لەمیهرەبانیخوا.

{والزيادة} نحو حديثِ الصحيحينِ: (لا احلفُ على يمين) اي يميناً وقيلَ هي إسمٌ ابداً لدخولِ حرفِ الجرِّ عليها. وقيلَ هي حرفٌ ابداً ولا مانع من دخـولِ حرف جرّ على آخر ، {امّا علا يعلو} ففعلٌ ومنهُ ﴿ إنَّ فرعون علا في الأرض ﴾ فقد إستكملت على الأصحِّ اقسام الكلمة[1]

{الخامس عشر: الفاءُ العاطفةُ للترتيبِ المعنوي وللذكري وللتعقيبِ في كلّ شيئٍ بحسبِهِ} تقولُ: قامَ زيدٌ فعمروٌ إذا عقبَ قيامَ عمرو قيامَ زيدٍ و دخلتُ البصرةَ فالكوفةَ إذا لم تقمْ في البصرةِ ولا بينهما، وتزوَّجْ فلان فولد لهُ إذا لم يكنْ بينَ التزوجِ والولادةِ إلاّ مدةُ الحملِ مع لحظةِ الوطءِ ومقدمَتِه[2]

---

(١)جاری واهەیە زیادەیە وەك ئەو فەرموودەیەی بوخاریو موسلیم ریوایەتی دەکەن: سوێن ناخۆم بەسوێن خواردن ، هەندێك وتوویانە: هەموو کات على إسم دەبێت، چونکە حەرفی جەڕی دەچێتە سەر وتراویشە: على هەموو کات هەر حەرفە هیچ جۆرە رێگریەکیش نیە رێ لەوە بگرێ حەرفی جەڕ نەڕواتە سەر حەرفی جەڕیتر، بەڵام ئەبێ مەجرورێك بۆ یەکێکیان دیاریبکەین، وەك: (مِنْ على السطح) واتە: (مِنْ شيئٍ على السطح) بەلام (علا يعلو) ئەوە فیعلە، ئەگەر فیعل بێ ئەوە بە ئەلفەوە ئەنوسرێ بەم شێوە (علا) لەبەشی فیعلەکەیە ئەم ئایەتە:﴿...علا في الأرضِ ﴾ بەم شێوەیە علا هەر سێ بەشەکەی کەلیمەی تیاجێکرایەوە.

(٢)پازدەهەم: (ف)عاطیفەیە ئەمیش بۆ چەند مانایەك هاتووە: أ- بۆ تەرتیب و ریز بەندییە، چ تەرتیبی مەعنەوی بێ یاخود تەرتیبی سەرزارەکیو باس کردن بێ ب-بۆ ئەوەی‌معطوفەکە بهێنێ بەشوێن معطوف علیه یەکەدا، بەڵام هەر معطوفێك بەگوێرەی خۆیو پێویستی ئەو زەمانەی ئەیەوێ، دەڵێی: قام زيد فعمرو، زەید هەستایە سەرپێ ئەنجا عەمریش هەستایەوە، کاتێ ئەم هەواڵەو دارشتەی راستە کەبەپێوە وەستانی عەمرو یەکسەر هاتبێ بەشوێن بەپێوە وەستانی زەیدەوە، یا ئەڵێیت: چوومە ناو بەصرە ئەنجا کوفە، کاتێ راستە کە نەلەبەصرەو نە لەنێوان بەصرەو کوفەدا نیشتەجێ نەبووبێ، چوونە نا کوفە هاتووە بەشوێن چوونە ناو بەصرەدا، ئەگەر بەیێبێ دوو سێ رۆژێکی دەوێ، یا دەڵێت: (تزوَّجَ فلان فولدَ لهُ) ژنی هێناو ئەمجار منداڵێکیان بوو، کاتێ دارشتنی ئەم هەواڵە راستە، کە لەنێوان ژنهێنان ومنداڵ بووندا تەنها ماوەی سك پڕبوون بێ‌لەگەڵ چرکەی دروست بوون و جیماعدا و پێشەکیەکەی.

والتعقـيبُ مشـتملٌ على الـترتيبِ المعنوي و إنّما صرَّحَ بهِ المصنِّف ليعطفَ عليهِ الذّكــرَى وهــو في عطـفِ مفصّـــلِ علـى مجمـــل، نحــو: ﴿ إنّـا انشـــأناهنَّ إنشــاءً فجعـلناهنَّ ابكــاراً عُرُبـاً اترابـاً ﴾ ﴿ فقد سألوا موسى اكبر منْ ذلك فقالوا: ارنـا الله جهرةً ﴾[1] {ولـلـسببـيَّةِ} و يلزمـها التـعقيبُ نحو: ﴿ فوكزَهُ موسـى فقضى علـيهِ ﴾ ﴿ فتلقّى آدم مـن ربِّه كلماتٍ فتـابَ عليـه ﴾ واحترزَ بالعاطفَةِ عنِ الرابطةِ للجوابِ فقد تتراخى عنِ الشـرطِ نحو: إنْ يسلم فلانٌ فهو يدخلُ الجنَّة وقدْ لايتسبَّبُ عنِ الشرطِ نحو: ﴿ إنْ تعذّبـهمْ فإنّهم عبادُكَ ﴾[2]

---

(١)کەوتت تـەعقیب و بەشوێنا نـەهێنان ئیتر ئەوە تعقیب و ریـز بـەندی مەعنـەوی دەگرێتەوە، دانەر کە بەڕوونیو صەراحەت ئەویشی وتووە تەنها لەبەر ئەوەیە تەرتیبە ذیکریو سەرزارەکیەکەی بەسەرد عطف بکاتەوە یەك، دووەم تەرتیبی ذیکری عطفی مفصلە لەسەر مجمل –عادەت وایە مفصل ئەبێ لـەدوای مجملـەوە بـێ ذاتـەن نـەك لەزەماندا کەوابوو تەرتیب لەنێوان دا هەیە لە ذیکرو باس دا، نەك لـەواقیعدا– وەك خوا دەفەرموێ: ئێمە حۆریەکانمان دروست کردووە بە دروسـت کـرن ئـەمجا کردومـانن بەکچ، هاوسەرەکانیان خۆش دەوێ هاوتەمەنیشن، –کردومانن بەکچ تاکۆتایی، بـۆ سـەر دروست کردنەکە عطف بووەتەوە ، عطفی تـەفصیلی بۆ سەر مجمل–، ئـەمجا دەفەرموێ: بێگومـان لـەوە گەورەتریان لـە موسـا داواکـرد و پرسـیاریان کـرد وتیـان بەئاشکرا خوامان پیٚنیشان بدە (فقالوا) تفصیلی (سألوا) یە.

(٢)فـێ هـاتووە بۆ ئەوەی پێشەکە بکا بەهۆ بۆ دواکەی ئینجا تعقیب و بەشـوێنا هێنـان و دواکەوتنی مەعطوفەکە کە لازم و پێویستە ، وەك: ئینـجا موسـا بۆکزێکـی لێدا و ئینجـا مـرد، بۆکزەکـە بـووە هـۆی مردنـی ، ئـادەم چـەند کەلیمەیـەکی لـە پەروەردگاریەوە وەرگرت ، ئەویش وتنی، ئەمجا خوا تەوبەو گەڕانەوەی لێوەرگـرت ، دانـەر لە مەتنەکەدا وتـی: (العاطفـة) فـێ عاطفـە، بەوشـەی عاطفـە خـۆی لـەو فێیـە پاراست کە بۆ رابیطە و بەستنەوەی جەوابە بەشەرطەکەوە، چونکە فێیـەك بۆ جەواب بێ جاری واهەیە لەنێوان جەواب و شەرطەکەدا ماوەیێکی زۆرو فراوان ئـەبێ ، وەك: ئەگەر فلانەکەس موسوڵمان بـێ ئـەوە دەچێتـە بەهەشـت دەخـۆ موسـوڵمان بـوون و هێشتا نەچوونەتـە بەهەشت، چونکە فێیەکە بـۆ تـەعقیب نیـە بـەڵکوو بـۆ جـەواب و زەمانی دیاریکراو نیە لەنێوانیاندا ، جاری واهەیە شەرطەکە نابێتە هۆی بەرپا بوونی جەوابەکـە، وەك: ئەگـەر عـەزابیان بدەیـت ، جـا خـۆ ئەوانـە بەنـــدەی خۆتـن عـەزاب سەبەبی ﴿ همْ عبادُكَ ﴾ نیە.

{السادس عشر: في للظرفين}المكاني و الزّماني نحو:﴿ وانتم عاكفونَ في المساجدْ﴾ ﴿ واذكروا اللهَ في ايّامٍ معدوداتٍ ﴾[1] {والمصاحبَة} كمعَ نحو:﴿ قالَ ادخلوا في امم ﴾ اي معهم[2] {والتعليل} نحو:﴿ لمسَّكم فيما افضتم ﴾أي لأجلِ ما افضتُم[3] {والإستعلاء} نحو:﴿ ولأصلبنَّكم في جذوعِ النّخلِ ﴾ اي عليها[4] {والتوكيد} نحو: ﴿ قالَ اركبوا فيها ﴾ والأصلُ إركبوها[5] {والتعويض} عن اخرى محذوفة نحو: زهدتُ فيما رغبتُ و الأصلُ زهدتُ ما رغبتُ فيه[6] {وبمعنى الباء} نحو:﴿ جعل لكم من انفُسِكم ازواجاً ومنَ الأنعامِ ازواجاً يذرؤكم فيهِ ﴾ اي يكثّركم بسببِ هذا الجعلِ[7] وإلى نحو:﴿ فردّوا ايديهم في افواههم ﴾ اي إليها ليعضّوا عليها من شدَّةِ الغيظِ[8] {ومن} نحو: هذا ذراعٌ في الثّوبِ اي منهُ فلا يعيبهُ لقلّته[9]

{السابع عشر: كي للتعليل} فينصبُ المضارع بعدها بأنْ مضمرةً نحو: جئتُكَ كي انظركَ اي لأن[10]

---

(١)شانزەهەم (فـي) ا-بۆ هەردوو ظەرفەكەیە: چ ظـەرفی مـەكان چ ظـەرفی زەمـان وەك:في المساجد بۆمەكان ، في ايام بۆ زەمان. (٢)ب-فیٚیە واتا لەگەڵ (و معَ) هاتووە، واتە پێش و پاشەكەی ئەكا بەیاوەری یەك وەك: في اممٍ واتە مع اممٍ. (٣)هـ-فیٚ هاتووە بۆ ئەوەی پاشەكەی بكا بەهۆی پێشەكەی وەك: ئەو تۆڵە ئەتان گرێتەوە لەبەر ئەو شتەی ئێوە رۆچووبوون تیایدا، (٤)د-هاتووە بەمانا (علی)یە بۆ بەرزیو بڵندییە، سوێن بیٚ هەڵتان ئەواسم بەسەر لقی دارخورماوە. (٥)هـ-هاتووە بۆ دوپات كردنەوە واتە زیادەیە، وەك: سواری پاپۆرەكە بن ئاخر بچنە ناوی. (٦)و-هاتووە بۆ تەعویض و لەباتی فێیكیتر كە لابراوە، وەك: وازم هێنا لەوەی حەزم لیٚبوو ئەو فێیە هابەسەر (فیما)وە، وەلەباتی ئەو فێیە كە لابراوە لەدوای رغبتُ فیە وە. (٧)ز-هاتووە بەمانای بیٚ وەك: خوا هەر لە رەگەزی خۆتان ژنانی بۆ دروست كردون، وەلە مەڕو ماڵاتیشدا جووتی دروست كردووە، بەهۆی تاكی بەرامبەرەوە زۆرتان ئەكات، زوج یانی جوتەكەی، ژن ئەبێتە جوت بۆ پیاو پیاویش دەبێتە جوت بۆ ژن، (٨)ح-جاری واهەیە بەمانا (إلى)یە وەك: :﴿ فردّوا ايديهم في افواههم ﴾ واتە الى افواههم یانی دەستیان بردووە بۆلای دەمیان بۆ ئەوەی قەپی لیٚبگرن لەتوندوتیژی تورەكەیاندا، (٩)ط-جاری واهەیە فی بەمانا (من)ە، وەك ئەمە نیو مەترە لەو پارچە، واتە شتێكی كەمن خراپم كردووە لەبەر كەمی هیچ نیە عەیبدارم ناكا چونكە چاكەم زۆرە، ئابروم مەبە.

(٤)حەڤدەیەم (كي)یە و هاتووە بۆ ئەوەی پێشەكەی بگێڕیٚ بە هۆ بۆ پاشەكەی ئەمجار فیعلە مضارعەكەی دوای مەنصوب دەبیٚ بەئەنێكی شاراوە، وەك: ئەوەی

{وبمعنى ان المصدريّة} بان تدخلَ عليها اللام نحو: جئتُكَ لكي تكرمني(١)

{الثامن عشر كلُ اسمٍ لإستغراق افراد} المضافِ اليهِ {المنكر} نحو:﴿ كلُ نفسٍ ذائقةُ الموت ﴾﴿ كلٌ حزبٍ بما لديهم فرحون ﴾[٢] {والمعرَّفُ المجموعُ} نحو: كل العبيدِ جاءوا و كلُ الدراهم صرف ومنه ﴿ إنْ كلُ منْ في السموات إلاّ آتي الرحمن عبداً﴾ ﴿ وكلُهم آتيهِ يومَ القيامَةِ فرداً ﴾[٣] {و}الأستغراق {اجزاء} المضافِ إليهِ {المفرد المعرّف} نحو: كلُ زيدٍ او الرجلُ حسنٌ اي كلُ اجزائه[٤]

{التاسع عشر: اللام} الجارة {للتعليل} نحو:﴿ وانزلنا إليكَ الذكرَ لتبيِّنَ للناسِ ﴾ اي لأجلِ ان تبيِّنَ لهم[٥] {والإستحقاق} نحو: النّار للكافرين[٦] {والأختصاصُ} نحو: الجنَّةُ للمتّقين[٧] {والملكُ} نحو:﴿ لله مافي السّموات و مافي الأرض ﴾[٨]

---

هاتووم بۆ ئەوەی بتبینم (١)جاری واهەیە بەمانا (ان)ە و دواکەی ئەبرێتە تەئویلی مەصدەرەوە ، کاتێ بەمانا (ان) دەبێ لام بڕواتە سەر کی وەك: هاتووم بۆ ئەوەی ڕێزم لێبگری.

(٢)هەژدەهەم لەفظی(کلُ)ە کولیش ئیسمە بۆ گرتنەوەی تەواوی ئەفرادەکانی مضاف الیه، (کلُ) ئەبێ نەکیرە بێ، وەك: هەموو گیانلەبەرێك و هەناسە کێشێك بچێژە بۆ ئەم مردنە، -کەسی لێدەرناچێ- هەموو تاقمێك بەوەی لایان ماوەتەوە هەمیشە شادمانن -بەپلەی فێرکردن و قەبوڵ نەکردنی ئەوەی لای خوا - (٣)یاخود مضاف الیەیەکە، مفردبێ و جمع بێ هەر هەموو فەردەکانی دەگرێتەوە، وەك: هەموو فەردێ لە ئەفرادی بەندەکان هاتن، هەموو پەنجاییێك لە پەنجاییەکان خەرج کران، هەر لە مضاف الیە معرفەو جەمعە (کلّ من) -من ئیسمی مەوصولە بۆ جەمعە- وەك: (کلّهم) ئیضافەی کل کراوە بۆلای هم جەمع، ئەمەیان ضمیرەو ئەوەیان بۆ ئیسمی مەوصولە.
(٤)یاخود بۆ گرتنەوەی تەواوی ئەندامەکانی (مضاف الیە)کەیە، کە مفرەدیشەو مەعرفەشە، کە هەموو ئەندامێکی زید یاخود ئەم پیاوە جوانە

(٥)نۆزدەهەم لامی حەرفی جەڕە بۆ چەند مانایەك هاتووە: أ-بۆ ئەوەیە کەکردنی پێشەکەی لەبەر پەیدا بوونی پاشەکەیەتی، وەك: ئێمە ئەم قورئانەمان بۆیە ناردە خوارەوە لەبەر ئەوە روونی بکەیتەوەو بیسەلمێنی (٦)ب-جاری واهەیە بۆ ئیستیحقاقە ئەوەیە پێشەکە بکا بەشایستەی پاشەکەی، وەك: دۆزەخ شایستەی بێ باوەڕانە نەك بەو مانایە کە هەر ئەوانی تێئەچن. (٧)ج-بۆ تایبەت کردنی پێشەکەیەتی بۆ پاش خۆی، وەك: بەهەشت تایبەتە بەوانە لە خوا دەترسن.

(٨)د-هاتووە بۆ ئەوەی شتێ بکا بەماڵ و مڵك بۆ شتێ یا کەسێ وەك: موڵکی

{والصيرورة اي العاقبة} نحو:﴿ إلتقطهُ آلُ فرعونَ ليكونَ لهم عدواً و حزناً ﴾ فهذه عاقبَةُ إلتقاطهم لاعلّة إذ هي التّبني[1] {والتمليك} نحو: وهبتُ لزيدٍ ثوباً اي ملّكتهُ إيّاهُ.[2] {وشبهه} نحو:﴿ واللهُ جعلَ لكم من انفسكم ازواجاً و جعل لكم بنينَ و حفدَة ﴾[3] {وتوكيد النفي} نحو:﴿ وماكان الله ليعذّبهمْ و انتَ فيهِم ﴾﴿ لم يكنِ اللهَ ليغفرَ لهم ﴾ فهي في هذا ونحوهِ لتوكيدِ نفي الخبَرِ الدّاخلَة عليهِ المنصوب فيهِ المضارعُ بأنْ مضمرةً[4] {والتعديّة} نحو: ماأضربَ زيدٌ لعمرو ويصيرُ ضرَبَ بقصدِ التعجّبِ بهِ لازماً يتعدّى الى ماكان فاعلَهُ الهمزة ومفعولَهُ باللام[5] {والتأكيد} نحو:﴿ إنّ ربّكَ فعّالٌ لما يُريدُ ﴾ الأصلُ فعّال ما[6] {وبمعنى إل}ى نحو:﴿ فسقناهُ الى بلَدٍ ميّت ﴾ اي اليهِ[7] {وعلى} نحو:﴿ يخرُّونَ للأذقانِ سجَّداً ﴾ اي عليها[8] {وفي} نحو: ﴿ ونضعُ الموازينَ القسطَ ليومِ القيامة ﴾ اي فيهِ[9]

---

خوایە ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەش لە زەویدایە. (١)هـ-جاری واهەیە فیعلی پێشەکەی بۆ ئەوەیە سەرەنجامەکەی ئەوەبێ کەها بەدوایەوە، وەك: خانەوادەی فیرعەون موسایان هەڵگرتەوە بۆ ئەوەی سەرەنجامەکەی ببێ بەدوژمنیان و مایەی غەمیان، ئەمە سەرەنجامی هەڵگرتنەوەیەتی، چونکە هۆی ئەوەبوو بکرێ بە زڕ کوڕیان. (٢)بۆ ئەوەیە شتێ بکرێ بە مەجروری لامەکە، وەك: بەخشم بەزید قوماشێك واتە کردم بە موڵکی.

(٣)ز-یاهاتووە بۆ شتێك کەوەك موڵك وایە، وەك: خوا لەڕەگەزی خۆتان جووتی خۆتانی بۆ دروست کردون ، وەلە هاوجوتەکانتانەوە کوڕو وەچەزای بۆ دروست کردون، لام بەسەر (كَ) بۆ ئەوە نیە کە ژن و منداڵ موڵکی پیاون، بەڵکوبۆ ئەوەیە کە وەك موڵك وان. (٤)ح-هاتووە بۆ دوپاتکردنەوەی نەفیەکە وەك: خوا عەزابیان نادا لەکاتێکا تۆیان تێدابێ(یاخود ناکرێ خوا لێیان خۆش بێ) بەلام لێرە وێنەی ئەمە بۆ دوپات کردنەوەی نەفی ئەو خەبەرەیە، کەلامەکە چوەتە سەری، مەنصوبیشە فیعلە مضارعەکە بەئەنێکی شاراوە. (٥)ط-جاری واهەیە فیعلێ دەکا بە متعدی وەك: ئای لەوەی زەیدی کردوە بەلێدەری عەمر، ضرب، بەهۆی ئەوەی کەمەبەست سەرسوڕمانی پێدەکرێ ئەبێ بە لازم باضرب، بەهۆی هەمزەکەوە زەید دەکا بە مەفعول، وەلە ئەصلدا فاعیل بوو، وەمەفعولەکەی بەهۆی لامەکەوە ئەکرێ بە مەفعولی غەیرە صەریح. (٦)ی-هاتووە بۆ دوپات کردنەوە وەك: بێگومان پەروەردگارت کارایە بۆ ئەوەی ئەیەوێت. (٧)ك-جاری واهەیە بەمانا (إلى) یە وەك: هەورەکە لێئەخوڕین تادەیگەیەنینە ولاتێکی مردوو. (٨)ل-هاتووە بەمانا (في)یە وەك: هەموو تەرازووەکانی

{وعندَ} نحو:﴿ بلْ كذّبوا بالحقِّ لما جاءهُمْ ﴾ بكسرِ اللامِ و تخفيفِ الميمِ في قراءة الجحدري اي عندَ مجيئهم إيّاهُم[1] {وبعدَ} نحو:﴿ اقمِ الصلاةَ لدلوكِ الشّمسِ ﴾ اي بعدَهُ[2] {ومن} نحو: سمعتُ لهُ صراخاً اي منهُ[3] {وعنْ} نحو: ﴿ وقال الذينَ كفروا للذينَ آمنوا لو كان خيراً ماسبقونا إليهِ ﴾ اي عنهُم وفي حقّهم وإلاّ بأن كان للتبليغ لقيلَ ما سبقتمونا وضميرُ كان و إليهِ للإيمانِ[4] امّا اللام غيرُ الجارّةِ فالجازمَةُ نحو: ﴿ لينفقْ ذو سعَةٍ منْ سعتهِ ﴾ وغيرُ العاملَةِ كلامِ الإبتداءِ نحو:﴿ لأنتُمْ اشدُّ رهبَةً ﴾[5]

{العشرون: لولا حرفٌ معناهُ في الجملَةِ الأسميَّة إمتناعُ جوابِهِ لوجودِ شرطِهِ} نحو: لولا زيدٌ اي موجودٌ لأهنتُكَ ، إمتنعَتِ الإهانَةُ لوجودِ زيدٍ فزيدٌ الشرط وهو مبتدأ محذوف الخبرِ لزوماً[6] {وفي المضارِعةِ التحضيضِ} اي الطلبُ الحثيثُ نحو: ﴿ لولا تستغفرونَ اللهَ ﴾ اي إستغفروهُ ولابدَّ[7]

---

دادپەروەری دائەنێین لە ڕۆژی قیامەتا. (١)م-هاتووە بەمانا (عندَ) وەك: نەخێر وانیە بەڵكوو لەبەر ئەوە بڕوایان بەحەق نەبووە كاتێ هاتووە بۆیان. (٢)ن-هاتووە بەمانا (بعدَ)وەك: نوێژ بەرپا بكە دوای لادانی ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسماندا. (٣)س-هاتووە بەمانا(من) وەك: هاوارێكم لێوە بیست (٤)ع-هاتووە بەمانا(عنْ) وەك: ئەوانەی بێبڕوا بوون بەرامبەر بەوانەی موسوڵمان بوون وتیان: ئەگەر شوێن كەوتنی قورئان چاك بوایە پێشمان نەئەكەوتن لە بڕوا پێهێنانیدا، ئەگەر لامەكە بۆ گەیاندنی مەبەستی قسەكەر بوایە ڕوبەڕو بۆ گوێگر ئەبوایە بەم شێوە بوایە :(ما سبقتمونا) ئیسمی كان و ضەمیری الیە هەردوكیان بۆ وشەی ئیمان دەگەڕێتەوە. (٥)تائێستە باسی لامی جارمان كردووە بەڵام لامێ جارە نەبێ، یا جازمەو فیعلی مضارعە مجزوم دەكاو بۆ ئەمر بۆ غائیبە، وەك : باخاوەن دەسەڵات خەرج لەدەسەڵات و ماڵ فراوانیەكەیدا بكا، یاخود لامێكە هیچ كارێك ناكا، وەك لامێك لەسەرەتای ڕستەیەكەوە بێت، وەك: بێگومان توندو گرانترن لە ڕوی ترسەوە.

(٦)بیستەم (لولا)یە، (لولا) حەرفە ماناكەی لەگەڵ جوملەی ئیسمیدا، بریتیە لە جەوابەكەی نابێ پەیدا بێ چونكە شەرطەكەی هەیە مادام شەرطەكەی هەبێ نابێ جەوابەكەی هەبێ، وەك: ئای ئەگەر زەید نەبوایە سوكایەتیم پێ دەكردی، سوكایەتی پێكردنەكە نەكراوە چونكە زەید بووە، كەوابوو زەید شەرطەكەیەتی و موبتدایە، خەبەرەكەی هەردەبێ حەزف كراو بێ لە تلفظدا نەبێ، (٧)بەڵام لەگەڵ جوملەی فیعلی دا فیعلەكەش ئەگەر مضارع بێ ئەوە ماناكەی داوای كردنی فیعلەكەو هاندانیشە بۆ كردنی، وەك : ئەوە بۆ داوای لێخۆشبوون لە خوا ناكەن، واتە داوای لێخۆشبوونی

{والماضيَةُ التوبيخ} نحو:﴿ لولا جاءوا عليه بأربَعَةِ شهداءَ ﴾ وبَّخهُم اللهُ تعالى على عدم المجيئ بالشهداءِ بما قالوهُ منَ الإفك وهو في الحقيقَة محلُ التوبيخ[1] {وقيلَ تردُ للنفي} كآيَةِ ﴿ فلولا كانتْ قريَةٌ آمنتْ ﴾ اي فما آمنتْ قريَةٌ اي اهلُها عندَ مجيئ العذابِ فنفعَها إيمانُها إلاّ قومَ يونس، والجمهورُ لمْ يثبتوا ذلكَ و قالوا: هي في الآيَةِ للتوبيخ على تركِ الإيمانِ قبلَ مجيئ العذابِ ، وكانَهُ قيلَ: فلولا آمنتْ قريَةٌ قبلَ مجيئهِ فنفعَها إيمانُها و الإستثناء حينئذٍ منقطعٌ فإلاّ فيه بمعنى لكنْ.[2]

{الحادي والعشرون: لو حرفُ شرطٍ للماضي} نحو: لو جاءَ زيدٌ لأكرَمتُهُ،[3] ويقِلُّ للمستقبَلِ نحو: اكرمْ زيداً ولو اساءَ، اي وإنْ[4] وعلى الأولِ الكثير {قال سيبويه}:هو {حرفٌ لما كان سيقعُ لوقوعِ غيرِه} فقولُهُ سيقعُ ظاهرٌ في انَهُ لمْ يقَعْ فكأنَهُ قالَ لإنتفاءِ ماكان يقَعْ[5]

---

لێبکەن و هەر ئەبێ بیشکرێ، (١)بەڵام ئەگەر فیعلەکە ماضی بێ ئەوە ماناکەی بۆ سەرزەنشت کردن ئەبێ، وەك: ئەوە بۆ لەسەر درۆ گەورەکە شاهیدیان نەهێنا، خوا سەرزەنشتیان دەکا، مەبەست سەرزەنشت کردنە نەك نەهێنانی شاهید.

(٢)هەندێك وتویانە (لولا) جاری واهەیە ماناکەی نەفیە، لەجێی(ما)یە، وەك: ئەم ئایەتە، دانیشتوانی هیچ دێیەك نیە ئیمانی هێنابێ لەکاتی عەزابی خوادا و ئیمانەکەی سودی پێگەیاندبێ، جگە گەلەکەی یونس نەبێ، جمهور ئەوەیان نەسەلماندووە، وتویانە لەم ئایەتەشدا هەر سەرزەنشتە لەسەر ئیمانَ نەهێنان پێش هاتنی عەزاب، كأنه ئاوا وتراوە: ئەوە بۆ دانیشتوانی دێیەکە ئیمانیان نەهێنا پێش هاتنی عەزاب و ئیمانەکەش سودی پێ گەیاندبێ، ئیستثناکە پچڕاوە لەپێشەکەی کەوابوو (إلاّ)کە لێرەدا بەمانا (لكنّ)ەیە، چونکە دێکە مەعلومە و دیارە، مەعلومیش بۆ عەدەم و گشتی نیە.

(٣)بیست و یەکەم حەرفی (لَوْ)، لەویش حەرفی شەرطە دانراوە بۆ ئەوەی کاتێ مانای شەرطەکەی لەڕابوردوودا بهاتایەتەدی جەزاکەشی لەڕابوردوودا ئەهاتە دی ، وەك: ئەگەر زەید بهاتایە ئەوە منیش ڕێزم لێئەنا. (٤)بەکەمی (لَو)یەت بۆ مانای داهاتوو، واتە بەمانا (إنْ) بێت ، وەك ڕێز لە زەید بگرە با خراپەش بکات، لەمەودوا (إنْ)ەکە غائبە. (٥)لەسەر قەولی یەکەم کە زۆرتر (لَوْ) بۆ ئەو بەکاردێ، واتە بۆ ماضی، ئایا لەم کاتەدا ماناکەی چی‌یە؟ جیاوازیەك هەیە لەنێوان زانایاندا لە دەربڕینی ماناکەیدا، سیبەویهی وتوویەتی: حەرفێکە دانراوە بۆئەوەی دەلالەت بکات لەسەر فەوتانی شتێك کە پەیدا بوو، ئەگەر غەیری ئەو کە شەرطەکەیە ببوایە، بەڵام

{وقالَ غيرُهُ} ومشى عليهِ المعربون {حرفُ إمتناعٍ لإمتناعٍ} اي إمتناعُ الجوابِ لإمتناعِ الشرطِ[1] وكلامُ سيبويه السابق ظاهرٌ في هذا ايضا، فإنّ إنتفاءَ ماكانَ يقعُ وهو الجوابُ لوقوعِ غيرِه وهو الشرطُ ظاهرٌ في انّهُ لإنتفاءِ الشرطِ ومرادهمْ انّ إنتفاءَ الشّرطِ و الجوابِ هو الأصلُ فلايُنافيهِ ما سيأتي في امثلَةٍ من بقاءِ الجوابِ فيها على حالهِ مع إنتفاءِ الشرطِ[2] {وقال الشلوبين:} هوَ {لمجرَّدِ الربطِ} للجوابِ بالشّرطِ كان وإستفادةُ ماذُكرَ من إنتفائهما او إنتفاءِ الشّرطِ فقط من خارجٍ[3] {والصحيحُ} في مفادهِ نظراً الى ماذُكرَ من القسمينِ {وفاقاً للشيخِ الإمام} والد المصنّف {إمتناعُ مايليهِ}مثبتاً كانَ او منفياً، {و إستلزامُهُ} اي مايليهِ {لتاليهِ} مثبتاً كانَ او منفياً فالأقسامُ اربعَةٌ {ثمَّ ينتفي التالي} ايضاً {إنْ ناسبَ} المقدَّم بأنْ لزمَهُ عقلاً او عادةً او شرعاً او {لمْ يخلفِ المقدم غيرَه}[4]

---

کەشەرطەکە فەوتاوە جەزاکەشی فەوتاوە دانەر کەئەڵێ: سیقع لەمەودا پەیدا دەبێ، ئەمە ئاشکــرایە لەوەدا کە جەزاکە پەیدا نەبووە، کأنە بەم شێوەی وتووە: دەلالەت دەکا لەسەر فەوتانی جەزایێك کە پەیدا ئەبوو، ئەگەر شەرطەکەی پەیدا بوایە،

(١)غەیری سیبەوەیهی وتویەتی ئەوانەی ئیعرابیان کردووە، خەریکی نەحو بوون لەسەر ئەمەیان رۆیشتوون، (لَوْ) حەرفێکە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوە کە جەوابەکەی ممتنعە، واتە هۆی فەوتاندنی جەزاکە فەوتاندنی شەرطەکەیە-ئەمە (لَوْ)ی لوغەیە-

(٢)قسە پێشوەکەی سیبەوەیهیش هەر ئەوەی پـــێوە دیارە چونکە فـەوتاندنی ئـەوەی کـە هاتـەدی -کـە جوابەکەیــە- لەبــەر پـەیدا بوونــی غـەیری جوابەکـە کـە شەرطەکەیە، ئەو پەیدا بوونە ئاشکرا و رونە لەوەدا چونکە شەرطەکە پەیدا نەبووە مەبەستیان ئەوەیە: ئـەصل ئەوەیـە لـەمانای (لَـوْ)دا هــەر کـات شـەرطەکە فـەوتا جەزاکەشی ئەفەوتێ بەلام جاروبار لەو ئەصلە لائەدرێ، بــۆیە دژایـەتی ئەم ئەصلە ناکا بەچەند وێنەیەك لەمەودوا دێت کەجەزاکە وەك خۆی ماوەتەوە و شـەرطەکەش فەوتاوە.

(٣)شەلوبین وتویەتی: حەرفی (لَوْ)تەنها بۆ بەستنەوەو پەیوەندی سازکردنی نێوان جەواب و شـەرطەکەیە، وەك (إن)ی شـەرطیە وایە بـەلام ئەوەی باسکرا کـە جـەواب و شەرط هەردوکیان پەیدانابن یاخود شەرطەکە تەنها پەیدا نابێ لە(لَوْ)ەکەی وەرناگرم لەشتی تری وەردەگرم. (٤)قەولی صەحیح لەمانای(لَوْ)دا بەگوێرەی ئـەو دوو جـۆرە مانایەی باسکران-کە فەوتانی هەردوکیانە (إن)تەنها شەرطەکەیە- باوکی دانەریش موافقە لەسـەری بریتیــە لە ئەوەی دێت بەشوێن (لَوْ)ەکەدا ممتنع بێ ، ئیــتر کەیفی

{كـ﴿ لوْ كانَ فيهما آلهةٌ إلاّ الله لفسدتا ﴾} اي غيرَهُ لفسدتا اي السمواتُ و الأرض ففسادُهما اي خروجهما عنْ نظامهما المشاهَدِ مناسبٌ لتعدُّدِ الإلهِ للزومِهِ لهُ على وفقِ العادةِ عندَ تعدُّدِ الحاكمِ من التمانُعِ في الشيئِ وعدَمِ الإتفاقِ عليهِ ولمْ يخْلُفِ التعدُّدُ في ترتُّبِ الفسادِ غيرَهُ فينتفي الفساد بإنتفاءِ التَّعدُّدِ المفادِ بلَوْ نظراً الى الأصلِ فيها وإن كانَ القصدُ منَ الآيَةِ العكس اي الدَّلالَةُ على إنتفاءِ الفسادِ لأنَّهُ اظهرُ"(١) {لاإنْ خَلَفَهُ} اي خلَفَ المقدَّمِ غيرُهُ إنْ كان لهُ خلفٌ في ترتُّبِ التَّالي عليهِ فلايلزَمُ إنتفاءُ التالي {كقولكَ} في شيئٍ {لوكانَ إنساناً لكانَ حيواناً} فالحيوانُ مناسبٌ للإنسانِ"(٢)

---

خۆیەتی مثبت بێ یاخود مەنفی بێ، وەئەوەیش ببێتە هۆی فەوتانی ئەوەی دێت بەشوێنیدا –جەزاکە– ئیتر مثبت بێ یاخود مەنفی بێ، کەوابوو ئەبنە چوار بەش: شەرطی مثبت وجەزای مثبت، شەرطی مثبت وجەزای منفی، شەرطی منفی وجەزای مثبت، شەرطی مثبت وجەزای منفی، پاشان جەزاکەش وەك شەرطەکە دەفەوتێ، ئەگەر گونجا خزمایەتی هەبێ لەگەڵ شەرطەکەدا ، بەم شێوە جەزاکە لازمی شەرطەکە بێ و بێئەو نەکرێ لەڕوی عەقڵەوە، وەك: ئەگەر قسەبکات ئەوە زیندووە یاخود لەروی عادەتەوە وەك ئەم ئایەتەی ئێستە باسی لێوە دەکەین، یاخود لەڕوی شەرعەوە، ئەگەر نوێژ بکا ئەوە دەست نوێژی گرتووە، لازمی بێ ، وەلە جێی شەرطەکەش شتێکیتر دانیشتبێ.

(١)ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی چەند خوایەکیان تیادا هەبێ ئەوە ئەو کاتە لەم یاسایەی ئێستەیانە ئەچوونەدەرو خراپ ئەبوون، چونکە دەرچونیان لەیاسای رێك و پێك گونجاوە لەگەڵ چەند خوایەك، چونکە فەساد لازمی چەند خوایکە بەگوێرەی عادەت چەند حاکمێك هەبن یاسا تێك ئەچێ، یەکێکیان ئەیەوێ ئەو شتە هەبێ ئەویتر نایەوێ هەبێ وەلەسەر یەك شێواز لەهەموو شتێکا یەك ناگرن، هیچ شتێکیتر نیە لەجێگەی تعدد و چەند خواییێك دانیشێ و بشێوی و بێیاسایی بەرپا بکا، کەوابوو بەشێوزەی نابێ بەهۆی نەبوونی چەند خواییکەوە کە وەردەگیرێ لە (لَوْ)، بەگوێرەی ئەوە کە ئەصل لە مانای (لَوْ)دا نەبوونی شەرطە کەهۆی نەبوونی جەوابەکەیە، هەرچەند مەبەستی ئایەتەکە پێچەوانەیە، واتە ئایەتەکە دەلالەت دەکا لەسەر نەبوونی چەند خواییێك بەهۆی نەبوونی فەساد و پشێویەوە چونکە مەلزوم نەبێ بێگومان لازم نابێ، نەك عەکسەکەی. (٢)بەلام ئەگەر لەجێی شەرطەکە شتێکیتر دائەنیشت وجەوابەکەی ئەهێنا بەشوێن خۆیا، ئەوکاتە لازم ناکا بەفەوتاندنی جەوابەکە، وەك: بەشتێك دەڵێن: ئەگەر ئەوە ئینسان بوایە حەیوانیش ئەبوو.

للزومِه لهُ عقلاً لأنّهُ جزؤهُ ويخلُفُ الإنسان في ترتبِ الحيوانِ غيره كـالحمارِ فلايلـزَمُ بإنتفاء الإنسانِ عنِ الشيئِ المفاد بلَـوْ إنتفاءُ الحيـوانِ عنـهُ لجـوازِ انْ يكـونَ حمـاراً كمـا يجوزُ انْ يكـونَ حجـراً[1] امّـا امثلَـةُ بقيَّة الأقسام فنحـو: لـوْ لم تجئـني مــا اكرمتُـك لـوْ جئتني ماأهنتُك لوْ لمْ تجئني اهنتُك[2] {ويثبُـتُ} التـالي بقسـميه علـى حالـه مـع إنتفـاء المقدَّم بقسميه {إنْ لم ينافِ} إنتفاء المقدَّم {و ناسبَ} إنتفائَهُ[3] إمّا {بـالأولى كــلوْ لم يخَفْ لمْ يعصِ} المأخوذ من قـول عمـر ﷺ وقيـل النـبي ﷺ (نعـم العبـد صـهيب لـو لم يخف الله لم يعصه) رتّب عدمُ العصيان علـى عـدم الخـوف المُفـاد بلـوْ انسـب فــيترتّب عليه ايضاً في قصده والمعنى انّهُ لايعصـي الله تعالى مطلقا اي لامع الخـوف وهـو ظـاهر ولامع إنتفائه إجلالا لهُ تعالى عنْ انْ يعصيه وقد إجتمع فيه الخوف و الإجلالُ ﷺ[4]

---

(١) چونکە حەیوان بۆ ئینسان گونجاوەو خزمایەتیەکیان هەیـە لەبەر ئـەوەی کـە حـەیوان لـەروی عەقڵـەوە لازمـی ئینسـانە، چونکــە بەشــیکە لەماهیــەتی ئینســان وەلـەجێی ئینسـاندا شتێکیتر دابنرێ هـەر حـەیوان -جەوابەکە- دەهێنـی بەشـوێن خۆیدا، وەك: بڵێیت ئەگەر ئەو شتە گوێدرێژ بێت حەیوانیش ئەبێ، چونکە بەهۆی ئەوەوە ئەوشتە ئینسـان نیـە -ئـەو نەبوونەش لـە (لـوْ)ەکــەوە وەردەگـیرێ- لازم ناکـا حەیوانیش نــەبێ چونکـە ئـەگونجێ گوێدرێـژ بێـت، وەك ئەشـگونجێ بـەردیش بـێ.

(٢)بەڵام میثال بۆ هەرسێ بەشەکەیتر کـەماون: ٢-ئەگـەر نەهاتبایـەی بـۆلام رێـزم لێ‌نەگرتی. ٣-ئەگەر بهاتبایەی بۆلام سوکایەتیم پێ‌نەئەکردی. ٤-ئەگـەر نەهاتبایـەی بۆلام سوکایەتیم پێ ئەکردی. (٣)جەوابەکە بەهەر دوو بەشەکەیەوە ئەرێ بێ یا نەرێ بـێ، لەسـەر حـاڵی خـۆی هــەر ئەمێنێتــەوە. لەگــەڵ ئــەودش شــەرطەکە بەهـــەردوو بەشەکەیـەوە فەوتاوە. -ئـەرێ بـێ یا نەرێ بـێ- بـەدوو مـەرج: ا-مانـەوەی جەوابەکـە دژایـەتی فـەوتانی [illegible] چونکە موناسب و گونجاو بێ بۆ فـەوتانی شەرطەکە. موناسەبەو گونجانی خزمایەتی نیوانیان سێ‌جۆرە:

(٤)١-یاموناسەبەوخزمایەتیان بەپـەی [illegible]یە، واتـە ثبوتـی جەوابەکـە گونجـاوترە کاتێ شەرطەکە فەوتابێ، وەك: فلأنە کەس ئەگەر لە خواش نەترسی هەر بێ فەرمانی خوا ناکـا، -واتـە ئەگـەر بترسـێ باشـتر گوێڕایـەڵی ئـەکا- ئەمـە وەرگـیراوە لەوتـەی حەزرەتی عومەر خوای لێ رازی بێ هەندێکیش وتویانە لە پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: چ بـەندەیێکی چاکــە صــهیب ئەگــەر لــە خــواش نەترســێ هــەر بــێ فــەرمانی ناکـا،بێ‌فـەرمانی نـەکردن هێـنراوە بەشـوێن نەترسیدا، لەگـەڵ ئـەوەش بێ‌فـەرمانی نەکردن گونجاوترە بەترسێکەوە کەوەردەگیرێ لە (لَوْ)ەکە، چونکە بەترس و خەوفەوە

وهذا الحديثُ أو الأثر المشهور بينَ العلماء قال أخو المصنِّف كغيرِهِ من المحدِّثين: انَّهُ لمْ يجدْ في شيئٍ من كتبِ الحديثِ بعدَ الفحصِ الشديد[1] {او المساواة كَلوْ لمْ تكن ربيبةً لمّا حلّت للرضاع } المأخوذة من قوله ﷺ في درَّة بضمِّ المهملة بنت امِّ سلمة اي هند لمّا بلغَهُ تحدُّثِ النساءِ انَّهُ يريدُ انْ ينكِحها: ( لوْ لمْ تكن ربيبتي في حجري ما حلّت لي إنّها لإبنَة اخي من الرضاعة) رواهُ الشيخان ، رتَّبَ عدمَ حلِّها على عدم كونها ربيبةً المبيَّنِ بكونها إبنَةَ اخي الرضاع المناسبِ هو لهُ شرعاً فيترتَّبُ ايضاً في قصدهِ على كونها ربيبةً المفاد بلوْ المناسبِ هوَ لهُ شرعاً فيترتَّبُ ايضاً في قصدهِ على كونها ربيبةً المفادِ بلوْ المناسبِ هو لهُ شرعاً كمناسبته للأوّلِ سواء لمساواةِ حرمَةِ المصاهَرَةِ لحرمَةِ الرضاعِ والمعنى انّها لاتحلُّ لي اصلاً لأنّ بها وصفينِ لو إنفرَدَ كلٌّ منهما حرمتْ لهُ كونها ربيبةً و كونها إبنةَ اخي من الرّضاعِ و النساءُ حيثُ تحدَّثنَ لما قام عندَهنَّ بإرادته نكاحَها جوَّزنَ ان يكونَ حلُّها لَهُ منْ خصائصه ﷺ[2]

---

دووباره هەر گوێڕایەڵیەکە دێتەدی لەنیازی قسەکەردا، کەمەبەست و ماناکەی ئاوای لێدێ، صهیب لە هیچ حاڵێکدا بێفەرمانی خوا ناکا، وەئەگەر نەشترسێ لەبەر ڕێزلێنان و شکۆمەندی خوا هەر بێفەرمانی خوا ناکا، بێگومان ترس و ڕێزلێنان لەخوا هەردوکیان لەدڵی صهیب دا کۆبونەتەوە، جەوابەکە لەسەر حاڵی خۆی ماوەتەوە لەگەڵ فەوتانی شەرطەکەش

(١)ئەم قسە نەستەقە یاخود ئەم فەرموودە کەبەناوبانگە لەنێوان زانایاندا، برای دانەرر وەك خەڵکیتر لە زانایانی فەرموودە دەڵێ: لەهیچ کتێبێکی فەرموودەدا دەستم نەکەوتووەو نەم بینیوە، دوای پشکنینێکی توندو تۆڵ. (٢)٢-یاخود موناسەبە وخزمایەتی نێوانیان یەکسانیە، وەك: ئەگەر زڕ کچیش نەبێ هەر حەڵاڵ نیە لەبەر شیر، ئەمە وەرگیراوە لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ لەبارەی دوڕەوە کە کچی أم سلمەی خێزانی پێغەمبەرە ناوی هیندە، کاتێ ئەمەی فەرموو کەپێی گەشتەوە ژنان لەوە دەدوێن کە گوایە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ مارەی بکا، فەرمووی دوڕە ئەگەر زڕکچیشم نەبێ و خۆم بەخێوم نەکردبێ هەر بۆم حەڵاڵ نیە چونکە کچی برای شیریمە، بوخاریو موسلم ریوایەتیان کردووە، حەڵاڵ نەبوونەکەی تەثبیت کردووە لەسەر شتێك کە زڕ کچ نەبوونە، ئەویشش بەیان کراوە بەوەی کەبرازای شیریەتی، کە گونجاوو موناسبە (عدم حل)ی بۆ (عدم ربيبه)يەك دوای (لو)وەبێ لەڕوی شەرعەوە دووبارەە لەنیازی پێغەمبەردا وایە کەبیسەلمێنێ دوڕە زڕکچیەتی ، ئەمەش وەردەگیرێ لە(لوْ) -چونکە دوای (لو)هەموو کات نەفی دەکرێ- کە موناسەبە و

قولَهَ في حجري على وفقِ الآيَةِ وقدْ تقدَّمَ الكلامُ فيـها ويجمعُ بينَ ما تقدَّمَ في إسمهامن أنَّهُ درقوبين ما في مسلم عنها كانَ إسمي برة فسمّاني رسولُ اللهﷺ زينب وقال: لاتزكّوا انفسكمْ اللهُ اعلمُ بأهلِ البرِّ منكُم بانّ لها إسمينِ قبلَ التغييرِ[1] {اوالأدونِ كقولِكَ} فيمَنْ عرضَ عليكَ نكاحَها {لو إنتفَتْ إخوة النسَبِ} بيني وبينها {لمَّا حلَّتْ} لي {للرضاع} بيني وبينها بالأخوَّة[2] وهذا المثالُ للأولى إنقلب علىالمصنِّف سهواً وصَّوا به ليكونَ للأدونِ لو إنتفت اخوةُ الرضاع لما حلَّتْ للنسَبِ رتَّبَ عدَمَ حلِّها على عدم اخوتها من الرضّاعِ المبيِّنِ بأخوّتها منَ النَّسَبِ المُناسِبِ هوَ لها شرعاً لكنْ دونَ مناسَبَتِهِ للأوّلِ لانّ حرمَةَ الرِّضاعِ ادونُ من حُرمَةِ النَّسَبِ والمعنىانَّها لاتحلُّ لي اصلاً لأنّ بها وصفينِ لو إنفردَ كلٌّ منهما حرمتْ لهُ اخوّتها منَ النَّسبِ و اخوتها من الرّضاعِ[3]

---

خزمایەتی هەیە لەنێوان زڕکچیەتیدا و شیردا ، چونکە لەگەڵ یەکەمدا چون یەکن، لەبەر یەکسانی حوکمی شەرعی زڕکچ و برازای شیری لە حەرامیدا، کورتەی ماناکەی ئاوایە: دورە بەهیچ شێوەیەك بۆم حەڵاڵ نیە چونکە دوو صیفەتی تێدایە ئەگەر یەك یەکیش بن هەر حەرام دەبێ، یەکەم زڕکچیەتیە، دووەم کچی برای شیریمە، ژنان کاتێ ئەو قسەیان داخست کەوا حاڵی بوون پێغەمبەرﷺ ئەیەوێ مارەی بکا کە بینیان لە زۆر نازپێدانیدا، وتیان لەوانەیە بۆی ڕەوابێ مارەی بکا، چونکە یەکێکە لەتایبەتیەکانی پێغەمبەر ﷺ چونکە ژنان ئەیانزانی برازایەتیو زڕکچیەتی.

(١)کە دەفەرموێ: في حجري واتە هالەباوەشی منداو من بەخێوی دەکەم، ئەوە بەگوێرەی ئایەتەکە یەم مانایە زۆربەی زڕمندالْ مێردی دایکی خۆیان بەخێویان دەکات،-ئەوە لەپێشە باسەکەی رابورد- لێرەوە وتمان: ئەو کچە ناوی دورەیە ، بەڵام لە موسلیم دا دەڵێ: ناوی من دورە بوو پێغەمبەرﷺ ناوی نام بە زەینەب وە فەرموی: خۆتان بەچاك و پاك ناوزەد مەکەن، چونکە خوا دەزانێ خاوەنی چاکەو پاکیزەکی ئێوە کامتانە، ئەم دوو ریوایەتە ڕێکخستنەکەیان بەم شێوەیە ئەبێ بڵێین: ئەم کچە پێ ناو لێنانەکەی دوو ناوی هەبووە: درە ، برە. (٢)٢-موناسەبەو خزمایەتیەکە لەنێوان جەوابو فەوتانی شەرطەکەدا لاوازتربێ تالەگەڵ بوونەکەی، وەك دەڵێت لەبارەی کچێکەوە پێشنیاز کراوە بۆت مارەی بکەیت: ئەگەر خوشك و برای باوك و دایکیو پشت لەیەك نەبین، ئەوە هەر بۆم حەڵاڵ نیە چونکە خوشك وبرای شیرین

(٣)ئەم میثال و وێنە دانەر هێنایەوە بۆ سێهەم و ادون، لەراستیدا ئەمە وێنەی اولیە ، بەڵام بەسەهوو بێئاگایی پێش و پاش بووەتەوە لەسەر دانەر ، راستیەکەی ئاوایە بۆ (ادون) ئەگەور خوشك و برای شیریش نەبێ هەر حەڵاڵ نیە لەبەر ئەوەی

وإنّما قالَ: كقولكَ كـذاقي الموضعينِ لأنّهُ كما قالَ لم يجدْ نحوَهُ فيما يستشهَدُ بهِ من القرآنِ او غيرهِ ولكنَّهُ غيرُ خارجٍ عن اسلوبهِ[١] ولو قال بدل المساواةِ المساوي لكانَ انسَبُ بقسيميه[٢] ولـو اسـقطَ لامُ لمـا في الموضعينِ لوافـق الإسـتعمالُ الكثـيرَ مـعَ الإختصار[٣] وقدْ تجرَّدَتْ لو فيما ذكرَ منَ الأمثلَةِ عنِ الزّمانِ على خلافِ الأصلِ فيها[٤]

امّا امثلَةُ بقيّةِ اقسامِ هذا القسم فنحو لو اهنت زيداً لأثنى عليكَ اي فيثنى معَ عدم الإهانَةِ من بابِ اولى، ولو ترك العبدُ سؤالَ ربِّه لأعطاهُ اي فيعطيهِ معَ السّؤال من بابِ اولى ﴿ ولو انّ مافي الأرضِ من شجرَةٍ اقلامٌ والبحرُ يمدُّهُ من بعدهِ سبعَةُ ابحرٍ مانفدت كلماتُ الله ﴾ اي فما تنفد معِ إنتفاءِ ماذُكرَ من بابِ اولى[٥]

---

خوشك و برای باوك و دایكین، حەلاڵ نەبوونەكەی تثبیت كردووە لەسەر ئەوەی كە خوشك و برای شیری نین، كە بەیان كراوە بەباوك و دایكی بونیان و موناسەبەو حەلاڵ نەبونەكەیان بۆ خوشك و برای شیری نەبونەكەیان لە روی شـەرعەوە، دووبارە ئـەم حەلاڵ نەبوونە لەنیازی قسەكەرەكەدا خوشك و برابوونی شیری ئـەهێنێ بە شـوێن خۆیا كە لە(لۆ)ەكەوە وەردەگیرێوە موناسبیشە ئەو حەلاڵ نە بوونە بۆ خوشك و برای شیری لە روی شەرعەوە بەلاّم كەمتر موناسیبە بۆ ئەوەڵ كە براو خوشكی پشتین، چونكە حەرام لەبەر شیر نزمترە لە حەرامێك لەبەر پشت ، ماناكەی ئاوای لێدێ، ئەوە بەهیچ جۆرێك حەلاڵ نیە بۆم چونكە دوو هۆی تیایە، ئەگەر تاك تاكیش بن هەر حەرام ئەبێ بۆی.ا–خوشك و برای پشتی ب–خوشك و برای شیری.

(١)ئەی بۆ چی وتی: وەك تۆ دەڵێیت؟ لە هەردووجێگەكەدا؟ ئەی بۆ نەی وت: وەك فلانە ئایەت؟ چونكە وەك خۆی لە منـع الموانـع دا وتویـەتی وێنـەی ئـەوەی دەسـت نەكەوتووە لەوەی ئەكرێ بەڵگە كە قورئان و وتەی رەوانبێژانە، بەلاّم لەشێوازی ئـەوە دەرناچێ كە دەكرێ بەبەڵگە. (٢)ئەگەر لەباتی وشەی (المساواة) (المساوي) بووتایـە ئـەوە موناسـیبتر بـوو، بـەوانی تـرەوە كـە اولی و ادون بـوون. (٣)ئەگــەر لامــی ســەر وشـەی(لمّـا حلـت) لابردایـە لەهــەردوو جێگەكــەدا ئــەوە موافیقــی دارشــتنی زۆری رەوانبێژان بوو، لەگەڵ ئەوەش وشەكە كورتتر بوو.

(٤)وشەی (لَوْ)لەو پێنـج وێنـەی باسكران رووت كراوە لەزەمان لەسەر پێچەوانـەی ئەصلی خۆی كە بۆ زەمانی رابوردووە. (٥)بەلاّم وێنەی بەشـەكانی تـری ئـەم بەشـەیە وەك ئەمانە، ئەگەر سوكایەتی بە زەید بكرایە ئەویش سوپاسی ئەكردی واتـە لەگـەڵ سـوكایەتی پێنـەكردنیدا چاكتر سوپاسـی دەكـرد، ئەگـەر بـەندە داوای شـتیش لــە پەروەردگاری نەكا هەر پێی دەبەخشێ، واتە ئەگەر داوای بكا چاكتر پێی دەبەخشێ،

{وتردُ لوْ للتمنّي و العرض و التحضيض} فينصبُ المضارعَ بعدَ الفاءِ في جوابِها لذلكَ بأنْ مضمرةً نحو: لو تاتيني فتحدِّثني ، لوْ تنزل عندي فتصيب خيراً ، لوْ تامرَ فتُطاع، ومنَ الأوّلِ ﴿ فلو انّ لنا كرَّةً فنكونَ منَ المؤمنين ﴾ اي ليتَ لنا، وتشترِكُ الثّلاثةُ في الطّلَبِ وهو في التحضيضِ بحثٌ وفي العرضِ بلين وفي التمنّي لما لاطمعَ في وقوعِه[1] {والتقليلُ} نحو حديث(تصدَّقوا {ولو بظلفٍ محرق)} كذا اوردهُ المصنِّف وغيرهُ وهو بمعنى رواية النسائي (ردُّوا السائل ولو بظلفٍ محرق) وفي روايةٍ (ولو بظلفٍ) والمُرادُ الردُّ بالإعطاء والمعنى تصدَّقوا بما تيسَّرَ من كثيرٍ او قليلٍ واو بلغَ في القلّةِ الى الظلفِ مثلاً فإنَّهُ خيرٌ منَ العدَمِ وهو بكسرِ الظاءِ المعجمةِ للبقرِ والغنَمِ كالحافرِ للفرس والخلفُ للجمَلِ وقيدَ بالإحراقِ اي الشّيّ كما هو عادتهم فيهِ لأنّ النيئَ قدْ لايؤخذُ وقدْ يرميه آخذُهُ فلاينتفعُ بهِ بخلاف المشوي[2]

---

ئەگەر ئەوەی ها لەزەویدا لەدارو درەخت بكرێ بەقەڵەم ودەریاكانیش بكرێن بەمەرەكەب وحەوت ئەوەندەی تریش ئەوە مەعلوماتیخوا هەرتەواو نابێ-پێم باشە بووترێ: بۆهەمووشتێوشەی (كنْ)ی ئەوێ، كەوابوو كۆتایی بەهەموو شتێك دێت بەڵام كۆتایی بە كەلیمەی خوا نابێ- (١)جاری واهەیە (لوْ)دێت بۆ داخوازی شتێكی مەحاڵ، وەجاری واش هەیە بۆ پێشنیازە و جاری واش هەیە بۆ هاندانە، لەسەر كردنی ئەو شتەی هابەدوایەوە، ئەو فیعلە مضارعەی بەدوای فْ جەوابی (لوْ)ەكەوەیە كە بۆ یەكێ لەو سێ مانایانە بێ، ئەوە مەنصوبە بە(ان)ێكی شاراوە وەك كاشكای ، خۆزگایە بهاتایێت بۆلام، قسەت لەگەڵ بكردمایە، دەتوانی دابەزیتە لامان-لابدەیتە لامان- توشی خێرێك بیت، فەرمان بدەیت گوێڕایەڵی ئەكرێیت، ئەم ئایەتانەش بۆ یەكەمەكەیانە دەفەرموێ: خۆزگایە تاكە یەك نیوەرۆژێكمان -نیوە رۆژێكی ترمان بووایە- ببوایە تابووایێن بە موسوڵمان، هەرسێ ماناكەی (لوْ) طەلەب و داخوازی تیایە، بەڵام بۆ هاندانەكە داخوازیەكە توندوتیژە، وەبۆ پێش نیازەكە بەنەرم و نیانە، بەڵام لەئاوات خوازتنەكەدا بۆ شتێك دەبێت بەتەمای بوونینیە بەهیچ جۆرێك.

(٢)جاری واهەیە (لوْ) هاتووە بۆ كەم كردنەوەی دوای خۆی وەك فەرمودەی: خێرو صەدەقە بكە با بەسمێكی برژاویش بێ، دانەر و غەیری دانەریش فەرمودەیەكیان هێناوە هەر بەواتای ئەو فەرمودەیەكە نەسائی و غەیری ئەویش ریوایەتی دەكەن دەفەرموێ: وەڵامی سواڵكەر بدەنەوە باسمۆڵكێكی برژاویش بێ، لە ریوایەتێكی تردا: بابە سمۆڵكێكیش بێ، مەبەست ئەوەیە سواڵكەر بەبەخشینەوە رایی بكرێ، مانای فەرمودەكە ئاوایەخێرو صەدەقە بكەن بەوەی دێت بەدەستتانەوە بەئاسانی ئیتر

**{الثاني والعشرون: لنْ حرفُ نفيٍ و نصبٍ وإستقبالٍ} للمضارعِ {ولاتفيدُ توكيدَ النفيِ ولا تأبيدَهُ خلافاً لمنْ زعَمهُ} اي زعمَ إفادتها ماذكر كالزمخشري قال في المفصّل كالكشّاف هي لتأكيدِ نفيِ المُستقبلِ على التأبيدِ و في بعضِ نسخةٍ على التأكيد و التأبيدُ نهايَةُ التأكيدِ وهو فيما إذا اطلِقَ النفي قالَ في الكشّاف مفرقاً فقولكَ لنْ اقيمَ مؤكّدٌ بخلافِ لااقيم كما في إنّي مقيمٌ و قولك في شيئٍ لنْ افعَلَهُ مؤكّدٌ على وجهِ التأبيدِ كقولكَ لاافعلَهُ ابداً والمعنى إنّ فعلَهُ ينافي حالي كقولِهِ تعالى :﴿ لنْ يخلقوا ذباباً ﴾ اي خلقهُ من الأصنام مستحيلٌ منفٍ لأحوالهم(١)**

---

زۆربێ یاخود کەم بێ، بالەکەمیشدا بگاتە سمە کارژەلێك. چونکە هەر ئەوە باشترە لەهیچ نەدان، ظلف بۆ سمی مانگاو مەڕو بزن بەکاردێ، بەلاّم حافر بۆ ئەسپ بەکاردێ و یەك تەختەیەو رەقە، خفّ بۆ وشتر بەکاردێ و یەك تەختەیەو نەرمە، جا فەرمووی باسوتاو بێت واتە برژاوبێ، چونکە عادەتی عەرەب وایە ئەی برژێنن، چونکە ئەگەر كاڵ بێ جاری واهەیە وەرناگیرێ، ئەگەر وەریشی بگ ێ لەوانەیە توڕی بدات و سودی لێوەرنەگرێ، بەلاّم برژاو وانیە.

(١)بیست و یەکەم (لَنْ)ە: ئەمیش حەرفی نەفیەو حەرفی نەصبەو بۆ ئەوەشە فیعلی مضارع تایبەت بکا بە داهاتووەوە، دوپات کردنەوەی فیعلەکە ناگەیەنێ، وەك بۆ نەفی هەتاهەتایی فیعلەکە نیە، بەپێچەوانەی ئەوانەی وایان وتووە، واتە وتوویانە: دوپات کردنەوەی نەفیەکەو هەتاهەتایی دەگەیەنێ، وەك زەمخشری لە کتێبی (المفصل) دا وەك کەشاف وتوویەتی: (لَنْ) بۆ دوپات کردنەوەی نەفی داهاتووە ، بەلاّم لە کتێبی (الأنموذج) دا دەڵێ: بۆ نەفی داهاتووە هەتا هەتایە، وە لەهەندێ لەبەر نوسراوەکانی (الأنموذج) دا هاتووە: بۆ دوپات کردنەوەی نەفیەکەیە، تأبید و نەفی هەتاهەتایی کردنی، بریتیە لە ئەوپەڕی دوپات کردنی نەفیەکە، ئەو جیاوازیە لە شتێکدا ئەبێ کاتێ کەنەفیەکە هیچ ناو نیشانێکی پێوە نەلکابێ بۆ کامیانە، لە کتێبی(الکشاف)دا جیاوازی نەفی (لَنْ) و نەفیەکیتر دەکاو دەڵێ: کە تۆ دەڵێیت: (لَنْ اقیمَ) هەرگیز جێنشین نابم نەفیەکە دوپات کراوەتەوە، جیاوازە لەگەڵ لااقیم، جێنشین نابم، وەك جیاوازی هەیە لەنێوان ئەم دوو رستەیەدا بۆ ئەرێ، إنی مقیم ، بێگومان من نیشتەجێم ، انا مقیمٌ من نیشتە جێم، وەك لەبارەی شتێکەوە دەڵێت: هەرگیز نایکەم ،دوپات کراوەتەوە بەشێوازی هەتا کۆتاییو وەك ئەوە وایە وتبێتت: هەرگیز ئەو کارە ناکەم هەتاهەتایە ماناکەی ئەمە دەگەیەنێ چونکە کردنەکەی دژایەتی دەکا لەگەڵ حاڵی مندا ولەگەڵمدا ناگونجێ، وەك خـــوا دەفەرموێ: هەرگیز

وفي قولِ المصنّف زعمَهُ تضعيفٌ لهُ لما قالَ غيرهُ انّهُ لادليلَ عليهِ واستفادةُ التأبيدِ في آيَةِ الذبابِ وغيرِها نحو:﴿ ولنْ يخلف اللهُ وعدَهُ ﴾ من خارجٍ كما في ﴿ ولـنْ يتمنـوهُ ابداً﴾ وكـونُ ابـداً فيـهِ للتـأكيدِ كمـا قيـلَ خـلافُ الظّـاهرِ وقـدْ نقـلَ التـأبيدُ مـنْ غـيرِ الزمخشري ووافقهُ في التأكيدِ كثيرٍ حتّى قالَ بعضهم إنْ منعَهُ مكابرةٌ ولاتأبيدَ قطعاً فيما إذا قيّدَ النفي نحو:﴿ فلنْ اكلّمَ اليومَ إنسيّاً ﴾[1] {وتردُ للدُّعاءِ وفاقاً لإبن عصفور} كقولِه: لنْ تزالوا كذلكم ثمَّ لازلـ * ـت لكم خالداً خلودَ الجبالِ

وإبن مالك وغيره لم يثبتوا ذلكَ وقالوا ولاحجَّةَ في البيتِ لإحتمالِ ان يكـونَ خبراً و فيه بُعد[2]

---

مێشێك دروست ناكەن هەتاهەتایە، واتە لەدروست كردنی مێشێك لەلایەن بتەكانەوە مەحاڵەو ناگونجێ لەگەڵ حاڵی ئەواندا.

(١)دانەر كە وتی: (خلافاً لمن زعمهُ) وشەی زعمه ، كەبەواتای وشەی بێ‌بەڵگەیە، ئەو قەولەی زۆر لاواز كردوە چونكە جگە لەدانەر خەڵكانیتر وتویانە: بەڵگە نیە لەسەر راستی ئەو قەولە لاوازە، ئەگەر دەڵێیت: هەتاهەتایی لەئایەتی دروست نەكردنی مێشەكەدا هەیەو لەوێنەی ئەویشدا هەیە، وەك: هەرگیز و هەتاهەتایێ خوا پێچەوانەی وادەی خۆی نابێ، ئەوە لە(لَنْ)ەكە وەرنەگیراوە لە شتێكیتر وەرگیراوە، وەك:﴿ ولنْ يتمنّوهُ ابداً ﴾هەتاهەتایەكە لەوشەی ابداً وەرگیراوە، بەڵام ئەوانەی دەڵێن: ئەم ابدا، بۆ دوپات كردنەوی (لَنْ)ەكەیە ئەوە پێچەوانەی قەولی ظاهیرو روونە، بێگومان (لَنْ) بۆ نەفی هەتاهەتایی بێ لە غەیری زمخشریشەوە نەقڵ كراوە، بەڵام لەوەی كەوتویەتی: بۆ دوپات كردنەوەی نەفیەكەیە زۆربەی زانایان موافقی بوون، هەتا هەندێكیان وتوویانە بێگومان قەدەغەكردنی (لَنْ) بۆ دوپات كردنەوەی نەفیەكە موكابەرەیەو ئینكاركردنی حەق و راستییە، بەڵام هیچ گومانی تێدا نیە كاتێ كەنەفیەكە تایبەت كرا بۆ هەتاهەتایی نابێ، وەك: هەرگیز ئەمرۆ لەگەڵ ئەوەی ئینسان بێ گفتوگۆ ناكەم.

(٢)جاری واهەیە (لَنْ) هاتووە و دێ بۆ دوعایە، ئیبن عصفوریش موافقی ئەم قەولەیە وەك شاعیر دەڵێ: یاخوا هەتاهەتایە هەروا بمێننەوە، پاشان منیش بۆتان بمێنمەوە هەتاهەتایە وەك مانەوەی ئەو شاخانە، ئیبن مالك و غەیری ئەویش ئەوەیان نەسەلماندووە كە (لَنْ) بۆ دوعاو پاڕانەوە هاتبێ، ئەو دێڕە هۆنراوەش نابێتە بەڵگە چونكە هەڵگری هەواڵ بێ، واتە ئەمە ماناكەی بێ: ئێوە هەروا هەمیشە ئەمێننەوە، پاشان منیش بۆتان ئەمێنمەوە وەك مانەوە ئەو شاخانە، ئەم ماناشە زۆر دوورە.

{الثالث والعشرون: ما تردُ إسمــيَّةً و حــرفيَّةً} فالاسميَّةُ تردُ {موصــولَةً} نحو: ﴿ ماعندَكم ينفد، وما عندَ الله باقٍ ﴾ اي الذي[1] {ونكرةً موصوفةً} نحو: مررتُ بما معجَبٍ لكَ اي بشيئٍ[2] {وللتعجُّبِ}نحو: مااحسنَ زيداً، فما نكرَةٌ تامَّةٌ مبتداً وما بعدَها خبره[3] {واستفهاميّة} نحو:﴿ فما خطبُكم ﴾ اي ماشأنُكم[4] {وشرطيّةً زمانيّة} نحو:﴿ فما استقاموا لكمْ فاستقيموا لهم ﴾ مدَّةَ إستقامتهم[5] {وغير زمانيّة} نحو:﴿وماتفعلوا من خير يعلَمْهُ الله ﴾[6] {و}الحرفيَّةُ ترد {مصدريَّةً كذلكَ} اي زمانيَّةً نحو:﴿ فاتقوا اللهَ ما استطعتُم ﴾ اي مدَّةَ إستطاعتكم[7] وغيرَ زمانيَّةٍ نحو: ﴿ فذوقوا بما نسيتم ﴾ اي بنسيانكم[8] {ونافيةً} عاملةً نحو:﴿ ماهذا بشراً ﴾[9] وغيرَ عاملةٍ نحو:﴿ وما تنفقونَ إلاّ إبتغاءَ وجهِ الله ﴾[10] {وزائدةً كافّةً} عن عملِ الرّفع نحو: قلّما يدومُ الوِصال[11]

---

(١)بیست وسێهەم (ما)یە: (ما)هەیە ئیسمە, (ما)هەیە حەرفە، جا ئەوەی ئیسم بێ جاری واهەیە: ا-موصولەیە لەجێی (الذي)یە، ئەوەی بەلای ئێوەوەیە تەواو ئەبێ، ئەوەش بەلای خواوەیە هەر ئەمێنێ، (٢)ب-جاری واهەیە (ما)ی نەکیرەیە، صیفەتێکی نەکیرە بۆ هێنراوە، وەك تێپەڕیم بەلای شتێکدا سەرسوڕهێنەری تۆ بوو، (٣)ج-جاری واهەیە (ما)ەکە بۆ ئەوەیە دواکەی خۆی ئەکا بە صیفەی سەرسوڕمان، وەك شتێکە سەیرە زەیدی جوان کردووە!! (٤)د-جاری واهەیە (ما)ی ئیسمی نیشانەی پرسیارە، وەك ئەوە ئیشتان چیە؟ (٥)ھ-جاری واهەیە (ما)ی ئیسمیە بۆ شەرطە و زەمان و کاتی لە خۆگرتووە، وەك: ئێوە ڕێك و پێك وراست بن لەگەڵ کافراندا، کاتێ کەئەوان ڕێك و پێك و راست بن لەگەڵتان. (٦)و-جاری واهەیە شەرطیە بەلام زەمان و کاتی تیادا نیە، وەك: لەمەرجێکا ئێوە هەر چاکەیەك بکەن ئەوە خوا پێی دەزانێ.

(٧)جا ئەو (ما)یەی حەرفە جاری واهەیە ئەو(ما)یە دواکەی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ مەصدەری فیعلەکە و زەمان و کات لەجێی خۆیدا دائەنێ، وەك: لە خوا بترسن کاتێ توانای گوێڕایەڵی خواتان هەبێ. (٨)جاری واهەیە هەر مەصدەریە بەلام زەمان و کات لەجێی دانانیشێ ، وەك: عەزابی خوا بچێژن بەهۆی ئەوەوە لە دونیادا خواتان لەبیر خۆتان بردبویەوە. (٩)جاری واهەیە (ما) بۆ نەفیە بەلام ئیسم مرفوع دەکا و خەبەر مەنصوب دەکا وەك ئەو میثالە. (١٠)جاری واش هەیە تەنها نافیە کار ناکا و ئیسم و خەبەری نیە، وەك ئەو میثالە. (١١)جاری واهەیە (ما)ی حەرفی زیادە ئەبێ و ڕێ ئەگرێ لەهەندێ شت کەکاری خۆی بکا،جاری واهەیە لەکاری ئەوەی ئەخا کە مرفوعی بکا،وەك: قلّما یدومُ الوِصال ئەصلەکەی (قلّ دوامُ الوِصالِ) یە، (ما) کە هاتووە نایەڵێ

او الرّفع والنّصب نحو: ﴿ إنّما اللهُ إلهٌ واحد ﴾[1] او الجرّ نحو: ربّما يدومُ الوصالُ[2] {وغيرَ كافّةٍ} عوضاً نحو: إفعل هذا إمّا لا اي إن منتَ لاتفعلُ غيرَهُ، فما عوضٌ عنْ كنتَ ادغم فيها النون للتقارب وحذف المنفي للعلمِ بهِ وغير عوضٍ للتأكيدِ نحو: ﴿ فبما رحمةٍ من اللهِ لنتَ لهم ﴾ والأصلُ فبرحمةٍ[3]

{الرابع و الشرون: مِنْ} بكسرِ الميم {لإبتداءِ الغايَةِ} في المكانِ نحو: ﴿ منَ المسجِدِ الحرام ﴾ والزّمان نحو: منْ اوّلِ يومٍ ، او غيرهما نحو: ﴿ إنَّهُ من سليمان ﴾[4] {غالباً} اي ورودها لهذا المعنى اكثرُ من ورودِها لغيرِه[5] {وللتبعيضِ} نحو: ﴿ حتّى تنفقوا ممّا تحبّون ﴾ اي بعضَهُ[6] {والتبيِّن} نحو: ﴿ ماننسَخْ منْ آيَةٍ ﴾، ﴿ فاجتنبوا الرِّجسَ منَ الأوثانِ ﴾[7] {والتعليل} نحو: ﴿ يجعلونَ اصابعهم في آذانهمْ منَ الصّواعِقِ ﴾ اي لأجلِها، والصاعقَةُ الصيحَةُ التي يموتُ منْ يسمعها او يُغشى عليه[8]

---

فاعیلی خۆی مرفوع بكا.(١)یاخود نایەڵێ كاری رەفعەو نەصبە بكا، وەك ئەو میثالە، ئەصلەكەی : إنّ اللهَ إلهٌ، (ما)كە هاتووە رستەكەی كردووە بە حەصر و (إنّ)ی لەكارخستووە، (٢)یاخود نایەڵێ عەمەلی جەڕ بكا، وەك ئەو میثالە، ئەصلەكەی ربّ دوامُ الوصال (٣)جاری واهەیە رێگرنیە بۆ كاری كەس بەلام لەباتی شتی تر دانیشتووە، وەك ناعیلاج ئەمە بكە ئەگەر شتیتر ناكەیت، یاخود رێگریش نیە و لەباتی هیچ شتێكیش دانەنیشتووە، تەنها بۆ دوپات كردنەوەیە، وەك ئەو میثالە.

(٤)بیست و چوارەم: (مِنْ) ئەمیش بۆ چەند مانایەك هاتووە: أ- بۆ سەرەتای دەست پێكردنی مەبەست ، چ لە جێو شوێنەوە بێ وەك: لەمزگەوتی حەرامەوە، یاخود لەكات و زەمانەوەبێ وەك: لەیەكەم رۆژی رەمەزانەوە ئەو كارە بكە، یاخود نە زەمانەو نەمەكانە تەنها بۆ سەرەتایە، وەك: من سلیمان ، لە سولەیمانەوە (٥)واتە هاتنی (مِنْ) بۆ ئەم مانایە زیاترە لە هەموو مانایەكیتر.

(٦)ب-جاری واهەیە هاتووە بۆجیاكردنەوەی هەندێ لەوەی دەچێتە سەری و دروستە وشەی: بعض لە جێیا دانرێ ، تا خەرج ئەكەن هەندێ لەوەی كە خۆشتان دەوێ. (٧)ج-بۆ راڤەو روون كردنەوەی هەندێ لەوەی پێشی خۆی ئەبێ، وەك: خۆتان دورگرن لەو پیسیە كە بریتیە لەو بتانە. (٨)د-دواكەی خۆی ئەكا بە هۆ بۆ پێشەكەی وەك: سەرپەنجەكانیان ئەكەن بە گوێیاندا لەبەر دەنگی هەورەگرمە، صاعقە، بریتیە لەو گرمەی هەركەس بیبیسێ ئەمرێ، یاخود بێهۆش دەبێ.

{والبدلُ} نحو:﴿ ارضيتمْ بالحياةِ الدّنيا منَ الآخِرَةِ ﴾ اي بدلَها[1] {والغايَـةُ} كـإلى نحو: قربتُ منهُ اي إليه[2] {وتنصيصُ العمومِ} نحو: ما في الدّارِ من رجلٍ ، فهو بدونِ ظاهرٍ في العمومِ محتمل لنفي الواحدِ فقط[3] {والفصلُ} بالمُهملَةِ بانْ تدخُلَ على ثانِ المتضادينِ نحو:﴿ واللهُ يعلَمُ المُفسِدَ منَ المـصلِحْ ﴾ ﴿ حتّى يميزَ الخبيثُ منَ الطَّيبِ ﴾[4] {ومرادفه الباء}بفتحِ الدّالّ اي لمعناها نحو:﴿ ينظرون منْ طرفٍ خفيّ ﴾ اي بهِ[5] {وعنْ} نحو:﴿ قدْ كنّا في غفلَةٍ من هذا ﴾ اي عنه[6] {وفي} :﴿ إذا نوديَ للصّلاةِ من يومِ الجمعَةِ ﴾ اي فيه[7] {وعندَ} نحو:﴿ لنْ تغنيَ اموالُهم و لااولادهم منَ اللهِ شيئاً ﴾ اي عندَهُ[8] {وعلى} نحو: ونصرناهُ منَ القومِ اي عليهم[9]

{الخامس والعشرونَ: مَنْ} بفتحِ الميمِ، {شرطيّةٌ} نحو:﴿ منْ يعملْ سوءاً يُجزَ بهِ ﴾[10] {واستفهاميّةٌ} نحو:﴿ منْ بعثَنا منْ مرقَدنا هذا ﴾[11]

---

(١)هـ-هاتووە بەمانای لەباتی وەك: ئێوە چۆن رازی دەبن بەم ژیانە كەم و نزمەی دونیا لەباتی ژیانی دوارۆژ. (٢)و-هاتووە بەمانا (إلى)یەو كۆتا مەبەستە وەك: وردەوردە تالێی نزیك بوومەوە، (٣)ز-هاتووە بۆ ئەوەی دەق بنێ بەسەر گشتگیری ئەو ناوەی دەچێتە سەری، واتە بۆ زیادەیە بەلاّم كاتێ ئەبێ پێشەكەی نەفی بێ یا وێنەی نەفی بێ، وەئەوەش ئەچێتە سەری ئەبێ نەكیرە بێ، وەك ئەوەی بوترێ پیاو لەم ماڵەدا نیە، ئەگەرَ وشەی (مِنْ)ی تێدا نەبێ هەڵئەگرێ تەنها نەفی یەك پیاوی كردبێ بەلاّم لەگەڵ (مِنْ)دا نەفی رەگەزەكەی‌دەكا. (٤)ح-هاتووە بۆ ئەوەی ناوبژیوان بێ لەنێوان دوو دژدا، واتە فەصل بێ، نەك فەضل، بەمانای جیاكەرەوەبێ، پێشو پاشەكەی دژی یەكبن و ئەو لەنێوانیاندا بێ، وەك: خوا ئاشوبگێڕ ئەناسێ و جیای ئەكاتەوە لە چاكەكارو چاكساز، بۆ ئەوەی پیس و پاك لەیەك جیابنەوە.

(٥)ط-هاتووە بەهاوتای بێ، واتە بەمانای (ب)یَ هاتووە، وەك سەرنج ئەدەن بەقنگە چاوێكی ژێر بەژێریەوە، (٦)ی-بەمانا (عَنْ) هاتووە، وەك: بەراستی ئێمە بێ‌ئاگا بووین لەمەو گوێمان پێ‌نەئەدا. (٧)ك-هاتووە بەمانای (في) وەك: كاتێ بانگ درا بۆ نوێژ لەرۆژی هەینی‌دا. (٨)ل-هاتووە بەمانا (عند)یە، بەلای، وەك: هەرگیز ماڵ و منداڵیان لەشتێكی كەم بێ‌ئیحتیاجیان ناكا بەلای خواوە. (٩)م-هاتووە بەمانا (على) واتە سەرمان خست بەسەریاندا.

(١٠)بیست و پێنجەم (مَنْ)ە بۆ چەند مانایەك هاتووە: أ-شەرطیە ئەبێ وەك: هەركەس هەر خراپەیە بكا بەخراپە پاداش ئەدرێتەوە. (١١)ب-بۆ پرسیار ئەبێ وەك: كێ ئێمەی زیندوو كردەوەو هەڵیساندینەوە لە گۆڕەكانماندا.

{وموصولَةً}نحو:﴿ ولله يسجُدُمنْ في السّموات والأرضِ ﴾[١] {ونكِرَةً موصوفةً}نحو: مررتُ بمَنْ معجَبٍ لكَ اي بإنسانٍ[٢] {قال ابو علي} الفارسي {ونكرة تامّة} كقوله: ونعمَ منْ هوَ في سرّ و إعلان، ففاعل نعمَ مستترٌ و مَنْ تمييزٌ بمعنى رجلاً وهو بضمّ الهاءِ مخصوصٌ بالمدح راجعٌ الى بشر من قولِه:

وكيفَ ارهَبُ امراً واراعُ لهُ * وقدْ زكاتُ الى بشرَ بنَ مروان

ونعمَ مزكاً منْ ضاقتْ مذاهبُهُ * ونعمَ منْ... إلخ ، وفي سرٍّ متعلقٌ بنعمَ وغيرُ ابي على لم يُثبتْ ذلكَ وقالَ منْ موصولَة فاعلُ نعمَ وهو بضمِّ الهاءِ راجعٌ إليها مبتدأ خبرُهُ هوَ محذوف راجعٌ الى بَشرْ يتعلّقُ بهِ في سرٍّ لتضمّنهِ معنى الفعلِ كما سيظهَرُ والجملَةُ صلَةُ منْ والمخصوص بالمدحِ محذوفٌ اي هوَ راجعٌ الى بشَرْ ايضاً و التقديرُ نعمَ الذي هوَ المشهورُ في السرِّ والعلانيَةِ بشرٌ وفيه تكلّفٌ"[٣]

---

(١)ج-هاتووه بەمانا (الذي) ئەوەی، وەك: هەر بۆ خوا كڕنوش ئەبا ئەوەی لە ئاسمانەكان و زەویدایە. (٢)د-ئەكرێ بەنەكیرەیێك دواكەی خۆی ئەكرێ بە صیفەتی، وەك ئەو میثالە.

(٣)ئەبو عەلی فارسی وتوویەتی: هاتووە تەنها بۆ نەكیرەو بەس نەموصوفەو نەشتی‌تر، وەك دەڵێ: (ونعمَ منْ هوَ في سرّ و إعلان) فاعیلی شاراوەتەوە، منْ تمییزە بە مانا رجلاً، (هوَ)ش تایبەتە بەپیاداهەڵدانەكەوە دەگەڕێتەوە بۆ بشر،ناوێك كەلە هۆنراوەكەدایە ئەڵێ: من چۆن دەترسم لەشتێك یاخود چۆن دەترسێنرێم، لەكاتێكدا پەنام بردووە بۆلای بشری كوڕی مەروان، ئەوە چاك پەناگاییكە بۆ كەسێك هەموو ڕێگەیەكی بۆ تەنگ بووبێتەوە گیرابێ، بشر لەروی پیاوەتیەوە چاك پیاوە لەپەنهان و ئاشكرادا، في سرّ پەیوەندە بە (نعم) ەوە،جگە لە ئەبو عەلی كەسیتر ئەوەی نەسەلماندوە كە(مَنْ) تەنها نەكیرەی تامە بێ و بەس، ئەی ئەم شیعرە چی لێدەكەی ؟ ئەو(مَنْ)ە بەمانا (الذي)یە فاعیلی (نعمَ) ەكەیە، هو ئەگەڕێتەوە بۆ (مَنْ)ەكە، (في سرِ) پەیوەندە بە (نعمَ)ەوە چونكە مانای فیعلی هەیە، وەك لەمەودوا دەردەكەوێ رستەكە دەبێتە صیلەی (مَنْ)ەكە، ئەوەش تایبەتە بە مەرجە لابراوەكەوە، (هوَ)یە ئەگەڕێتەوە بۆ بیشر، دووبارە هەمووی ئاوای لێدێ، چاكە ئەوەی خۆی بەناوبانگە لەپەنهان و ئاشكرادا، ئەویش بیشرە، بەڵام دروستكردنی ئەم مانایە زۆر لەخۆ كردنێكی تیایە.

{السادس و العشرون: هلْ لطلَبِ التصديقِ الإيجابيِّ لا للتصوّرِ ولا للتصديقِ السلبيِّ} التقيّدِ بالإيجابيِّ و نفي السلبيِّ على منوالهِ أخذاً منْ إبنْ هشام سهوٌ سري في انّ هلْ لاتدخُلُ على منفيٍّ، فهيَ لطلَبِ التصديقِ اي الحُكم بالثبوتِ او الإنتفاءِ كما قالَهُ السّكاكي و غيرَهُ يُقالُ في جوابِ زيدٍ هلْ قامَ زيدٌ مثلاً؟ نعَم او لا، وتشركها في هذا الهمزة وتزيدُ عليها بطلَبِ التصوّرِ نحو: ازيدٌ في الدّارِ ام عمروٌ ، افي الدّارِ زيدٌ ام في المسجدِ ، فيُجابُ بمعيَّنٍ مما ذُكرَ وبالدّخولِ على منفيٍّ فتخرُجُ عنِ الإستفهام الى التقريرِ اي حملُ المخاطَبِ على الإقرارِ بما بعدَ النّفي نحو:﴿ ألَمْ نشرَح لكَ صدرَك ﴾ فيُجابُ ببلى، كما في حديثِ البُخاري بينا ايوب يغتسلُ عرياناً فخرَّ عليهِ جرادٌ من ذهبْ فجعَلَ ايوب يحثي في ثوبهِ فناداهُ ربُّهُ: ياايوب الَمْ تكنْ اغنيتُكَ عمّا ترى، قالَ: بلى، وعزّتكَ ولكن لاغنى لي عنْ بركتكَ، وقدْ تبقى على الإستفهام كقولكَ: لمنْ قالَ: لمْ افعلْ كذا، الَم تفعَلْهُ اي احقٌّ إنتفاء فعلكَ لهُ؟ فتُجاب بنَعَمْ او لا، ومنْهُ قولُهُ:

الا إصطبار لليلى ام لها جلَدُ * اذا الاقي الذي لاقاهُ أمثالي فتُجابُ بمعيَّن منهما[1]

---

(١)بيست و شەشەمین (هَل)ە هاتووە بۆ ئەوەی پرسیار لێکراوەکە تەصدیقی کەلامەکەی تۆ بکا بەئەرێ، نەبۆ تصور هاتووە نەبۆ تصدیقی نەرێ هاتووە، لکاندنی وشە الإيجابی و نەفی کردنی تصدیقی نەرێش بەشوێنیا ئەمە سەهویەکە لە ئیبن هیامەوە وەرگیراوە، لەوەشەوە سەری هەڵداوە کە (هَل) ناچێتە سەر گوتاری مەنفی کەوابوو هەر بۆ ئەوەیە داوای تصدیقی لێدەکەی، واتە حوکم بدا بەئەرێ یاخود بەنەرێ سەکاکی و غەیری سەکاکیش وایان وتووە ، لەوەلامی (هلْ قام زيدٌ؟) دەوترێ (ئا) یاخود (نا)، کەوابوو تصدیق یانی وەڵام دانەوە چ بە (ئا)بێ یاخود بە (نا)بێ، نەك هەر وەڵام دانەوە بە (ئا)، هەمزەیش لەمەدا هاوبەشی (هَل) دەکا -واتە وەڵامی هەمزەش بە (ئا) بێ یاخود بە (نا) بێ- واتە وەڵامی هەمزەش بە (ئا)ئەبێ و بە (نا) ش دەبێ، بەڵام هەمزە دوو شتی لە(هَل) زیاترە: ا-هەمزە بۆ داوای وەڵامی تصور دەبێ، بەڵام(هَل) نابێ وەك: (ازيدٌ في الدّار ام عمروٌ؟) لەمماڵەدا یەکێکیان هەیە بەڵام نازانی کامیانە، بەئامێری پرسیاری تصور کە هەمزەیە داوای دیاریکردنی دەکا، یاخود (افي الدّار زيدٌ ام في المسجدِ؟) دەزانێ زەید لەناو یەکێکیاندا هەیە ئەیەوێ بۆی دیاری بکرێ، کەوابوو بەیەکێك لەو دیاریکراوانە وەڵام دەدرێتەوە کەداواکار وتوونی. ب-هەمزە دەڕواتە سەر رستەی مەنفی، بەڵام لەم کاتەدا لەنیشانەی پرسیار دەردەچێ ئەبێ بە ئامێری زۆرهێنان بۆ قسە لەگەڵ کراوەکە، دان بنێ بەوەی هابەدوای نەفیەکەوە، وەك:﴿ الَمْ نشرَحْ لك صدرَك؟﴾ ئایا ئێمە سنگی تۆمان گوشاد نەکرد؟

{السابع و العشرون: الواو} من حروفِ العطفِ {لمطلَقِ الجمعِ} بينَ المعطوفينِ في الحكمِ لأنّها تستعمَلُ في الجمعِ بمعيَّةٍ او تأخّرَ او تقدَّمَ نحو: جاءَ زيدٌ و عمروٌ، إذا جاءَ معَهُ، او بعدَهُ او قبلَهُ، فتجعَلُ حقيقَةً في القدرِ المشترَكِ بينَ الثلاثةِ وهوَ مطلَقِ الجمعِ حذراً منَ الإشتراكِ والمجازِ و إستعمالُها في كلٍّ منهما منْ حيثُ انَّهُ جمعٌ إستعمالٌ حقيقيٌ[1] {وقيلَ} هي {للترتيبِ} اي التأخيرِ لكثرَةِ إستعمالِها فيه فهي في غيرِه مجازٌ(٢)

---

لێرەدا ئەبێ دان بنێ بەگوشادی دڵیا ، ئەبێ وەڵام بدرێتەوەبە: (بلی) واتە ئیستیفهام ئینکاریە، وەك ئەم فەرموودەیە بوخاری ریوایەتی کردووە:لەکاتێکدا ئەیوب بەڕووتی خۆی ئەشۆرد، کوللەی زێرین باری بەسەریدا ئەیوبیش خێرا دەستی کرد بەکۆکردنەوەیان و خستنە ناوی جل و بەرگەکەی، پەروەردگاری بانگی لێکرد: ئەیوب ئەوە من تۆم بێئیحتیاج نەکردووە لەوەی ئەیبینی؟ ئەیوبیش وتی: بەڵێ بەگەورەیی خۆت قەسەم بێئیحتیاجت کردوم ، بەڵام بێئیحتیاج نیم لە زیادە فەزڵی تۆ ، جاری واهەیە چوەتە سەر مەنفیچو هەر بۆ نەفیە، وەك کەسێ دەڵێ: ئەو ئیشەم نەکردووە، تۆش دەڵێیت: دەی ئەوە حەقە نەت کردووە؟ تۆش وەڵام دەدەیتەوە بە(ئا) یان بە(نا).

ئەم شیعرەش هەر میثالە بۆ ئەوە هەمزەکە چووەتە سەر کەلامی مەنفی و بۆ پرسیاریشە: ئایا من مردم سەلما ئارامی نیە یاخود ئازایە وخۆڕاگرە کەوابوو ئەوەی عاشقانی هاوڕێنەم پێی گەیشتن منیش پێی ئەگەم، وەڵام دەدرێتەوە بەیەکێکیان.

(١)بیست و حەوتەم: واوە ، یەکێکە لە حەرفی عەطف ، هاتووە بۆ ئەوە ی عەطف کراوەکەو عەطف لەسەر کراوەکە لەیەك حوکمدا کۆبکاتەوە، چونکە واو لە هەموویاندا بەکاردێ، ئیتر پێکەوەبن یاخود عەطف کراوەکە لەدواوەبێ، یاخود لەپێشەوە بێ، واو هەموویان دەگەیەنێت وەك دەڵێیت: زەید و عەمر هاتن ، ئایا پێکەوە هاتن ؟ هەرئەیگەیەنێ یاخود بەرودوا هاتبن هەر راستەو ئەیگەیەنێ، کەوابوو واو بۆ ئەوەی لەهەر سیانیان هاوکار بێ ئەوە حەقیقەتی واوە، کە بریتیە لەوەی بڵێیت: واو بۆ کوێ پێش و پاشی خۆیەتی بێلەکاندنی وشەی لەگەڵی یا بەرودوا ، بۆ ئەوە خۆت بپارێزی لەوە بڵێیت: واو لەفظێکی موشتەرەکە یاخود مەجازە، بەکارهێنانی واو لەهەریەك لەو سیانەدا لەوبارەوە کە هۆکاری کۆی پێش و پاشی خۆیەتی ئەوە بەکارهێنانێکی حەقیقیە. (٢)هەندێك وتوویانە واو بۆ تەرتیب و دواخستنی عەطف کراوەکەیە لەسەر عەطف بۆ سەر کراوەکە، چونکە لەمەدا زۆر بەکارهاتووە، بەڵام لەغەیری تەرتیبدا مەجازە.

{وقيلَ للمعيَّة} لأنَّها للجمعِ والأصلُ فيهِ المعيَّةُ فهي في غيرِها مجازٌ فإذا قيلَ: قامَ زيدٌ و عمروٌ ، كانَ محتملاً للمعيَّةِ والتأخيرِ و التقدّم على الأوّلِ ظاهراً في التأخيرِ على الثاني وفي المعيَّةِ على الثالثِ وعدلَ عنْ قولِ إبنِ الحاجبْ وغيرِهِ للجمعِ المطلَقِ قالَ لإيهامهِ تقييد الجمعِ بالإطلاقِ والغرضُ نفي التقييدِ[1]

{الأمرُ} اي هذا مبحَثُهُ وهو نفسيٌّ ولفظيٌّ و سيأتيان، {ا م ر، ا} اللفظُ المنتظَمُ من هذهِ الأحرفِ المسمّاةِ بألف ميم راء ويُقرأُ بصيغةِ الماضي مُفكّكاً[2] {حقيقةٌ في القولِ المخصوصِ} اي الدّالِ على إقتضاءِ فعلٍ الى آخرَ ما سيأتي ويعبَّرُ عنهُ بصيغةِ إفعَلْ نحو:﴿ وامُــرْ أهلَكَ بالصّــلاةِ ﴾ اي قلْ لــهــمْ صلُّوا[3] {مــجازٌ في الفعلِ} نحو:﴿ وشاورهُمْ في الأمرِ ﴾ اي الفعلِ الــذي تعزِمُ عليهِ لتبادُرِ القولِ دونَ الفعلِ من لفظِ الأمرِ الى الذّهنِ والتبادرُ علامةٌ للحقيقَةِ[4]

---

(١)هەندێکیش وتویانە : واو بۆ ئەوەیە پێش و پاشی پێکەوە حوکمەکەیان بەسەردا بدرێ، چونکە واو بۆ کۆی هەردوکیانە ، ئەصلیش کۆدانەوەیە پێکەوەبن، کەوابوو واو لەغەیری مانای لەگەڵدا بوونا بۆ مەجازە ، ئەگەر بوترێ: هات زەیدو عەمر، ئەگونجێ پێکەوە هاتبن، یا لەدواوە هاتبێ یا لەپێشەوە هاتبێو لەسەر قەولی یەکەم لەسەر قەولی دووەمیش ئاشکرایە کەدوواکەوتووە، لەسەر قەولی سێهەمیش پێکەوە هاتوون، جا بۆ دانەر لای دا لەقسەی ئیبن حاجب و خەڵکانیتر کە وتوویانە واو بۆ جەمعی مطلقە ، دەڵێ: چونکە وادەخاتە دڵی ئینسانەوە کە ئەو جەمعە قەیدی مطلقی پێوەیە، مەبەستیش ئەوەیە نەفی قەیدی لێبکرێو بەرەڵابێ و تەنها بۆ جەمع و کۆبێ و بەس.

(٢)ئەمە باسی ئەمرو فەرمانە ئەمریش دوو جۆرە نەفسی و لەفظی ، لێرەدا باسیان ناکەم، لەمەودوا پێناسەکەیان دێ ، (ا ، م، ر) واتە ئەو لەفظەی پێك هاتبێ لەم پیتانە، ناویان ئەلیفەو میمەو رێیە، وەبە صیغەی فیعلی ماضی ئەخوێنرێتەوە، لەکاتێکدا بەگوێرەی لەفظ و نوسینی لەیەك خرابێتەوە بەم شێوە، (ا ، م، ر).

(٣)ئەمر لە حەقیقەتدا بریتیە لە قەولێك تایبەت کراوە بە صیغەیێکی دیارەوە، وەدەلالەت دەکا لەسەر داخوازی کارێك...هتد. کەلەمەودوا دێت، تەعبیری لێدەدرێتەوە ویچنە دەگیرێ بەوشەی: إفعل ، وەك: خێزانەکەت فەرمانی پێبدە بەنوێژکردن ، واتە بڵێ پێیان: نوێژ بکەن. (٤)ئەمر وەك لەحەقیقەتدا قەولە ، لەمەجازدا فیعل و کارە وەك: لە ئەمردا راوێژیان بکە،واتە لەو کارەی بێگومان نیازی ئەنجامدانیت کردووە راوێژی بکە،-خۆ ئەگەر کارێ گومانی تێدا هەبێ ئەو ئەبێ زۆر

{وقيلَ} هـوَ {للقدر المشترَك} بينـهما كـالشـيئ حذراً من الإشتراك و المجـاز فإستعماله في كلّ منها من حيثُ انَّ فيه القدر المشترك حقيقيٌّ {وقيل هـو مشتركٌ بينهـما}[1] {وقيلَ وبينَ الشأنِ والصفةِ والشـيئِ} ، لإستعمالِه فيها ايضاً نحو:﴿ إنّما امرُنا لشيئٍ إذا اردناهُ ﴾ اي شأنُنا ، لامـرٍ ما يسـودُ من يسودُ، اي لصفةٍ من صفات الـكمالِ لأمر مّا جدعَ قصيرٌ انفه، اي لشيئٍ ، والأصـلُ في الإستعمالِ الـحقيقَةُ، واُجيبَ بأنَّهُ فيها مجـازٌ ، إذ هوَ خيرٌ من الإشتراك، كمـا تقدَّمَ، ولـفظَةُ قيلَ بعدَ بينهُما ثابتَةٌ في بعضِ النسَـخِ و بها يُستَفـادُ حكايَةُ الإشـتراكِ بينَ الإثـنينِ الأشـهَرُ منْهُ بينَ الخمسَةِ، ويؤخَذُ من قـولِه حقيقةً في كذا حدُّ اللفظيِّ به[2]

---

چاكتر راوێژ بكرێ- بۆ ئەمر حەقیقەتە لەقەولاو مەجازە لەكاردا؟ چونكە بیستنی لەفظی ئەمر ، یا صیغەكەی یەكسەر فەرمان بەرەو ذیهنی ئەڕوا نەك كردارو گوفتار ، خۆ بێگومان زوو حاڵیبونیش نیشانەیماناى حەقیقیە. (١)هەندێكی تریش دەڵێن: ئەمر دوو جار دانراوە جارێ بۆ گوفتارو جارێ بۆ ڕەفتار.

(٢)هەندێكیش وتوویانە: لەفظی ئەمر موشتەرەكە قەول و فیعل و شأن و حاڵ و صیفەت و شتدا، چونكە بەكارهاتووە لەم سیانەشدا وەك لەو دوانەكەدا بەكارهاتووە، وەك: تەنها شأن و حاڵی ئێمە بۆ كارێك كاتێ بمانەوێ بیكەین...، ئەم ئەمرە بەمانا شأن و حاڵە یا وەك: بەهۆی صیفەتێ لە صیفاتی كەماڵەوە كار دەگرێتە دەس، ئەم ئەمرەش بەمانا صیفەتە، یاوەك ئەبێ لەبەر شتێك بێ، قصیر، لوتی بڕاوە، ئەم ئەمرەش بەمانا شتە لەگەڵ ئەوەش ئەصل لەبەكارهێنانی لەفظدا ئەوەیە لەحەقیقەتدا بەكاربێ. وەڵامی ئەم قیلەش دراوەتەوە كە ئەمر لەماناادا مەجازە، چونكە مەجاز باشترە لە ئیشتراك، وەك لەپێشەوە رابوورد، لەفظی (قیل) لەدوای (بینهما)وە لەهەندێ لەبەرگیراوەی ئەم كتێبەدا هەیە، هەر بەهۆی ئەم لەفظی قیلەوە ئەوە وەردەگیرێ، لەفظی ئەمر موشتەرەكە لەنێوان گوفتارو رەفتاردا كە ئەم موشتەرەكە بەناوبانگترە، تا ئەو ئیشتراكەی لەنێوان هەر پێنجیاندا. وەك دانەر دەڵێ: ئەمر حەقیقەتە لە لەفظێك دەلالەت دەكا لەسەر داخوازی كارێك... ئەمەپێناسەی ئەمری لەفظیە ، بەلام بەڕوونی نا، بەڵكو (ضمناً) ئەوە ئەگرێتە خۆ، بەلام ئەمری نەفس بە صریحی پێناسە كردووە بۆ ئەوەیە ئامارە بكا كە ئەمری ئەصلی ئەمری نەفسیە.

وامّا النفسيُ وهو الأصلُ اي العمدَةُ فقال فيهِ: {وحدُّهُ إقتضاءُ فعلٍ غيرِ كفَّ مدلولٍ عليهِ} اي على الكفِّ {بغيرِ} لفظِ {كفَّ} فتناولَ الإقتضاء اي الطّلبَ الجازم وغيرَ الجازم لما ليسَ بكفّ ومثلَهُ مرادفهُ كأترك وذَرْ بخلافِ المدلولِ عليهِ بغيرِ ذلكَ اي لاتفعَلْ فليسَ بأمرٍ وسمّي مدلولَ كفّ امراً لانهياً موافقةً للدالّ في إسمه[1]

ويحدُّ النفسيُّ ايضاً بالقولِ المقتضي لفعل إلخ وكلٌ من القولِ والأمرِ مشتركٌ بينَ النفسيِّ واللفظيِّ على قياسِ قولِ المحقّقين في الكلام الآتي في مبحثِ الأخبارِ[2] {ولايُعتبَرُ فيهِ} اي في مسمّى الأمرِ نفسيّاً او لفظياً حتّى يعتبرَ في حدِّهِ ايضاً {علوٌ} بأنْ يكونَ الطالبُ عالِي الرتبَةِ على المطلوبِ منهُ[3]

---

(١)بەلاّم ئەمری نەفسی کە ئەویش ئەصلەو ستونی کاری دینداریە،-چونکە واجب و حەرام و .. لەمەوە گوێڕایەڵی خوا دێتەدی-، کەئەمرو واجب یەکێکیانە- جادانەر لەبارەی ئەمری نەفسیەوە دەڵێ: پێناسەکەی بریتیە لە: داخوازی کارێك کە قەدەغەکردن نەبێ -ئەوە ئەمرە وەك: نوێژ بکە، ئەمە داخوازی ئەنجامدانی کارێکە کەنوێژە، قەدەغە کردنی تێدا نیە ، بەلاّم ئەگەر- دەلاّلەت کراوبێ لەسەر قەدەغەکردن بەبێ لەفظی وشەی (کف و دعْ) ئەوە نەهیە چونکە ئەمیش داخوازی تێدایە.کەواوبوو ئەم پێناسەی ئەمرە نەفسیە کە بریتیە لەداخوازی چ جازم بێ یاجازم نەبێ گشتگیرە بۆ: ا-کارو رەفتارێك قەدەغەی تێدا نەبێ وەك : نوێژ بکە، وەبۆ ب-کارو فیعلێکیش خودی ئەو فیعلە قەدەغەو ڕێ لێگرتن بێ، کە دەلاّلەتی لەسەر کرابێ چ بەلەفظی (کفّ)بێ واتە وازی لێبێنە ، یاخود بەلەفظێك بێ هاوتاو هاومانای (کفّ)بێ، وەك: (اترك او ذَرْ) وازبێنە، بەلاّم بەپێچەوانەی قەدەغەیێك و داخوازیەك بێ ئەو دوو شێوازەبێ، واتە وەك: (لاتفعلْ) ئەوەنەکەی داخوازیو قەدەغەی تیایە، ئەمە ئەمر نیە بەڵکو نەهیە، ئەوەی(کفّ) دەلاّلەت دەکا لەسەری ناونراوە ئەمر: لەگەڵ ئەوەش مەدلولی نەهیە ناونراوە بەنەهی بۆ ئەوەی دال و لەفظی (کفّ)ە مەدلول داخوازی وازهێنانە موافقی یەك بن لەناوەکەیدا. واتە لەفظەکە ئەمرە ماناکەش هەر ئەبێ بەئەمر ناوبرێ. (٢)هەروەها دووبارە ئەمری نەفسی پێناسە دەکرێ بەقەولێکی نەفسیە کە داخوازی کەری کارێکە کەقەدەغەکردن نەبێ و قەدەغەی تیادا نەبێ، هەریەك لە قەول و ئەمر موشتەرەکێکی لەفظین لەنێوان نەفسی و لەفظیدا، لەسەر قیاسی رای زانایانی عیلمی کەلام کەلە باسی الأخبار دا دێت و باس دەکرێ.

(٣)لەناوەڕۆکی ئەمردا چ نەفسی بێو چ لەفظی بێ مەقام و پلەی فەرماندەرو مەرج نەگیراوە بڵندتر بێ لەفەرمان بەسەردا کراوەکە، هەتا دوبارە لەپێناسەکەشیدا

{ولا إستعلاءً} بأنْ يكونَ الطّلبُ بعظمَةٍ لإطلاق الأمرِ دونَهما[1] قالَ عمرو بن عاص لمعاوية: امرتكَ امراً جازِماً فعصيتني * وكانَ من التوفيقِ قتل إبنِ هاشمِ

هوَ رجلٌ من بني هاشم خرجَ منَ العراقِ علىمعاوية فامسكَهُ فاشارَ عليه عمرو بقتلهِ فخالَفَهُ و اطلَقَهُ لحلمهِ فخرجَ عليهِ مرّةً اخرى فانشدَهُ عمرو البيتَ فلن يرد بابنِ هاشم علي بن ابي طالب ﷺ ويقالُ امرَ فلانٌ فلاناً برفقٍ ولين[2] {وقيلَ: يُعتبرانِ} و إطلاقُ الأمرِ دونهما مجازيٌ[3]

{واعتبرتِ المُعتزِلَةُ} غيرَ ابي الحسين {وابو إسحق الشيرازي وإبن الصّباغ و السمعاني العلوَّ و ابو الحسين} منَ المعتَزِلَة{والإمام} الرّازي {و الآمدي وإبن حاجب الإستعلاء}[4] ومن هؤلاءِ منْ حدَّ اللفظيَ كالمُعتَزِلَةِ فإنَهم يُنكرون الكلامَ النفسيَّ ومنهم منْ حدَّ النفسيَّ كالآمدي[5]

---

ئیعتیباری بۆ بکرێ. (١)وەك مەرجیش نەگیراوە داخوازیەکە بەشێوەیەکیش بێ خۆی بەگەورە نیشان بدات، چونکە ئەمر کراوەو ئەو دووانەشی تیادا نیە.
(٢)وەك: عەمری کوڕی عاص بە معاویەی وت: فەرمانێکی بێگومانم پێکردی کەچی تۆ بێفەرمانیت کردم، کوشتنی هاشم زادە بەشێك بوو لەتەوفیق، عەمر ژێر دەستەی معاویە بوو کەچی پێی دەڵێ: (امرتك) مانای وایە پایە بڵندی و خۆ بەگەورە دەرخستن پێویست نیە، ئەو هاشم زادە پیاوێك بوو لە بنی هاشم لە فەرمانی معاویە دەرچوو لەعێراق دا، معاویەش بەدیل گرتی عەمریش ئاماژەی کوشتنی کرد بۆ معاویە، معاویەش بەگوێی نەکردو بەریلای کرد چونکە لێزان و ژیر بوو، ئەمجا جارێکی تریش دایە شاخ دژی معاویە، ئەمجا عەمریش ئەو شیعرەی بۆ خوێندەوە، مەبەست بەو هاشم زادەیە ئیمامی عەلی نیە، ئەشوترێ فلانە کەس ئەمری کرد بە فلان بەنەرمونیانیو هێوری.
(٣)هەندێك وتوویانە: گەورەیی و خۆ بەبڵند دەرخستن هەردوکیان ئیعتباریان پێدەکرێ، بەکارهێنانی ئەمر بێئەو دووانە ئەوە ئەمرێکی مەجازیە.
(٤)موعتەزیلە جگە لە ئەبو الحسین و شیرازیو صەباغ و سمعانی: بلندیان لە ئەمردا بەمەرج زانیوە، وەك رازیو ئامیدی و ئیبن الحاجبیش، خۆ بەگەورە دەرخستنیان بەمەرج زانیوە. (٥)هەندێ لەمانە تەنها پێناسەی ئەمری لەفظیان کردووە، وەك: موعتەزیلە چونکە موعتەزیلە بڕوایان نیە بە کەلامی نەفسی بەلام هەندێکیان پێناسەی ئەمری نەفسیان کردووە، و بەس وەك: ئامێدی.

{واعتبر ابو علي و ابنهُ} ابو هاشم منَ المعتزِلَة زيادةً على العلوّ {إرادةَ الدّلالَة باللفظ على الطلَب} فإذا لمْ يرد به ذلكَ لايكونُ امراً لأنَهُ يستعملُ في غيرِ الطّلَب فلاحاجةَ كتهديدِ ولاممَيّزَ سوى الإرادَةِ ، قلنا استعمالُهُ في غيرِ الطلَبِ مجازيٌّ بخلافِ الطّلَب فلاحاجَةَ الى إعتبارِ إرادتهِ[1] {والطّلَبُ بديهيٌّ} اي متصورٌ بمجرَّد إلتفاتِ النّفسِ إليهِ من غيرِ نظرٍ لأنّ كلَّ عاقلٍ يفرقُ بالبديهَةِ بينَهُ وبينَ غيرِه كالأخبارِ وما ذاكَ إلاّ لبدايتهِ فاندفعَ ما قيلَ منْ انّ تعريفَ الأمرِ بما يشتملُ عليه تعريفٌ بالأخفى بناءً على انّهُ نظريٌّ.[2] {والأمرُ} المحدودُ بإقتضاءِ فعلٍ... إلخ {غيرَ الإرادَةِ} لذلكَ الفعلِ فإنَهُ تعالى امرَ منْ علم انَهُ لايؤمنُ بالإيمانِ ولمْ يردْهُ منهُ لإمتناعهِ {خلافاً للمعتزِلَةِ} فيما ذُكرَ فإنَهم لمّا انكروا الكلامَ النفسيَّ لم يمكنهم إنكارُ الإقتضاءِ المحدودِ بهِ الأمرُ قالوا إنَهُ الإرادَةُ[3]

(١)ئەبوعەلى‌و ئەبو هاشمی کوڕی کە موعتەزیلەن زیاد لەمەرجەکەی خۆیان کە وتیان علو مەرجە، وتویانە: ویستو ئیرادەی ئەوەی هەبێ ئەو لەفظ دەلالەت لەسەر طلب و داخوازی ئەکا، ئەگەر بەو لەفظە مەبەستی ئەوە نەکرێ نابێ بە ئەمر، چونکە ئەو لەفظە جاری واهەیە بەکاردێ لەشتێکی‌تردا جگە لەداخوازی ، وەك: هەڕەشە لێکردن، هیچ شتێکیش نیە ئەم دوو لەفظە جیا بکاتەوە جگە لەویست و ئیرادە نەبێ، ئێمەیش لە وەلامیاندا دەڵێین: بەکارهێنانی ئەو لەفظە لە شتێکدا کە داخوازی تیادا نەبێت ئەوە مەجازیە، بەلام لە داخوازیدا بەکاربێ ئەوە حەقیقەتە، لەبەر ئەوە هیچ پێویستیەك نیە کەویست و ئیرادەی ئەو داخوازیە بکرێ. (٢)طلب و داخوازی چیە؟ طلب شتێکی روونەو لێی حاڵی ئەبی‌و ئەڕواتە ناومێشکمان تەنها بەوەی ژیری لایەکی بەلاوە بکاتەوە، بێ‌ئەوەی پێویست بەبیرکردنەوەو بەڵگەهەبێ، چونکە هەموو ژیرێك بەبێ بەڵگەو هەر بەدەرکەوتنی جیاوازی ئەکا لەنێوان طلب وداخوازی و غەیری طلبدا،وەك هەواڵدان، -واتە بێ‌بەڵگە دەزانێ ئەمەیان هەواڵەو ئەوەیان داخوازیە- ئەو جیاوازی کردنەشی تەنها لەبەر روونی و بەڵگە نەویستیە، کەوابوو ئەو رەخنەی وتراوە: کە پێناسەی ئەمری نەفس بە پێناسەیێك کراوە طلب و داخوازی ئەگرێتەوە ناساندنی ئەمرە بە پێناسەیەکی غامزو شاراوەتر، بینا لەسەر ئەوە کە ئەم طلب و داخوازیە نظریە.

(٣)ئەو ئەمرەی پێناسەکراوە بەداخوازی ئەنجامدانی کارێك و...، جیاوازیەك نیە لەگەڵ ئەو ویست و ئیرادەیەی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ئەبێ هەبێ -ئەمرو ئیرادە لەیەك جیان- چونکە خوای گەورە کەسێك کە هەر لەئەزەلدا زانیویەتی بڕوا ناهێنێ

{مسئلَةٌ: القائلونَ بالنفسيِّ} منَ الكلام ومنهمْ الأشاعِرَة {إختلفوا هلْ للأمرِ} النفسيِّ {صيغَة تخصُهُ} بأن تدلَّ عليهِ دونَ غيرِهِ فقيلَ: نعمْ وقيلَ: لا ، {والنَّفي عنِ الشّيخِ} ابي الحسنِ الأشعري ومنْ تبعَهُ {فقيلَ} النفي {للوقفِ} بمعنى عدم الدِّرايَةِ بما وضعَتْ لهُ حقيقةً مما وردَتْ لهُ من امر وتهديد وغيرهما {وقيلَ: للإشتراكِ} بينَ ماوردتْ لهُ[1] {والخلافُ في صيغَةِ إفعَلْ} والمرادُ بها كلُّ مايدُلُّ على الأمرِ من صيغَةٍ فلا تدلُّ عندَ الأشعري ومنْ تبعَهُ على الأمرِ بخصوصهِ إلاّ بقرينَةٍ كانْ يُقالَ صلِّ لزوماً بخلافِ الزمتُكَ و امرتُكَ[2]

---

ئەمرۆ فەرمانی پێکردووە باوەڕ بهێنێ، لەگەڵ ئەوەش ویست و ئیرادەی ئیمانی لەنەکردووە، چونکە خوا زانیویەتی ئیمتناع ئەکا و ڕێی خوا وەرناگرێ ، بە پێچەوانەی موعتەزیلە لەمەدا باس کرا، ئەمان ئەڵێن: ئەمرو ئیرادە هەریەکن و جیاواز نین، چونکە موعتەزیلە بڕوایان نیە، بەکەلامی نەفسی بەڵام بۆیان نەگونجاوە بڕوایان نەبێ بەتەکلیف و داخوازییەك كە ئەمری نەفسی پێناسەکراوە پێی، لەبەر ئەوە وتویانە: ئەمر بریتیە لە ئیرادە.

(١)ئەمە مەسئەلەیەکی سەربەخۆیە، ئەوانەی قەول ئەکەن وباوەڕیان هەیە بەکەلامی نەفسی-هەندێکیشیان ئەشعەریەکانن- جیاوازیان هەیە لەمەدا، ئایا ئەمری نەفسی صیغەیێکی هەیە تایبەت پێیەوە، کەهەر دەڵالەت بکا لەسەر ئەمرو شتیتر نەگەیەنێ، بەم شێوە: هەندێکیان وتویانە: بەڵێ صیغەیێکی تایبەتی هەیە، هەندێکیتریش وتویانە، صیغەی تایبەتی نیە، لەشێخی ئەشعەری و شوێن کەوتوانیەوە نەقڵ کراوە کە نیەتی ، بۆ نیەتی؟ هەندێك وتوویانە: لەبەر وەقف و هەڵوێستە کردن و نەزانین و حاڵی نەبوون کە حەقیقەتەن بۆ چ مانایێك دانراوە لەو مانایانەی کە صیغەی ئەمر ئەیان گەیەنێ، وەك ئەمرو هەڕەشە لێکردن و شتانی تریش، هەندێکیش وتوویانە: بۆیە صیغەیەکی تایبەتی نیە چونکە موشتەرەکە لەنێوان ئەو هەموو مانایانەدا کە صیغەی ئەمر ئەیگەیێنێ. (٢)ئەو کێشەو جیاوازیە لەنێوان زانایاندا هەیە لەصیغەو هەیئەتی ئەمر بەصیغەدا هەیە -نەك لەئەمر بەمادە-مەبەست بە صیغەی إفعل هەموو صیغەیێکە دەڵالەت بکا لەسەر ئەمر بە هەموو صیغەکانیەوە ، ئیتر (افعِلْ)ە یاخود(اُفعُلْ) یانەوانیتر، کەوابوو صیغەی ئەمر بەلای ئەشعەریوشوێن کەواتوانەوە دەڵالەت ناکات لەسەر ئەمرو فەرمان کردن، کە تایبەت بێ پێیەوە، مەگەر بەهۆی قەرینەوەبێ تایبەت بکرێ بەفەرمانەوە وەك ئەوی بوترێ: صلِّ لزوماً وشەی لزوماً قەرینەیەکە ئەمرە بۆ وجوبە، بەڵام ئەگەر بەمادەی ئەمر بێ وەك: (امرتُكَ و الزمتُكَ)

{تردُ} لستةٍ وعشرينَ معنى {للوجوبِ} اقيموا الصلاةَ[1] {والنَّدب} ﴿ فكاتبوهم إنْ علمتم فيهم خيراً ﴾ {والإباحة} ﴿ كلوا من الطيبات ﴾[2] {والتهديد} ﴿ إعملوا ما شئتُم ﴾ ويصدُقُ مع التحريمِ و الكراهَةِ[3] {والإرشـاد} واستشـهدوا شـهيدينِ مـنْ رجـالِكم والمصلَحَةُ فيه دنيوية بخلافِ النَّدبِ وقدَّمَهُ هنا بعدَ انْ وضعَهُ عقِبَ التأديبِ لقولِه الآتي وقيلَ مشتَرَكَةٌ بينَ الخمسَةِ الأوّلِ فإنَّهُ منها[4] {وإرادَةُ الإمتثالِ} كـقولِه تعالى: لآخَرَ عندَ العطَشِ: إسقني ماءً[5] {والإذن} كـقولِكَ لمنْ طـرَقَ البـابَ: أدخـلْ[6] {والتأديـب} كقولـه ﷺ لعمرو بن ابي سلمة -وهو دونَ البـلوغ ويدُهُ تطيشُ في الصفحَةِ: (كلْ مما يليكَ) رواهُ الشيخان امّا اكلُ المكلَّفِ مما يليهِ فمندوبٌ و مما يلي غيرَهُ فمكروهٌ ونصّ الشافعي على حرمتهِ للعالم بالنّهي عنهُ محمـولٌ على المشتمِلِ على الإيذاء[7]

---

ئەمە جیاوازی نیەو کێشەی تێدا نیە، کە بۆ وجوبە (١)صیغەی (إفعل) بۆ بیست و شەش مانا هاتووە، ونازانین کامیان بۆ حەقیقەتە : ١ـ بۆ وجوبە وەك: شیعاری نوێژ بەرپا بـکەن . (٢)٢ـ سوننەتـە وەك: كاتبـوهم ، والإباحـە:﴿ كلوا منَ الطَّيبات ﴾ ٣ـ هاتووە بۆ حوكمی ئیباحەو رەواكردنی شتێ، لەشتە پاكەكان بخۆن. (٣)٤ـ بۆ هەڕەشە لێكردنیش هاتووە وەك: هەرچی ئارەزوتان لێیە بیكەن، هەڕەشە لەگەڵ حەرام كردن و كەراهەتیشدا هاتووە.

(٤)ئەمر هاتووە بۆ رێنومایی و ئیرشاد وەك:﴿ واستشهدوا... ﴾واتە دوو شاهید لـەپیاوانتان بگـرن بـە شـاهید ، جیـاوازی نێـوان ئیرشـاد و نـەدب چیـە؟ ئیرشـاد بەرژەوەندی دنیایی تیایە، بەڵام نەدب بەرژەوەندی و پاداشتی قیامەتی تێدایە، ئەی بۆ لێرەدا دانەر ئیرشادی پێش خستووە بەسەر تأدیب دا ، كەچی لەبەرگێراوێكی‌تردا لەدوای تأدیبەوە دایناوە؟ ئەوە لەبەر ئەوەیە قسەیەكی هەیە كەمێكی‌تر دێتە پێش و دەڵێ: هەندێك وتوویانە ئەمر موشتەرەكە لەنێوان پێنجەكەی پێشەوە. (٥)٦ـ هاتووە بەمانا ئەوەیـە فەرماندەرەكـەی ئەیـەوێ فـەرمان بەرەكـە كارەكـە بكـا بـەنیازی جـێ بەجێكردنی فەرمانی ئەم، وەك ئەڵێت بەیەكێكی‌تر لـەكاتی تینوێتیدا: كوڕە تۆزێ ئاوم دەرخوادبە. (٦)٧ـ هاتووە بەمانا مۆڵەتە وەك دەڵێت بەكەسێ لەدەرگاكەت دەدا: وەرە ژورەوە بەم مانا نیە كە واجبە بێتە ژورەوە، بەڵكو یـانی مۆڵـەت هەیـە بێتـە ژورەوە (٧)ئەمر هاتووە بۆ ئەوەی ئەدەب و رەوشت فێری بەرامبەرەكەی بكا، وەك پێغەمبەر ﷺ بە عومـەری كوڕی ئەبو سەلەمەی فەرموو-عومەر نەگەیشتبویە تەمەنی ئەرك بەسـەرداران، دەسـتیش لەناو قاپەكـەدا و لەبەردەم خەڵـكدا هەڵئەسـوڕاند-

{والإنذار} نحو:﴿ قلْ تمتّعوا فإنّ مصيرَكم الى النّار ﴾ ويُفارقُ التهديد بـذكرِ الوعيـدِ[1] {والإمتنان}:﴿ كلوا مما رزقكُمُ الله ﴾ ويفارقُ الإباحَةَ بذكرِ ما يحتاجُ إليهِ[2] {والإكرام} ﴿ ادخلوها بسلامٍ آمنين ﴾[3] {والتسخيرِ} اي التذيل والإمتهـان نحـو: ﴿ كونـوا قردةً خاسئين ﴾[4] {والتكوينِ} اي الإيجاد عنِ العدَم بسرعة نحو:﴿ كنْ فيكون ﴾[5] {والتعجيز} اي إظهار العجز نحو:﴿ فأتوا بسورةٍ منْ مثلهِ ﴾[6] {والإهانَة} نحو:﴿ ذُق إنَّـكَ انـتَ العزيـزُ الكريـم ﴾[7] {والتسـويَة} ﴿ فاصـبروا أو لاتصـبروا ﴾[8] {والدّعـاء} نحو:﴿ ربّنا إفتحْ بيننا وبينَ قومنا بالحقِّ ﴾[9]

---

لەبەردەم خۆتـەوە بخـۆ، بوخـاریو موسـلیم ریوایـەتیان کـردووە، بـەڵام خواردنـی موسوڵمانی موکەلەف لەبەردەم خۆیەوە ئەوە سوننەتە، وەلەبەردەم یەکێکی‌تردا بخوا ئەوە کەراهەتی هەیە، بەڵام شافعی دەقی پیا ناوە کەحەرامە لەبەردەم خەڵکەوە بخـوا، بۆ کەسـێ بزانـێ پێغەمبـەرﷺ قەدەغەی کردووە، ئـەوە حـەمل دەکرێتـە سـەر دەسـت راکێشانێك کەئازاری یەکێکی‌تر بدا.

(١)٩ـ ئـــەمر هاتـووە بـۆ ئـەوەی گوێگـر بترسێنێـــێ، ئەفـــەرموێ: ئـەی محمـد بڵێ:ئەی بێباوەڕان رابوێـرن، چونکە بێگومان سەرەنـــجامتان بەرەو ئاگـــر چوونـە جیائەکرێتەوە کەهـــەڕەشە بەمە لـــە ئینذارو ترساندنـــدا هەڕەشەکە دیاری کراوە، بەڵام لەهەڕەشەدا مەرج نیـــە، (٢)هـاتووە بۆ منەت نان وەك: بخۆن بخۆن لـــەوەی خوا رزقی داون، لەگەڵ ئیباحە جیائەکرێتـــەوە ، بەوە ئەوەی منەتی پێ‌ئەکا باســـی ئەکا ، لە ئیباحـەدا باسـی ناکـا. (٣)١١ـ هـاتووە بـــۆ رێزلیـــنان وەك: بچنـە نـاو بەهـــەشتـــی خواوە هەمیشـە لـەئارامدا ئـەبن. (٤)١٢ـ هـاتووە بـۆ ئـەوەی فـەرمان پێکراوەکـــە زەلیل ئەکاو ســـوکایەتی پێ‌دەکا وەك: جولەکە ئێوە ببن بە مـــەیمون لەکاتێکدا کە ریسـوان.

(٥)١٣ـ هـاتووە بۆ ئەوەی شتێك لـە نـەبووەوە بێتـە بـوون دەستبەجێ وەك: خـوا دەفـەرموێ: بەشتـێ ببـە یەکسـەر ئـەبێ. (٦)١٤ـ هـاتووە بـۆ دەرخسـتنی نەتـەوانایی بەرامبەر وەك: دەئێوەش یەك تاکە سورە لەوەی قورئان بهێنن، لەسەر گۆی پیاوێکی وەك محمـدەوە. (٧)١٥ـ هـاتووە بۆ گاڵتـە پێکـردن وەك:بچێژە چونکە تـۆی ئازیـــزو بەرێز. (٨)١٦ـ هاتووە بۆ یەکسان کردنی کارێك بەلای گوێگرەکەوە، وەك:ئارام بگرن یـاخود ئارام نەگرن، هـەر لـە دۆزەخدان، چون یەکە. (٩)١٧ـ ئەمر جاری واهەیە بـۆ پاڕانـەوە ئـەبێ لەبەرامبـەر وەك: ئـەی پـەروەردگارمان دەرگـای داخـراوی نێـوان ئێمـە و گەلەکەمان بکەرەوە بەهۆی حەقو راستیەوە.

{والتمني} كقولِ إمرئِ القيسِ :

الا أيُها الليلُ الطويلُ الا إنجَلي * بصبحٍ وما الإصباحُ منْكَ بأمثلِ

ولبُعدِ إنجِـــلائِه عنـدَ المحبِّ حتّـى كأنّـهُ لاطمعَ فيـه كـانَ مُتمنيـاً لامترجيّـاً[1] {والإحتقارِ} ﴿ القوا مـــا انتم مُلقـون ﴾ إذْ مايلقونَهُ مـنَ السّحرِ وإنْ عظُمَ محـــتقرٌ بالنسبَةِ الى معجِزَةِ موسى عليهِ السلام[2] {والخبر} كحديثِ البخاري:(إذا لمْ تستطعْ فـاصنعْ ماشـئتَ) اي صنعـتَ[3] {والإنعـام} بمعنـى تذكيـر النعمة نحـو:﴿ كلـوا مـنْ طـــيِّباتِ ما رزقناكُمْ ﴾[4] {والتـــفويض} ﴿ فاقضِ مـا انتَ قاضٍ ﴾[5] {والتعجُّب} نحو:﴿ أنـــظُـــرْ كيفَ ضربوا لكَ الأمثال ﴾[6] {والتكذيب} ﴿ قلْ فـاتوا بـالتَّوراةِ فاتلوها إنْ كنـــتُم صـــادقين ﴾[7] {والمشورَة} ﴿ فانظرْ ماذا ترى ﴾[8] {والإعتبارِ} ﴿ انظروا إلى ثَمَرِهِ إذا اثمَر ﴾[9]

---

(١)١٨ـ ئـەمر هـاتووە بـۆ ئـاوات خوازتـن بەمـەحاڵ وەك: ئاگـاداربە ئـەی شـەوە درێژەكە ئایا روون نابیـتەوە ، بەڕۆژی بەیانـەوە ، خـۆ وەنـەبێ بـەیان كردنـەوە لەتـۆ باشتر بێ، بارم هەر غەمە لەبـەر دووری روون بوونەوەی شەو بەلای عاشقانەوە هـەتا وای لێهاتووە ئومێد بڕبـێ لێـی نـەك بـەهیوای بـێ. (٢)١٩ـ بـۆ دەرخسـتنی سـوكی شتەكەیە وەك: بیخەنەڕوو ئەوەی ئەتانەوێ بیخەنەڕوو، چونكـە ئـەو جادوەی ئـەوان ئەیخەنەڕوو هەرچەند زۆر گەورەیە، بەڵام بەگوێرەی موعجیزەی موسا هیچ نیە.

(٣)٢٠ـ هاتووە بەمانا هەواڵە وەك: ئەم فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: (كـاتێ كەشەرم نەكەی، ئەوەی ئارەزوتە بیكە) هەرچەندە هـەر فیعلێك بـــەدوای (إذا)وە بـێ هـەر بـــەمانا مضارعە بۆ داهاتووە ، مانـای وانیە بیكە بەڵكو مانـای وایـە ئەیكـەی.

(٤)٢١ـ هـاتووە بەمانـــا یادخستـــنەوەی نیعمەتە ، وەك لـەو رزقـە پاكـانەی پـــێی داون بـــخۆن و یادی خواش بكەن بەگـــوێڕایەڵی كردنی. (٥)٢٢ـ هـاتووە بـــۆ ئـەوەی كارەكـــە بخاتـە دەستـــی قسە لەگەڵ كراوەكە وەك: كـــاری خۆت بكە چـی ئەكـەی بیكە. (٦)٢٣ـ هاتـــووە بۆ سەرسـوڕمان وەك: سـەرنج بـدەن!! چـــۆن پـەندی جـۆراو جۆرت بۆ لێدەدەن؟

(٧)٢٤ـ بۆ بەدرۆخستنەوە، وەك: تەورات بیچنن و بیخوێننەوە ئەگەر راســت دەكەن،

(٨)٢٥ـ هـــاتووە بەمانـــا راوێژكردنـــە ، وەك: سـەرنج بـدە بزانـە چـــی دەبیـــنن.

(٩)٢٦ـسەرنج بدەنە بەرەكـــەی كاتێ دێتەبەر –نەبووەو لەو دارە رەقـــە خوا دروستی دەكا ، دەی دەرس وەربگرن لـــەم نیشانەی دەسەلاتی خوایە–

{والجمهورُ} قالوا: هي {حقيقةٌ في الوجوبِ} فقط {لغةً او شرعاً او عقلاً مذاهب} وجهُ اوّلها الصحيحُ عندَ ابي إسحق الشيرازي إنّ اهلَ اللغةِ يحكمون بإستحقاقِ مخالفِ امرِ سيِّدِهِ مثلاً بها للعقابِ[1] والثاني القائلِ بأنّها لغةٌ لمجرَّدِ الطّلَبِ وإنّ جزمَهُ المحقّقِ للوجوبِ بأنْ يترتَّبَ العقابُ على التّركِ إنّما يُستفادُ منَ الشرعِ في امرِهِ اوامرُ منْ اوجبَ طاعتَهُ اجابَ بأنَّ حكمَ اهل اللغةِ المذكورِ مأخوذٌ منَ الشرعِ لإيجابِهِ على العبدِ مثلاً طاعةَ سيِّدهِ[2] والثالثُ إنّ ماتفيدُهُ لغةً منَ الطّلَبِ يتعيَّنُ ان يكونَ الوجوب لأنّ حملَهُ على النّدبِ يصيرُ المعنى إفعَلْ إنْ شئتَ وليسَ هذا القيدُ مذكوراً وقوبِلَ بمثلِهِ في الحملِ على الوجوبِ فإنَّهُ يصيرُ المعنى إفعَلْ من غيرِ تجويزِ تركٍ[3] {وقيلَ}هي حقيقةٌ {في النّدبِ} لأنّهُ المتيقّنُ منْ قسمي الطّلَبِ[4] {وقالَ} ابو منصور {الماتريدي} منَ الحنفيّةِ هي موضوعةٌ {للقدرِ المشترَك بينهما} اي بينَ الوجوبِ والنّدبِ وهو الطّلَبُ حذراً من الإشتراكِ والمجازِ فإستعمالُها في كلٍّ منهما منْ حيثُ إنّهُ طلبُ إستعمالٍ حقيقيٍّ[5]

---

(١)جمهوری زانایان وتوویانە: صیغەی ئەمر تەنها حقیقەتە لە وجوبدا ، هەندیّ دەڵیّن: لەروی لوغەوە حقیقەتە لە وجوبدا، وەبازێکیتر دەڵیّن: لەروی شەرعەوە، وەکۆمەڵێکیتر دەڵیّن: لەروی عەقڵەوە. (٢)دووەم کەدەڵیّ: صیغەی ئەمر لە لوغا تەنها بۆ داوای رووتە ، بەڵام بەجەزم داواکردنەکەی وجوبەکە پەیدا دەکا، بەم شێوە کە تۆڵە دێنە سەر نەکردنەکەی ئەمە لەشەرع وەردەگیریّ لەسەرپیچچی کردنی فەرمانیدا یاخود فەرمانی کەسێککە ئەو واجبی کردبیّ گوێڕایەڵی بۆ بکا، ئەم دووەمە وەڵامی یەکەم ئەداتەوە دەڵیّ: ئەو حوکمەی ئەهلی لوغە کردیان لەشەرع وەرگیراوە، چونکە شەرع واجبی کردوە لەسەر بەندەکەی گوێڕایەڵی گەورەکەی بکا.

(٣)سیّهەم ئەڵیّ: ئەوەی صیغەی ئەمر ئەیگەیەنیّ لەڕووی لوغەوە، کەداواکردنە بۆ وجوب، چونکە حەمل کردنی لەسەر نەدب ماناکەی بەم شێوە لیّدەکا: (إفعَلْ إنْ شئتَ) ئەگەر ئارەزوت هەبوو بیکە، خۆ ئەم قەیدەش ئەگەر...نەوتراوە، ئەم بەڵگە عەقڵیە بەرەخنەیەکی وەك خۆی عەقڵی ریّی لیّگیراوە، واتە حەمل دەکرێتە سەر وجوب، چونکە ماناکەی ئاوا لیّدەکا:(إفعلْ منْ غيرِ تجويزِ تركٍ) ئەو کارە بکە بیّ ئەوەی ریّی نەکردنی بدریّ. (٤)وتراویشە کە حەقیقەتی ئەمر لە حەقیقەتدا بۆ نەدبە، چونکە نەدب بێگومان یەکێکە لەدووبەشی طلب و داخوازی. (٥)الماتریدی یەکێکە لەزانایانی حەنەفی دەڵیّ: صیغەی ئەمر دانراوە بۆ شتێك کەهالە نێوان وجوب و نەدبدا ، کەبریتیە لە داخوازی، بۆ وای وتووە ؟ لەترسی ئەوەی لەئیشتراك و مەجاز دوری

والوجوب الطلَبُ الجازمُ كالإيجابِ تقولُ منهُ وجبَ كذا اي طلَــبَ بالبناءِ للمفعولِ طلباً جازِماً[1]{وقيلَ} هـيَ {مشترَكَةٌ بينهما}[2] {وتوقَّفَ القاضي} ابوبكر البـاقلاني {والغزالي والآمدي فيها} بمعنى لمْ يدروا أهيَ حقيقةٌ في الوجوبِ أم في النَّدبِ أم فيهما[3]

{وقيلَ} هي {مشترَكةٌ فيهما وفي الإباحةِ}[4] {وقيلَ في} هذهِ {الثلاثةِ والتهديـدِ} وفي المختصر قولٌ إنّها للقدرِ المشترَكِ بينَ الثلاثةِ اي الإذنِ في الفعلِ، وتركَهُ المصنِّف لقولهِ لانعرفهُ في غيرهِ[5] {وقالَ عبد الجبار} منَ المعتزِلَة :هـي موضوعَـةٌ {لإرادَةِ الإمتثالِ} وتصدقُ مع الوجوبِ والنَّدبِ[6] {وقالَ} ابوبكر {الأبهري} منَ المالكيَّة: {امر الله تعالى للوجوبِ وامر النـبيِّ ﷺ المبتدأ} منهُ {للنـدبِ} بخلافِ المـــوافِقِ لأمرِ اللهِ تعل او المبيِّنِ فللوجوبِ ايضاً[7]

---

بخاتــەوە، كـەوابوو بـەكارهێنانی صیغـەی ئـەمر بـۆ هەریـەكێ لـە وجـوب و نـەدب لەڕووەوە داواو داخوازی تێدایە، ئـەوە بـەكارهێنانێكی حەقیقیـە، (١)وجـوب بـەمانا داواو داخوازێكی بێگومان و جازم، هەر ئەوەش مانای ئیجابە ، بۆ وێنە كە دەڵێن: وجب كذا ، داواكـراوە بـەداواكردنێكی بێگومـان. (٢)وتراویشـە كـە لـەفظێكی موشـتەرەكە لـەنێوان هـەردوكیاندا. (٣)باقـــلانی و غـەزالی و ئـامێدی هەڵوێسـتەیان كردووە لە حەقیقەتی صیغەی ئەمردا واتە نەیانزانیوە ئایـا صیغەی ئەمر حەقیقەتە لەوجوبدا، یا لەنەدبدا ، یاخود لەهەردوكیاندا ، واتە بەڵگەكانیان چون بەگژ یەكدا و هەموو بەهێز بوون.

(٤)وتراویشـە موشـتەرەكە لەنێـوان وجـوب و نـەدب و ئیـباحەكەدا.

(٥)وتـراویشە: صیغـەی ئـەمر وتراویشـە موشـتەرەكە لەنێـوان وجـوب و نـەدب و ئیـباحـەو تـەهدیدا، لەكتێبی (المختصر)دا قەولێك هەیـە دەڵـێ: صیغـەی ئـەمر بریـتیە لەو شتەی لەنـێوان هەرسیاندا هەیە كـەبریـتیە بە مۆڵەتدان بـەكردن، دانـەر لە مەتنـدا ئەم قـەولەیەی نەوت چونكە دەڵـێ: لە جێگەیەكیتردا جگە لەم جێگادا نازانم هەبێ.

(٦)عبد الجبار كەیـەكێكە لە مەعتەزیلە دەڵێ: صـیغەی ئەمر دانراوە بۆ ئەوەی ئەمر بەسەردادراوەكە گوێڕایەڵی بكاو جێبەجێ بكات، ئەمـەش لەگـەڵ وجـوب و نەدبـدا ئـەبێ. (٧)ئەبهـەری كـەیەكێكە لـەزانایانی مالیكـی دەڵێ: ئـەمر ئەگـەر لەلایەن خواوە بێ بۆ وجـوبە ، وەئەگەر هەر لەسەرەتاوە لە پێغەمبـەرەوە ﷺ بـێ بۆ نەدبە، بەڵام ئەگەر موافقی ئەمـری خوا بێ یارون كەرەوەی فـەرمانی خوا بێ دوبارە هەر بۆ وجوب دەبێ.

{وقيلَ} هـي {مشتركَةٌ بينَ الخمسَةِ الأوَلِ} اي الوجـوبِ والنَدبِ والإباحَـةِ والتـهديدِ والإرشاد[1] {وقيلَ: بينَ الأحكام} الخمسَةِ اي الوجوبِ والنَدبِ و التحريـم والكراهـة و الإباحَـة[2] {والمختارُ وفاقاً للشيخ ابـي حـامد} الأسـفرايني {و إمـامُ الحرمـين} إنَّـها {حقيقَةٌ في الطَلَبِ} الجازمِ لغةً فلاتحتملُ تقييدَهُ بالمشـيئة[3] {فإنْ صـدرَ} الطَلَبُ بـها {منَ الشارعِ اوجبَ} صدورَهُ منهُ {الفعلَ} بخلافِ صـدورهِ مـنْ غـيرهِ إلاّ مَـنْ اوجبَ هـوَ طاعَتَهُ وهذا قالَ المصنِّف غير القولِ السّابقِ إنَّها حقيقةٌ في الوجـوبِ شرعاً لأنَّ جزمَ الطَلَبِ علـى ذلكَ شرعيٌّ وعلـى ذا لغويٌّ وإستفادَةُ الوجوبِ عليـه بالـتركيبِ مـنَ اللغَـةِ والشرعِ ، وقال غيرهُ إنَّـهُ هـوَ لإتّفاقـهما في انّ خاصـةَ الوجـوبِ مـن ترتُّـبِ العــقابِ علـى التركِ مستفادةٌ من الشـرعِ وعلـى كلِّ قـولٍ هـي في غـيرِ مـاذُكرَ فيـه مجازٌ[4] {وفي وجـوبِ إعتقادِ الوجوبِ} في المطلوبِ بها {قبلَ البحثِ} عمّا يصـرِفُها عنهُ إنْ كـانَ {خـلافَ العامِ} هلْ يجبُ إعتقادُ عمومِهِ حتّى يتمسَّكَ بـهِ قبـلَ البحـثِ عـنِ المخــصّصِ الأخـصِّ نعم كما سياتي[5]

---

(١)وتراويشـە صيغــەی ئـەمر موشــتەرەكە لـەنێوان ئـەو پێنجــەدا. (٢)وتراويشــە موشتەرەكە لەنێوان هــەر پێنــج حوكمەكـەدا. (٣)رای هــەڵبژاردەو مـن پێــی رازیبم و موافقی اسفرايينی و ئيمام بێت ئەوەيە: كەصيغەی ئەمر حەقيقەتە لەداخوازی جازم و بێگومـاندا لـەروی لوغـەوە، كـەوابوو ئيـتر ئـەوە هـەڵناگریٚ رسـتەی: ئەگـەر ئـارەزوت هەيەی پێوە بلكێ.

(٤)جائەگەر داخوازيەكە بەصيغەی ئەمر لەلايەن خواوە بـوو،مادەم ئەمرەكە لەلايـەن ئەوەوە صادرەو دەرچووە كارەكە واجب دەكا، بـەڵام ئەگـەر لەلايـەن يـەكێكیترەوەبێ واجب نابێ، مەگەر كەسێكە كە خوا فـەرمانی دابێـت بەگوێڕايـەڵی كردنـی، ئەم قەولە دانەر وتوويەتی لە قەولە پێشوەكە جيايە، چونكە صيغـەی ئـەمر حەقيقەتـە لـەوجوبدا لـەڕوی شـەرعەوە، چونكـە بێگومـان لەداخوازيەكـەدا لەسـەر قەولـە پێشـوەكە لەشــەرع وەرگيراوە، لەسەر ئەم قەولە هەڵبژاردەيە لە لوغەوە وەردەگيرێ، وەوەرگرتنیوجوبەكە لەلوغەو شەرع پێك هـاتووە لەسـەر ئـەو قــەولە، بـەڵام غـەيری دانـەر دەڵـێ: ئەم قەولـە هـەروەك قـەولی پێشـو وايـە چونكـە هـەردوكيان يـەك قسـەن لەسـەر شـتێك كەتايبــەتیو وجوبە، كـە تۆڵـە وەرگرتنـە لەسـەر نەكردنی، هــەر لەشــەرعەوە وەرگـيراوە بـەگوێرەی هـەموو بۆچونێك، صيغـەی ئـەمر جگـە لــەوەی حەقيقەتـە تيـايدا، ئيـتر لەهـەموويـاندا مـەجازە. (٥)ئايـا واجبە بڕوامـان هـەبێ بە واجب بوونـی داواكراوێــك بــــەصيغەی ئەمر پێش گەڕان بەشوێن ئەوەی صيغەی ئەمرەكە لە وجوب لادا، ئەگەر هـەبێ؟ ئەوە

{فإنْ وردَ الأمرُ} اي إفعَلْ {بعدَ حظرٍ} لمتعلّقِه {قالَ الإمامُ} الرّازي {او إستئذانٍ} فيه {فللإباحَةِ} حقيقَةً لتبادُرِها الى الذّهنِ في ذلكَ لغلَبَةِ إستعمالِه فيـها حينئـذٍ والتبـادُرُ علامَةٌ للحقيقَةِ[1] {وقالَ} القضي {ابو الطيّب}والشيخ ابو إسحق {الشيرازي و} ابو المظفر {السّمعاني والإمام} الرّازي {للوجوب} حقيقةً كما في غيرِ ذلكَ وغلَبَةُ الإستعمالِ في الإباحَةِ لاتدلُّ على الحقيقَةِ فيها[2] {وتوقّفَ إمامُ الحرمينِ} فلمْ يحكُمْ بإباحَةٍ ولا وجوبٍ ومنْ إستعمالِه بعدَ الحظرِ في الإباحَةِ ﴿ وإذا حلَلْتم فاصطـــادوا ﴾ ﴿ فإذا قضيتُمُ الصلاةَ فانتشروا في الأرض ﴾، ﴿ فإذا تطهّرنَ فأتــوهُنَّ ﴾ وفي الوجوب ﴿ فإذا إنسلَخَ الأشهُرُ الحُرُمُ فاقتلوا المشركينَ ﴾ إذ قتالُهُم المؤدي الى قتلِهم فرضُ كفايَةٍ وامّا بعدَ الإستئذان فكأن يُقالَ: لمن قال: افعَلُ كذا إفعَلْه.[3]

---

جوابەکەی جیاوازی تیادا هەیەو وەك صیغەی عام وگشتگیر وایە، ئەو کێشەی تیایە ئایا واجبە باوەڕ بە عام و گشتگیریەکەی بکەین، دەستی پێوە بگیرێ و کاری پێ بکرێ، پێش گەڕان بەشوێن شتێکدا کەتایبەتی بەکات و لەگشت گیریەتی بخات؟ قەولی ئەصەح و راستتر ئەوەیە بەڵێ واجبە، وەك لەمەودوا دێ. (١)بەڵام ئەگەر صیغەی ئەمر هات داوای ئەوەی کە قەدەغە کرابوو، رازی دەڵێ: یاخود صیغەی ئەمر بێ داوای مۆڵەت خواستن لەکردنی کارێکدا، ئەوە ئەو ئەمرە بۆ ئیباحەو حەڵاڵ کردنە لە حەقیقەتدا، چونکە کەهات یەکسەر حەڵاڵی بوونی بەرەو ذیهنی مرۆڤ دەڕوات لەوکاتی هاتنی ئەمرەدا داوای حەرام بوونی، چونکە ئەمر لەو کاتەدا زۆربەی بۆ ئیباحە بەکاردێ، زۆر لێحاڵی بونیشی نیشانەی حەقیقەتە. (٢)قازی و شیرازی و سمعان و رازی دەڵێن: ئەمر دوای قەدەغە بۆ وجوبە لەحەقیقەتدا، وەك ئەگەر داوای قەدەغەش نەبێ ئەمر ئەصلەن هەر بۆ وجوبە، زۆر بەکارهێنانیشی بەڵگە نیە لەسەر ئەوە کە دەلالەت لەسەر ئیباحە بکا لەحەقیقەتدا.

(٣)ئیمام الحرمین هەڵوێستەی کردووە لەم بابەتەدا لەبەرئەوە نەحوکمی بەئیباحە گەیاندنی کردووە، وەنە بەوجوبی، جا وێنە بۆ ئەوەی کەصیغەی ئەمر بۆ ئیباحەیە دوای قەدەغە بوونی ، کاتێ ئیحرامتان شکاند دروستە راو بکەن، جا کاتی کۆتایی بەرپاکردنی نوێژی هەینی هێنرا دروستە لەمزگەوت بچنەدەرێ و بڵاوبنەوە، کاتێ ژنان لە حەیز پاك بوونەوە دروستە بچنە لایان، بەڵام وێنە بۆ صیغەی ئەوەی صیغەی ئەمر بۆوجوب بێ دوای قەدەغە بوون- کاتێ مانگە حەرامەکان تەواو بوون موشریکەکان بکوژن- جا خۆ مراندنیان بەدەستی ئێمە نیە، چونکە جەنگ لەگەڵ کردنیان فەرزی کیفایەیە، تا سەرەنجام ئەکوژرێن بەڵام وێنە بۆدوای مۆڵەت خوازی وەك ئەوە بووترێ

{امّا النّهيُ} اي لاتفعَلْ {بعدَ الوجوبِ فالجمهورُ} قالوا: هوَ {للتحريم} كما في غيرِ ذلكَ ومنهُم بعضُ القائـلينَ بانَّ الأمرَ بعدَ الحظرِ للإباحَةِ وفرَّقوا بانّ النهي لدفعِ المفسَدَةِ والأمر لتحصيلِ المصلَحَةِ واعتناءُ الشّارعِ بالأوّلِ اشدُّ[1] {وقيلَ للكراهَةِ} علـى قياسِ انّ الأمرَ للإباحَةِ[2] {وقيلَ للإباحَةِ} نظراً الى انّ النهيَ عنِ الشيئِ بعدَ وجوبِه يرفَعُ طلَبَهُ فيثبُتُ التخييرَ فيهِ[3] {وقيلَ لإسقاطِ الوجوبِ} و يرجعُ الأمرُ الى ماكانَ قبلَـهُ مـن تحريمٍ او إباحَةٍ لكونِ الفعلِ مضرَّةً او منفعةً[4] {وإمامُ الحرمينِ على وقفِهِ} في مسألَةِ الأمرِ فلمْ يحكُمْ هنا بشيئٍ كما هناك[5]

{مسئلَةٌ: الأمـرُ} اي إفعـلْ {لطلَـبِ الماهيَّـةِ لالتكـرارِ ولا مـرَّةٍ والمـرة ضروريّـةٌ} إذ لاتوجد الماهيّة بأقلّ منها فيحملُ عليها[6]

---

بەکەسێ کەئەڵێ: ئایا ئەو کارە بکەم؟ بیکە. (٢)بەڵام نەهی و قەدەغە هات دوای وجوب ئەم نەهیە بۆ چیە؟ جمهور وتویانە بۆ حەرام کردنیەتی، وەك چۆن ئ،صل لە نەهیدا ئەوەیە بۆ حەرام کَردن بێ، هەر قسەی ئەم جمهورە ئەکەن ئەوانەی وتوویانە: ئەمر دوای قەدەغە بۆ ئیباحەیە، ئەبوایە بیان وتبایە بۆ کەراهەیە، ئاخر چۆن ئەوان جیاوازیان لەنێوان ئەمرو نەهیدا کردووە، کەنەهیو قەدەغە کردن بۆ لابردنی خراپەو فەسادە، بەڵام ئەمر بۆ پەیداکردنی بەرژەوەندیە، شارع گرنگی بەیەکەم زیاتر ئەداو توندتر ئەیگرێ. (١)وتراویشە: نەهی دوای وجوب بۆکەراهەتە، لەسەر قیاسی ئەوە کەئەمر دوای قەدەغە بۆ ئیباحەیە، (٢)وتراویشە: نەهی دوای وجوب بۆ ئیباحەیە، چونکە سەیرە سەرنجی ئەوەی داوە کە: نەهیو قەدەغە بوون دوای واجب بوونی تەنها داخوازیەکە لائەبا، کەوابوو سەرپشك کردنەکەی تیادا دەمێنێتەوە. (٣)وتراویشە: نەهی تەنها ب لابردنی وجوبەکەیە، حوکمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کاتی پێشوی چ حەرام کردن بێ یا حەڵاڵ کردن بێ، حەرام و حەڵاڵیش بەوەدا ئەزانرێ کە: کارەکە ئەگەر زیانی بوو ئەوە حەرامە، وەئەگەر قازانجی بوو ئەوە حەڵاڵە. (٤)بەڵام ئیمام الحرمین هەر لەسەر هەڵوێستەی خۆیەتی وەك لەمەسئەلەی ئەمردا هیچ حوکمێکی نەدا، لێرەشدا هەر هیچ حوکمێك نادا.

(٥)ئەمە مەسئەلەیەکی ترە، صیغەی ئەمر دانراوە بۆ ئەوەی داوای جێبەجێکردنی ماهیەتی مانای ئەولەفظەی، نەبۆ ئەوەیە چەند جارێك دوبارەبکرێتەوە، وەنەبۆ ئەوەیە یەك جار بکرێ، بەڵام یەك جار هەرئەبێ بکرێ، چونکە ماهیەتەکەی بەوەنەبێ نایێتەدی و جێبەجێ ناکرێ، کەوابوو صیغەی ئەمر حەمل دەکرێتە سەر یەك جار.

{وقيلَ} المرَّةُ {مدلولُهُ} ويحملُ على التكرارِ على القولَينِ بقرينـــةٍ[1] {وقالَ الأستاذ} ابو إسحق الأسفرايني {و}ابو حـاتم {القزويـني} في طائفةٍ {للتكــرارِ مطلقاً} ويحمَلُ على المرَّةِ بقرينـَةٍ[2] و{وقيلَ} للتكرار {إنْ علقَ بشرطٍ او صـــفةٍ} اي بحسبِ تكرارِ المعلّقِ بهِ نحو:﴿ وإنْ كنتُم جُنُباً فاطهروا ﴾،﴿ والزانيّةُ والـــزانـــي فاجلدوا كـلَّ واحدٍ منهما مأةَ جلدة﴾ تتكرَرُ الطهارةُ والجلدُ بتـــكرُرِ الجـــنابَةِ والزِّنـا و يحـمَلُ المعلّقُ المذكورُ على المرَّةِ بقرينَةٍ كما في امرِ الحجِّ المعلّقِ بالإستـــطاعَة فإنْ لمْ يعلَقِ الأمرُ فللمرَّةِ ويحملُ على التكرارِ بقرينَـةٍ[3] {وقيلَ بالـــوقفِ} عنِ الـــمرَّةِ والتكرارِ بمعنى انّهُ مشترَكٌ بينهما او لأحَدِهما ولانعــــرفهُ قولان فلا يحتَمَلُ علـــى واحدٍ منهما إلاّ بقرينةٍ[4]

---

(١)وتراويشه: ئەمر مەدلولەكەی یەك جارە بەلای ئەم دوو قەولەوە ئەمر حەقیقەتە لەیەك داو مەجازە لەدووبارە بوونەوەیدا بۆ چەند جارێك بەلام بەهۆی قەرینــەو بەلگەییێ ،وە لەمەدلولەكەی لائەدا.

(٢)إسفراینیو قەزوێنی لەگەڵ كۆمەڵێكیتردا دەڵێن: ئەمــر بۆ دوبارە بوونـەوە دەبـێ ئیتر قەرینـە هــەبێ یـا نـەبێ، بەلام بەقەرینـەوە دەبرێتـە سـەر یـەك جـار،

(٣)وتراویشەئەمر بـۆ دووبـارە بوونەوەیـە ئەگـەر بەسـرابێ بـە مەرجێكــەوە یـاخود صیفەتێكـەوە واتـە چـەند جـار مـەرج و صیفەتەكـەی دووبـارە بێتـەوە ئـەمرەكەش دووبارە دەبێتەوە، وەك: خوای گەورە دەفـــەرموێ: ئەگەر لەشتان پیس بوو خۆتان بشۆن، ئافرەتی زیناكەرو پیاوی زیناكەر هەریـەكی هەریـەكی صـەد داریـان لێـدەن، خۆشـۆردن و دار لێدانەكـە دووبـارە دەبێتـەوە بـەهۆی دووبـارە بوونــەوە لــــەش پیسیەكەو زیناكە ، بەلام ئەگەر قەرینە هەبێ ئەمرەكـــە كەبەسـراوە بەمەرجێكەوە یا صیفەتێكەوە ئەبرێ بەسەر یەك جاردا ، وەك: فەرمان بەحەج كردن كەبەستراوە بـە توانای ماددی و جەستەییدا، بەلام ئەگەر ئەمر نەبەسترابێ بـە هیـچ شتێكەوە ئەوە ئەبرێ بەسەر یەك جاردا، وەئەگەر قەرینە هـەبێ ئەبرێ بەســـەر دووبارە بوونەوەدا.

(٤)وتراویشـــە هەڵوێستە ئـەكرێ لـەوەی بوتـرێ: بـۆ یــــەك جـارە یـــا بـۆ چـەند جارێكە، واتـە ئـەمر بـۆ شـتێكە كەموشـتەرەكە لـەنێوان هـەردوكیاندا، یـاخود بـــۆ یەكێكیانـە، بەلام ئێمـە نـازانین ئـەو یەكـە كامەیانـە ئەمـە دوو قەولـە: ا-موشـتەرەكە لـەنێوان هەردوكیـــاندا، ب-بـۆ یەكـێكیانــــە نـــازانین كامیانـــە، نـــابرێ بەســـەر یەكێكیاندا تاقەرینەیەك نەبێ.

ومنشَا الخلافِ إستعمالُهُ فيهما كامرِ الحجِّ والعمرَةِ وامر الصّلاةِ والزّكاةِ والصوم فهلْ هوَ حقيقَـةٌ فيـهما لانّ الأصـلَ في الإسـتعمالِ الحقيقَـة او في احَدهمـا حـذراً مـنَ الإشتراكِ ولانعرفهُ او هوَ للتكرارِ لانَـهُ هوَ الأغلَبُ او المـرَّة لانَـهُ المتيقَـنُ او في القَـدَرِ المُشترَكِ بينهما حذراً منَ الإشتراكِ والمجازِ وهوَ الأوّلُ الرّاجحُ[1] ووجهُ القول بالتكرارِ في المعلّقِ انَّ التعليقَ بما ذكرَ مشعرٌ بعليَّتِهِ والحكمُ يتكرَّرُ بتكـرُّرِ علّتهِ[2] ووجهُ ضعفه انّ التكرارَ حينئذٍ عن سلّمَ مطلقاً اي فيما إذا ثبتَ عليهِ المعلّقُ بهِ من خـارجٍ او لم تثبُتْ ليسَ منَ الأمرِ[3] ثمَّ التكرارُ عندَ الأستاذِ و موافقيهِ حيثُ لابينَ لأمَدِهِ يستوعبُ مايمكنُ منْ زمانِ العمرِ إنتفاءِ مرجعِ بعضهِ على بعضٍ فهم يقولونَ بالتكرارِ في المعلّقِ بتكرارِ المعلّقِ بهِ من بابِ اولى وبالتكرارِ فيهِ إنْ لم يتكرَّرِ المعلّقَ بهِ حيثُ لاقرينـةَ علـى المرَّة فلهذا قالَ المصنِّف مطلقاً[4]

---

(١)سەرچاوەی دروست بوونی ئەم جیاوازیە لەنێوان زانایاندا، بوکارهێنـانی ئـەمرە بۆ هەردوکیان، وەك ئەمر بەحەج و عەمـ ، یەك جار ، وەئەمر بە نویـژ و زەكـات و رۆژو بـۆ دووبـارە بوونەوەیـە، جـا ئایـا ئـەمر حەقیقەتـە لـە هـەردوکیاندا، چونکـە ئـەصل لەبەکارهێناندا ئەوەیە لە حەقیقەتدا بێ یاخود ئایا حەقیقەتە لەیەکێکیاندا و نازانین کامەیانە، بۆ ئەوەی لەترسی ئیشتراك راکەین، یاخود بۆ دووبارە بـوونەوەیە چونکە زۆربەی ئەمر بۆ دووبارە بوونەوەیە، یاخود بۆ یەك جارە، چونکە بێـگومان بـۆ ئـەو یەك جارە هاتووە، یاخود بـۆ ئەوەیە کەموشـتەرەکە لـەنێوان هـەردوکیاندا، ئەمـەش راکردنە لەترسی ئیشتراك و مەجاز، ئەوەش قەولی یەکەمە کە راجح و زیـاتر قبوڵـە لەوانیتر. (٢)بەڵگەی ئەو قەولەی کە دەڵێ: ئەمر بۆ دوبارە بوونەوەیە ئەگەر بەسرابێ بەمەرجـەوە یـا صیغەتـەوە ئەوەیـە کـە: بەسـتنی ئـەمر بەصیفـەت و مەرجەوەئـەوە ئەگەیـەنێ کە عیلـەت و هـۆی پـەیدابوونی ئـەمرن، دەخۆ بێگومـان حوکمیـش دووبـارە دەبێتەوە بە دووبارە بوونەوەی عیلەتەکەی.

(٣)ئەی بەڵگەچیە لەسەر لاوازی ئەم قیلە؟ بەڵگەکانی ئەمەیە کە دووبـارە بوونـەوەی ئەمرەکە لەکاتی دووبارە بوونەوەی مەرج و صیغەتەکەدا، ئەگەر بسەلمێنرێ بەمطلقی واتـە لـەوەدا عیلـەتی ئەمرەکـە سـابت بـێ یـا سـابت نـەبێ، ئـەوە دووبـارە بوونـەوە لەصیغەکە وەرناگیرێ، بەڵکو لەشتێك وەردەگیرێ لە صیغەکە بەدەرە. (٤)پاشان ئەو دووبـارە بوونەوەیـە بـەرای أسـفراینیو هاوڕاکانیـەوە لەشـوێنێکدا مـاوەی دیـاری نەکـرابێ ئـەوە بگونجـێ لـەکاتی تەمـەنی ژیـانیدا هـەمووی ئەگرێتـەوە، -واتـە لەهەمووتەمەنیدا هەر دەبێ دووبارە بێتەوە- چونکە شـتێ نیە بلێ ئەم ساڵە بیکە و

{ولا للفورِ خلافاً لقومٍ} في قولهم إنّ الأمرَ للفورِ اي المبادَرَةِ عقِبَ ورودِهِ بالـفعلِ ومنهم القائلونَ بأنَّهُ للتكرارِ[١] {وقيلَ: للفورِ او العزمِ} في الحالِ على الفعلِ بعدُ[٢] {وقيلَ:} هـوَ {مشترَكٌ} بينَ الفورِ والتراخي اي التأخيرِ[٣]

{والمبادرُ} بالفعلِ {ممتثِلٌ خلافاً لمنْ منعَ} إمتثالَهُ بناءً على قولِهِ الأمرُ للتراخي {ومن وقفَ}عنِ الإمتـثالِ وعدَمِهِ بناءً علىقولِهِ لانعلَمُ اوضِعَ الأمرُ للفورِ ام للتراخي[٤] ومنشأ الخلافِ إستعمالُهُ فيهما كأمرِ الإيمانِ و أمرِ الحجِّ وإنْ كانَ التَّراخي فيهِ غير واجبٍ فهل هوَ حقيقَةٌ فيهما لأنّ الأصلَ في الإستعمالِ الحقيقَةُ او في احدِهما حذراً منَ الإشتراكِ ولانعرفهُ، او هـو للفورِ لأنَّهُ الأحوَطُ او التراخي لأنَّهُ يستدعى الفورَ بخلافِ العكسِ لإمتناعِ التقديـمِ او في القدرِ المشترَكِ بينهـما حذراً منَ الإشـتراكِ والمجازُ وهـوَ الأوَّل الرَّاجحُ اي طلَبِ الماهيّةِ من غيرِ تعرُّضٍ لوقتٍ من فورٍ او تراخٍ[٥]

---

لەوىترى مەيكە، ئەوان دەڵێن: ئەمرێ ئەگەر مطلقبێ دووبارە دەبێتەوە، خۆ ئەگەر مەرج و صیفەتەکە دو. بارە ببنەوە ئەوە باشترە دووبارە ئەبێتەوە وەهەم وتوويانە ئەمرەکە دووبارە بوونەوەی تيايە، هەرچەند معلَق بەو صیفەت و مەرجەکەشی دووبارە نەبووبێتەوە، لەو شوێنەی قەرینە نەبێ لەسەر ئەوەی کە بۆ یەك جارە ، جالەبەر ئەمەيە دانەر وتی: (مطلقا) واتە مەرج و صیفەتەکە ببن یا نەبن دووبارە بوونەوەی تيادايە.

(١)وەئەمر بۆ ئەوەش نيە کەيەکسەر جێبەجێ بکرێ، بەپێچەوانەی کۆمەڵێکەوە کە دەڵێن: ئەمر بۆ ئەوەيە هەردوای هاتنەکەی پەلەی جێبەجێ کردنی بکرێ، لەم کۆمەڵەن ئەوانەی دەڵێن: کە ئەمر بۆ دووبارە بوونەوەيە. (٢)وتراویشە ئەمر بۆ ئەوەیە ئازا بکرێ و جێبەجێ بێ، یاخود ئێستە عەزم ونیەتی کردنی هەبێ دوای نیەت هێنانەکەی. (٣)وتراویشە ئەمر مشتەرەکە لەنێوان ئازاجێبەجێکردنداو دواخستنیدا. (٤)ئەوەی کە زوو دەچێ دەیکا ئەوە گوێرایەڵی و فەرمانی جێبەجێ کردووە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە دەڵێ: ئەوەی زوو دەچێ جێبەجێ بکا ئەوە فەرمانەکەی جێبەجێ نەکردووە، چونکە وتوويەتی: ئەمر بۆ ئەوەیە لەدوای بیستنی وپێگەیشتنی دوای بخا.(٥)سەرچاوەی جیاوازی ئەم زانایانە بەکارهێنانی ئەمری بۆ هەردووکیان چ فەوریەت بێ یا تەراخی بێ، بەپەلە ئەنجام دانی وەك ئەمر بەئیمان، بۆتەراخی بێ وەك ئەمر بەحەج ، هەرچەند دواخستنی ئەمری حەج واجب نیە، جا ئایا ئەمر حەقیقەتە لەهەردوکیاندا، چونکە ئەصل لەبەکارهێناندا حەقیقەتە، یاخود حەقیقەتە لەیەکێکیاندا و نازانین کامیانە؟ ئەمەش راکردنە لەترسی ئیشتراك، یاخود

{مسئلَةٌ:} قال ابوبكر {الرّازي} منَ الحنفيّة {و}الشيخ ابو إسحق {الشيرازي} منَ الشافعيّة {و عبد الجبار} منَ المعتزلة: {الأمرُ} بشيئٍ مؤقّتٍ {يستلزمُ القضاءَ} لهُ إذا لم يفعَلْ في وقتِهِ لإشعار الأمرِ بطلبِ إستدراكِهِ لأنّ القصدَ منهُ الفعل[1] {وقالَ الأكثرُ القضاءُ بأمرٍ جديدٍ} كالأمر في حديثِ الصحيحينِ:(منْ نسي الصّلاةَ فليصلّها إذا ذكرَها) وفي حديثِ مسلمٍ (إذا رقدَ أحدكم عنِ الصّلاةِ أو غفلَ عنها فليصلّها إذا ذكرها) والقصدُ منَ الأمرِ الأوّلِ الفعلُ في الوقتِ لامطلقاً والشيرازي موافقٌ للأكثرِ كما في لمعهِ و شرحِهِ فذكرُهُ منَ الأقلّ سهوٌ[2]

---

ئەمر بۆ فەوریەت و ئازا ئەنجامدانە، چونکە ئەم گشتگیرترە ، یاخود بۆ دواخستنە چونکە جیٚی فەوریەتیش دەگرێتەوە، -نوێژ بەقەزا بکەیتەوە جیٚی حازر دەگریٚ بەلاٚم پیٚش کات بیکەی جیٚی هیچ ناگریٚ- بەلاٚم پێچەوانەکەی جیاوازە چونکە پیٚش خستن قەدەغەیە ، یاخود ئەم حەقیقەتە لەوشتەی موشتەرەکە لەنێوان هەردوکیاندا، ئەمەش راکردنە لەترسی ئیشتراك و مەجاز. ئەمەش قەولی یەکەمەو راجح لەهەموویان زیاترە، واتە تەنها بۆداواکردنیماهیەتی کارەکەیەبیٚ ئەوی ئاماژە بۆکاتی ئەنجادانەکەی بکریٚ،چ جیٚبەجیٚ کردنی بیٚ بەئازا یاخود دواخستنی بیٚ.

(١)رازیو شیرازی و عبد الجبار وتوویانە: ئەگەر ئەمر کرا بە جیٚبەجیٚ کردنی شتێك لە کاتێکی دیاری کراوداو ئەوە ئەگەر لەکاتەکەی خۆیدا نەکرا هەر ئەو ئەمرە داوا بەقەزا گەڕاندنەوەی ئەکا، چونکە خودی ئەمرەکە رای ئەگەیەنیٚ لەکاتی خۆیدا نەکراوە داوای فریا کەوتنی دەکا، چونکە مەبەست لە ئەمرەکە ئیشەکەیە ، کاتەکەش مەبەستەو ئیشەکەش ، کاتەکە تواوبووە ، ئیشەکە ماوە.

(٢)زۆربەی زانایان دەڵێن: گەڕانەوەی فەرمانێك کەکاتی نەماوە پێویست بەفەرمانێکی تازە دەکا، وەك ئەم ئەمرە لە فەرمودەیەکدا کە بوخاریو موسلیم ئەی گەڕێننەوە. دەفەرمویٚ: کەسێك لەبیری چوو نوێژ بکا هەرکاتێك بیری کەوتەوە بابیکاتەوە، وەلە فەرمودەیەکدا موسلیم ریوایەتی دەکا دەفەرمویٚ: کاتێك یەکێکتان نوست و نوێژەکەی فەوتا یاخود نوێژەکەی بیرچویەوە کاتیٚ بیری کەوتەوە با نوێژەکەی بکاتەوە، مەبەست بەفەرمانی یەکەم کردنی ئیشەکەیە لەکاتی خۆیدا، نەلە هەرکاتێکدا بیٚ هی خۆی بیٚ یا دوای خۆی بیٚ،-نوێژ ئەگەر بەعوزرەوە بفەوتیٚ ئەبیٚ بگەڕێتەوە، بەبەڵگەی ئەم فەرموودانە خۆ ئەگەر عوزری نەبیٚ باشتر ئەبیٚ بیکاتەوە- شیرازی یەکێکە لەو زانایانە کە دەڵێن: قەزا بە ئەمرێکی تازە ئەکرێتەوە لە کتێبێکی خۆیدا بەناوی(لمع) و شەرحەکەیەوە باس کراوە، کەوابوو ناوهێنانی شیرازی لەناو

{والأصحُّ انّ الإتيانَ بالمأمورِ بهِ} اي بالشيئِ على الوجهِ الذي امرَ بهِ {يستلزِمُ الإجزاءَ} للماتيِّ بهِ بناءً على انّ الإجزاءَ الكفايضةُ في سقوطِ الطّلَبِ وهوَ الرّاجحُ كما تقدَّمَ[1] وقيلَ لايستلزِمُهُ بناءً على انَّهُ إسقاط القضاءِ لجوازِ انْ لايسقط المأتي بهِ القضاءَ بأنْ يحتاجَ الى الفعلِ ثانياً كما في صَلاةٍ منْ ظنَّ الطهارةَ ثمَّ تبيّنَ لهُ حدثُهُ[2]

{و}الأصحُّ {انَّ الأمرَ} للمخاطبِ {بالأمرِ} لغيرِهِ {بالشيئِ} نحو:﴿ وامرْ اهلكَ بالصَّلاةِ ﴾ {ليسَ امراً} لذلكَ الغيرِ {بهِ} اي بالشيئِ وقيلَ: هوَ امرٌ بهِ وإلاّ فلا فائدَةَ فيهِ لغيرِ المُخاطَبِ وقدْ تقومُ قرينةٌ على انَّ غيرَ المُخاطَبِ مامورٌ بذلكَ الشيئِ كما في حديثِ الصحيحينِ انّ إبنَ عمر طلّقَ إمراتَه وهي حائضٌ فذكرَ ذلكَ عمر للنبيِّ ﷺ فقالَ: مُرهُ فليراجعها[3]

---

كەمەكاندا سەهوە.(١)قەولی ئەصەح ئەوەیە کە: ئەنجامدانی ئەو ئیشەی بەسەردا دراوە، وەك پێسپێرراو كردویەتی ئەوە مستلزمی (اجزاء)ە بۆ ئەوەی كردویەتی لەسەر ئەو قەولە كە (اجزاء) بەمانا كیفایەیە لەوەدا داوا لێكردنی لە كۆڵ كەوتووە – نەك (اجزاء) بەمانا قەزای لە كۆڵ كەوتووە– ئەوەش قەولی راجیحە، وەك لەپێشەوە رابوورد. (٢)وتراویشە مستەلزمی (اجزاء) نیە، واتە: (اجزاء)ی بەمانا قەزا كردنەوەی لە كۆڵ بخا، چونكە ئەگونجێ ئەوەی كردویەتی و ئەنجامیداوە گێڕانەوەی لەكۆڵ نەخستبێ، واتە پێویستی بەكردنەوەی هەبێ جاری دووەم، وەك كردنەوەی نوێژی كەسێ وای زانیبێ دەست نوێژی هەیەو نوێژی كردووە، پاشان بۆی روون بوەتەوە كە بێ دەست نوێژ بووە–دە ئەمە (اجزایە) لە سقوطی طەلەبدا، (اجزاء) نیە لەسقوطی قضائدا–.

(٣)قەولی ئەصەح ئەوەیە كە ئەمرو فەرمان كردن بەگوێگرەكە كەبڕوا بەفەرمانی شتێ بەغەیری خۆی بگەیێنێ وەك: فەرمان بدە بەخاوو خێزانەكەت نوێژ بكەن، ئەوە فەرمان و ئەمر نیە بەغەیری گوێگرەكە بەئەنجامدانی ئەو شتە، تەنها ئەمرە بەمخاطبەكە خۆی لەلایەن فەرماندەكەوە، وتراویشە: وەك ئەمرە بەگوێگر ئەمریشە بەغەیری ئەو، ئەگەر وانەبێ چ سودێكی نیە بۆ غەیری گوێگرەكە، –ئەم جیاوازیە كاتێ ئەبێ قەرینە نەبێ– بەلام ئەگەر قەرینە هەبوو كەغەیری مخاطەبەكە فەرمان پێكراوە ئەوشتە ئەنجام بدا، ئەوە ئیتر جیاوازی تیادا نابێ، وەك ئەو فەرمودەیەی بوخاریو موسلیم ریوایەتی دەكەن: عبدالله كوڕی عومەر لەكاتی حەیزدا ژنەكەی طەلاق دا، عمریش ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باسی كرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: فەرمانی پێبدە بابیگەڕێنێتەوە، بابیگەڕێنێتەوە، ئەمر بەغائبە، قەرینەیەكە بۆعبدالله،

{و}الأصحُّ {أنَّ الأمرَ} بالمدِّ {بلفظٍ يتناولُهُ} كما في قولِ السيِّد لعبدِه: اكرِمْ مَن احسَنَ هوَ إليَه ، {داخلٌ فيه} اي في ذلكَ اللفظِ ليتعلَّقَ به ما امرَ به وقيلَ لايدخُلُ فيه لبُعدِ انْ يُريدَ الآمرُ نفسَهُ وسيأتي تصحيحه في مبحَثِ العام بحسَبِ ماظهرَ لهُ في الموضعينِ وقدْ تقومُ قرينةٌ على عدَمِ الدُّخولِ كما في قولهِ لعبدِه تصدَّقْ على منْ دخَلَ داري وقدْ دخَلَها هوَ.[1] {و}الأصحُّ {أنّ النيابةَ تدخُلُ المأمور} به مالياً كانَ كالزكاةِ أو بدنياً كالحجِّ بشرطِه {إلاّ لمانعٍ} كما في الصَّلاةِ وقالَت المُعتزلَةُ لاتدخُلُ البدنيَّ لأنَّ الأمرَ به إنَّما هوَ لقهرِ النَّفسِ وكسرِها بفعلِه والنِّيابَة تنافي ذلكَ إلاّ لضرورَةٍ كما في الحجِّ قلنا لاتُنافيه لما فيها من بذلِ المؤنَةِ أو تحمُّلِ المنَّةِ[2]

---

چونكە ئەمر بە عمر بەوشەی ئەمر بوو.(١)قەولی ئەصەح ئەوەیە كەفەرماندار ئەگەر فەرمانی دا بە لەفظێك وتی: خۆیشی بگرێتەوە، ئەوە خۆیشی ئەچێتە ناو ئەو فەرمانەوە، وەك ئاغایێك بەبەندەكەی بڵێ: رێز بگرە لەوەی چاكەی لەگەڵ كردووی، خۆیشی چاكەی لەگەڵ كردووە، ئەو فەرمانە خۆیشی ئەگرێتەوە، چونكە ئەوەی فەرمانیداوە جێبەجێ بكرێ خۆیشی ئەگرێتەوە، وتراویشە خۆی ناگرێتەوە، چونكە زۆر دوورە فەرمان بۆ خۆی دەربكا، لەمەودوا دێ لەباسی بابەتی: العام، دا كە ئەم قیلە بە صەحیح دائەنرێ، بۆیە لێرە بەقیل حیسابی بۆ ئەكاو لەوێ بە صەحیح باسی ئەكا، بەگوێرەی بۆ دەركەوتنە، بۆ لێرە وای بۆ دەركەوتووەو لەوپێش وای زانیوە، جاری واش هەیە قەرینەیێك بەرپا دەبێ لەسەرئەوە خۆی ناگرێتەوە وەك ئاغایێك بەبەندەكەی دەڵێ: هەركەس هاتە ماڵم پارەی بەرێ ، خۆی هاتە ژورەوە، لێرەدا قەرینە هەیە كە خۆی ناگرێتەوە، چونكە پارەی خۆی چۆن بەخۆی بدرێتەوە!!

(٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە كە ئەمرو فەرمانی بەجێبەجێ كردنی كارێك بدرێ، ئەگەر بەجێگریش ئەنجام بدرێ هەر ئەی گرێتەوە، چ پەرستشێكی مالی بێ وەك زەكات ، خۆت جێبەجێی بكەی یاخود جێگیرێكت بیكا، یاپەرستشێكی بەدەنی بێت، وەك حەج كردن بەڵام بەمەرجی خۆی، كە خۆی نەتوانێ بڕوا، هەمووكات جێگر وەك خۆی وایە مەگەر رێگرێك هەبێ وەك لەنوێژدا هەیە، كە نوێژ بۆ ئەوەیە نەفس زەلیل بكرێ. موعتەزیلە وتوویانە: پەرستشی بەدەنی جێگری قبوڵ ناكا، چونكە فەرمان بە پەرستشی بەدەنی بۆ ئەوەیە نەفس كۆت بكرێ و بشكێ بەكردنی ئەو پەرستشە، خۆ جێگریش ئەو مەبەستە نایێنێتە دی كەوابوو دژی یەكن ، مەگەر بۆ كاتی ضەرورەت بێ وەك حەج كردن ، ئێمەیش ئەڵێین: دژی یەك نین، چونكە لە جێگریدا خەرج بۆ كێشانی تێدایە یاخود منەت هەڵگرتنی تێدایە ئەگەر بەخۆڕایی بۆی بكا.

{مسئلَةٌ: قالَ الشيخ} ابو الحسن الأشعري {والقاضي} ابوبكر الباقلاني {الأمرُ النفسيُ بشيئٍ معيَّنٍ} إيجاباً او ندباً {نهيٌ عن ضدِّه الوجودي} تحريماً او كراهةً واحداً كانَ السكونُ اي التحرُّك او اكثر كضدِّ القيام او القعود وغيرِه[1] {وعنِ القاضي} آخراً انَّهُ {يتضمَّنهُ وعليهِ} اي على التضمُّنِ {عبد الجبار و ابو الحسين و الإمام} الرّازي {و الآمدي} فالأمرُ بالسّكونِ مثلاً اي طلَبه متضمِّنٌ للنهي عنِ التّحرُّكِ اي طلَبِ الكفِّ عنهُ اوهوَ نفسُهُ بمعنى انّ الطلَبَ واحدٌ هوَ بالنسبَةِ الى السكونِ امرٌ و الى التحرُّك نهيٌ كمايكونُ الشيئُ الواحدُ بالنسبَةِ الى شيئٍ قرباً والى آخرَ بعداً[2] ودليلَ القولينِ انَّهُ لمَّا لم يتحقَّقْ المأمور بهِ بدونِ الكفِّ عنْ ضدِّهِ كانَ طلَبُهُ طلباً للكفِّ او متضمناً لطلَبِه[3] ولكونِ النّفسي هوَ الطلَبُ المستفادُ منَ اللفظيِّ ساغَ للمصنِّف نقلُ التضمُّنِ فيهِ عنِ الأولينِ، وإنْ كانَ المعتزلَةُ منَ المنكرينَ للكلامِ النفسيِّ[4]

---

(١)مەسئەلە: ئەشعەریو باقلانی وتویانە: ئەمری نەفس بۆ شتێکی دیاریکراو چ بۆ واجب کردن بێ یا خود بۆ مەندب بێ، خودی ئەو ئەمرە نەهیە لەدژی وجودیەکەی — کە بریتیە لە مەنع کردنەکەی نەك نەکردنەکەی– چ حەرام کردنی بێ یاخود کەراهەتی بێ، ئەو دژە چ یەکێك بێ، وەك دژی سکون واتە بزوتن، وەچ زیاتر بێ لەیەکێك وەك دژی وەستانەکە دانیشتنەو راکشانەو شتیتر. (٢)ریوایەتی رایەکیتر لەقازیەوە کراوە کە دەڵێ: ئەمری نەفسی نەهی دژەکەی دەگرێتەوە خۆی و لازمیەتی ، نەك عەینی نەهیەکە، عبد الجبارو رازی و حسین و ئامێدیش هەروا دەڵێن: وەلەسەر ئەم رایەی دوایی قازین ، کەوابوو ئەمر بە سکون واتە داواکردنی سکونێ کەنەهی لەبزوتن دەگرێتە خۆی و لازمیەتی، واتە داوای مەنع لێکردنی یاخود ئەمر بەسکون هەر خودی نەهیەکەیە، بەو واتایە کەداخوازی ئەمرەکە هەریەك داخوازیە ، بەلام بەگوێرەی سکون ئەوە ، وەبەنیسبەت شتێکیترەوە دوورە.

(٣)بەڵگەی هەردوو قەولەکە ئەوەیە کە: کاتێ فەرمانی دا بەکردنەکەی بێمەنع کردنی دژەکەی نەبێ ، ئەوە داوای جێبەجێکردنەکەی داوایە لەوازهێنان لە دژەکەی یاخود ئەگرێتە خۆی داوای وازهێنان لەدژەکەی.(٤)چۆن ئەمری نەفسی لە عبدالجبار و وێنەی ئەوەوە ریوایەت دەکەی خۆ ئەوان موعتەزیلەن بڕوایان بەکەلامی نەفسی نیە؟ لەبەر ئەوەی کە ئەمری نەفسی بریتیە لەداوایەك کەوەرئەگیرێ لەکەلامی لەفظی، دروستە بۆ دانەر نەقڵی ئەوە بکا کەلە ئەمرە نەفسیەکەدا نەهی بگرێتە خۆی لەو دوو زاناموعتەزیلەیە ریوایەت بکا،هەرچەندە هەردووکیان لەموعتەزیلانەن بڕوایان بە کەلامینەفسی نیە،خۆ بڕوایان بەکەلامی لەفظی هەیە،کەلامی نەفسیش مەدلولیئەوە.

{وقالَ إمام الحرمين والغزالي} هوَ {لاعينُهُ ولايتضمَّنُهُ} والملازمَةُ في الـدليلِ ممنوعَةٌ لجوازِ انْ لايحضرَ الضدَّ حالَ الأمرِ فلا يكونُ مطلوبُ الكفُّ به[1] {وقيلَ امرُ الوجوبِ يتضمَّنُ فقط} اي دونَ امرِ النَّدبِ فلايتضمَّنُ النهي عنِ الضِّدِ فيهِ لايخرُجُ بهِ عنِ الضدِّ فيهِ لايخرُجُ بهِ عن أصلِهِ منَ الجوازِ بخلافِ الضدِّ في أمرِ الوجوبِ لإقتضائهِ الذمَّ على التركِ[2] واقتصرَ على التضمُّنِ كالآمدي وإنْ شملَ قولَ إبنِ الحاجبْ منـهم منْ خصَّ الوجوبَ دونَ الندبِ العينِ ايضاً أخذاً بالمحقِّقِ واحترز بقولِهِ مـعيَّنٍ عنِ المبهَمِ منَ اشياءَ فليسَ الأمرُ بهِ بالنظَرِ الى ماصـدقهُ نهياً عن ضدِّه منها ولا متضمِّناً لهُ قـطعاً وبالوجوديِّ عـنِ العدمـيِّ أي تـركِ المـأمورِ بـه فـالأمرُ نـهيٌ عنـهُ او يتضمَّنـهُ قطعاً والتضمُّنُ هنا يعبَّرُ عنهُ بالإستلزام لإستلزام الكلِّ للجزءِ[3]

(١)ئيمام الحرمين و غەزالی وتویانـە: نەهیەکـە عـەینی ئەمرەکە نیـە و ئەمرەکـەش متضمنی نەهیەکە نیە وناى گرێتە خۆی، ئەوەش کە دەڵێن: ئەمر بەو شتەلازمیەتی نـەهی لەدژەکـەی بکـرێ، ئـەم ملازەمەیـە لەبەڵگـە هێنانـەوەدا لازم ناکـا و قەدەغەیـە، چونکە دەگونجێ‌و دروستە ئامر فەرمان بداو لەکاتی فەرمان دانەکەیدا دژەکەی هـەر لەخـەیاڵیدا نـەبێ ، کـەوابوو بەصیغـەی ئەمرەکـە وازهێنـان لەدژەکـەی داوانـەکراوە.

(٢)وتراویشە ئەمرێك بۆ وجوب بێ تەنها نەهی دەگرێتە خۆی، نەك بۆ نـەدب بـێ، ئـەم نـەهی لەدژەکـەی ناگرێتـە خـۆی، چونکـە دژەکـە لـە ئـەمرە نەدبەکـەدا دەرنـاچێ لەئەصلەکەی خۆی کە جەوازە بەهۆی ئەمر بەنەدبەکەوە ، بەپێچەوانەی دژی ئـەمرێك بـۆ وجـوب بـێ چونکـە داوای زەمدەکـا لـەدونیاو تۆڵـە دەکـا لـە قیامـەتدا لەسـەر نەکردنەکەی.

(٣)قیلەکە وتـی: تەنها ئـەمرێك بـۆ وجـوب بـێ نـەهی ئەگرێتـە خـۆی بۆیـە وای وت: ئامێدیش هـەروای وتـووە، هەرچـەند قسـەکەی ئیبن الحـاجب دەڵـێ: هـەندێکیان هـەن ئەڵێن: ئەمرێك نەهی بگرێتە خۆی ئەوە تایەبەتـە بەئـەمری واجبەوە نەك نـەدب ، ئـەم قسەیە عەینی نەهیش دەگرێتـەوە دووبارە چونکە ئـەوەیان کە موحەقـەق و بێگومـان هەیە وەرگرتووە، نەك عەینەکەی، دانەر وتی: ئـەمری نەفسـی بەشـتێکی مـەعلوم بۆیە وتی مەعلوم تا نا مەعلومێك لەناو چەند شتێکدا بچێتەدەر ، چونکە ئـەمر بەشـتێکی نامـەعلوم لـەناو چـەند شـتێکدا بـەگوێرەی ماصەدەقەکـەی -کـەتاکێکی دیـاری کراویەتی- نەهی نیە لەعەینی دژەکەی لەو شتانە ، وەبێگومانیش یەکێکی تایبـەتیان ناگرێتە خۆی، وەدانەر وتـی: لـەدژە وجودیەکـەی ، بۆیـە وجـودی وت خـۆی لـەدژە عەدەمی وەرگرتووە، کە بریتیە لە نەکردنی ئەو شتەی فەرمان کراوە بکرێ، جا ئـەمر

{امّا} الأمرُ {اللفظيُ فليسَ عينَ النهي} اللفظيّ {قطعاً ولا يتضمَّنُهُ على الأصحّ} وقيلَ يتضمَّنُهُ على معنىً انّهَ إذا قيلَ اسكن مثلاً فكأنّهُ قيلَ لاتتحرَّك ايضاً لأنّهُ لايتحقّقَ السكون بدونِ الكفِّ عنِ التحرُّكِ[1] {وامّا النهيُ} النفسيُّ عنِ شيئٍ تحريماً او كراهةً {فقيلَ:} هوَ {امرٌ بالضدِّ} لهُ إيجاباً او ندباً قطعاً بناءً على انّ المطلوبَ في النهي فعلُ الضدِّ وقيلَ: لاقطعاً بناءً على انَّ المطلوبَ فيه إنتفاءُ الفعلِ حكاهُ إبن الحاجبْ دونَ الأوّلِ وتركَهُ المصنِّف لقولِهِ انّهُ لم يقفْ عليهِ في كلام غيرِهِ[2] {وقيلَ على الخلاف} في الأمرِ انّ النهيَ امرٌ بالضدِّ او يتضمَّنُهُ او لا ولا، او نهي التحريمِ يتضمّنُهُ دونَ نهي الكراهَةِ وتوجيهُها ظاهرٌ مما سبقَ والضدّانِ كان واحداً كضدِّ التحرُّكِ فواضحٌ او اكثرَ كضدِّ القعودِ اي القيام و غيرَهُ فالكلامُ في واحدٍ منهُ اياً كانَ والنهيِ اللفظيُّ يُقاسُ بالأمرِ اللفظيِ[3]

---

نەهی کردنە لەو نەکردنە، یاخود ئەو نەگرتنە دەگرێتە خۆی، بێگومان تضمن لێرەدا مەبەست پێی دەلالەتی تضمن نیە، بەڵکو بەمانای ئیستلزامە، چونکە لێرەدا ئیستلزامی کل هەیە بۆ جوزء-ئەمر پێك هاتووە لە ئەنجامدانی کارێك قەدەغەی نەکردنیش ، نەهی لەنەکردنی جوزئێکە لە حەقیقەتی ئەمر -

(١)بەلاّم ئەمری لەفظی بێگومان عەینی نەهی لەفظی نیە، لازمیش نیە، قیلێك وتویەتی: لازمیەتی بەو مانایە ئەگەر وتت: اسكن، وەك ئەوەوایە وتبێتِت: لاتتحرّك ، دوبارە چونکە سکون بێ وازهێنان لە بزوتن نایێتەدی.

(٢)بەلاّم نەهی نەفسی لەشتێك چ لەڕوی حەرام کردنیەوە بێ یاخود کەراهەت بێ، ئەوە کۆمەڵێك وتویانە: ئەو نەهیە ئەمرو فەرمان دانە بەکردنی دژی ئەو نەهیە، ئەگەر نەهیەکە بۆ حەرام کردن بێ دژەکەی واجب دەبێ، وەئەگەر بۆ کەراهەت بێ دژەکەی بۆ نەدب دەبێ بێگومان، ئەم سەرەنجامە لەوە دروست بووە کە: ئەوەی داخوازی کردنی کراوە لە نەهیدا بریتیە لەکردنی دژی نەهیەکە، وەهەندێ‌تر وتویانە: بێگومان فەرمان کردن نیە، بەدژەکەی ئەمەش لەوەوە دروست بووە کە: ئەوەی داواکردنەکەی کراوە بریتیە لەوەی ئەنجام نەدرێ، ئەم قیلی دووەمە ئیبن الحاجب گێڕاویەتەوە، بەکەمی باسی نەکردووەوبەلاّم دانەر قیلی‌دووەمی پشت گوێ‌خستووە،چونکە لە(منع الموانع) دا دەڵێ:جگە لەئیبن الحاجب نەبێ لەکەسی ترەوەم نەدیوە لەبەرئەوە نەقڵم نەکردووە

(٣)وتراویشە: بەسەر ئەو جیاوازیەی کە لەئەمردا هەبوو، واتە: نەهی کردن لەشتێ ئەمرە بەدژەکەی بەلای هەندێکەوە ، یاخود لازمیەتی بەلای هەندێکی‌ترەوەیاخود نەئەمرە بەدژەکەی و نەلازمیشیەتی یاخود نەهی ئەگەر بۆ حەرام کردن بوو ئەوە ئەمر

{مسئلةٌ:الأمرانِ} حالَ كونهما{غيرَ متعاقبينِ} بان يتراخى ورودَ احدِهما عنِ الآخَرِ بمتماثلينِ او متخالفينِ {أو} متعاقبينِ {بغيرِ متماثلينِ} بعطفٍ او دونِهِ نحو: إضربْ زيداً واعطِهِ درهماً {غيرانِ} فيعمَلُ بهما جزماً[1] {والمتعاقبانِ بمتماثلينِ ولامانعَ منَ التَّكرارِ} في متعلَّقِهِما من عادةٍ او غيرِها {والثاني غير معطوفٍ} نحو: صلِّ ركعتينِ {قيلَ معمولٌ بهما} نظراً للأصلِ اي التأسيسِ {وقيلَ} الثاني {تأكيدٌ}[2] {وقيلَ بالوقفِ} عنِ التأسيس و التأكيدِ لإحتمالِهما {وفي المعطوفِ التأسيس ارجحُ} لظهورِ العطفِ فيه {وقيلَ التأكيدُ} ارجحُ لتماثُلِ المتعلَّقينِ[3]

---

بەدژەكەی لازمیەتی، بەڵام بۆ كەراهەت لازمی نیە، بەڵگەی هەمویان ئاشكرایە لەوەی پێشەوە رابوورد جا دژەكە ئەگەر یەكێك بوو وەك دژی بزوتن كە سكونەئەوە راجیاوازەكانی پێشوو تیایدا رەوان دەبێ، بەڵام ئەگەر زۆرتر بوون وەك دژی دانیشتن ، واتە وەستان و راكشان و شتی تر، ئەوە گفتوگۆمان تەنها لەیەكێكیانە هەركامیان بێ، بەكورتی نەهی لەفظی قیاس دەكرێتە سەر ئەمری لەفظی، چۆن ئەمری لەفظی عەینی نەهی نیە بەقەطعەن وەلازمیش نیە لەسەر قەولی ئەصەح ، نەهی لەفظیش عەینی ئەمر نیە بێگومان، وەلازمیش نیە لەسەر قەولی ئەصەح.

(١)ئەمەش مەسەلەیەكی سەربەخۆیە: دوو ئەمر كران و لەكاتێكدا بەشوێن یەكدا نەهاتن ، واتە هاتنی دووەمیان زۆر لەدوای هاتنی یەكەمیانەوە بوو، جا هەردووكیان هەرچون یەك بوون وەك:(إضربْ، إضربْ)یاخود لەیەك جیابوون وەك:(إضربْ، اكرمْ) یاخود بەشوێن یەكدا هاتبوون بەڵام وەك یەك نەبوون ، جا حەرفی عەطف هەبێ یاخود نەبێ، وەك:(إضربْ زیداً، واعطِه درهماً)ئەوانە دووئەمری لەیەك جیان ، وەبێگومان كار بەهەردووكیان دەكرێ.

(٢)بەڵام ئەگەر بەشوێن یەكدا هاتن و هاوێنە بوون، وەرێگرێكی عادەتی یا غەیرە عادەتی نەبوو نەیەڵێ كارەكەی دووبارە بێتەوە، دووهەمەكەشیان عەطف نەكرا بوویەوە، وەك: دوو ركات نوێژ بكە، دوو ركات نوێژ بكە، ئەوە كۆمەڵێك دەڵێن: هەردوكیان كاریان پێ دەكرێ، چونكە تەماشای ئەوەدەكرێ كە ئەصل لە ئەمردا ئەوەیە ئەمر بۆسەرەتایەو كۆمەڵێكیش دەڵێن: دووەمیان دووپاتیەكەمیان دەكاتەوە چونكە ئەوەی دیاربێ ئاوایە. (٣)هەندێ وتویانە لەبەر ئەوە هەڵنەگرێ بۆ سەرەتاو بۆدوپات كردنەوەش بێ تیایدا وەستاون هیچ حوكمێكیان نەداوە بەڵام ئەگەر عەطف هەبێ، دووەمیان ارجح وایە بۆ تأسیس بێ،چونكە عەطف بۆ ئەوەیە لەیەكەم جیابێ، كۆمەڵێكیش دەڵێن: دوپات كردنەوە چاكترە چونكە فیعلەكانیان چون یەكن.

{فإنْ رجحَ التأكيدُ} على التأسيسِ {بعادي} و ذلكَ في غيرِ العطفِ نحو: إسقني ماءً، إسقني ماءً ، و صلِّ ركعتينِ، صلِّ ركعتينِ، فإنّ العادَةَ باندفاعِ الحاجَةِ بمرَّةٍ في الأوَّلِ وبالتعريفِ في الثاني ترجع التأكيدُ {قدمَ} التأكيدِ لرجحانهِ{وإلاّ}وإنْ لم يرجع التأكيدُ بالعادي وذلكَ في العطفِ لمعارَضَتِهِ للعادي بناءً على ارجحيَّةِ التأسيسِ حيثُ لاعادي {فالوقفُ}عنِ التأسيسِ والتأكيدِ لإحتمالها[1] وإنْ منعَ منَ التكرارِ العقل نحو: اقتُلْ زيداً او الشرع نحو: اعتق عبدَكَ اعتق فالثاني تأكيدٌ قطعاً وإن كان بعطفٍ[2]

{النهي} النفسي {إقتضاءُ كفّ عنْ فعلٍ لابقول كفَّ} و نحوه كـذَرْ و دَعْ فإنَّ ماهو كذلكَ امرٌ كما تقدَّمَ وتناوَلَ الإقتضاءُ الجازِمَ وغيرَهُ ويُحدُّ ايضاً بالقولِ المقتضي لكفّ الخ كم ايحدُّ اللفظيُّ بالقولِ الدّالّ على ماذكِرَ ولايُعتبَرُ في مسمَّى النهي مطلقاً علوٌ ولا إستعلاء على الأصحّ كالأمر[3]

---

(١)جائەگەر بەهۆی شتێکی عادەتیەوە دوپات کردنەوە چاکتر بو لە تأسیس ئەوە لە جێیەکدا ئەبێ، عەطفی تیا نەبێ، وەك: ئاوم دەرخوارد بە، ئاوم دەرخوارد بە، دوو رکات نوێژ بکە، دوو رکات نوێژ بکە، چونکە عادەت وایە بەیەك جار ئاو خواردنەوە پێویستی بەئاو نامێنێ، بۆیە بۆ دوپات بوونەوەیە، ئەلیف لامەکەی لەسەر الرکعتین ، چونکە بۆ عەهدە ئەیبڕێ بەسەرر دوپات بوونەوەدا ئەم دووانە ئەبنە هۆ بۆ ئەوەی ببڕێ بەسەر دوپات بوونەوەدا ، بەڵام ئەگەر بەهۆی شتێکی عادەتیەوە نەئەبڕا بەسەر دوپات بوونەوەدا، ئەوەش لە عەطف دا ئەبێ چونکە عەطف ئەچێ بەگژ هۆکاری عادەتیدا، چونکە ئەصل وایە هەرکات هـۆکاری عادەتـی نەبوون ئەوە لایەنی تأسیس و سەرەتا بوون قورس ئەبێ، جائەگـەر هۆکاری عادەتی نەبوو وەستان لە حوکمداندا باشترە چونکە هەردووکیان هەڵـئەگرێ چ تأسیس بێ چ تأکید بێ.

(٢)بەڵام ئەگەر عەقـڵ نەیهێشـت بۆ دووپـات بوونەوە بێ وەك: زەید بکوژە، زەید بکوژە، چـونکە یەك جـار ئەکوژرێ، یاخود شـەرع نەیئەهێشت وەك: بەندەکـەت ئازاد بکە، بەندەکەت ئازاد بکە، ئەوە بێگومان دووەم بۆ دووپات بوونـەوە دەبێـت، هـەرچەند بەحەرف عەطفیش بێ.

(٣)نەهی نەفسی بریتیە لە داخوازی نەکردنی کارێك -بەصیغەی تایبەت- نەك بەوشەی مەکەو وێنەی ئەو وازبێنە، و کۆتا بکە لەو کارە ، چونکە ئەگەر بەو صیغە بێ ئەوە ئەمرە وەك لەپێشەوە تێپەڕی کرد، کە ئەڵێت: نەهی بریتییە لە قەولێکی نەفسی کە داخوازی کەری نەکردنی کارێکە... وەك: چۆن نەهی لەفظی پێناسە دەکرێ بەقەولێك کە دەلالەت کەربێ لەسەر ئەوەی باسکرا، نەهی نەفسـی بێ یاخود

{وقضيَتُهُ الدوامُ} على الكفِّ {مالمْ يقيَّد بالمرَّةِ} فإن قيِّدَ بها نحو: لاتُسافِرِ اليوم إذالسفَرُ فيه مرَّةً منَ السفَرِ كانتْ قضيَّتُهُ[1] {وقيلَ} قضيَتُهُ الدوامُ {مطلَقاً} والتقييدُ بالمرَّةِ يصرِفُهُ عنْ قضيَّتِه[2] {وتردُ صيغَتُهُ} اي لاتفعلْ {للتحريم} نحو:﴿ ولاتقربوا الزِّنا ﴾ {والكراهة}:﴿ ولاتيمَّموا الخبيثَ منهُ تنفقونَ ﴾[3] {والإرشاد}﴿ لاتــسألوا عنْ اشياءَ إنْ تُبدَ لكمْ تسؤكُم ﴾ {والدُّعاء} ﴿ ربَّنا لاتُزِغْ قلوبَنا ﴾[4] {وبيان العاقبَةِ} نحو:﴿ ولاتحسبَنَّ الذينَ قتلوا في سبيلِ اللهِ امواتاً بلْ احياءٌ ﴾ اي عاقبة الجهادِ الحياةُ لا الموتُ[5] {والتقليل والإحتقار} ﴿ ولا تمدَنَّ عينيكَ الى ما متَّعنا به ازواجاً منهُمْ ﴾ اي فهوَ قليلٌ حقيرٌ بخلافِ ماعندَ اللهِ ، ومن إقتصرَ على الإحتقارِ جعَلَهُ المقصودُ في الآيَةِ وكتابَةُ المصنِّف التعليلِ المأخوذُ منَ البُرهانِ بالعينِ سبقُ قلَمٍ[6]

---

لەفظی بێ لەناوەڕۆکەکەیا بوڵندی و خۆتیاگەورەکردنی تیا مەرج نیە، لەسەر قەولی ئەصەح وەك تێپەڕی کرد. (١)داخوازی نەهی بریتیە لەبەردەوام بوونی مکلف لەسەر نەکردنی ئەوکارە، بەمەرجێ نەبەسرابێ بەیەکجارەوە، ئەگەر نەهیەکە بەسرا بەیەکجارەوە ، ئەوە هەر ئەو جارە داخوازی نەهیەکەیە، وەك: ئەمڕۆ سەفەر نەکەی چونکە لەرۆژێکدا هەر یەکجار سەفەر دەکرێ، -واتە بەگوێرەی ئەنجامدانی کارەکەیە-. (٢)هەندێك وتویانە: داخوازی نەهی ئەوەیە مکلەفەکە بەردەوام بێ لەسەر نەکردنی چ جارێکی پێوە لکابێ یاخو نەلکابێ هەر بۆ بەردەوام بوونە، بەڵام ئەگەر جارێکی پێوە لکابێ ئەوە لەداخوازیەکەی خۆی لای ئەداو لە حەقیقەتی خۆی وەری ئەچەرخێنێ. (٣)صیغەی نەهی بۆ چەندەها مانا هاتووە:أ-بۆ قەدەغەکرنی شتێك وەك نزیك زینا نەکەون. ب-بۆ کەراهەتە ، وەك: نەکەن نیازی ئەوە بێنن لەشتی پیسو خراپ زەکات و خێر بکەن .

(٤)ج-بۆ ڕێ پیشاندانە وەك: لەچەند شتانێ مەپرسن ، ئەگەر بۆتان دەرکەوێ ئازارتان دەدات ، د-بۆ پاڕانەوەیە، وەك: پەروەردگارمان دڵەکانمان لانەدەیت دوای گرتنەبەری ڕێی حەق. (٥)هـ-بۆ رون کردنەوەی سەرەنجامە ، وەك: گومان مەبە ئەوانەی لەرێی خوادا کوژراون مردون. (٦)و-هاتووە بۆ کەمکردنەوی بەهای شتێ و سوك زانینی، وەك: نەکەی هەردوو چاوت بەدرێژی ببڕیتە ئەو ماڵ و سامانەی مۆڵەتمان داوە هەندێکیان رابوێرن پێی، واتە ئەو رابواردنە کەمە وبێنرخە، جیاوازە لەگەڵ ئەو نیعمەتەی بەلای خواوەیە ئەوەی هەر وتویەتی: ئەم نەهیە بۆ سوك کردنە ئەوە هەر کردویەتی، بەمەبەستی ئایەتەکە، دانەر لەباتی ئەوەی بنوسێ تەقلیل نوسیویەتی بەعەین لەکتێبی البرهان وەرگیراوە ، ئەوە تێپەڕبوونی قەڵەمەکەیەتی.

{والياسِ} لاتعتذروا اليومَ[1] {وفي الإرادَةِ والتحريمِ ما} تقدَّمَ {في الأمرِ} من الخلافِ فقيلَ: لاتدلُ الصيغةُ علـى الطَّلَبِ إلاّ إذا أُريدَ الدلالَـةُ بها عليهِ و الجمهورُ علـى انـها حقيقَةٌ في التحريمِ و قـيلَ الكراهَـةِ وقيلَ فيـهما و قيـلَ في احدهمـاو لانعرفُـهُ.[2] {وقـدْ يكونُ} النـهي {عنْ واحدٍ} وهـوَ ظـاهرٌ {و}عنْ {متعَدِّدٍ جمعاً كالحرام المُخيَّرِ} نحـو: لاتفعَلْ هذا او ذاكَ فعليهِ تركُ احدهما فقط فلا مُخالَفَةَ إلاّ بفعلِها فالمحرَّمُ جمعَهُما لافعلُ احدهما فقط[3] {وفرقاً كـالنعلينِ تلبسانِ او تنزعـانِ ولايفـرَّقُ} بينـهما بلبـسِ او نـزع احداهُما فقط فهوَ منهيٌ عنْـهُ إخذاً من حديثِ الصحيحَينِ:(لايمشيَنَّ احدُكم في نـعلٍ واحدٍ لينعلهُما جميعاً او ليَخلعهما جميعاً) فيصدُقُ أنهما منـهيٌّ عنهما لِبساً او نـزعاً من جهَةِ الفرقِ بينهما في ذلكَ لاالجمعُ فيهِ {وجميعاً كالزِّنا و السرقَة} فكـلٌ منـهما منـهيٌ عنهُ فيصدُقُ بالنظَرِ اليهما إنْ النهي عن متعدِّدٍ وإن كـانَ يصدُقُ بـالنظرِ الى كلٍ منـهما انَّهُ عنْ واحدٍ[4]

---

(١)ز–هـاتووه بۆ بێئومێد كردن ، وەك: بێباوەڕان ئەمڕۆ عـوزر مەهێننـەوە، ئیـتر بێئومێدبن لەرەحمـەتی خـودا.(٢)ئایـا نـەهی ئـەبێ ویست وئیرادەی لەگـەڵدا هـەبێ ، یاهـەر بۆویست و حـەرام كردنـی شـتێكە، ئـەوە ئـەو جیاوازیـەی لـە ئـەمردا هـەبوو لێرەشدا هەیە، بەم شێوە: هەندێ دەڵێن: حەقیقەتە لە كەراهەتدا، كۆمەڵێكیتر دەڵێن: حەقیقەتـە لەهـەردوكیاندا ، هەندێكیتر دەڵێـن: حەقیقەتـە لەیەكێكیاندا بەڵام نـازانین كامیانە. (٣)جاری واهەیە نـەهی لەتاكە شتێ دەكرێ ئەوەش شتێكی دیـارو ڕوونـە، جاری واش هەیە نـەهی لەچـەند شـتێكە جا كـەیفی خۆیـەتی ئـەو چـەند شـتە هـەموو پێكەوەبن جا نـەهیان لێ بكرێ، وەك حـەرامێك سەرپشك بكرێـت بـۆ نـەكردنی، وەك: ئەمە یاخود ئەوە نەكەی، وەئەوە لەسەریەتی تەنها یەكێكیان وازلێ بهێنێ، سـەرپێچی نـەكردووە تـا هـەردووكیان بكات، كەوابوو حـەرام كراوەكـە كردنـی هەدووكیانـە نـەك كردنی یەكێكیان و بەس.

(٤)یـاخود لـەیك جیابنـەوە جا نـەهیان لێبكـرێ ، وەك: هـەردوو كـەوش یاهــەردوو لەپێ بكرێن یا هەردوو داكەنرێن، نابێ لەیەك جیابكرێنەوە بەلـەپێكردنی یـەكێكیان و لابردنی ئەوی تریان، ئەو لەیەك جیاركدنەوەیە نەهی لێكراوە، ئەمـەش وەرگیراوە لـەو فەرمودەیە كە بوخاری و موسلیم هـەردووكیان ریوایـەتیان كـردووە، باكـەس لـەئێوە بەلەپێكردنی تاكە كەوشـێك نـەچێ بـەڕێوە یـا ئـەبێ هـەردووكیان لـەپێبكا یـاخود هەردووكیان داكــەنێ، كەوابوو قەدەغــەكراوە لــەڕوی جیاكردنەوەیان ، چ بەپۆشـین بێ یا بەداكەندن نەك بەداكــەندنی هەردوو یا پۆشیــنیان. یاخــود نەهیە لە هەموو

{ومطلَقُ نهي التحريمِ} المستفادُ منَ اللفظ {وكذا التنزيهُ في الأظهَرِ للفسادِ} اي عدمُ الإعتدادِ بالمنهي عنْهُ اذا وقعَ {شرعاً} إذ لايُفهَمُ ذلكَ من غيرِ الشّرع {وقيلَ: لغةً} لفهمُ اهلِ اللُغَةِ ذلك من مجرَّدِ اللفظِ {وقيلَ: معنىً} اي من حيثُ المعنى وهوَ انَّ الشيئَ إنّما يُنهى عنه إذا إشتملَ على ما يقتضي فسادَهُ[١] {فيما عداَ المعامَلات} منْ عبادةٍ و غيرِها مما لهُ ثمرَةٌ كصَّلاةِ النفلِ المطلَقِ في الأوقاتِ المكروهَةِ فلا تصحُّ كما تقدَّمَ على التحريمِ وكذا التنزيهِ في الصَّحيحِ المعبذّرِ عنهُ هنا في جملَةِ الشمولِ بالأظهَرِ وكالوطءِ زناً فلايُثبِتُ النَسَبَ {مطلقاً} اي سواءً رجع النهي فيما ذُكرَ الى نفسه كصَّلاةِ الحائضِ و صومِها أم لازمَهُ كصومِ يومِ النَّحرِ للإعراضِ بهعن ضيافَةِ الله تعالى كما تقدَّمَ و كالصَّلاةِ في الأوقاتِ المكروهَةِ لفسادِ الأوقاتِ اللازمَةِ لها بفعلِها فيها[٢]

---

شێوەیەکیەتی چ بەتاك بێ یاخود پێکەوەبن ، وەك زینا و دزیەتی تاك تاکی ئەم دوانە نەهی لێکراوە، ئەگەر سەیری هەردووکیان بکرێ ئەوە نەهیە لەچەند شتێك ، هەرچەند ئەگەر سەیری تاك تاکیان بکرێت ئەوە نەهیە لەیەك شت.

(١)نەهی رووت بێ ئەوەی وشەی فەساد و بەتاڵی پێوە بێ چ بۆ حەرام کردنی ئەو شتە بێ، کەلە خودی لەفظەکەوە وەربگیرێ، یاخود بۆ تەنزیهو خاوێن راگرتنبێ بەلای قەولی ئەظهەرەوە ، ئەوە هەر ئیعتباری پێناکرێ ئەگەر کرا وەك نەکرابێ وایە، ئەم فەساد و بەتاڵە لەڕوی شەرعەوە دەزانرێ ، چونکە ئیعتبار پێکردن یاخود نەکردن لەرێی غەیری شەرعەوە نازانرێ ، هەندێك وتویانە لەڕوی لوغەوە ئەزانرێ ، چونکە زانایانی لوغە لە لەفظە روتەکەوە ئەوە حاڵی ئەبن، کۆمەڵێکیش وتویانە: لەڕوی عەقڵەوە دەزانرێ ، چونکە بەشتێ ئەگەر قەدەغەکرا کاتێ ئەبێ شتێکی تیادا هەبێ داخوازی فەسادو بەتاڵ بوونی بکا.

(٢)ئەمە لەشتێکدا وایە کە موعامەلات نەبێ، ئیتر عیبادەت و پەرستش بێ یاخود شتێکیتر بێ کەبەرهەمێکی هەبێ، عیبادەتەکە وەك: نوێژی سوننەتی بێ هۆ کە ئەنجام بدرێ لەو کاتانەدا کەکەراهەتی هەیە ئەنجام دانی نوێژ تیایدا، ئەوە صەحیح نیەو بەتاڵە وەك لەپێشەوە رابوورد کە حەرامە نوێژکردن تیایاندا، هەروەها بەتاڵە ئەگەر نەهیەکەشی بۆ تەنزیهو پاك راگرتن بێ، بەلای قەولی صەحیحەوە کەلێرەدا بەقەولی ئەظهەر لێکدراوەتەوە بۆ هەموو کەراهەتەکانە نەك تەنها بۆ نوێژ ، وێنە بۆ ئەوەش بەرهەمی هەبێ، وەك: جیماع کردن لەگەڵ ژندا بەزینا ئەوە نەسەب بۆ منداڵەکە سابت ناکاو سابت نابێ، مطلقاً، واتە کەیفی خۆیەتی نەهیەکە لەبەر خودی ئەو شتەبێ کەموعامەلە نەبێ، وەك نوێژو رۆژووی ئافرەتی حەیزدار، چونکە پاکی

{وفيها} اي في المُعامَلات {إنْ رجعَ} النهيُ الى امرٍ داخلٍ فيها كالنهي عن بيع الملاقيح اي ما في البطونِ منَ الأجِنَّةِ لإنعدامِ المبيع وهوَ ركنٌ منَ البيع.[1] {قال إبنُ عبد السلام: او إحتمَلَ رجوعَهُ الى امرٍ داخلٍ} فيها تغليبياً لهُ على الخارجِ ، {او} رجعَ الى امرٍ {لازمٍ} لها كالنهي عن بيع درهَمٍ بدرهَمَين لإشتمالهِ على الزيادَةِ اللازِمَةِ بالشرطِ {وفاقاً للأكثرِ} منَ العلماءِ في انَّ النهي للفسادِ فيما ذُكرَ امّا في العبادَةِ فلمنافاةِ النهي عنهُ لأنْ يكونَ عبادةً ماموراً بهِ كما تقدَّمَ في مسألَةِ الأمرِ لايتناوَلُ المكروهَ وامّا في المعامَلَةِ فللإستدلالِ الأوّلين من غيرِ نكيرٍ على فسادِها بالنّهي عنها وأمّا في غيرِهما كما تقدَّمَ فظاهرٌ.[2]

فەوتاوە، یاخود نەهیەکە لەبەر لازمی شتەکە بیّ، وەك: رۆژوی جەژنی قوربان ، چونکە بەرۆژوو گرتنەکەی پشت لە میوانداریەکەی خوا دەکا، وەك لەپێشەوە رابوورد، یا وەك نوێژ لەکاتە مەکروهەکاندا ، چونکە کاتەکان فەسادن، کاتیش لازمی نوێژە، چونکە نوێژ هەرئەبیّ لە کاتدا بکریّ.

(١)بەلاّم لە موعامەلاتدا ئەگەر نەهیەکە لەبەر شتێك بوو ئەگەڕایەوە بۆ خودی موعامەلاتەکە ئەویش هەر فەسادەو بەتاڵە، وەك: فرۆشتنی مەلاقیح واتە فرۆشتنی بێچو لەسکی دایکیدا، چونکە یەکێك لەڕوکنەکانی کڕین و فرۆشتن بوونی فرۆشراوەکەیە، ئێستە لێرەدا نیە. (٢)ئیبن عەبدوسەلام وتوویەتی: یاخود ئەوە هەلگریّ بۆیە نەهی لیّکراوە لەبەر شتێکە دەگەڕێتەوە بۆ ناخی خودی موعامەلەکە- هەڵنەگریّ لەبەر شتێکی دەرەکی بێت- بەلاّم ئێمە لاکەی تری وانە ناوەوەی ئەدەین بەسەر دەرەکیەکەدا، یاخود بۆیە نەهی لیّکراوە لەبەر شتێکە لازمیانە ، وەك نەهی لەفرۆشتنی درهەمێك بەدوو درهەم، چونکە ئەم فرۆشتنە زیادەیەك دەگرێتەوە کە لازمیەتی بەهۆی مەرج گرتنیەوە لەبەر ئەوە چونکە زۆربەی زانایان موافقن لەوەدا کەنەهی بۆ فەسادەو ئیعتباری نیە ئەگەر نەهیەکە بگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی یاخود لازمی، جا لەعیبادەتدا چونکە دژایەتی دروست دەبیّ و دەچن بەگژیەکدا چونکە شتیّ نەهی لیّبکریّ ناگونجیّ عیبادەتی بەمانا فەرمان کرابیّ بەکردنی، وەك: رابورد لەپێشەوە لەمەسئەلەی(الأمرُ لايتناوَلُ المكروهَ)دا بەلاّم لەمامەڵەدا لەبەر ئەوەیە زانایانی پێشوو بەڵگەیان لەسەر فەسادی ئەو مامەڵانە وتویانە نەهیان لیّکراوەو کەسیش رەخنەی لیّنەگرتوون، بەلاّم شتێك نەعیبادەت بیّ نەمامەڵەش بیّ ئەوە وەك لەپێشەوە رابوورد شتێکی دیارە ، چونکە شەرع بەبەرهەم حیسابی ناکات.

{وقالَ الغزالي والإمام} الرّازي للفاسدِ {في العبادات فقط} اي دونَ المُعاملات ففسادُها بفواتِ ركنٍ او شرطٍ عُرِف من خارجٍ عنِ النهي ولانسلّمُ انَّ الأولينِ استدلّوا بمجرَّدِ النهي علة فسادها دونَ غيرها كما تقدَّمَ ففسادُهُ من خارجٍ ايضاً[1] {فإنْ كانَ} مطلَقُ النهي {لخارجٍ} عنِ المنهيِّ عنهُ اي غيرُ لازمٍ لهُ {كالوضوءِ بمغصوبٍ} لإتلافِ مالِ الغيرِ الحاصلِ بغيرِ الوضوءِ ايضاً وكالبيعِ وقتَ نُداءِ الجُمعَةِ لتفويتِها الحاصلِ بغيرِ البيعِ ايضاً وكالصّلاةِ في المكانِ المكروهِ او المغصوبِ كما تقدَّمَ {لم يفدْ} اي الفسادَ {عندَ الأكثرِ} منَ العلَماءِ لأنَّ المنهيَّ عنهُ في الحقيقَةِ ذلك الخارجُ.[2]

{وقالَ} الإمام {احمد} مطلقُ النّهي {يفيدُ} الفسادَ {مطلَقاً} اي سواءٌ لم يكُن لخارجٍ او كانَ لهُ لأنَّ ذلكَ مقتضاهُ فيفيدُ الفسادَ في الصورَةِ المذكورَةِ للخارجِ عندهُ قالَ: {ولفظُهُ حقيقةٌ وإنْ إنتهى الفسادُ لدليلٍ}[3]

(١)غەزالى و رازى وتوويانە: نەهیەکە لەبەر فەسادە تەنها عیبادەتی پەرستشەکاندا، واتە نەك لە مامەڵەکاندا ئەوان بەتاڵ بوونەکەیان بەهۆی نەبوونی روکنێکەوە یامەرجێکەوە کەلەدەرەوەی نەهیەکە زانراوە، ئێمە ئەوە ناسەلمێنین، کە زانایان کۆن تەنها بەڵگەیان لەسەر بەتاڵ بوونیان نەهیەکەیە، وەهەم جگە لەغەیری مامەڵەکانیش وەك رابوورد، بەتاڵی ئەوانیش دووبارە هەر لەدەرەوەی نەهیەکە وەردەگیرێ،

(٢)جائەگەر موطلەقەن نەهیەکە لەبەر شتێکی دەرەکی بێ لەقەدەغە لێکراوەکە، واتە لازمی قەدەغە لێکراوەکە نەبوو، وەك: دەست نوێژگرتن بەئاوی داگیرکراو، بۆیە نەهی لێکراوە ماڵی غەیری فەوتاندووە، کە بەبێ دەست نوێژگرتنیش هەردەفەوتێ، یاخود وەك کرین و فرۆشتن لەکاتی بانگی نوێژی هەینیدا ، بۆیە نەهی لێکراوە چونکە ئەبێتە هۆی فەوتاندنی نوێژی هەینی کەبەبێ کرین و فرۆشتنیش هەر ئەفەوتێ، یاوەك: نوێژکردن لە شوێنی مەکروهو داگیرکراودا ، وەك رابورد، ئەم جۆرە نەهیانە بەلای زۆربەی زانایانەوە فەسادو بەتاڵە ناگەیێنێ، چونکە چونکە قەدەغەلێکراوەکە لەحەقیقەتدا ئەو خارجو شتە دەرەکیەیە.

(٣)ئیمام ئەحمەد وتویەتی: نەهی ئەگەر روت بوو قەیدی فەساد و بەتاڵی پێوە نەبوو، ئەوە فەسادو بەتاڵ ئەگەیەنێ بەمطلقی واتە کەیفی خۆیەتی هۆیەکی دەرەکی نەبێ یاخود هەبێ، چونکە فەسادو بەتاڵ داخوازی داوای نەهیە، کەوابوویەلای ئیمام ئەحمەدەوە هەموو ئەو میثالانەی باسکران نەهیەکەیان فەسادو بەتال ئەگەیینێ بەهۆی هۆیەکی دەرەکیەوە ، ئیمام ئەحمەد دەڵێ: لەفظی نەهی حەقیقەتە لەفەسادو بەتاڵدا ، هەرچەندە فەسادەکەشی بەهۆی بەڵگەیەکی دەرەکیەوە نەمابێ.

كما في طلاقِ الحائِضِ للمرِ بمراجعتها كما تقدَّمَ لأنَّهُ لم ينتقِلْ من جميعِ موجبِهِ منَ الكفِّ والفسادِ فهوَ كالعامِ الذي خصَّ فإنَّهُ حقيقَةٌ فيما بقيَ كما سيأتي[1]

{وقالَ ابو حنيفة} مطلَقُ النَّهي {لايفيدُ} الفسادَ {مطلقاً}اي سواءٌ كانَ لخارجٍ ام لمْ يكُنْ لهُ لما سيأتي في إفادَتِهِ الصِّحَةَ قالَ: {نعَمْ المنهيُّ} عنهُ {لعينِهِ} كصلاةِ الحائضِ و بيعُ الملاقيحِ {غيرُ مشروعٍ ففسادهُ عرضيٌّ} اي عرض للنهي حيث استعمل في غير المشروع مجازاً عنِ النفي الذي الأصل انْ يستعمَلَ فيهِ غخباراً عن عدَمِهِ لإنعدامِ محلِّهِ هذا فيما هوَ من جنسِ المشروعِ امّا غيرُهُ كالزِّنا بالزاي فالنهي فيهِ على حالِهِ وفسادُهُ من خارجٍ[2]

---

(١)وەك طەلاقدانی ژنێك لەكاتی حەیزدا –ئەمە نەهی لیکراوە بەلام فەسادەكەی نەماوە بەهۆی فەرمانی پێغەمبەرﷺ بەگەڕاندنەوەی – ئەگەر نەكەوتایە فەرمان بەگەڕانەوەو رجوعی نەئەكرا وەك لەپێشەوە رابووردچونكە نەهیەكە لەهەموو ماناكەی دەرنەچووە كە فەسادو وازهێنانە –ئەگەر دەرچێ تەنها لەیەكێكیان دەرچووە– كەوابوو ئەو نەهیە وەك عامێك وایە تایبەت كرابێ ئەوە هەر حەقیقەتە ئەو عامە لەو مانایەدا ماوەتەوە وەك لەمەودوا دێ.

(٢)ئەبو حەنیفە وتوویەتی: نەهی رووت فەســاد و بەتــاڵ ناگەیەنێ بەمطلقی واتە: چ نەهیەكە لەبەر شتێكی دەرەكی بێ یا نەبێ، چونكە لەبەر ئەو بەڵگەی لەمەودوا دێ واتەگەیێنێ –واتە شت ئەبێ هەبێ ئەمجا نەهی لێبكرێ– ئەبو حەنیفە دەڵێ: بەڵێ ئەوەی قەدەغە كراوە لەبەر خودی خۆی وەك نوێژی ئافرەتی حەیزدارو كڕین و فرۆشتنی بەچەی ناوسك مەشروع نیە ، –كەمن ئەڵێم فەساد بەتاڵ ناگەیەنێ مەبەســتم فەسادی زاتیە–كەوابوو فەسادەكەی عەرەضیەو بۆی پەیدا بووە، واتە بۆ نەهــیەكە پەیدا بووە، چونكە نەهیەكە بەكارهاتــووە لە شتێكدا كە لەشــەرعدا نیە، لەڕوی مەجازەوە بەكارهاتووە لەباتــی ئەو نەفیەی كە ئەصل و قاعیدە وایە نەفی لەو غەیرە مەشروعەدا بەكاربێ، –بوترایێ: لاصلاة لحائضٍ... الخ– چونكە هەواڵدانە بەنەبونی ئەو غەیرە مەشــروعە لەبەر نەبوونی شوێنــــەكەی ، شــوێنی نوێــژ نوێژكەرێكی پاكە و هەروەها، مەبەست بەنەبوونی نەبوونی شەرعیە نەك حیسی، نەفیش بۆ خەبەرو هەواڵدانە ، نەهیش بۆ داوای وازهێنانە. ئەمەش موشابەهە هەیە لەنێوانیاندا چونكە هەردوكیان نەكردنی ئەو كارەیە، بۆیە مەجــازە لەمەدا –ئــەم نەهیە كەبەمانا نەفیە لە شتێكدا ئەبێ كەلەڕەگەزێك بێ لەشەرعدا هەبــێ– نوێژی ئافرەتی حەیزدار لە ڕەگەزی نوێژە، نوێژیش مەشــروعە هــەروەها ئەوانی تریش–

**{ثمَّ قالَ: والمنهي} عنهُ {لوصفِهِ} كصومِ يومِ النَّحرِ للإعراضِ بهِ عنِ الضيافَةِ وبيعِ درهَمٍ بدرهمينِ لإشتمالهِ على الزيادَةِ {يفيدُ} النهي فيهِ {الصِّحةَ} لهُ لأنَّ النهيَ عنِ الشيئِ يستدعي إمكانَ وجودِهِ وإلاّ كانَ النهي عنهُ لغواً كقولِكَ للأعمى: لاتبصر، فيصحُ صومُ يومِ النَّحرِ عن نذرِهِ كما تقدَمَ لا مطلقاً لفسادِهِ بوصفِهِ اللازمِ بخلافِ الصَّلاةِ في الأوقاتِ المكروهَةِ فتصبحُ مطلقاً لأنَّ النهي عنها لخارجٍ كما تقدَّمَ ويصحُ البيعُ المذكورُ إذا اسقطَتِ الزيادَةُ لامطلقاً لفسادِهِ بها وإنْ كانَ يفيدُ بالقبضِ الملكَ الخبيث كما تقدَّمَ واحترزَ المصنِّف بمطلَقِ النهي عنِ المقيَّدِ بما يدلُ على الفسادِ أو عدَمِه فيعمَلُ به في ذلكَ اتفاقاً[1]**

---

**بەڵام ئەوەی لەڕەگەزی مەشروع نەبێ وەك: زینا، ئەوە نەهیەكە تیایدا هەر لەسەر حاڵی خۆیەتی بۆ داوای وازهێنانە -نەك بەمانا نەفی بێ-فەسادەكەشی لەدەرەوەی نەهیەكە وەردەگیرێ.**

**(١)پاشان ئیمامی ئەبو حەنیفە ،ەڵێ: ئەگەر قەدەغە كراوەكە لەبەر صیفەتیخۆی بێ، وەك رۆژوی رۆژی جەژنی قوربان كە ئەبێتە هۆی پشت هەڵكردن لەقەبوڵكردنی میوانداری خوا ، یافرۆشتنی درهەمێك بەدوو درهەم ، چونكە مامەڵكە زیادەكەشی ئەگرێتەوە، ئەو نەهیە صحەتو بوونی كرین و فرۆشتنەكە ئەگەیەنێ، چونكە شتێك ئەگەر قەدەغە بكرێ خودی نەهیەكە داوای بوونی قەدەغە لێكراوەكە دەكاو ئەگەر نەبێ نەهی لێناكرێ، ئەگەر نەبێ قەدەغە كردنەكەی هیچ ئەبێ، وەك: بەكوێرێك بڵێی بۆی مەڕوانە، ئەو چاوی نیە بۆچی بڕوانێ؟ كەوابوو رۆژوی رۆژی جەژنی قوربان لەباتی بەجێهێنانی نەزر دروستە، وەك لەپێشەوە رابوورد نەك بەمطلقی دروستە، -تەنها ئەگەر نەزر كرابێ دروستە- چونكە بەتاڵ ئەبێ بەهۆی وەصفە لازمەكەیەوە ، جیاوازە لەگەڵ نوێژدا لەمەكروهەكاندا ئەم بە مطلقی دروستە ، نەزر بێ یانەبێ ، چونكە بۆیە نەهی لێكراوە لەبەر شتێكی دەرەكیە، وەڕابوورد ، ئەوكڕین و فرۆشتنەی باسكرا دروستە كاتێ كەزیادەكە لابرێ و وەرنەگیرێ، نەك بە مطلقی چونكە بەهۆی زیادەكەیەوە ئەو بەیعە بەتاڵە ، هەرچەندە بەهۆی وەرگرتنیەوە ئەبیچتە خاوەنی ئەم ماڵە حەرامە، وەك رابوورد، دانەر كەوتی: مطلقی نەهی خۆی پارست لەنەهیەك شتێكی پیچوە لكابێ بەتاڵی بگەیەنێ یا نەی گەیەنێ، ئەوە بەیەك رایی هەموو زانایان ئەو نەهیە بەو قەیدەوە عەمەلی پیدەكرێ.**

{وقيلَ إنْ نفي عنهُ القبول} اي نفيهُ عنِ الشيئِ يفيدُ الصحَّةَ لهُ لظهورِ النفي في عدَمِ الثوابِ دونَ الإعتداد[1] {وقيلَ: بل النفيُ دليلُ الفسادِ} لظهورهِ في عدَمِ الإعتداد[2]. {ونفيُ الإجزاء كنفي القبولِ} في انَّهُ يفيدُ الفسادَ او الصحَّةَ قولانِ بناءً للأوَّلِ على انَّ الإجزاءَ الكفايَةُ في سقوطِ الطلَبِ وهو الرَّاجحُ وللثاني على انَّهُ اسقاطُ القضاءِ فإنَّ مالايسقطهُ بأن يحتاجَ الي الفعلِ ثانياً قدْ يصحُّ كصلاةِ فاقدِ الطهورَينِ[3] {وقيلَ} هوَ {اولى بالفسادِ} منْ نفي القبولِ لتبادُرِ عدَمِ الإعتدادِ منهُ الى الذّهنِ وعلى الفسادِ في الأوَّلِ حديثِ الصحيحَينِ لايقبَلُ اللهُ صلاةَ احدِكم إذا احدَثَ حتّى يتوضأ وفي الثاني الدارقطني وغيره لاتجزئُ صلاةٌ لايقرا الرّجُلُ فيها بإمِّ القرآنِ[4]

(١)هەندێك وتوويانە: ئەگەر نەفی قبولْ بوونی شتێك كرا، ئەوكاتە صحەتو دروستی ئەو شتە ئەگەیەنیْ، چونكە بەنەفی قەبولْ بوونەكەی نەبوونی پاداشتی دەرئەكەویْ، نەك كەڵك نەبوونەكەی -وەك: كەسیْ بڕوا بۆ لای عەڕڕاف و بڕوای پیْبكا ئەوە(لم يقبلِ اللهُ صلاتَهُ اربعينَ يوماً)، خوا چل ڕۆژ نوێژی لیْقبول ناكا ، واتە پاداشتی نوێژەكانی نیە، نەك كەڵكیان نیە و لەكۆڵی ناكەویْ-

(٢)كۆمەڵێكیش دەڵێن: نەخێر بەڵكو خودی نەفیەكە بەڵگەی بەتاڵیەتی، چونكە نەفیەكە لەكەڵك نەبوونیدا دەرئەكەویْ. (٣)نەفی (إجزاء) وەك نەفی قەبولْ وایە، لەوەدا ئایا ئەگەر نەفی وەك نەفی قەبولْ وایە، لەوەدا ئایا ئەگەر نەفی (إجزاء)ی شتیْ كرا، ئایا بەتاڵی ئەو شتە ئەگەیەنیْ ، ئەمە دوو قەولی تێدایە، یەكەمیان ئەڵیْ: بەتاڵی و فەسادی ئەوشتە ئەگەیەنیْ، چونكە (إجزاء) بەمانا كیفایەتە لەكۆڵْ كەوتنی داواكردنی ئەو شتە، ئەوەش قەولی راجیحە، قەولی دووەمیش صحەت و دروست دەگەیەنیْ چونكە قەزاكردنەوەی لەكۆڵْ دەكەویْ چونكە ئەوەی قەزاكردنەوەی لەكۆڵْ نەخا ، واتە پێویستی بەدووبارە كردنەوەی هەبیْ ، كەم جارانێك دروست دەبیْ وەك: نوێژی كەسێك ئاوو گڵی دەست نەكەویْ بۆ دەست نوێژو تەیەمموم.

(٤)وتراویشە نەفی (إجزاء) چاكتر فەساد ئەگەیەنیْ تانەفی قەبولْ، چونكە كەوترا: (إجزاء) نیە زوتر بۆ ذیهنی ئینسان بیْكەڵكی ئەو شتە ئەگەیەنیْ ، جا میثال بۆ فەسادیْ بەمانا نەفی قەبولْ بوون بیْ ئەو فەرموودەیە بوخاریو موسلیم ریوایەتی دەكەن دەفەرمویْ: خوا نوێژی هیچ كەس لەئێوە قەبولْ ناكا كاتیْ كە بیْ دەست نوێژ دەبیْ هەتا دەست نوێژ نەگرێتەوە، وە میثال بۆ فەسادیْ بەمانا نەفی (إجزاء)بیْ ئەو فەرموودەیە كە دارقطنی و غەیری ئەویش ریوایەتی دەكەن و دەفەرمویْ: نوێژێك مجزی نیە كەپیاو (أم القرآن)ی تیا نەخوێنیْ.

## {العام}

{لفظٌ يستغرِقُ الصالحَ لهُ} اي يتناولَهُ دفعةً خرجَ بــــهِ النَّكرَة في الإثباتِ مفردةً او مثنّاةً او مجموعةً او اسمَ عددٍ، لامنْ حيثُ الآحادِ فإنّها تتناولُ ما تصلُحُ لهُ علىسبيلِ البدَلِ لا الإستغراقِ نحو: اكرم رجلاً وتصدَّقْ بخمسَةِ دارهمَ[١] {مــن غــيرِ حصرٍ}خرجَ بهِ اسمُ العدَدِ منْ حيثُ الآحادِ فإنَّهُ يستغرقُها بحصرٍ كعشَرَةٍ ومثلــه النَّـــكرَة المثنّاةُ منْ حيثُ الآحادِ كرَجلينِ ومنَ العمِ اللفظُ المستعملُ في حقيقَتِهِ او حـــقيقَتِه و مجازِهِ او مَجازِيَّةً على الرَّاجحِ المتقدِّمِ من صحَّةِ ذلكَ ويصدُقُ عليهِ الحدّ كما يصدُقُ على المشتَركِ المستعَملِ في افــــرادِ معنىً واحد لأنَّهُ مع قرينَـةِ الواحـدِ لايصلُحُ لغيرِه[٢]

## عام

(١)عام لەفظێكە بەیەكجار هەموو ئەفرادەكانی ئەگرێتەوە ئەوەی ئەگونجێ بۆ ئەو لەفظە، نــەك لــەڕوی بەدەلیــەت هــەرجارێ فــەردێك، بــەڵكو بەیــەكجار هــەموویان ئەگرێتەوە،بەم پێناسە نەكیرەیەك نەفی لەگەڵ نەبێ لەعام چووەدەر ، چ تاك بێ وەك: رجل یا تاكەكە كرابێ بەدووان وەك: رجـلان، یـاخود نیشـانەی كـۆی پێـوە بـێ وەك:مسلمون، یـاخود نـاوێك بێ بـۆ ژمـارەیێك وەك: عشـرون، بـەڵام عشـرونەیەك دەرئەچێ بەگوێرەی بیست بیستەكان بێت، نەك بەگوێرەی ژمارەكان یەك تا بیست، چونكـە بـەگوێرەی ئـەمان بەیـەكجار ئـەیان گرێتـەوە، ئەوانـە هـەموویان فـەردەكانی خـۆیان ئەگرنەوە بەگوێرەی بەدەلیەت و هەرجارێ فەردێك، نەك هەموویان بگرێتەوە بەیەكجار، وەك: رێز لەپیاو بگرە وەبەپێنج درهەمیش صەدەقە بكە،

(٢)ئەمە بۆ ئەم پیاوەو بۆ ئەم پیاوەش دەبێ بەڵام بەگوێرەی هـەرجارێ یـەكێك، هـەروەها درهەمەكانیش، جاعام هەموو فەردەكانی ئەگرێتەوە بەیەكجار، ئەبێ بەبێ حـەصرو گـەمارۆدان و دیواركێشـان وەك: چـوار چێوەیـەك تەنـها ئەوانـەی نـاوی بگرێتەوە ، نابێ ئاوابێ، كەوتت: بەبێحەصر ئەو ناوانەی دیاریكراون بۆ ژمارەكان لەپێناسەی عام دەرچون بەگوێرەی تاكەكانی، چونكە ئەو ژمارە هەرچەند بەیەكجار هەموویان ئەگرێتەوە بەڵام حەصرەو نیشانەی كۆتایی بۆ كێشراوە، وەك ژمارەی دە ، هـەروەك ژمـارە وایــە نەكیرەیـەك نیشــانەی دووی پێـوە نرابـێ ئـەویش بـەگوێرەی تاكـەكانی وەك رجلـین ، ئـەمیش حـەصری تێدایـە، بەشـێكە لـەعام ئـەو لەفظـەی بەكاربهێنرێ لـە دوو مانـای حـەقیقی خۆیـدا، وەك: قـرأ، یـاخود لـەمانای حـەقیقیو مەجازیەكەیدا، وەك: (لمسَ) یاخود لەهــــەردوو مانا مەجـازیەكەیدا وەك: (شراء) ،

{والصحيحُ دخولُ} الصُّـــورَةِ {النـادرَةِ وغـيرُ المقصـودَةِ} وإنْ لم تكُـنْ نـادرَةً مـن صورَةِ الـعام {تحتَهُ} في شمولِ الـحكمِ لهما نظراً للمقصودِ مثالُ النّادرَةِ الفيلُ في حديـثِ أبـي دواد وغـيرِهِ: (لاسبقَ إلاّ في خـــفٍ او حـافرٍ او نصلٍ) فـــإنَّهُ ذو خـفٍ والمسـابقَةُ عليـهِ نـادرَةٌ والأصـحُ جوازُهـا عليـهِ ومثـالُ غـيرِ المقصـودِ وتـــدرَكُ بالـقريــنَةِ مالو وكّلَـهُ بشـراءِ عبيـدِ فـلان وفيـهم مـن يعتـقُ عــليهِ ولمْ يعلـم بـهِ فالصحيحُ صحَّةُ الـشّراءِ أخذاً من مسئلَةِ مالوْ وكّلَهُ بـشراءِ عـبدٍ فاشترى من يعتِقُ عليهِ و إنْ قامت قريـــنةٌ على قصدِ النّادرَةِ دخلت قطــعاً او قصد إنتفاء صورة لم تدخُلْ قطعاً[1]

ئەمەش لەســـەر قەولی راجیح کـەرابوودر ئەو صەحیحە پێـناسەی عام ئەم لەفظەی ئەگرێتەوە، وەك: موشتەرەکێك کەبەکاربێ لەچەند فەردێکدا لەتاکە مانایـەکدا –وەك: عین–چو نکە موشتەرەکە لەگەڵ قەرینەدا لەسەر ئەوەی ئەو تاکە مانایە مەبەستە، ئیتر ناگونجێ بۆ مانایەکیتر.

(١)قەولی صەحیح ئــەوەیە هەندێ فەردی نادری غەیـــر مەقصود هەیـە، یاغـەیر مەقصودەو غـەیر نـادرە هـەندێکن لەشێوازی عـام ، لـەژێر پێناسـەی عـامدا جێیـان ئەبێتـەوە کەحوکمەکـە هـەدووکیان بگرێتـەوە، بۆیـە ئەیانگرێتـەوە چونکـە سـەیری عمومیـەت و گشـتگیریەکەی ئـەکرێ، هـەندێکیش دەڵێـن: بەرنـــاکەون چـــونکە تەمـــاشای لایەنی مەبەست دەکرێ نەك عمومەکە ، وێنە بۆ نادرەکە وەك: فیـــل لـەو فـەرموودەدا کـــە ئــەبو داود و غـــەیری ئـــەویش ریوایەتی‌دەکــەن و دەفــەرموێ: (پێشبڕکێ ڕەوا نیە جگە لەگیانـــلەبەری خوفدارو سمدارو تیرو ڕمبازی نەبێ) دەخۆ فیلـــیش خـــوفی هەیە، پێشبڕکێ بەسەر پەشتێکی کـەم و ناوازەیـە، قـەولی ئەصـەح پێشـــبڕکێ بەسـەریەوە دروستە، وێنەی غەیــــرە مەقصودەکـەش بـەڵام بەقـــەرینـــە بزانرێ، کەسێ بکا بەوەکیلی خۆی بەندەکانی فلانەکەس بکڕێ، بەڵام ئەو بەندانـە کــەسی وایان تێدایە ئەگـــەر بیکڕێ ئازاد دەبێ، پێنازانێ–وەك: ئەوەیە بوکی بێ یا کـوڕی بـێ– ئـەوە قـەولی صـەحیح ئەوەیـە ئـەو کڕیـن و فرۆشتـــنە دروســتە ، ئـەم دروستیشـە لـەو مەسەلـــەیە وەرگیراوەکـــە ئەگـەر کەسێکی‌کرد بـەوەکیلی خـۆی بەندەیەکی بۆ بکـــڕێ ، ئەویش کـەسێکی بۆ کڕی ئازاد ئەبوو لەسەری ، وەئەگەر قەرینە هەبـوو لەســـەر ئەوەکە مەبەست نـادرەکەیە ئەوە ئەو نادرە بێگومان ئەچێتە ناو عامەکــەوە، یـاخـود بەڵـگە هەبێ لەسەر نـەبوونی مەبەست بەو نـادرە بێــگومان ناچێتە ژێر ئەو عامەوە .

والصحيحُ {أنَّهُ} اي العامُ {قدْ يكونُ مجازاً} بأن يقتَرنَ بالمجازِ اداةُ عمومٍ فيصدقُ عليهِ ماذُكِرَ كعكسِهِ المُعبِّر بهُ ايضاً نحو: جاءني الأسودُ الرماةُ إلاّ زيداً[1] وقيلَ: لايكونُ العامُ مجازاً فلايكونُ المجازُ عاماً لأنَّ المجازَ ثبتَ على خلافِ الأصلِ للحاجَةِ إليهِ وهي تندفعُ في المُقترنِ بأداةِ عمومٍ ببعضِ الأفرادِ فلا يُرادُ بهِ جميعها إلاّ بقرينةٍ كما في المثالِ السابقِ منِ الإستثناءِ[2] وهذا اي المجازُ لايعمُّ نقلَهُ المصنِّف عن بعضِ الحنفيَّةِ كالمقتضي وهُمْ نقلوهُ عنْ بعضِ الشافعيَّةِ بانياً عليهِ ماروي: (لاتبيعوا الدّرهم بالدرهمينِ ولا الصّاعَ بالصّاعينِ) اي مايحلُ ذلكَ اي مكيلُ الصّاعِ بمكيلِ الصّاعينِ حيثُ قالَ المُراد بعضُ المكيلِ لما تقدَّمَ وهوَ المطعومُ[4]

---

(١)قەولی صەحیح ئەوەیە کەعام جاری واهەیە مەجاز ئەبێ، واتە:لەفظە مەجازەکە ئامێری عامی پێوە بێ،کەوابوو ئەو عامە مەجازی بەسەردا ئەبرێ،وەك پێچەوانەکەی ئەوتریٚ دووبارە واتە: مەجازیش کەمجاریٚ عام ئەبێ ، وەك:شێرە تیر ئەندازەکان هەموو هاتن بۆ لام جگە زەید نەبێ، الأسود عامە بەهۆی ئەلەکەوە مەجازیشە.

(٢)هەندیٚ وتوویانە: عام مەجاز نابێ، کەوابێ مەجازیش عام نابێ، چونکە ئەصل لەکەلامدا ئەوەیە بەحەقیقەتبێ مەجاز پێچەوانەی ئەصلە لەبەر پێویستی پەنای پێئەبرێ، ئەو پێویستیەش لائەچیٚ لەمەجازێکدا کە ئامێری عامی پێوە بێ، بەوەی بیبڕیٚ بەسەر هەندیٚ فەردەکانیدا، کەوابوو ئیرادەی هەموو ئەفرادەکانی ئەو لەفظە مەجازە ناکریٚ کەنیشانەی عامی پێوەیە، مەگەر بەقەرینە نەبێ، وەك ئەو میثالەی پێشەوە کە ئامێری ئیستثنای تێدا بوو.

(٣)ئەمەش-واتە مەجاز عام نابێ- دانەر لەهەندیٚ زانای حەنەفیەوە ریوایەتی کردووە، قیاسی کراوەتە سەر مقتضی وەك عموم لەمقتضیدا نیە لەمەجازیشدا نیە، مقتضی یانی کەلامێك بەبێئەوەی شتێکی بۆ تەقدیر بکەی راست دەرنەچیٚ ، جاکە بەتەقدیری فەردێك راست دەبێتەوە پێویست ناکا ژمارەیەکی زۆری بۆ تەقدیر بکەی ، بەکورتی وەك مقتضی بەلای هەموو مالکیەکانەوە عام نابێ، مەجازیش بەلای هەندیٚ لەحەنەفیەکانەوە عام نابێ ، ئەوانیش لەهەندیٚ زانای شافعیەکانەوە ریوایەتیان کردووە، جائەم شافعیانە لەسەر قاعیدەی مەجاز عامی لێناگیرێ، ئەو فەرموودەی ریوایەت کراوە دەفەرمویٚ: درهەمێك بەدوو درهەم مەفرۆشن بەم شێوە مانایان لێداوەتەوە، واتە: ئەوەی ئەچێتە ناو صاعەوە بەمانا ئەوەی بەصاع ئەپێورێ ، یەك ئەندازەی بەدوو ئەندازەی صاعێك مەفرۆشن، نەك خودی صاعەکە کەئامێری ئەندازە زانینە، ئەوە یەك صاعی بەدوو صاع دروستە، جا ئەو هەندە زانایانە وتوویانە:

لما ثبتَ منْ انَّ علةَ الرِّبا عندَنا في غيرِ الذَّهَبِ والفضَّةِ الطعمُ وعلى الأوَّلِ يخصُّ عمومَهُ بما اثبتَ عليَّةَ الطعمِ فيسقُطُ تعلُّقُ الحنفيَّةِ بهِ في الرِّبا في الجصِّ ونحوِهِ. والحديث في مُسلم عن ابي سعيد الخدري قالَ: (كنَّا نرزُقُ تمرَ الجمعِ فكنَّا نبيعُ صاعينِ بصاعٍ فبلغَ ذلكَ رسولَ اللهِ ﷺ فقالَ: لاصاعَةَ تمرٍ بصاعٍ ولاصاعَةَ حنطةٍ بصاعٍ ولادرهَمِ بدرهمينِ)[1]

{و}الصحيحُ {انَّهُ} اي العموم {من عوارِضِ الألفاظِ} دونَ المعاني، {قيلَ والمعاني} ايضاً فكما يصدُقُ لفظُ عامٍ يصدقُ معنىً عام حقيقةً ذهنياً كانَ كمعنى الإنسانِ او خارجيّاً كمعنى المطَرِ والخصبِ لما شاعَ منْ نحوِ الإنسانِ يعمُّ الرَّجُلَ والمرأةَ ، وعمَّ المطرُ و الخصبُ فالعمومُ شمولُ امرٍ لمتعدِّدٍ[2]

---

هەندێ لەوەی کەبە صاع ئەیپێورێ نەك هەرشتێ کەبەصاع بپێورێ – لەبەر ئەوەی لەپێشەوە رابوورد کەمەجاز ئەصل نیە لەکەلامدا– ئەو کەمەش بریتیە لەوەی کە قوت و ژیواری خەڵك بێ،

(١)چونکە بەلای ئێمەوە ثابت بووە کە هۆی حەرام بوونی سوو جگە لە ئاڵتون و زیودا نەبێ قوت وژیوارە بەڵام لەسەر قەولی یەکەم کە مەجاز عام ئەبێ عمومەکەی تایبەت دەکرێ بەو ریوایەتەی کە هۆی حەرام بوونی سوو طعم و قوت و ژیوارە، کەوابوو دەست گرتنی ئەو هەندە حەنەفیە بەو ریوایەتەی پێشەوە لەناو ئەچێ، کە دەڵێن: لەسەر عموم و گشتگیری خۆی دەمێنێتەوە، سوو لەگەچ و شتانیتریشدا هەیە، ئەو فەرموودەی پێشەوە لە موسلم دا بەم شێوەیە : ابو سعیدی الخدری وتی: ئێمە بە خورمایێك ئەژیاین کۆئەکرایەوەو دابەش ئەکرا بەسەرماندا ، بەوە ئەژیاین هەتا خورمای تازە پێئەگەییەوە ، جائێمە دوو کیلۆ خورما کۆنەمان ئەدا بەیەك کیلۆ، ئەوە گەییە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: دوو صاع خورما نەفرۆشن بەیەك صاع، دوو صاع گەنم نەفرۆشن بەیەك صاع گەنم، ، وەدرهەمیچك نەفرۆشن بەدوو درهەم.

(٢)قەولی صەحیح ئەوەیە کە عام بۆ لەفظ پەیدا ئەبێ و ئەوترێ، – نەك بۆ مانا ئەوترێ لە لەفظی عام نەك مانای عام– کۆمەڵێك وتوویانە: عام وەك بۆ لەفظ ئەبێ بۆ ماناش ئەبێ لە حەقیقەتدا، کەوابوو وەك لەفظی عام راستەو ئەوترێ مانای عامیش راستەو ئەوترێ،حەقیقەتەن، چ ژیهنی بێت وەك مانای ئینسان، وەچ لەدەرەوەو واقیع بێ وەك مانای باران و هەرزانی، چونکە بڵاوە بەسەر زاری خەڵکەوە کە ئینسان ئافرەت و پیاویش دەگرێتەوە، یائەڵێن: بارانەکە گشتگیرە یا هەرزانی دونیای گرتۆتەوە، کەوابوو ئەگەر عام بۆ لەفظ و مانابێ نابێ وەك پێشەوە پێناسە بکرێ،

{وقيلَ بهِ} اي بعروضِ العمومِ {في الذّهنيّ} حقيقَةً لوجودِ الشمولِ لمتعدِّدٍ فيهِ بخلافِ الخارجيّ والمطَرِ والخصبِ مثلاً في محلّ غيرِهما، في محلّ آخر فإستعمال العمومِ فيهِ مجازيّ وعلى الأوّلِ إستعمالُهُ في الذّهني مجازيّ ايضاً وعلى الآخرين الحدُّ السابقُ للعامِ من اللفظِ[1]

{ويقالُ} إصطلاحاً {للمعنى اعمُّ} واخصُّ ، {واللّفظُ عامّ} و خاصّ تفرقةً بينَ الدالّ والمدلولِ، وخصَّ المعنى بأفعلَ التفعيلِ لأنّهُ اهمُّ من اللّفظ، ومنهم من يقولُ في المعنىعامّ كما عُلِم مما تقدَّمَ و خاصّ، فيُقالُ لمعنى المشركين: عامّ و اعمّ، وللفظه عامٌّ، ولمعنى زيد خاص و اخصّ، وللفظِه خاص، وترك الأخصّ والخاصّ إكتفاءً بذكرش مقابلِهما ولم يترُك، وللفظ عام المعلومِ مما قدّمهُ حكايةً لشقّ ماقيلَ ليظهرَ المراد[2]

---

ئەبێ بووترێ: عام بریتیە لەشتێك كەداگرندەی چەند شتێ بێ. (١)هەندێك وتوویانە: عموم بۆ مانای ذیهنی پەیدا ئەبێ حەقیقەتەن، چونكە شت هەیە داگرەندە بێ بۆ چەند شتێك لەمانای ذیهنیدا، بەلأم بۆ دەرەوەی ذیهن وانیە، ئەی چی ئەكەن لە باران و...ئەوەنیە داگرندەیە؟ ئاخر باران شینكاییك لە جێكدایە. ئەو باران شینكایە نیە لەجێیەكی‌تر هەیە، كەوابوو بەكارهێنانی عام لەدەرەوەی ذیهندا مەجازیە ، لەسەر قەولی یەكەم كەعام تەنها بۆ لەفظ بەكارهێنانیشی لەمانای ذیهنیشدا هەر مەجازیە دووبارە، وەلەسەر دوو قەولەكەی‌تر پێناسەی پێشوو بۆ عامی لەفظ ئەبێ و بەس.

(٢)ئەگەر عام بۆ مانا بەكاربێ بەگوێرەی إصطلاح دەوترێ: اعم و اخص، بەلأم ئەگەر بۆ لەفظ بێ دەوترێ: عام و خاص، بۆ ئەوەی دال و مەدلول جیاوازیان هەبێ لەیەك و جیابكرێنەوە، بۆیە إسمی تفضیل تایبەت كراوە بەماناوە، لەبەر ئەوە كەمانا گرنگترە لە لەفظ، هەندێكیشیان دەڵێن: بۆ مانا عام و خاص، وەك لە پێشەوە وتراو زانرا، كەوابوو بۆ مانای للمشركین، دەوترێ: عام و خاص، بۆ لەفظەكەش دەوترێ: عام ، بۆ مانای زەیدیش دەوترێ خاص و اخص، بۆ لەفظەكەشی دەوترێ: خاص ، دانەر لەمەتنەكەدا خاص و اخص ی نەووت، چونكە باسی بەرامبەرەكەی كردوون و بەكافی زانیون، بەلأم للفظ عام، تەرك نەكردووە كە ئەمیش بەپێشەكەی خۆی ئەزانرا، چونكە ویستویەتی هەردوو لای ئەوەی وتراوە بیگێرێتەوە، بۆ ئەوەی مەبەست دەركەوێ.

{ومدلولهُ} اي العام في التركيبِ من حيثُ الحكم عليهِ {كليةً اي محكومٌ فيهِ على كلِ فردٍ مطابقةً إثباتاً} خبراً او امراً ، {او سلباً} او نفياً او نهياً نحو: جاءَ عبيدي و ماخالفهم فأكرمهم و لاتهنهم، لأنهُ في قوّةِ قضايا بعدَدِ افرادهاي جاءَ فلان و جاءَ فلان، ، هكذا فيما تقدّمَ ....الخ، وكلٍ منها محكومٌ فيهِ على فرد دالٌ عليهِ مطابقةً.[1] {لا كلٌ} اي لامحكومٌ فيهِ على مجموعِ الأفرادِ من حيثُ هو مجموعٌ نحو: كلُ رجلٍ في البلدِ يحملُ الصخرةَ العظيمةَ اي مجموعهم و إلاّ لتعذّرَ الإستدلالُ بهِ في النهي على كلِ فردٍ ، لأنّ النهي المجموع يتمثّلُ بإنتهاءِ بعضهم ولم تزل العلماءُ يستدلون بهِ عليهِ ، كما في ﴿ ولاتقتلوا النفسَ اللّتي حرّم اللهُ ﴾ ونحوه[2]

(١)مەدلول و مانای عام کاتێك ئەخرێتە رستەوە، کوللیە لەهەرجێ حوکمی بەسەردا بدرێ ، واتە لەو عامەدا هەموو فەردێکی حوکمەکە ئەیگرێتەوە بە دەلالەتی مطابقی، چ ئەو رستە مثبت بێ ئەمیش هەوالْ بێ یا فەرمان بێ، چ سەلب، ئەمیش بە ئامێری نەفی بێ یانەهی بێ، وەك بەندەکانم هەموویان هاتن ، بۆ مثبتی خەبەری، کەسیان سەرپێچی نەکرد، بۆ هەوالی سەلبی، رێزیان لێبگرە ، بۆ مثبتە، وە سوکایەتییان پێنەکەی سەلبەو نەهی، بۆیە مەدلولی عام کولییە، چونکە دەڵێیت: جاء عبیدی لە کێشی چەندەها قضیەدایە بە ئەندازەی ئەفرادی بەندەکانە، واتە: جاء فلان و ماجاء فلان ، هەروەها بۆ ئەوانی تریش کە رابووردن، هەموو فەردێك لە ئەفرادی عامەکە تیایدا حوکمی بەسەردا کراوە ، دەلالەت دەکا لەسەری بە مطابقی ، کەوابوو ئەوەی لە کێشدا بێ هەموو تاك تاکێکی حوکمەکە ئەیگرێتەوەو دەلالەت ئەکا لەسەری بە دەلالەتی مطابقی.

(٢)لە عامدا مەحکومەکە مەجموعی ئەفرادی نیە، لەو روەوە کە حوکمەکە بۆ مەجموعەکە دەبێ، چونکە ئەگەر حوکمێك درایە پاڵ مەجموعێك ئەوە ئەگەر هەندێکیان بیکەن حوکمەکە نەهاتووەتە دی بەڵکوو ئەبێ هەموویان بیکەن ئەمجا دێتە دی، بۆ وێنە: (لاتزنوا)، ئەگەر هەموو موسوڵمانان زینا بکەن یەکێکیان نەبێ بێفەرمانی نەکراوە ، بەلام بۆ هەموو فەردێکە نەهیەکە نەك بۆ مەجموعەکە، وەك: مەجموعی پیاوی ئەم شارەیە ئەتوانێ ئەم بەردە گەورەیە هەڵبگرێ ، نەك تاك تاکیان، ئەگەر وانەبێ ئەکرێ بەعام بەڵگە بهێنرێتەوە وەلە نەهیدا کە قەدەغەی هەموو فەردێکی پێدەکرێ -لاتزنوا، لاتقتلوا-چونکە ئەگەر نەهیەکە لەمەجموع بێ نەك لەهەموو فەردێك ، ئەوە ئەگەر هەندێکیان نەیکەن و ئەوانیتر بیکەن، ئەوە هەر جێ بەجێ کراوە، خۆ زانایان ئێستەو ئێستەش هەتا قیامەت هەر بەڵگە بەعام ئەهێننەوە

{و لاكلّي} اي لامحكومٌ فيهِ على الماهـيَّةِ من حيثُ هي اي من غيرِ نظَرٍ الى الأفرادِ نحو: الرجل خيرٌ من المراة، اي حقيقتُهُ افضـلُ من حقيقتها، وكثيراً مايفضل بعض افرادها على بعضِ افرادِه، لأنّ النّظرَ في العم الى الأفرادِ[1]

{ودلالتُهُ} اي العام {على اصلِ المعنى} من الواحدِ فيما هو غيرُ جمعٍ والثّلاثةُ او الإثنينِ فيما هو جمعٌ {قطعيَّةٌ، وهو عنِ الشافعيّة ﷺ} وعلى كلِّ فردٍ بخصوصه ظنيَّةٌ، وهو عنِ الشّافعيّةِ لإحتمالهِ التخصيصَ وإنْ لم يظهر فخصّص لكثرةِ التخصيصِ في العموماتِ[2]

---

لەسەر نەهی لە هەموو فەردێك وەك:﴿ و لاتقتلوا النفسَ اللتي حرّم الله ﴾ ووێنەی ئەویش کە هەموو فەردێکی موسوڵمان حەرامە لەسەری قەتڵ بکا، نەك مەجموعی موسوڵمانان واتە نەهیەکە روو لەهەموو فەردێك ئەکا نەك لە مەجموعەکە.

(١)مەدلولی عام وەك کوللی نیە و کلیش نیە، -واتە حوکم بەسەر ماهیەتێکدا کراوە بێ ئەوەی رعایەتی تحققی ئەو حوکمە لە ماهیەتیدا بەرِووی ذاتی ماهیەتەکەوە بێ، بێ رعایەتی هەندێ ئەفرادی یا هەموو ئەفرادی- واتە لەعامدا حوکم بەسەر ماهیەتدا نەکراوە لەو ڕووەوە کە ماهیەتە، واتە بێگوێدانە ئەفرادەکانی وەك ماهیەتی پیاو لە ماهیەتی ژن چاکترە، واتە لەڕووی حەقیقەتەوە ، نەك لە رووی ئەفرادیەوە، چونکە زۆر ئەفرادی ژن هەیە لەهەزاران ئەفرادی پیاو باشترە -بۆیە ماهیەتی پیاو باشترە چونکە افضل البش لە رەگەزی پیاوە- بۆ عام بە کولییەت لێك دەدرێتەوە نەك بەکولی؟ چونکە بابەت لە عامدا ئەفرادە، نەك ماهیەت، ئەفرادیش بۆ کولیەن ئەبێ و ماهیەتیش بۆ کوللی.

(٢)دەلاڵەتی عام لەسەر ئەصلی مەبەست و مانا ، کە ئەگەر ئەو لەفظە عامە جەمع نەبوو دەلاڵەت لەسەر یەك فەرد بکات، یاخود دەلاڵەت لەسەر سێ یان دووان بکات ئەگەر ئەو لەفظە جەمع بێ، ئەو دەلاڵەتە دەلاڵەتێکی قەطعی و بێگومانە ، ئەوەش لەپێشەوا شافیعی خۆیەوە ریوایەت کراوە، بەڵام دەلاڵەت کردنی عام لەسەر هەموو فەردێك، بەهۆی تایبەت کردنی ئەو عامەوە، ئەو دەلاڵەتە دەلاڵەت کردنێکی ظەنی و گومانایە، ئەوەش لە زانایانی پێڕەوی شافعیەوە ریوایەت کراوە -عامەکە تەنها تایبەت دەکەی بەهەندێ ئەفرادیەوە، نەك بەجارێ لە هەموو ئەفرادەکانی لێبکەیتەوە، ئەوە سڕینەوە و نەسخە ئەگەر هەمووی لێبکەیتەوە- چونکە ئەو لەفظە عامە هەڵئەگرێ تایبەت کرابێ، هەرچەند تایبەت کەرەکەشی دیار نەبێ بۆمن و تۆ، چونکە لەناو هەموو عامەکاندا تایبەت کردن زۆرە.

{وعنِ الحنفيَّةِ قطعيَّةٌ} للزومِ معنى اللفظِ لهُ قطعاً حتَّى يظهر خلافَهُ من تخصيصٍ في العام، او تجوُّزٍ في الخاصِّ، او غيرَ ذلكَ، فيمتنعُ التخصيصُ بخبرِ الواحدِ وبالقياسِ على هذا دونَ الأوّلِ ، وإنْ قامَ دليلٌ على إنتفاءِ التخصيصِ كالعقلِ ، في ﴿ واللهُ بكلِ شيئٍ عليم ﴾﴿ للهِ ماقي السّموات وما في الأرضِ﴾ كانت دلالتُهُ قطعيةَ إتفاقاً.[1] {وعمومُ الأشخاصِ يستلزمُ عمومَ الأحوال والأزمنة والبقاع} لأنّها لاغنى الأشخاصِ عنها ، فقولُهُ تعالى: ﴿ الزّانيةُ والزّاني فاجلدوا كلّ واحدة منها مأةَ جلدة ﴾ أي على أي حالٍ كان و في اي زمانٍ ومكانٍ كان،[2]

---

(١)بەڵام لەزۆربەی زانایانی پێڕەوی پێشەوا حەنەفیەوە ریوایەت کراوە کە لەفظی عام وەك بێگومان دەلالەت دەکا لەسەر ئەصلی ماناکە، ئاواش دەلالەت دەکا لەسەر هەموو فەردەکانی بەتایبەتو بێگومان، چونکە مانای لەفظەکە لازمی لەفظەکەیە بێگومان، هەتا پێچەوانەکەی دەرئەکەوێ، چ تایبەت کردنی عام بێ یا خود مەجاز لە تایبەتێکدا، یاخود غەیری ئەوان وەك: تەقییدی مطلق یا نەسخ لە محکەمدا، کەوابوو تایبەت کردنی ئەو عامە بەهەواڵی یەك کەس و بەقیاس نابێ و ناکرێ، - چونکە دەلالەتەکە قەطعیەو دەلالەتی خەبەری و احید و قیاسیش ظەنین ، دەخۆظن ناتوانی قەطعی بەرێتە دواوە- ئەمەش لەسەر ئەم بۆچونی ئەم زانا حەنەفیانە، نەك لەسەر رای یەکەم -ئەمە کاتێ ئەم جیاوازیە هەیە بەڵگە نەبێ- بەڵام ئەگەر هەبێ لەسەر ئەوە کە ئەو عامە تایبەت نەکراوە، وەك، عەقڵ ئەوە دەلالەتی ئەو عامە لەسەر هەموو فەردەکانی دەلالەتێکی بێگومان و قەطعیە، بەڕای هەموویان چ شافعی یاخود حەنەفی وەك: خوابە هەموو شتێك تەواو زانایە، ئەمە عەقڵ رێگە نادات خوا ئاگای لە هەموو شتێك نەبێ، یاخود ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، ئەمەش عەقڵ رێگە نادا خوا هەموو شتێکی دروست کردبێ و بەڵام تۆ بڵێیت هەندێ لەم دروستکراوانەماڵی خوا نین.

(٢)عموم لە ئەفرادا مستەلزمی عمومە بۆ هەموو حاڵێك و هەموو کات و شوێنێك، چونکە ئەفراد بوونیان نیە بەبێ حاڵ و کات و شوێن، هیچ شتێك نیە لە کاتوو شوێن و حاڵەتێکدا نەکرێ، کەوابوو کە خوا دەفەرموێ: هەموو پیاوێکی زیناکەرو ژنێکی زیناکەر هەریەکێ لەوان صەد جەڵدەی لێبدەن، واتە هەر حاڵێکی هەبێ زانابێ یا نەزان بێ، دەوڵەمەندبێ یا هەژار ، وەلەهەر کاتێکدا بێ بەشەو بێ یا بەرۆژ ، بەهار بێ یا هاوین، وەلە هەر شوێنێکدا بێ لە مەککەدا بێ یا لە کوردستان .

وخصّ منهُ المحصَنَ فيرجمُ وقولهُ تعالى : ﴿ ولاتقربوا الزّنى ﴾ اي لايقربهُ كلٌ منكم على اي حالٍ كان وفي ايّ زمانٍ و مكانٍ كان، وقولهُ: ﴿ فاقتلوا المشركينَ ﴾ اي كل مشركٍ على ايّ حال وفي ايّ زمانٍ و مكانٍ كان، وخصّ منهُ البعضُ كأهلِ الذمّة[1] {وعليهِ} اي على الإستلزام {الشيخُ الإمام} والدُ المصنِّف كالإمام الرّازي وقال القرّافي و غيره: العام في الأشخاص مطلقٌ في المذكورات لإنتفاء صيغةِ العموم فيها فما خصَّ به العامُ علة الأوّلِ مبيَّنٌ للمراد بما اطلقَ فيه علىهذا[2]

{مسئلَةٌ:} في صيغ العموم ، {كلّ} وقدْ تقدَّمتْ ، {والذي واللّتي} ، نحو اكرم الذي يأتيكَ، واللّتي تأتيكَ اي كلّ آتٍ وآتية.[3]

---

(١) بەلام ئەم عامە (محصن)ی واتە کەسێ جیماعی حەلالی کردبێ ، لێی جیا دەکرێتەوە و تایبەت دەکرێ، دەبێ بەرد باران بکرێ بە هۆی سوننەتی عەمەلی پێغەمبەرەوە تایبەت کراوە، یا خوا دەفەرموێ: نزیکی زینا نەکەونەوە، واتە هیچ کەس لە ئێوە هەر حالێکی هەبێ زانابێ یانەزان، سێد بێ یا هەربنەمالەبەك بێ، وەلە هەر کات و شوێنێکدا بێ ، یاخود خوا دەفەرموێ: ئەوان شەریك بۆ خوا بڕیاردەدەن بیانکوژن، واتە هەموو موشریکێك لەسەر هەر حالێك بێ وەلەهەر کات و شوێنێك بێ ، بەلام ئەم موشریکە هەندێکی لێ جیارکراوەتەوە، وەك: ئەوانەی پەیمانیان هەیە و جزیە ئەدەن بە ئایەت و فەرمودەی‌تر تایبەت کراوە.

(٢)لەسەر ئەم ئیستیلزامەیە باوکی دانەر، وەك رازیش رای وایە، بەلام قرافی و غەیری قەرافیش دەلێن: عام لە ئەفرادی عامدا لە حالْ و شوێن و کاتدا مطلقە، چونکە ئەگونجێ دەلالەتیشیان لەسەر بکا یا نەکا، تەقیید نەکراوە پێیانەوە چونکە صیغەی عموم لە مانادا نیە، - هەر چەند ئەویش نەی وت: دەلالەتیان لەسەر دەکا، بەلکو وتی: مستەلزمیەتی، جائەوەی پێی ئەوت عام ئەوەی لێدەردەکرد ناوی دەبرد بە (مخصص)، بەلام ئەوەی ناوی ئەبا بە مطلق ئەوەی لێدەرئەچوو ناوی ئەبرێ بە (مبین)، (مخصص)ئیخراجی فەردێك دەکا کە یەقین دخولە، بەلام(مبین) ئیخراجی فەردێك دەکا کە موحتەمەلە، - کەوابوو ئەوەی عامەکەی پێ‌تایبەت کراوە لەسەر قەولی یەکەم ئێستە مبین و رۆشنکەرەوەی مەبەستەکەیە بەو مطلقەی کەتیایەتی لەسەر ئەم رای دووەمە.

(٣)ئەم مەسەلەیە باس لە دیاری کردنی ئەو صیغانە دەکا بۆ عموم و گشتگیرن ، یەکێك لەوانە: ١-کل لەپێشەوە باسەکەی رابورد ٣و٤-الذي و اللتي ، وەك ئەوەی لە پیاو و ژن دێت بۆ لات رێزی‌لێ بنە، واتە هەموو کەسێ.

{واي وما} الشرطيتان والإستفهاميتان و الموصولتان و تقدمتا، واطلقتهما للعلم بإنتفاءِ العمومِ في غيرِ ذلك[1] {ومتى} للزّمانِ إستفهاميةً او شرطيَّة نحو: متى تجيئني، متى جئتني اكرمتُك[2] {واينَ و حيثما} شرطيتينِ للمكانِ نحو: اينَ او حيثُما كنتَ آتِكَ وتزيدُ اينَ بالإستفهام نحو: اينَ كنتَ[3] {ونحوها} كجمع الذي و اللّتي وكمن الإستفهاميّة و الشرطيّة و الموصولة و قدْ تقدَّمَتْ ، وجميعُ القومِ جاءوا ، ونظرَ المصنِّف فيها بأنَّها إنّما تضافُ الى معرفَة، فالعمومُ من المضافِ اليه، ولذلكَ شطبَ عليها بعد ان كتبها عقب كلِّ هنا.[4] وقولُهُ كالأسنوي إنَّ ايّاً ومن الموصولتينِ لايعملانِ مثل مررتُ بأيِّهم قامَو مررتُ بمنْ قامَ اي باللّذي صحيحٌ في هذا التمثيل و نحو مما قامتْ فيه قرينةُ الخصوصِ لامطلقاً.[5]

(١) ٤و٥-(اي و ما) يەك بۆ شەرط بن ياخود بۆ ئامێری پرسيياربن، ميثاليان بۆ ناهێنمەوە چونكە لەپێشەوە رابووردن، دانەر لەپێشەوە وەصفەكەی نەووتن بەرووتی ناوی بردن ، چونكە عموم جگە لە ئيستيفهام و شەرط و مەوصولدا نەبێ نابێ.
(٢)متی يە بۆ كات و زەمانە: ا-ئەبێتە نيشانەی پرسيار وەك: متى تجيئني؟ كەی يەيت بۆ لام؟ ب-يا ئەبێتە شەرطيە وەك هەر كاتێ هاتی بۆ لام رێزت دەگرم.
(٣)٧و٨-اين و حيثما هەردووكيان بۆ جێ و رێــن، نەك شەرطين وەك: لەهــەر جيــێيەك بيت دێمە لات. بەڵام زياد لەوەيش اين ئەبێتە نـيشانەی پـرسياريش وەك لە كوێ بويت؟

(٤)٩-وەك وێنـەی ئەوانە، جەمـعی الذي و اللتي و مەنی ئيستفهامی و شەرطی و مەوصولە، كە هەموويان لەپێشەوە رابووردن ياوەك وشەی جەميع، جا دانەر بيری كردەوە لە وشەی جميع كە ئەبێ هەميشە ئيضافە بكرێ بۆ لای مەعريفە، جـا ئەو عموم و گشتگيريەی تيايـــەتی لە (مضاف اليە)ەكەوە ، وەری ئـــەگرێ نەك خودی خۆی ، لەبەر ئەوە دانــەر قەڵـــەمێكی بەسەردا هێنـاوە و كوژاندويەتيـەوە دوای ئـــەوەی كە نوسيويەتی لەدوای وشەی كل لێرەدا.

(٥)دانەر وەك ئەسنەوی لە جێيەكیتر وتويانە، (اي) مەوصولە و (مــن) مەوصولە بۆ عموم دەست نادەن، ئێســـتە چۆن دەڵێی بۆ عمومن؟ وەك چووم بەلای ئەوەيـــاندا بەپێوە وەستابوو، ئـەم قســـەيان راسـت و دروسـتە لـەم ميسالەو وێنـەی ئەمـــدا، لەوانەی كـــەبەڵگەی تيـادا هەيـە كـــە تايبەتـە -بەڵگـەی ئێرە (مـررت) يـە چونكـە گونجاو نيە چوو بێ بەلای هەمـــوو كەســێكدا- كەوابـــوو كاتێ بۆ عام نابن بەڵگە هەبێ نــەك بە مطلقی بۆ عام نابن.

{للعموم حقيقةً} لتبادُرِهِ الى الذهـــنِ، {وقيلَ للخصوص} حقيقـــةٌ اي للواحدِ في غيرِ الجمعِ والثلاثةِ او الإثنينِ في الجمعِ لأنّهُ المتيقّنُ، والعمـــوم مجازٌ، {وقيـــلَ مشتركةً} بينَ العمومِ والخصوصِ لأنّها تستعملُ لكلّ منهما، وانّ الأصلَ في الإستعمـــالِ الحقيقةُ {وقيلَ بالوقفِ} اي لايدري اهي حقيقـــةٌ في العموم ام في الخصوص ام فيهما[١] والجمعُ المعرَّف باللام نحو: ﴿ قدافلح المؤمـــنون ﴾ او الإضـــافة نحو: ﴿ يوصـــيكم الله في اولادكم ﴾ للـــعموم مالم يتحقّق عهد لتبادره الى الذهن خلافاً لأبي هاشم في نفيه العموم عنه مطلقاً فهو عنده للجنس الصادق ببـــعض الأفراد كما في تزّوجت النساء و ملّكت العبيد لأنّه المتيقّن مالم تكن قرينةٌ على الـــعموم كما في الآيتين[٢]

---

(١)ئەمانـە كـەوتران هـەموويان حەقيقەتـەن بـۆ عمـوم و گشـــتگیری ئـــەبن چونکـە کەوتران گشتگیریەکە زوو بەرەوە ذیهن ئەڕوا ، هەندیچکیش وتویانە حەقیقەتـەن بۆ خصوص وتایبەتمەندیە بەئەفرادیەوە، واتە ئەگەر تایبەت نـەبیٚ تایبەتـە بەیەکـەوە وەئەگـەر جـەمع بـوو تایبەتـە بـەدوو سـیٚوە ، چونکـە ئـەوەیان بیٚگومانـە، بـەلاّم گشتگیریەکەی مەجازە هەندیٚکیش وتوویانە: ئەمانە هـەموویان موشـتەرەکن لە نیٚـوان عموم و خصوصدا چونکە هـەموویان بـۆ هـەردووکیان بـەکار ئـەهیٚنریٚن، ئـەصلیش لەبەکارهیٚنانی لەفظدا ئەوەیە لە حەقیقـەتدا بەکاربـهیٚنریٚ، کۆمـەلیٚکیش وتوویـانە: ئیٚمە هەلویٚستەی تیٚدا دەکەین، واتە نازانریٚ ئـایا ئەم لەفظە عامانە حەقیقەتن لـە عامدا یاخود لە خاصدا، یاخود لە هەردوکیاندا؟

(٢)جەمعیٚك کـەبەهۆی ئـەلیف لامـەوە بوبیٚ بەمـــەعریفە وەك: ..المؤمنون یـاخود بەهۆی ئیضافەوە وەك: ..اولادكم ، ئەوە بۆ عمـــوم ئەبیٚ لەهەرکاتیٚکدا کە مەعهودیٚك بیٚگومان نەبیٚ، بـــۆیە بۆ عمومین چونکە زوو بەرەو ذیهن ئەچیٚ و والـــیٚی حالّی ئەبیٚ ، بەپیٚچەوانەی ئەبو هاشمەوە کە ئەو دەلـــیٚ: هەر عمومی تیٚدا نیە، مـــەعهود هـەبیٚ یانەبیٚ چونکە بەلای ئەوەوە مەعهود بۆ جینس و رەگەز ئەبیٚ، جینسیـــش بەهـەندیٚ ئـەفراد دیٚتـە دی وەك: تزوجـت النســـاء ، خـۆ ژنـانی هـەموو دونـــیای نـــەهـیٚناوە لـە جینسـی ئـەوانی هیٚـــناوە، یـا ئـــەلیٚت: ملكـت العبیـد ، هـەموو بەنـــدەی دونیای نەکردۆتـە کۆیلـەی خـۆی ،هـەندیٚکی نەبـــیٚ چونکـە جینسـەکە بیٚگومانـــە ئەمە هـەموو کـات وایـە بەمـەرجیٚ بەلگـەیێك دروســـت نـەبیٚ لەســـەر عمومیەتی وەك: ئەو دوو ئایەتە.

{و}خلافاً {لإمام الحرمينِ} في نفيِه العمـومَ عنـهُ {إذا إحتمـل معـهودٌ} ، فـهو عنـدَهُ بإحتمالِ العهدِ متَرَددٌ بينَهُ و بينَ العمومِ حتّى تقومَ قرينَـةٌ، امّـا إذا تحقَّقَ عهدٌ صـرفَ إليه جزماً، وعلى العمومِ قيلَ افرادِه مجموعٌ، والأكثرُ آحادٌ في الإثـباتِ و غيرِه، عليـه ائمّةُ التفسيرِ في إستعمالِ القرآنِ نحو: ﴿ واللهُ يحبُّ المحسنين ﴾ اي يثيبُ كلَّ محسنٍ، ﴿ إنَّ اللهَ لايحبُّ الكافرين ﴾ اي كلاً منهم بأن يعاقبَهم، ﴿ ولاتطعِ المكذّبين ﴾ اي كلَّ واحدٍ منهم.[1] ويؤيدُهُ صحَّةُ إستثناءِ الواحدِ منهُ نحو: جاء الرجلُ إلاّ زيداً، ولو كان معناهُ: جاءَ كلُّ جمعٍ من جموعِ الرِّجالِ لم يصحَّ إلاّ ان يكونَ منقطعاً. نعم قدْ تكونُ قدْ تقومُ قرينـةٌ علـى إرادَةِ المجمـوعِ نحـو: رجـال البلـدِ يحملـون الصخـرةَ العظيمَـةَ اي مجموعهم، والأول يقولُ: قامت قرينَةُ الآحاد في الآيات المذكورات و نحوها[2]

---

(١)وەبەپێچەوانـەی ئیمـامی حەرەمـەین کـە دەڵـێ: جـەمعی معـرف ئەگـەر معـهود هەڵگرێ ئەوە بۆ عموم نابێ، چونکە ئەوە بەلای ئەوەوە کە هەڵگری مەعهـودەکەش بێ، ئیتر موشتەرەکە لەنێوان مەعهودو عمومەکەدا، هـەتا بەڵگەیـەك ئـەیبڕێ بەسـەر یەکێکیاندا، بەڵام کاتێ مـەعلوم بوو بۆ مەعهودەکەیـە ئـەوە بێگومـان ئـەدرێ بـەلای ئەودا، بەڵام لەسەر ئەو قەولەی دەڵـێ: جـەمعی معرف بـۆ عمومـە، هـەندێ وتوویانـە ئەفرادی ئەو عمومە جەمعەکانیەتی –کە دەڵــێن: المؤمنون، ئەم دەستەو ئەو دەستە– زۆربـەش دەڵـێن: ئەفرادەکانی هەموو تـاك تاکەکانیـەتی لـە إثبـات و غـەیرە إثبـات دا وایە، لەسەر ئەم رای زۆربەی زانایانە پێشەوایانی تەفسیر لەو عامانەدا کە لەقورئان دا هـاتوون، وەك: خـوا (المحسنين) ی خـۆش دەوێ ، واتـە هــەموو محسنێك پـاداش ئەداتـەوە، یـاخود بێگومـان خـوا (الکـافرین)ی خـۆش نـاوێ ، هـەموو تاکـە کـافرێکی خـۆش نـاوێ، واتـە تۆڵـەی لێ ئەسـێنێ، گوێڕایـەڵی (المکذبین)مەکـە ، واتـە هـەموو یەکێکیان.

(١)ئەم قەولە بەهێز دەکا دروستە إستثنا کردنـی فەردێك لـە جـەمعی معرف بەئەل، وەك: جـاء الرجـالُ إلاّ زیـداً ، ئەگـەر عامەکـە مـەجموع بوایـە ئەبوایـە بوترایـە ....إلا زیدون، ئەگەر مانای ئەو میثالە هەموو جەمعێك لـە دەسـتە جـەمعی پیـاوان هـاتن، دروست نەئەبوو مەگەر مستثنای منقطع بێ، واتە الا بەمانا لکن بێ ، بەڵێ کەم جارێ بەڵگە ئەبێ لەسـەر ئـەوەی کەمەبەست بەو عامـە مـەجموع و دەسـتەیەکە، رجال البلـد یحملـون الصخـرةَ العظیمَـة ، واتـە کۆمـەڵێك لـە پیـاوانی شـار ئـەو بـەردە گەورەیـە هەڵدەگرن، وشەی العظیمَةَ قەرینەیە لەسەر ئەوە کە ئەو بەردە بەکۆمـەڵێك هـەڵدەگیرێ نەك بەیەك کەس ، ئەی قەولی یەکەم ئەو هەموو ئایەتانە چۆن لێك دەداتەوە؟ دەڵێ:

{والمفردُ المحلّى} باللام {مثلَهُ} اي مثلُ الجمعِ المعرَّفِ بها في انَّهُ للعموم مالم يتحقّق عهدٌ لتبادُرِهِ الى الذّهنِ نحو: ﴿ واحلَّ اللهُ البيعَ ﴾ اي كلَّ بيعٍ، وخصَّ منهُ الفاسدَ كالرِّبا.[1] {خلافاً للإمام} الرازي في نفيِهِ العمومَ {مطلقاً} فهو عندَهُ للجنس الصّادقِ ببعضِ الأفرادِ كما في لبستُ الثوبَ، وشربتُ الماءَ لأنهُ المتيقّنُ ما لم تقم قرينةٌ على العمومِ كما في: ﴿ إنّ الإنسانَ لفي خسر إلاّ الذينَ آمنوا ﴾[2] {و}خلافاً {لإمام الحرمين والغزالي} في نفيهما العمومَ عنهُ، {إذا لم يكن واحدةٌ بالتاء} كالماء، {زادَ الغزالي أو تميَّز} واحدةٌ {بالوحدَة} كالرجلِ إذ يُقالُ رجلٌ واحدٌ فهو في ذلك للجنس بالصادقِ بالبعضِ نحو: شربتُ الماءَ و رأيتُ الرجلَ ، ما لم تقمْ قرينةٌ على العمومِ نحو: الدينار خيرٌ من الدرهم، اي كلَّ دينارٍ خيرٌ من درهم[3]

---

قەرینەهەیە کە مەبەست لەو عامانەدا کەلە ئایەتەکاندایە، : هەموو کەسێکە، هەروەها وێنەی ئەو ئایەتانەش. (١)ئەگەر موفرەد ئەلیف لامی بەسەرەوە بوو هەروەك جەمعی معرف بەئەلە، لەوەدا کە ئەمیش بۆ عموم و گشتگیریە، ئەمەش کاتێ ئەبێ کە بیچگومان بۆ ئەلەکە عەهد نەبێ، چونکە مانای گشتگیریەکە زوو بەرەو ذیهن دەڕوا، وەك ﴿ احلَّ اللهُ البیعَ ﴾ خوا هەموو کڕین و فرۆشتنێکی حەڵاڵ کردووە، بەڵام بەهۆی چەند ئایەت و فەرموودەی تر ئەم عامە تایبەت کراوە، هەندێ کڕین و فرۆشتن هەیە بەتاڵە وەك سوو.

(٢)جیاوازە لەگەڵ رای ئیمامی رازیدا، چونکە ئەو بە مطلقی نەفی عمەومی لێدەکات، -واتە تێی پێوە بێ یان تێی پێوە نەبێ، قەرینە هەبێ لەسەر عمومیەت یا نەبێ- ئەلیف لامی سەر موفرەد بەلای ئەوەوە هەر بۆ جینسە کە بەهەندێ ئەفراد دێتە دێ، وەك لە میثالی لبست الثوب ، واتە هەندێ جل و بەرگم پۆشی، یا شربت الماء ، واتە: هەندێ ئاوم خواردەوە، نەك هەرچی ئاوی دنیا هەیە هەمووم خواردەوە، چونکە ئەو کەمەیە بیچگومان هاتوەتە دێ، بەڵام ئەمەش کاتێ بۆ جینسە بەڵگە نەبێ لەسەر ئەوە کە بۆ عموم و گشتگیریە وەك: إنّ الإنسانَ ... ئێستە چونکە ئیستثناء لێکراوە مانای وایە ئینسان بۆ گشتگیریە بەو عامە.

(٣)جیاوازیش بۆ رای ئیمام الحرمین و غەزالی کە هەردووکیان نەفی عمومیان کردووە لێی کاتێ کە بەپیتی تێی تایبەت نەکرێ بە موفرەدەوە وەك: الماء موفرەدەکەی مائة نیە، غەزالی زیاد لەوەش دەڵێ یا موفرەدەکەی جیابکرێتەوە بە لەفظی واحد، وەك: الرجل چونکە دەوترێ: رجل واحد، کەوابوو ئەو عامە موفرەدەکەی بەتێ نەبێ و بەواحدیش تایبەت کرێ، بە موفرەدەوە، ئەلیف لامەکەی بۆ

وكان ينبغي ان يقولَ و تميّزَ بالواوِ بدل او ليكونَ مقيّداً فيما قبلَهُ فإنّ الغزالي قسّم ما ليس واحدَهُ بالتّاءِ الى ما يتميّزُ واحد بالوحدةِ فلا يعمُّ والى ما لايتميّزُ بها كالذهَبِ فيعمُّ كالمتميّزُ واحدهُ بالتاءِ كالتمرِ في حديثِ الصحيحينِ (الذهبُ بالذهبِ رباً إلاّ هاءً و هاءً، والبرُّ بالبُرِّ رباً إلاّ هاءً و هاءً، والشعيرُ بالشعيرِ رباً إلاّ هاءً و هاءً، والتمرُ بالتمرِ رباً إلاّ هاءً و هاءً)وكان مرادُ إمام الحرمين حيثُ لم يمثّل إلاّ بما يتميَّزُ واحدةٌ بالوحدةَ ماذكرَهُ الغزالي، امّا إذا تحقَّقَ عهدٌ صرفِ إليهِ جزماً[1] والمفرَدُ المضافُ الى معرفةٍ للعمومِ على الصّحيحِ كما قالَهُ المصنِّف في شرحِ المختصَرِ يعني مالم يتحقّق عهدٌ نحو: ﴿ فليَحذرِ الذينَ يخالفون عن امرِهِ ﴾ اي كلِ امر الله و خصَّ منهُ امرُ النَّدبِ[2]

---

جینس دەبێ کە بەهەندێکیش هەر دێتە دی، وەك: شربتُ الماء يا رايت الرجل، ئەمەش کاتێك کە قەرینەیەك نەبێ بیبڕێ بەسەر عومودا، وەك: الدينارُ خيرٌ من الدرهم ، واتە هەموو میثقاڵێکی ئاڵتون لەهەموو میثقاڵێکی زیو باشترە، کە قەیدەکە قیمەتی زۆری ئاڵتونەکەیە.

(١)چاك وابوو دانەر لەباتی(او تميّزَ)ی بیوتایە:(وتميَّزَ)، بۆ ئەوەی بکرایە بە مەرجی دووەم بلکایە بەمەرجی پێشەوە ، چونکە غەزالی ئەو موفرەدەی بەتێ نەبێ ئەیکا بەدوو بەشەوە: ١-ئەوەی کە موفرەدەکەی بە واحد جیا دەکرێتەوە، وەك رجل ئەوە گشتگیر دەبێ. ٢-ئەوەیە کە موفرەدەکەی بە لەفظی واحد جیاناکرێتەوە وەك،ذهب، ئاڵتون، وەك: تمر لەم فەرموودەدا بوخاری و مسلم ریوایەت دەکەن، فرۆشتنی ئاڵتون بە ئاڵتون سودە مەگەر دەست بەدەست نەبێ،گەنم بەگەنم فرۆشتن سووە مەگەر دەست بەدەست نەبێ، جۆ بەجۆ سووە مەگەر دەست بەدەست نەبێ، خورما بە خورما سووە مەگەر دەست بەدەست نەبێ،وادەردەکەوێ إمام الحرمين بەوەی کە تەنها میثالی بۆ ئەوە هێناوەتەوە موفرەدەکەی بە لەفظی واحد جیائەکرێتەوە وە مەبەستی ئەویش هەر وەك ئەوەی غەزالی وابووە، بەلاّم ئەگەر عەهدیەتی ئەلەکە بێگومان بێ، ئەوە ئەبڕێ بەسەر عەهدکەدا بۆ عەهد دەبێ.

(٢)بەلاّم مەفرەدێك بەهۆی ئیضافەوە بۆ لای ئیسمێك مُعرفە بکرێت بەلای قەولی صەحیحەوە ئەویش بۆ عموم و گشتگیری ئەبێ، وەك دانەر لە شەرحی (المختصر)دا وتوویەتی، بەلاّم بەمەرجێ بۆ عەهد نەبێ، وەك ئەوانەی سەرپێچی لە هەموو فەرمانێکی خوا دەکەن، بابترسن ، امره، واتە هەموو فەرمانێکی، ئەی چی ئەکەی لەو ئەمرانەی بۆ نەدبن ، خۆ نەکردنیان تۆڵەی بەدواوە نیە؟ ئەو عامە تایبەت کراوە بەو ئەمرانەی کە تەنها بۆ وجوبن، کەوابوو ئەو ئەمرانەی بۆ نەدبن لێی دەرکراوە.

{والنَّكرَةُ في سياقِ النفي للعمومِ وضعاً} بأنْ تدلَّ عليهِ بالمطابقَةِ كما تقدَّمَ من انَّ الحكمَ في العامِ على كلِّ فردٍ مطابقَةً {وقيلَ لزوماً، وعليهِ الشيخُ الإمام} والدُ المصنِّف كالحنفيَّةِ نظراً الى انَّ النفي اولاً للماهيَّةِ، ويلزَمهُ نفي كلِّ فردٍ فيؤخرُ التخصيصُ بالنيَةِ[1] {نصاً إن بنيت على الفتحِ} نحو: لارجل في الدَّارِ {وظاهراً إن لَم تُبن} نحو: ما في الدّار رجلٌ ، فيحتملُ نفي الواحدِ فقط، ولو زِيدَ فيها من كانتْ نصاً ايضاً كما تقدَّمَ في الحروفِ انَّ من تأتي لتخصيصِ العمومِ[2]

---

(١)بەلام نكیرەیەك لەدوای نەفیەوە بێت ئەوەش بۆ عموم و گشتگیریە، هەر لە روی وەضعەوە واتە هەر بۆ ئەوە دانراوە، بەم شێوە پڕاو پڕ دەلالەت بكا لەسەری ، چونكە لەپێشەوە رابوورد كە: حوكم لەلەفظی عام و گشتگیر دائەبڕێ بەسەر هەموو فەردێكیا پڕاوپڕ، هەندێك وتوویانە دەلالەتەكە دەلالەتی لزومی یە نەك مطابقی. چونكە نەفی جینس دەكا، ئەویش فەردی بەرناكەوێ، چونكە فەرد نیە بێ جینس بێ ، دەخۆ نەفی جینسەكەی كردووە، كەوابوو هەموو فەردێكیشی نەفیكردووە، باوكی دانەر وەك حەنەفیەكان رایان لەسەر ئەوەیە كە لزومەنە، نەك مطابقەتەن ، لەبەر ئەوە وایان وتووە، چونكە بیریان بۆ ئەوە چووە كەیەكەم جار نەفی لە ماهیەت ئەكرێ، كەنەفی ماهیەتیش كرا لازمیەتی نەفی هەموو فەردێكیش كرابێ، كەوابوو لەسەر بۆچوونی قەولی یەكەم كە ووتی: وضعاً دەلالەت لەسەر عموم ئەكا، تایبەت كردنی ئەو عمومە بەهۆی نیەتەوە دروستە، بلێ: طەلاقم كەوتبێ ماجائنی احد ، مەبەستم پێی زەید بوو، بەلام بەلای قەولی دووەمەوە دروست نیە، چونكە نەفی خودی ماهیەتەكەی كراوە ، كەوابوو نەفی هەموو فەردێكیش كراوە.

(٢)جا نەكرە لەدوای نەفیەوە بۆ عموم دەبێ، دەلالەت كردنی لەسەر عموم یا نەصا دەبێ، -واتە قبولْ ناكا بۆ عام بێ ئیحتمالی عدم القبول نیە-ئەگەر ئەو نەكیرەیە مەبنی بێت لەسەر فەتحە وەك: لارجلَ فی الدّار، چونكە متضمنی (مَنْ)ی ئیستغراقیە، یاخود ظاهراً دەلالەت لەسەر عموم دەكا، كاتێ مەبنی نەبێ لەسەر فەتحە : مافي الدّارِ رجلٌ. ئەمە هەڵئەگرێ ظاهراً، - واتە ئیحتمالی عدم العموم هەیە - تەنها نەفی یەك كەس ئەكاو بەس، بەلام ئەگەر (من)ی تیا زیادبكرێ دووبارە ئەبێتەوە بە نصاً دەلالەت لەسەر عموم بكا ، چونكە لەپیشەوە رابوورد لەباسی حەرفەكاندا كە (من) جار جارێ دێ بۆ ئەوەی عامێك تایبەت بكا بەعامەوە.

قالَ إمامُ الحرمـينِ: والنَّكرةُ في سياقِ الشرطِ للعموم نحـو: منْ يـأتيني بمـالٍ اجـازه، فلايختصُّ بمـالٍ، قـال المصنِّـف: مـرادُهُ العمومُ البـدلي لا الشـمولي اي بقرينَـةِ المثـالِ، واقولُ وقدْ تكونُ للشموليِّ نحـو: ﴿ وإنْ احدٌ مـن المشـركينَ إستجاركَ فأجِرهُ ﴾ اي كلَّ واحدٍ منهم.[1] {وقدْ يعمُّم اللفظُ عرفاً كـالفحوى} اي مفـهوم الموافقـةِ بتسـميةِ الأولى والمساوي على قولٍ تقدَّمَ نحو: ﴿ فلا تقُلْ لهما افٍّ ﴾﴿ إنّ الذينَ يأكلون أموالَ اليتامى ....الآية﴾ قيل: نقلهما العرفَ الى تحريمِ جميعِ الإيذائاتِ و الإتلافاتِ ، وإطلاقُ الفحوى على مفهوم الموافقة بقسميهِ خلافَ ما تقدَّم انَّهُ لـلأولى منـهُ صحيحٌ ايضـاً كما مشـى عليهِ البيضاوي[2]

(١)ئیمـامی حەرەمـەین وتوویـەتی: نەکرەش لـەدوای شـەرطەوە هـەر بـۆ عمـوم دەبـێ وەك: هـەر کەسـێ بەمـەرجێ هـەر جـۆرە مـاڵێکم بـۆ بـهێنێ، ئـەوە منیـش پاداشـتی ئەدەمەوە، ئەوە ئەو ماڵە تایبەت ناکرێ بە ماڵێکی تایبەت کراوەوە، دانەر وتوویـەتی: مەبەستی ئیمام الحرمین نەکرە لەدوای شەرطەوە بۆ عموم دەبێ، عمومێك کە عەمەمی بەدەلی بێت –واتە ئەم نا ئەو– نەك شمولی واتـە مەبەسـت بەماڵەکە ئەوەنیـە، هـەرچی پێی ئەڵێن ماڵ بیهێنێ، بەڵکو مەبەست یانی هەر ماڵێك واتە میثالەکە خۆی قەرینەیە لەسەر ئەوە کە مەبەست هەموو ماڵێك نیە، بەڵام من دەڵێم جاری واهەیەئەو نەکیرەی دوای شەرطەوە بۆ شمول دەبێ، وەك ئەگەر هـەر کەسێك یاخود هـەر موسـوڵمانێك یا موشریك پـەنای هێنـاو داوای پـەنای کرد پـەنای بدە، واتـە هـەر کەسێك بـێ یـاخود هەموو موشریکەکان بن.

(٢)کـەم جـارێ لـەفظ ئـەبرێ بەسـەر عـام و گشـتگیریدا لـە روی عورفـەوە نـەك لـەڕوی لوغـەوە ، وەك: فحـوی واتـە هـەر دوو بەشـەکەی مەفـهومی موافقـە:١–ئەولایـە ٢– المساوی لەسەر قەولێك کە لەپێشەوە رابوورد کە وتی: دەلالەتەکە لەفظیە نەك عـەقلی وەك: نەکـەیت بـەباوك و دایکـت بڵێـی: ئـۆف، مەفـهومی موافقـەی ئـۆف ئازاردانیانـە، یاخود دەفەرموێ: ئەوانەی ماڵی هەتیوان دەخۆن...، مەفهومی موافقەکەی لـەنابردنی ماڵی هەتیوانە، بەهەر جۆر هەبێ هەندێك وتوویانە: لەپێشا دانراوە بۆ حەرامی ئۆف و خواردنـی مـاڵی هـەتیو ئـەمجا عـورف نـەقڵی کـردوون بـۆ حـەرام کردنـی هـەموو جـۆرە ئازارو ماڵ لـەناوبردنێك، بڕینـی وشـەی فحـوی بەسـەر هـەردوو بەشـەکەی مەفـهومی موافقـەدا صـەحیح و دروسـتە دووبارە هەرچەند جیـاوازە لەگـەڵ ئـەوەی پیشـەوە کـە رابوورد، کـەوترا فحـوی هـەر بـۆ اولی دەبـێ، چونکـە بیضـاوی لەسـەر ئـەم قەولەیـە ڕۆیشتووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.

﴿ وحرِّمتْ عليكم امّهاتُكم ﴾ نقلَهُ العرفُ من تحريم العينِ الى تحريم جميع الإستمتاعات المقصودَةِ من النّساءِ من الوطءِ و مقدماتِهِ و سيأتي قول إنّهُ مجملٌ[1]

{او عقلاً كتركيبِ الحكمِ على الوصفِ} فإنَّهُ يفيدُ عليَّةَ الوصفِ للحكمِ كما سيأتي في القياسِ فيفيدُ العمومَ بالعقلِ على معنى انَّهُ كلّما وجدتْ العلّةُ وجدَ المعلول مثالُ اكرم العالم إذا لم يجعل اللاّم فيهِ للعمومِ ولا عهدٍ[2] {وكمفهوم المخالَفةِ} على قول تقدَّمَ انَّ دلالَةَ اللّفظِ على أن ماعدا المذكور بخلافِ حكمهِ بالمعنى المعبّرِ عنهُ هنا بالعقل وهو انَّهُ لو لم ينفِ المذكور الحكم عن ماعداهُ لم يكنْ لذكرِهِ فائدة، كما في حديثِ الصحيحينِ (مطلُ الغنيِّ ظلمٌ) اي بخلافِ مطلِ غيرِهِ[3]

---

(١)هەروەها لەفظی کەعورف بیبڕێ بەسەر عامدا وەك: دایکەکانتان حەرام کراون لەسەرتان ، عورف نەقلّی حەرامی خودی دایکەکانی کردووە بۆ هەموو ئەو لەزەتانەی کە پیاو لەژنی ئەوێ، وەك خۆبەسەردادان و پێشەکیەکانی،لەمەودوا قەولێکیش دێ کە دەڵێ: ئەو لەفظەی (امهات) ە لەفظێکی مجملە.

(٢)یاخود جاری واهەیە لەفظەکە ئەبڕێ بەسەر عام و گشتگیریدا، لەڕوی عەقڵەوە عەقڵ ئەیبڕێ بەسەریا، وەك بەرپا بوونی حوکمێك بەهۆی وەصفێکەوە، ئەوە ئەو تەرتیبە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو وەصفە هۆی دروست بوونی حوکمەکەیە، وەك لەمەودوا لەباسی قیاس دا باس دەکرێ و دەڵێ: لەفظەکە خۆی عموم ناگەیەنێ بەڵکو عەقڵ خۆی ئەیبڕێ بەسەر عمومدا، بەم شێوە هەرکات هۆکە پەیدا ببێ هۆکارەکەش دێتە بوون، وەك: اکرم العالم صیفەتی هەرکەسێ ببێ ڕێزی لێبنە، ئەمەش کاتێ وایە ئەلەکەی بۆ عموم نەبێ چونکە ئەو کاتە دەلاڵەت کەرەکەی لەسەر لەفظی عموم لەفظی لوغەوی ئەبێت نەك عەقڵی، وە بۆ عەهدیش نەبێ چونکە ئەگەر بۆ عەهد بێ لەڕووی لوغەوە بۆ عام دەبێ وە لەڕووی عەقڵەوە.

(٣)جاری واهەیە عەقڵ لەفظەکە عام دەکاتەوە، وەك لە ئەفرادی مەفهومیموخالەفە، لەسەر ئەو قەولەی لەپێشەوە رابوورد، کە لەفظەکە دەلاڵەت دەکا لەسەر ئەوەی ئەو صیفەتەی نەبێ حوکمەکەی جیایە، ، ئەم دەلاڵەتە بەمانا ئەزانرێ، مانا واتە بە عەقڵ دەزانرێ، کە لێرەش مانامان بە عەقڵ لێداوەتەوە، ئەو مانایەش ئەوەیە:ئەگەر هێنانی ئەو صیفەتە بۆ نەفی کردنی غەیری خۆی نەبێ، هێنان و باسکردنەکەی سودێکی نەبوو، وەك لەم فەرموودەدا بوخاریو مسلم ریوایەتی دەکەن: کەسێ دەسەلاتی هەبێ و قەرز دوابخا لەکاتی خۆی ئەوە ستەمە واتە کەسێ دەسەلاتی هەبێ و قەرز دوابخا لەکاتیخۆی ئەوە ستەمە واتە:کەسێئەگەر دوای بخا لەبەر هەژاریئەوە ستەم نیە.

{والخلافُ في انَّهُ} اي المفهوم مطلقاً {لاعمومَ لهُ لفظيّ} اي عائدٌ الى اللّفظِ او التسميّةِ اي هل يسمّى عاما او لا، بناءً على انّ العموم من عوارض الألفاظِ و المعاني، او الألفاظِ فقط و امّا من جهَةِ المعنى فهو شاملٌ لجميع صور ماعدا المذكورِ كما تقدَّم من عرفٍ، صار بهِ منطوقاً او عقل[1] {و}الخلافُ {في انّ الفحوى بالعرفِ و المخالَفة بالعقلِ تقدَّمَ} في مبحثِ المفهوم، نبَّهَ بهذا على انّ المثالينِ على قولٍ ولو قال بدلَ هذا فيهما على قولٍ كما قلتُ كان اخصر و اوضح[2] {ومعيارُ العلومِ الإستثناءُ} فكلُّ ماصحَّ الإستثناءُ منهُ مما لاحصرَ فيهِ فهو عامٌ للزومِ تناولهِ للمستثنى وقدْ صحَّ الإستثناء من الجمع المعرَّف و غيرهِ مما تقدَّمَ من الصيَغِ نحو: جاء الرِّجالُ إلاّ زيداً، وفي نفي العمومِ فيها يجعلُ الإستثناءَ منها قرينةً على العمومِ[3]

---

(١)ئەو جیاوازیەی هەیە لەناو زانایاندا ئایا مەفهوم عمومی بۆ هەیە یانە؟ ئەم جیاوازیە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە جیاوازییەکی لەفظیە، یاخود بۆ ناونانەکەی ، واتە ئایا مەفهوم ناو ئەبرێ بەعام یا نە؟ ئەم جیاوازیە لەسەر ئەمە دروست بووە کە ئەگەر عموم و گشتگیری یەکێك بێ لە عەوارض و پەیدا بووەکانی لەفظ و مانا ئەوە ناوئەبرێ وە ئەگەر تەنها لەپەیدا بووەکانی لەفظ بێت، ئەوە ناو ئەبرێ، چونکە مەفهوم لەبەشی مانایە ئەم جیاوازیە کاتێ ئەبێ کەروو لەلەفظ بکا ، بەڵام لەڕووی ماناوە ئەو مەفهومە گشتگیرە بۆ هەموو ئەفرادی هەموو میثالێك جگە لەو صیفەتە نەبێ کە باس کراوە-مطل الغنيّ ظلمٌ- جگە لە غەنی نەبێ هەرچی صیفەتی تر هەیە مەفهومەکە ئەیگرێتەوە کە ئەیشی گرێتەوە بە هۆی ئەوەی کەڕابوورد، کە وتمان لەفظەکە عمومی لێئەگیرێ لەڕووی عورفەوە، هەرچەند بەهۆی عورفەکەوە مەفهومەکە ئەبێ بە مەنطوق، یاخود گشتگیریەکەی بەهۆی عەقڵەوە دەبێت.

(٢)ئەو جیاوازیەکە پەیا بوو لەوەدا کە گشتگیری لە فحوی و مەفهومی موافقەدا عورف پەیدای کردووە بۆیە لێرەدا وتراوەتەوە ئاگاداری فێر خواز دەکاتەوە کە قەولێك وتوویەتی: دەلالەتی لەفظ لەسەر فحوی بە عورفە، وەقەولێك وتوویەتی: دەلالەت لەسەر مەفهومی مخالف بە عەقڵە، ئەگەر دانەر لەباتی: إنَ الفحوى بالعرف... الخ لە هەردوکیاندا: واتە لەفحوی و مفهومیمخالفەدا بیووتایە:علی قولٍ، وەك:من لە شەرطەکەیدا بۆم زیاد کردووە کورتتر و رونتریش بوو چونکە ئەوەی کەوتی:علیقولٍ لاوازی ئەگەیەنێ، بەڵام لەودا علی قولٍ نەوت هێزێك ئەگەیەنێ. (١)ترازوی عمومی لەفظ بریتیە لە دروست بوونی ئیستثناء تیایدا، کەوابوو هەر شتێك ئیستثنای تیا دروست بێ ئەوە عامە و گشتگیرە، بەمەرجێ حصر و چواردەور نەدرابێ، چونکە

ولمْ يصحَّ الإستثناءُ من الجمعِ المنكّرِ إلاّ انْ تخصَّصَ فيعمَّ فيما يتخصَّصُ بهِ نحو: قامَ رجالٌ كانوا في داركَ إلاّ زيداً منهم، كما نقلهُ المصنِّف عنِ النّحاةِ، ويصحُّ جاء رجالٌ إلاّ زيدٌ بالرفعِ على انّ صفةً بمعنى غير كما في: ﴿ لو كانَ فيهما آلهةٌ إلاّ الله لفسدتا ﴾[1] {والأصحُّ انّ الجمعَ المنكّرَ} في الإثباتِ نحو: جاءَ عبيدٌ لزيدٍ {ليسَ بعامٍ} فيحملُ على اقلِّ الجمعِ ثلاثةٌ، انّ إثنينِ لأنّهُ المحقّقُ، وقيلَ: انّهُ عامٌ لأنّهُ كما يصدُقُ بما ذُكرَ يصدُقُ بجميعِ الأفرادِ و بما بينَهما، فيحملُ على جميعِ الأفرادِ و يستثنى منهُ اخذاً بالأحوطِ، مالم يمنع مانعٌ،كما في رايتُ رجالاً فعلىاقلِّ الجمعِ قطعاً[2]

---

مادام ئیستثنای تیایە مانای وایە گشتگیرە و مستثناکەش دەگرێتەوە، بۆیە ئیلا جیای دەکاتەوە، ئیستثناء لە جەمعێك کە ئەلیف لامی پێوە بێ دروستە وە هەروەها لە هەموو ئەو لەفظانەی بۆ عامن، وەك: جاء الرجال إلاّ زیدا، الرجال مانای وایە زەیدیش دەگرێتەوە بۆیە (إلاّ)لێی دەردەکا، بەڵام ئەوانە ئەڵێن هەموو لەفظەکانی عموم ئەصلەن بۆ عموم دانەنراون، بەڵکو ئیستثنا لێکردنەکەی دەلالەت لەسەر ئەوە دەکا کە ئێستە بۆ عموم بەکار هاتوون،

(١)بەڵام جەمعێك کە نەکیرە بێ ئیستثنای لێدروست نیە، چونکە عام نیە مەگەر تایبەت بکرێ، جا کە تایبەت کرا بەڵام هەر عامە بۆ هەموو ئەوانەی کە عامەکەی تایبەت کردووە، وەك: قام رجالٌ كانوا فی دارك إلاّ زیداً منهم، ئێستە رجال تایبەت بووە بەوانەی کەلە ماڵی تۆدان، بەڵام هەر عامە بۆ هەموو ئەوانەی کە لە ماڵی تۆدان، چونکە دانەر وای نەقڵ کردووە لە زانایانی نەحوەوە، دروستیشە بڵێیت: جاو رجالٌ إلاّ زید بەرەفعەی زەیدەکەی، چونکە إلاّ لێرەدا لەجێی غەیرەو صیفەتە، وەك: ﴿ لو كانَ فیهما آلهةٌ إلاّ الله لفسدتا ﴾ ئەم إلاّ بەمانا غەیرەو صیفەتە بۆ ئالهەکە.

(٢)قەولی ئەصح ئەوەیە کە جەمعی نەکیرە لە ئیثباتدا وەك: عبید عام و گشتگیر نیە، کەوابوو ئەبرێ بەسەر کەمترین ئەفرادی جەمعدا، کە سێیەو دوو، چونکە بێگومان ئەوە ئەگرێتەوە، هەندێکیش وتوویانە:جەمعی نەکیرە لە ئیثباتدا بۆعموم و گشتگیریە، چونکە وەك چۆن کەمترین ئەفرادی جەمع ئەگرێتەوە، هەموو ئەفرادەکانیش دەگرێتەوە ئەوەش لە نێوان کەمترو هەموویاندا هەر دەیگرێتەوە، کەوابوو ئەبرێ و ئەدرێ بەسەر هەموو ئەفرادەکانیدا، و ئیستثنای لێدەکرێ، بۆیە ئەیبرێ بەسەر هەموویاندا چونکە ئەمە هەموویان دەگرێتەوە پارێزترە بۆ هەموان، بەمەرجێ هیچ شتێ نەبێ رێی لێبگرێ، وەك لەم میثالەدا کە دەڵێ: رایت رجالاً ، ئەوە بێگومان ئەبرێ و ئەدرێ بەسەر کەمترین لە ئەفرادی جەمعدا، چونکە ناکرێ هەرچی

{و}الأصحُ {أنَّ اقلَّ مسمَّى الجمع} كرجال و مسلمين {ثلاثةٌ لا إثنان} فهو القول الآخر و اقوى ادلّتَهُ: إن تتوبا الى الله فقدْ صغتْ قلوبكما اي عائشة و حفصة و ليس لهما الأقليان[1] واجيبَ بأنّ ذلك ونحوه مجازٌ لتبادُرِ الزائدِ على الإثنينِ دونهما الى الذّهنِ والدّاعي الى المجازِ في الآيَة كراهةَ الجمع بينَ تثنيتينِ في المضاف و متضمّنه و هما كالشّيئِ الواحدِ ، بخلاف نحو: جاء عبداكما[2] ويُبنى على الخلاف ما لو اقرأ و اوصى بدراهم لزيدٍ و الأصحُ انّهُ يستحقُّ ثلاثةٌ لكن ما مثّلوا به من جمعِ الكثرَةِ مخالفٌ لإطباقِ النّحاةِ على انّ اقلّهُ احد عشر فلذلك قال المصنّف: الخلافُ في جمع القلّة. وشاعَ في العرفِ إطلاقُ دراهمَ على ثلاثة كما قال الصفيّ الهنديّ، الخلافُ في عمومِ الجمعِ المنكرِ في جمعِ الكثرَةِ[3]

---

پیاوی دنیایە هەمووی ببینیْ. (١)قەولی اصح و راست تر ئەوەیە کە کەمترین ژمارە ناو دەبریْ بە جمع، وەك رجال و مسلمین، ژمارەی سێیە، نەك دوو کە ئەویش قەولێکیترە، بەهێزترین بەڵگەی ئەو قەولە کە دەڵێ: دوانە ئەم ئایەتەیە: ئەگەر هەردووکتان بگەڕێنەوە بۆ لای خوا قەبولْ دەکرێن، چونکە دڵەکانتان لایان داوە، وەك: عائشەو حفصە دەخۆ ئەوانیش هەردوو دڵیان هەیە نەك قلوب.

(٢)وەڵامی ئەو بەڵگەی قەولە دراوەتەوە کە: ئەوەو وێنەی ئەو مەجازن -بەهۆی وتنی جوزئو مەبەست پێی کوللە، واتە قلوب مەبەست پێی عائیشەو حەفصەیە، یاخود بەهۆی شوبهاندنی دوانە بە جەمعەوە- چونکە کەوترا قلوب ئازاو زوو بەزوو زیاتر لە دوو دێت بە مێشکی بیسەردا، نەك دوان بەڵام ئێستە بۆ دوانە، کەوابوو مەجازە، ئەوەش وادەکات ببرێ بەسەر مەجازدا لەم ئایەتەدا ئەوەیە کە: مرۆڤ پێی ناخۆشە شتیْ ببیستیْ دوو (تثنیة) کۆبکرێنەوە لە نێوان مضاف و مضاف الیەیەکدا کە مضافەکە جوزئێك بیْ لەمضاف الیەیەکە، هەردوکیان وەك یەك شت وان ، بەڵام ئەمە جیاوازە لەگەڵ جاء عبداکما چونکە مضافەکە جوزئێك نیە لەمضاف الیەیەکە بەڵام دڵ بەشێکە لە مرۆڤ.

(٣)ئەم جیاوازیە بەرپا دەبیْ لەم میثالەدا کە ئەگەر کەسیْ دان بنیْ یان وەصیەت بکا بە دراهم، بۆ زەید ژمارەکەی دیاری نەکا ئایا چەندی پیْ دەدریْ؟ قەولی ئەصح ئەوە شایستەی سیْ درهەمە بەڵام قەولەکەیتر دەڵیْ: دووان ، بەڵام ئەو جەمعانەی وینەیان پیْهێنانەوە بۆ عامن هەمویان، ئەمەش سەرپێچیە بۆ هەموو زانایانی نەحو کە یەکران و دەڵێن: ژمارەی هەرە خواری (جمع الکثرة) بریتیە لە یانزە، بۆیە دانەر فریای ئەمە کەوتوەو دەڵێ: ئەم جیاوازیە لەباسی عامدا لە (جمع القلة)دا ئەبیْ ، لە

{و}الأصحّ {انَهُ} اي الجمعُ {يصدُقُ على الواحِدِ مجازاً} لإستعمالهِ فيهِ نحـو: قـولِ الرَّجُلِ لإمرأتهِ وقدْ برزتْ لرجلٍ اتتبرجينَ للرجالِ؟ لأستواءِ الواحدِ و الجمعِ في إستواءِ التبرُّجِ لهُ، وقيلَ: لا يصدُقُ فيهِ ولمْ يستعملْ فيهِ ، والجمعُ في هـذا المثالِ على بابِهِ لأنَّ من برزتْ لرجلٍ تبرُزُ لغيرِهِ عادةً[1]

{والأصحُّ تعميمُ العامِ بمعنى المدحِ والذمِّ} ، بأن سيقَ لأحـدهما {إذا لم يُعارِضُهُ عامٌ آخر} لمْ يسقْ لذلك، إذا ما سيقَ لهُ لايُنافي تعميمَهُ، فإنْ عارَضَهُ العام المذكور لمْ يعُمْ فيما عورِضَ فيهِ جمعاً بينهما ، وقيلَ: لايَعمُّ مطلقاً لأنَهُ لم يسُقْ للتعميم[2] {وثالثها يعمُّ مطـلقاً} كغيره و يُنظرُ عنـد المـعارَضَة الى المرجّـح مثالُـهُ ولامـــعارضَ ﴿ إنَّ الأبرارَ لفي نعيم وإنّ الفجّارَ لفي جحيم ﴾[3]

---

عورفدا بلاوه كه دراهم ئەبڕێ بەسەر سێشدا، وەك الصفی الهندی دەڵێ: ئەم جیاوازیە لەعمومی جەمعی نەكره یەكدا دەبێ كه (جمع الكثرة) بێ.

(١)قەولی ئەصەح ئەوەیـە كـە جـەمع لـەڕوی مـەجازەوە ئـەبڕێ بەسـەر یەكێكیشـدا چونكه بەكارهاتووه تیایدا، وەك پیاوێك بەژنەكەی دەڵێ: لەكاتی خۆ دەرخستنیدا بۆ پیاوێك: ئەوە خۆت بۆ پیاوان دەردەخەی؟ چ بۆ یەك پیاوبێ یا بۆ كۆمـەڵێك یەكسانه پێناخۆش بوونـی خـۆ بـۆ دەرخستنی بـۆی، هەندێك وتوویانە: جـەمع نـابڕێ بەسـەر یەكدا و بەكاریش نایە تیایدا، بەڵام جەمعێك لەسەر وێنەی ئەم میساله بێ ئەوە لەسەر ژمارەی خۆیەتی، چونكه ئـافرەتێك بۆ یـەك پیـاو خـۆی دەرخـا شتێكی عادەتیشه بۆ چەندەها پیاو خۆی دەردەخا.

(٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە لەفظێكی عام بۆ مەدح بێ یا بۆ ذەم بێ، واتە بۆ یـەكێكیان هێنرابێ قەصدی عمومەكـەی دەكرێ، كـاتێ عـامێكی تـر بـەردەمی نـەگرێ، وڕێگـری نـەبێ كە بـۆ ئـەوە نـەهێنرابێ، چونكـە ئەگـەر بـۆ ئـەوە هـاتبێ لەگـەڵ قـەصدی گشتگیریەكەیدا دژی یـەك نـین، بـەڵام ئەگـەر ئـەو عامـە ڕێـی پێگـرت، لـەوەیدا ڕێـی پێگـیراوە ئـەو عامــە نایگرێتــەوە ، بـۆ ئـەوەی هـەردوكیان كۆبكرێنـەوە، هــەندێك وتوویانە: لەفظێك بۆ مەدح بێ یابۆ ذەم بـێ قەصدی گشتگیری لێناكرێ، چونكە بـۆ گشتگیری نەهێنراوە. (٣)قەولی سێهەم دەڵێ: لەفظێك بۆ مـەدح یا بۆ ذەم معارضـی هەبێ،یانەبێ هەر قەصدی گشتگیری تیا دەكرێ،وەك چۆن ئەگەر بۆ مەدح و ذەم نەبێ هەر بۆعامە، بەڵام لەكاتی معارضەكەدا تەماشای لاوباری تەرجیحەكە دەكرێ، میثـال بۆ عـامێ بۆ مـەدح و ذەم بـێ و معارض نـەبێ : بێگومان چاكە كاران لە جێـی نـەرم ونیان و خۆشدان، وەبەڕاستی خراپەكاران لە ناو ئاگرو زەحمەتدان، (الأبرار والفجّار)

ومعَ المعارضِ ﴿ إلاّ على ازواجِهم او ماملكتْ ايمانُهُم ﴾ فإنَّـهُ قد سيقَ للمدحِ يعمُّ بظاهرِهِ الأختين بملكِ اليمينِ جمعاً، وعارضَهُ في ذلكَ : ﴿ وانْ تجمعوا بينَ الأختينِ ﴾ فإنَّهُ ولم يسقْ للمدحِ شاملٌ لجمعهما بملكِ اليمين فحملُ الأوّل على غيرِ ذلكَ بأنْ لم يردْ تناولَهُ لهُ، او اريدَ ورجّح الثّاني عليهِ بأنّه محرّمٌ(١)

{و}الأصحُّ {تعميم نحو: ﴿ لايستوون ﴾} من قولِه تعالى: ﴿ افمن كان مؤمناً كمن كانَ فاسِقا لايستوون ﴾﴿ لايستوي اصحابُ النّارِ و اصحابُ الجنّةِ ﴾ فهو لينفي جميع وجوه الأستواءِ الممكنِ نفيُها لتضمنِّ الفعلِ المنفيِّ لمصدرِ منكر، وقيلَ: لايعمُّ نظراً الى انّ الأستواءَ المنفي هو الإشتراكُ من بعضِ الوجوهِ، وعلى التعميمِ يُستفادُ من الآيَةِ الأولى: إنّ الفسقَ لايلي عقد النّكاحِ ، ومنَ الثّانيةِ انّ المسلمَ لايُقتلُ بالذّميِّ، وخالفَ في المسألتينِ الحنفيَّة.(٢)

---

بۆ مەدح و ذەمن وعارض ی معارض و بەرهەڵستکارێکیشیان نیە، هەموو چاکەکارو خراپەکارێك دەگرێتەوە، (١)بەلاّم وێنە بۆ ئەوە ، عارض و بەرهەڵستکارێکی لە گەڵدا هەبێ: ئەوانەی کە پارێزگاری عەورەتیان دەکەن جگە بۆ ژن و جاریەکانیان نەبێ ، ئەمە بۆ مەدح هاتووەو هێنراوە، ظاهیرەکەی بەهۆی (ملك اليمين)ەوە دوو خوشك کۆبکرێنەوە لەژێر ئاغایەکدا ئەیگرێتەوە، بەلاّم ئەم ئایەتە بەرهەڵستی ئەکا کە دەفەرموێ: حەرام کراوە لەسەرتان دوو خوشك پێکەوە کۆبکەنەوە واتە نیکاحیان، ئەم ئایەتە بۆ مەدح نەهێنراوە، حەرام کردنەکەی کۆکردنەوەی دوو خوشکیش دەگرێتەوەبە هۆی(ملك اليمين)ەوە، لەبەر ئەوە ئایەتی یەکەم هەر لەئەوەڵەوە وتوویانە: ئەو دوو خوشکە ناگرێتەوەو هەر مەبەستیش نین لە ئایەتەکەدا ، یاخود بڵێن ئایەتی یەکەم ئەیانگرێتەوە، بەلاّم تەرجیحی ئایەتی دووەممان داوە بەسەریا، چونکە حەرام کراوە، قاعیدەش وایە، دەفعی مەفسەدە دەکەوێتە پێش جەلبی مەصلەحەوە.

(٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە: قەصدی گشتگیری ئەکرێ لەوێنەی لایستوون کە خوای گەورە دەفەرموێ: ئایا باوەڕدار وەك کەسێك وایە لە فەرمانی خوا دەرچێ، نابێ، لەهیچ شتێکدا یەکسان نین، یاخود دەفەرموێ: ئەوانەی لە ئاگردان و ئەوانەی لەبەهەشتدان چون یەك نین، ئەوەنەفی هەموو شتێ دەکا کە یەکسان بن بەلاّم شتێ بگونجێ نەفی بکرێ -نەك لەبوون و هەوا هەڵمژین و خواردن دا- چونکە فعلەکە نەفی کراوە (لایستوون) گرتویەتیە خۆی مانای مەصدەرێکی نەکیرە، واتە بەمانای لاإستواء ، لەهیچ شتێکدا یەکسان نین، هەندێکیش وتوویانە نابێ قەصدی عموم و

{و}الأصحُ تعميم نحو: {لا اكلتُ} من قولكَ: واللهِ لا اكلتُ فهو لنفي جميعِ المأكولاتِ بنفي جميعِ افراد الأكلِ المتضمّنِ المتعلّقِ بها، {قيلَ: وإن اكلتُ} فزوجتي طالقٌ مثلاً فهو للمنعِ من جميعِ المأكولاتِ فيصحُ تخصيصُ بعضها في المسألتينِ بالنّيَةِ ويصدُقُ إرادتُهُ وقال ابو حنيفَة: لاتعميمَ فيهما فلا يصحُ التخصيصُ بالنّيَةِ، لأنّ النفي والمنعَ لحقيقةِ الأكلِ وإن لزم منهُ النفي و المنع لجميعِ المأكولاتِ حتّى يحنثَ بواحدٍ منهما إتفاقاً، وإنّما عبَّرَ المصنّف في الثانيَةِ بقيلِ على خلافِ تسويَةِ إبنِ الحاجبِ وغيرِهِ بينهما لما فهمَهُ من انّ عمومَ النَّكرَةِ في سياقِ الشرطِ بدليّ كما تقدَّمَ عنهُ وليسَ الأمرُ كما فهمَ دائماً لما تقدَّمَ من مجيئها للشمول[1]

---

گشتگیریان لێبکرێ، چونکە سەیری ئەوە ئەکرێ کەیە کسان نەبوونە، کە بریتیە لە ئیشتراك بوون لە هەندێك رووەوە لەسەر قەولی ئەوەی کەووتی: قەصدی عموم وگشتگیری دەکرێ ، لەئایەتی یەکەمدا ئەوە وەردەگیرێ: کە فاسق ناتوانێ کچی خۆی مارە بڕێ وەلە ئایەتی دووەمیش ئەوە وەردەگیرێ: کە موسوڵمان ناکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی ذمییەکەوە، بەڵام لەهەردوو مەسئەلەکەدا زانایانی مەزهەبی حەنەفی جیاوازیان نواندووە.

(١)قەولی ئەصەح ئەوەیە: قەصدی عموم و گشتگیری لەوەی کە دەڵێیت: (واللە لااکلتُ) ئەکرێ کەوا بۆ نەفی هەموو ئەوشتانەیە کە ئەخورێن، لەگەڵ نەفی هەموو ئەفرادی خواردن کە لەدوتۆی أکلتُ ، دایەو پەیوەندە بەهەموو ئەفرادەکانەوەیە ، هەندێکیش دەڵێن: ئەگەر بخۆم، ئەو ژنەم تەلاقی کەوتبێ، ئەمیش هەر بۆ گشتگیری ئەبێ کەوابوو شەرطەکەش بۆ قەدەغەکردنی خۆی دەبێ لە هەموو ئەوشتانەی ئەخورێن، کەوابوو دروستە ئەو عامە تایبەتبکرێ بە هەندێکیانەوە لە هەردوو مەسەلەکەدا بەهۆی قەصد و نیەتی خۆیەوە، وبڕوایشی پێدەکرێ لە ویست و نیازەکەیدا. بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێ: لە هەردوکیاندا گشتگیری تێدا نیە، چونکە بۆ جینسە کەوابوو بەهۆی نیەتەوە تایبەت ناکرێ، چونکە نەفیەکەو رێگرتنەکە بۆ حەقیقەتی خواردنەکەیە، هەرچەند لەو نەفیو مەنعەوە لازم دێ نەفیو مەنعی لە هەموو خواردنەکان بکرێ، بایەکێکیشیان بێ هەر سوێنەکەی ئەکەوێ بەڕای هەمووان، بۆ دانەر قەولی دووەمی بەقیل لێدایەوە -بەپێچەوانەی ئیبن الحاجب و غەیری ئەویش کە قەولی یەکەم و دووەمیان بەیەکسان سەیریان کردووە-؟ چونکە لەبەر ئەوەیە وای لێحاڵی بووە کە نەکیرە لەدوای شەرطەوە عموم و گشتگیری بەدەلی هەیە ، چونکە لەپێشەوە رابوورد کەئەوەی لێوە ریوایەت کراوە، لەگەڵ ئەوەش وانیە

{لا المقتضي} بكسرِ الضادِ و هو مالايستـقيمُ من الكلام إلاّ بتقديرِ احدِ امورٍ يسمّى مقتَضى بفتحِ الضّاد، فإنَهُ لايعمُّ جميعها لإنـدفاعِ الـضّرورَةِ بأحدِها ويكونُ مجملاً بينهما يتعيَّنُ بالقرينَةِ، وقيلَ: يعمُّهما حذراً من الإجمالِ مثالُهُ حدثُ مَسند اخي عاصم الآتي في مبحثِ المجمَلِ :{رفعَ عن امّتي الخطأ والنسيانُ} فلوقوعهما لايستقيمُ الكلامُ بدونِ تقديرِ المؤاخذَةِ او الضمانِ و نحوِ ذلكَ فقدرنا المؤاخذَةَ لفهمهما عرفاً من مثلهِ ، وقيلَ يقدَّرُ جميعاً.[1]

{والعطفُ على العام} فإنَهُ لايقتضي العمومَ في المعطوفِ، وقيلَ: لوجوبِ مشارَكةِ المعطوف للمعطوف عليه في الحكمِ و صفتِه[2]

---

کە لێی حاڵی بووە، هەموو کات وانیە ، چونکە لەپێشەوە رابوورد کە: نەکیرە لەدوای شەرطەوە هەندێ جار دێ بۆ شمول و گشتگیری.

(١)بەلاّم عموم و گشتگیری لە موقتەضیدا نیە، کە بریتیە لە رستەیەك بەتەقدیرکردنی شتێك نەبێ راست نەبێتەوە، و پڕاوپڕی واقیع نەبێ، ئەوەش کە تەقدیر ئەکرێ ناوئەبرێ بە مقتضى ، بەفەتحەی ضادەکە، مقتضى یەکە هەموو تەقدیر کراوەکان ناگرێتەوە، -بڵێیت: هەمویان تەقدیر دەکەن- چونکە تەنها بە یەکێکیان پێویستە کە دەرئەچێو نامێنێ ، جا ئەو مقتضیە مجمل ئەبێ و هەموو مقدەراتەکان هەڵئەگرێ هەتا قەرینەیەك دروست ئەبێو موقەدەرەکە دیاری دەکا، هەندێك وتوویانە: بۆ ئەوەی خۆت لە ئیجمال بپارێزی دەڵێن: ئەو مقتضیە هەموویان دەگرێتەوە، نموونەکەشی ئەو فەرمودەیە لەمسندی براکەی عاصمدا و لە مجمل دا دێت و دەفەرموێ: غەڵەت و لەبیرچوونەوە لە ئومەتی من هەڵگیراوە ، لەبەر ئەوەی رۆژانە غەڵەتیش دەکەین و شتیشمان لەبیر دەچێتەوە، ئەم فەرموودەیە بەبێ تەقدیرکردنی وشەی مؤاخذە یا ضمان ، یاخود وێنەی ئەمانە نەبێ رستە راست نابێتەوە لەبەر ئەوە لەم فەرموودەدا وشەی مؤاخذە تەقدیر دەکەین، چونکە عورف لەم نموونانەدا ئەوەی لێوەردەگرێ ، مانای فەرموودەکە وای لێ دێ تۆڵەسەندن لەسەر غەڵەت و لەبیر چوونەوە لەسەر ئوممەتی من لابراوە، هەندێك وتوویانە: هەمویان تەقدیر دەکرێن.

(٢)هەروەها عەطف کردنەوە لەسەر عامێ ئەوە ناخوازێ کە عموم وگشتگیریش لە مەعطوفەکەدا هەبێ، کۆمەڵێك وتوویانە: ئەوە ئەخوازێ، چونکە مەعطوف و مەعطوف علیە واجبە لە حوکم و صیفەتەکەیدا هاوبەش بن.

قلنا في الصفةِ ممنوعٌ مثالُهُ حديثُ ابي داود وغيره: {لايقتلُ مسلمٌ بكافرٍ ولاذو عهدٍ في عهدِهِ}، قيلَ يعني بكافرٍ وخصَّ منهُ غير الحربيّ بالإجماعِ قلنا لاحاجةَ الى ذلك بل يقدَّرُ بحربيٍّ[1] {والفعلُ المثبتُ} بدونِ كانَ {ونحو كان يجمعُ في السَّفرِ} مما إقترنَ بكانَ فلايعمُّ اقسامهُ وقيلَ يعمُّها[2] مثالُ الأوّلِ حديثُ بلال انّ النبيَّ ﷺ صلّى داخلَ الكعبَةِ، رواهُ الشيخان، والثّاني حديثُ انس انّ النبيَّ ﷺ كان يجمعُ بينَ الصّلاتينِ في السَّفرِ، رواهُ البخاري فلايعمُّ الأوّلَ الفرض و النفلَ، ولا الثّاني جمعَ التقديمِ و التأخيرِ إذ لايشهدُ اللّفظُ بأكثرَ من صلاةٍ واحدةٍ و جمعٍ واحد يستحيلُ وقوعُ الصّلاةِ الواحدِ فرضاً و نفلاً و الجمعُ الواحدُ في الوقتينِ و قيلَ: يعمّانِ ماذُكرَ حكمهما لصدقهما بكلّ من قسمي الصّلاة و الجمع[3]

---

(١)ئێمەیش دەڵێین: هاوبەشی مەعطوف بۆ مەعطوف علیە لە صیفەتی حوکمەکەدا قەدەغەیەو ناکرێ، نمونەکەشی ئەو فەرمودەیەی ئەبو داود و غەیری ئەویش ریوایەتی دەکەن دەفەرموێ: موسوڵمان ناکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی کافرێکەوە، خاوەن پەیمانیش ناکوژرێتەوە لەماوەی پەیمانەکەیدا، قیلێکیش وتوویەتی: ئەو خاوەن پەیمانە ناکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی کافرێکەوە، بەڵام بە ئیجماع ئەو کافرە تایبەت کراوە بە کافرێك کە حەربی نەبێ، واتە ذممی بێ، ئێمەیش دەڵێین: پێویس بەو تەقیید و تەخصیصە ناکا بەڵکو تەقدیری وشەی حەربی بۆ دەکرێ واتە :بکافرٍ حربيٍّ. (٢) هەروەها عموم و گشتگیری لە فعلی مثبت دا نیە، بەمەرجێ بەبێ کان بێ، هەروەها عموم و گشتگیری لە وێنەی:(کان یجمعُ فی السّفر) هەموو بەشەکانی کۆکردنەوەی نوێژ ناگرێتەوە.چ نوێژ بە پێش خستن بێ و چ بە دواخراوی بێ، هەندێك وتوویانە هەموو بەشەکانی نوێژ کۆکردنەوە دەگرێتەوە.

(٣)نموونە بۆ فیعلی مثبت بێ(کان): ئەو فەرموودەی بیلال ئەیگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ناو کەعبەدا نوێژی کرد، ئەمە هەموو نوێژێ ناگرێتەوە نموونە بۆ دووەمیش ئەو فەرموودەی ئەنەسە کە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لەسەفەردا دوو نوێژی کۆدەکردەوە، بوخاری ریوایەتی کردووە، کەوابوو فەرموودەی یەکەم نوێژی فەرزو سوننەت ناگرێتەوە، دووەمیش نوێژ پێشخستن و دواخستن ناگرێتەوە، چونکە ئەو لەفظە نوێژێك زیاتر و فەرموودەیەك زیاتر ناگەیەنێ، چونکە مەحاڵە یەك نوێژ فەرزیش بێ سوننەتیش بێ، یا یەك کۆکردنەوەیێك لەیەك کاتدا، هەندێکیش وتوویانە: هەردوو فەرموودەکە گشتگیرن بۆ ئەوانەی باسکران، لەڕووی حوکمەوە، چونکە هەردوو فەرموودەکە هەموو بەشەکانی نوێژو کۆکۆدنەوەی ئەگرێتەوە.

وقدْ تستـعملُ كانَ مع المُضارعِ للتكرارِ، كما في قولِهِ تعالى في قصّةِ إسماعيل ﷺ : ﴿ وكانَ يأمُرُ اهلَهُ بالصَّلاةِ و الـــزَّكاةِ ﴾ و قولهم كـــان حاتم يكرمُ الضّيفَ، وعلى ذلك جرى العرفُ.[1] {ولا المعلّقُ بعلّةٍ} فإنَّهُ لايعـمُّ كـلَّ محـلٍّ وجـدتْ فـيه العـــلّةُ، {لفـــظاً لكن} يعمُّهُ {قياساً}، وقيلَ: يعمُّهُ لفظاً، مثالُهُ ان يقـولَ الشـارعُ: حرِّمـتِ الخمرُ لإسكارهـــا، فلا يعمُّ كلَّ مسكرٍ لفظاً، وقيل: يعمُّـهُ لذكرِ العلّـةِ، فكأنَّـهُ قـالَ: حـرِّمتِ المسـكرُ[2] {خلافاً لزاعمـي ذلـك} اي العمـوم في المـقتضي و مابـعدَهُ كـما تـقدَّمَ.[3] {و} الأصحُّ {انّ ترك الإستفصالِ} في حكايةِ الحـــالِ {ينزَّلُ منزلَةَ العـمومِ}في المقالِ[4]

---

(١)کەم جاریٚ لەفظی کان لەگەڵ فیعلی مضارعدا بەکاردیٚ بۆ دووپات بوونەوەی کارەکە ، وەك خوای گەورە لەبارەی سەرگوزەشتەی ئیسماعیلەوە دەفەرمویٚ: ﴿ وكـانَ يأمُرُ اهلَـهُ بالصَّلاةِ و الزّكـاةِ ﴾ فەرمانی دەکرد بەئەهلەکەی کە نویٚژ بکەن و زەکات بدەن، ئەمە تیکرارو دووبارە بوونەوەی تیٚدایە نەك بەهۆی کانەکەوە بەڵکو بەهۆی فیعلە مضارعەکـەوە، چونکـە بـەردەوام تـازە بوونـەوە ئەگەیـەنیٚ -واتـە دووبـارە بوونـەوەی فیعـل و کـار لـە چـەند کـاتیچکدا عمومـی فیعلـی مثبـت ناگەیـەنیٚ، ئیٚمـە مەبەستمان ئەوەیە: کە فیعلی مثبت هەموو بەشەکانی ئەو فیعلە ناگریٚتەوە- یـاخود وەك دەڵیٚـن: حاتـەم ریٚــزی لـە میــوان دەگـرت، فیعلەکـە تیکـراری دەگەیــەنیٚ نــەك لەفظی(کان)، عورف لەسەر ئەو شیٚوازە رۆشتووە.

(٢)هەروەها عموم و گشتگیری لە حوکمیٚکدا نیـە کە بەسرابیٚ بە هـۆو عیلەتیٚکـەوە، ئـەوە ئـەو حوکمـە جیٚیـەك ناگریٚتـەوە ئـەو علـەت و هۆیـەی تیٚدابـیٚ، لـەرووی لەفظـەوە نایگریٚتـەوە، بـەڵکو لـەروی قیاسـەوە ئەیگریٚتـەوە، هــەندیٚکیش وتوویانـە: لــەروی لەفظەوە ئەیگریٚتەوە، نموونەی: وەك ئـەوەی گریمـان شارع بفـەرمویٚ: عـەرەقم حـەرام کردوە لەبەر ئەوەی سەرخۆشکەرە،لەروی لەفظەوە هەموو سەرخۆشکەریٚك ناگریٚتـەوە ، کۆمـەڵیٚك دەڵیٚـن: لەبـەر ئـەوەی علەتەکـەی بـاس کـردووە دەیگریٚتـەوە، کـەوابوو وەك ئەوە وایە وتبیٚتی: سەرخۆشکەرم حەرام کردووە.

(٣) ئـەوەی کـە وتمـان: عمـوم و گشـتگیری لـە مقتضـی و ئـەوانی دوای ئەودانیـە، جیـاوازو پیٚەوانەیە بۆ ئەوانەی کـەبیٚ بەڵگـە وتــوویانە: عمومیـان تیٚـدا هەیـە، وەك پیٚشتر رابورد لەشـەرحەکەدا، بـەڵام دانـەر لـە مەتنەکـەدا باسـی نـەکردووە. (٤)قـەولی ئەصـەح ئەوەیـە داوانـەکردنی دریٚژەپیٚـدان و رونکردنـەوەی هــەموو شـیٚوازەکان لـە گیٚرانەوەی حاڵی زەلامیٚکدا ئەوە لەجیٚی عموم و گشتگیری دائەنریٚ لە لەفظ دا .

كما في قولهِﷺ لغيلان بن سلمة الثقفي وقدْ أسلمَ على عشر نسوة: {أمسك اربعاً و فارق سائرهنَّ}رواهُ الشّافعيّ و غيرَهُ، فإنَهُ ﷺ لمْ يستفصلْ: هلْ تزوّجهنَّ معاً او مرتباً. فلولا انّ الحكمَ يعمُّ الحالتين لما أطلقَ الكلام لإمتناعِ الإطلاقِ في موضعِ التفصيلِ المحتاجِ اليهِ، وقيلَ: لاينزَّل منزلَةَ العموم، بل يكونُ الكلامُ مجملاً، و سيأتي تأويلُ الحنفيَّة:امسكْ بابتدئ نكاح اربعٍ منهنّ في المعيّة واستمرَّ على الأربع الأوّل في الترتيب[1]

{و}الأصحُّ {انّ نحو: ﴿ ياايها النبيّ} إتقِّ اللهَ ﴾ ﴿ و ياايها المزّمِلْ ﴾ {لايتناولُ الأمّة} من حيثُ الحكم لإختصا الصيغة ، وقيلَ يتناولُهم. لأنّ امرَ القدوَة امرٌ لإتّباعه معه عرفاً، كما في امرِ السّلطانِ الأمير بفتح بلدٍ او ردِّ العدوِّ واجيبَ بأنّ هذا فيما يتوقّفُ المأمورُ بهِ على المشاركَة، وما نحنُ فيهِ ليسَ كذلك[2]

(١)وەك پێغەمبەرﷺ فەرمووی بە غیلانی کوڕی سەلەمەی ثەقەفی لە کاتێکدا موسوڵمان بوو دە ژن لەژێر نیکاحیدا بوون: دەست بگرە بە چواریانەوە ئەوانی‌تر جیابکەرەوە، شافعی‌و غەیری ئەویش ریوایەتیان کردووە، چونکە لەبەر ئەوەی ·٢ پرسیاری لێنەکرد: ئایا هەر دەکەی بەیەك جار مارە بریون ، یاخود یەك لەدوای یەك مارەی کردون؟ ئەگەر حوکمەکەی پێغەمبەر ﷺ هەردوو حاڵەتەکە نەگرێتەوە، واتە بە مطلقی ئەو کەلامانەی نەئەفەرموو، چونکە گونجاونیە، کەلامی مطلق بەکاربێ لە جێیەکدا کە پێویستی بە درێژەپێدان و دیاری کردنی حوکمی هەموو بەشەکانی، هەندێکیش وتوویانە: ئەو حاڵە لەجێی عموم و گشتگیری لەفظدا دانانرێ، بەڵکو کەلامەکە مجمل دەبێ، لەمەودوا دێ کە حەنەفیەکان وشەی امسك ، تەئویل دەکەن بە: إبتدا ، واتە ئەگە هەموویان بەیەك جار مارەی بریبون ئێستە باچواریان مارە ببڕێ ، وەئەگەر بەدوا هەردەکەی هێنابوو ، ئەوە امسك، واتە: بەردەوام بە لەسەر چواری یەکەمیان ، کەلە پێشەوە مارەی بریبون.

(٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە کە بانگەوازێك بکرێ بۆ پێغەمبەر ﷺ ، وەك بەجێ‌هێنانی فەرمان و شەو نوێژ کردن، ئەو بانگەوازە ئوممەتەکەی ناگرێتەوەو لەڕوی حوکمەوە- بێگومان لەروی لەفظەوە نایگرێتەوە ، چونکە النبیّ دەفەرموێ- چونکە صیغەکە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، هەندێکیش دەڵێن: ئوممەتەکەشی دەگرێتەوە، چونکە فەرمان بەسەرکردە فەرمانیشە بۆ ئەوانەی هان لەگەڵیا لەروی عورف و عادەتەوە،وەك فەرمانی سوڵتان دەرئەچێ بۆ ئەمیرێك بۆ ئەوەی شارێك رزگاربکا یا خود بەرپەرچی دوژمنێك بداتەوە، دەئەو ئەمرە ئەمریشە بۆ سەربازەکانی، وەڵام دراوەتەوە، ئەوە بۆ شتێك دەبێ کە فەرانەکە بەبێ هاوکاری خەڵك جێبەجێ نەکرێ، بەڵام ئەمەی ئێرە کە

{و} الأصحُ ان {نحو: ﴿ ياايها النّاسُ ﴾ يشملُ الرسولﷺ ، وإنْ إقترنَ ب(قلْ)} وقيلَ: لايشملُهُ مطلقاً، لأنّهُ ورد على لسانه للتبليغ لغيره، {وثالثها التفصيلُ} إنْ إقترنَ ب(قلْ) فلا يشملُهُ لظهورهِ في التّبليغ ، وإلاّ فيشملُه"[1]

{و}الأصحُ {انّهُ} اي نحو: ﴿ ياايها النّاسُ ﴾ {يعمُ العبدَ}، وقيلَ لايعمُّهُ لصرف منافعهِ الى سيِّدهِ، شرعاً قلنا في غيرِ اوقاتِ ضيقِ العبادات. {والكافرَ} و قيلَ لابناء على عدم تكليفهِ بالفروع ، {ويتناولُ الموجودينَ} وقتَ ورودهِ {دونَ من بعدَهم} وقيلَ: يتناولهم أيضاً لمساواتهم للموجودين في حكمه إجماعاً. قلنا بدليل آخر وهو مستند الإجماع لامنه"[2] {و}الأصحُ {أنّ (منْ) الشرطيَة تتناولُ الإناثَ} وقيلَ تختصّ بالذكور[3]

---

شەونوێژ و لەخوا ترسانە بەیەك كەس دەكرێ ، پێویستی بەیارمەتی خەڵك نیە بۆ جێبەجێ كردنی. (١)قەولی ئەصەح ئەوەیە: كە نموونەی ئەی خەڵكینە پێغەمبەریش دەگرێتەوە ، هەرچەند صیغەی (قُلْ) بلێیشی لەگەڵدابێ، كۆمەڵێك دەڵێن: (قُلْ) ی لەگەڵ بێ یان نەبێ هەر پێغەمبەرﷺ ناگرێتەوە ، چونكە ئەو بانگەوازە لەسەر زاری ئەوەوەیە، بۆ گەیاندنی بەغەیری خۆی،قەولی سێهەم دەڵێ: درێژەپێدانی ئەوێ ، ئەگەر (قُلْ) ی لەگەڵ بوو ئەوە پێغەمبەرﷺ ناگرێتەوە،چونكە دیارە (قُلْ) بۆ گەیاندنە، وەئەگەر (قُلْ)ی لەگەڵ نەبێ ئەوە پێغەمبەرﷺ ئەگرێتەوە.

(٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە كە نموونەی: ﴿ یاایها النّاس ﴾ بەندەش دەگرێتەوە، كۆمەڵێك وتوویانە نایگرێتەوە، چونكە لەروی شەرعەوە هەرچی قازانج و سودی هەیە، ئەبێ بەرەو روی ئاغاكەی بكرێتەوە، ئێمەیش دەڵێین: جگە لەو كاتانەی پەرستشی خوای تیادا دەكرێ، وەهەروەها كافریش دەگرێتەوە، كۆمەڵێك وتوویانە: نەخێر كافر ناگرێتەوە،ئەم قیلە لەسەر ئەوە بەرپا بووە كە كافر تەكلیفی فەرعی ئیسلامی لێناكرێ، ئەو بانگەوازە تەنها ئەوانە ئەگرێتەوە لەكاتی دابەزیندا هەبوون، ئەو خەڵكانە ناگرێتەوە، دوای ئەوان بوون كۆمەڵێك وتوویانە: ئەوانیش دەگرێتەوە، چونكە بەبەڵگەی ئیجماع ئەمانیش یەكسانن لەگەڵ ئەواندا لە حوكمی ئەو بانگەوازەدا، ئێمەیش دەڵێین: ئەوانیش بەبەڵگەیەكی تر خودی ئەوحوكمەیان بەسەردا دەدرێ، -نەك ئەو نیدایە-كە ئەو بەڵگەش موستەنەدی ئەو ئیجماعەیە نەك یەكسانی بونەكەیان لە﴿ یاایها النّاس ﴾ ەكەوە دروست بوبێ.

(٣)قەولی ئەصەح ئەوەیە كە(مَنْ)ی شەرطیە ژنانیش دەگرێتەوە، هەندێ وتوویانە بەس تایبەتە بەنێرینەوە،

وعلى ذلك لو نظرت إمراةٌ في بيتِ اجنبيّ جاز رميُها على الأصحِّ ، لحديثِ مسلم (منْ تطلع في بيتِ قومِ بغيرِ إذنهمْ فقدْ حلّ لهم انْ يفقأوا عينهُ) وقيلَ: لايجوزُ لأنّ المـرأةَ لايستترُ منها.[1] {و}الأصحُّ {انّ جمعَ المذكرِ السّالم} كالمسلمينَ {لايدخُلُ فيه النّساء ظاهراً} و انّها يدخلنَ بقرينةٍ تغليباً للذكور، قيلَ: يدخُلنَ فيهِ ظاهراً لأنّهُ لمّا كثُرَ في الشرعِ مشاركتُهنَّ للذكورِ في الأحكام لايقصدُ الشّارعُ بخطابِ الذّكورِ قصرَ الأحكام عليهم[2] {و}الأصحُّ {انّ خطابَ الواحدِ} يحكُمُ في مسألةٍ {لايتعدّاهُ} الى غيرِه، {وقيلَ يعمُّ} غيرَهُ {عادةً} لجريانِ عادةِ النّاسِ بخطابِ الواحدِ وإرادةِ الجمعِ فيما يتشاركونَ فيه، قلنا مجازٌ يحتاجُ الى القرينة.[3] {و}الأصحُّ {انّ خطابَ القرآنِ و الحديثِ بياأهلَ الكتابِ} نحو قولِه: ﴿ ياأهلَ الكتابِ لاتغلوا في دينكم ﴾ {لايشملُ الأمّةَ} و قيلَ: يشملُهم فيما يشاركونَ فيهِ {و} الأصحّ {انّ المخاطِبَ} بكسرِ الطاءِ {داخلٌ في عموم خطابِه إن كان خبراً}[4]

---

(١)لەسەر ئەوەیان کە بۆ هەردووکیان ئەبێ، ئەگەر ژنێك بڕوانێ بۆ ماڵێکی بێگانە دروستە تیری لێبگیرێ، لەسەر قەولی ئەصەح لەبەر ئەوە فەرموودەی مسلم ریوایەتی دەکا: کەسێ بڕوانێ بۆ ناو هۆدەی خەڵك بەبێ مۆڵەتی خۆیان، ئەوە حەڵاڵە بۆیان چاوی کوێرکەن، چونکە دەفەرموێ: (منْ) ژنیش دەگرێتەوە، هەندێ وتوویانە: ئەگەر ژن بێ دروست نیە چاوی کوێر بکرێ، چونکە وەك پیاو شتی لێ ناشاررێتەوە.

(٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە کە جەمعی موزەکەری سالم وەك وشەی:مسلمین، ئافرەتان ناگرێتەوە و ناچنە ناو ئەو وشە بەڕواڵەتی وشەکە، بەڵام ئەگەر قەرینە هەبوو ئەچنە ناو ئەو وشە، بەڵام ناونیشانی نێرینەی پێوەنراوە لەبەر زۆرکردنی پیاوان و خوێندنەوەی ژنانیش لە ریز ئەواندا، هەندێك وتوویانە: رواڵەتی وشەکەش هەر ئەیانگرێتەوە، چونکە کاتێ کە هاریکاری ژنان بۆ پیاوان لە ئەحکامدا زۆرە، ئیتر شارع کە ناونیشانی نێرینە لە گفتوگۆدا بەکار دەهێنێ، مەبەست نیە کە حوکمەکان تەنها بۆ پیاوانە. (٣)قەولی ئەصەح ئەوەیە کە گفتوگۆ لەگەڵ تاکێکدا لە بابەتێکدا بەهەر حوکمێك هەبێ تەنها بۆ ئەو تاکەیە، جگە لەو ناگرێتەوە، هەندێك وتوویانە: لە ڕووی عادەتەوە غەیری ئەویش دەگرێتەوە ئێمەیش دەڵێین:بەکارهێنانی بەغەیری ئەو تاکە ئەوەمەجازە و پێویستی بەقەرینەهەیە. (٤)قەولی ئەصەح ئەوەیە: کە گفتوگۆی قورئان وفەرمووده بە(یاأهل الکتاب...)ئەی خاوەن پەیامەکان لە ئایینەکاندا زیادەڕەوی مەکەن، ئەوحوکمە ئوممەتی محمد ناگرێتەوە، هەندێك وتوو یانە: ئەیان گرێتەوە، ئەگەر لەو شتانەدا بێ کە هاوبەشن تێیدا. قەولی ئەصەح

نحو: ﴿ واللهُ بكلِّ شيئٍ عليم ﴾ وهو سبحانَهُ وتعالى عالِـمٌ بذاتِه و صفاتِه {لا امراً} كقولِ السيِّدِ لعبدِه وقدْ احسنَ إليه ، منْ احسَنَ إليكَ فأكرِمْهُ لبعدِ أن يريدَ الآمرُ نفسَهُ بخلافِ المخبِرِ، وقيلَ: يدخُلُ مطلقاً نظراً لظاهرِ اللّفظِ، وقيلَ: لايدخُلُ مطلقاً لبعدِ أن يريدَ المخاطَبُ نفسَهُ إلاّ بقرينةٍ، وقالَ: النّووي: في كتاب الطّلاقِ في الرّوضَةِ انّهُ الأصحُّ عندَ اصحابنا في الأصولِ، وصحَّحَ المصنِّف الدخولَ في الأمرِ في مبحَثِه بحسبِ ما ظهرَ لهُ من الموضعينِ[1] {و}الأصحّ {انّ نحو:﴿ خذْ من اموالِهم ﴾ يقتضي الأخذَ من كلِّ نوعٍ} وقيلَ: لا ، بل يتمثّلُ بالأخذِ من نوعٍ واحدٍ ، {وتوقفَ الآمدي} عن ترجيحِ واحدٍ من القولينِ ، والأوّلُ ناظرٌ الى انّ المعنى من جميعِ الأموالِ ، والثّاني الى انّهُ من مجموعِها[2]

---

ئەوەیە: کە قسەکەر ئەچێتە ناو گشتگیری گفتگۆکەی خۆیەوە ئەگەر کەلامەکە خەبەرو هەواڵ دان بێ(١)وەك: خوا بەهەموو شتێك تەواو ئاگادارە، لەم هەواڵەدا خوا خۆیشی بەردەکەوێ، واتە خوا زانایە بە زات و صیفاتی خۆیشی، چونکە ئەویش شتە، بەڵام ئەگەر کەلامەکەی ئەمرو فەرمان بێ نایگرێتەوە، ئاغایەك بەبەندەکەی دەڵێ: لەکاتی چاکە لەگەڵ کردنیدا، هەرکەس چاکەی لەگەڵ کردی تۆیش ڕێزی لێبگرە، دەئەمە دوورە فەرماندەکە کە مەبەستی خۆی هەبێ، بەڵام هەواڵدەر جیاوازە لەگەڵیدا، کۆمەڵێك وتوویانە: فەرمان بێ یاهەواڵ بێ هەر دەیگرێتەوە، چونکە لە لەفظەکەوە دیارە، کۆمەڵێکش وتوویانە: هەرکامیان بێ هەر نایگرێتەوە، چونکە دوورە قسەکەرەکە خۆی مەبەست بێ بەقەرینە نەبێ، نەوەوی لەبابی طەلاقدا لە کتێبی (الروضة)دا وتوویەتی: بەلای هاوەڵانی ئێمەوە لە ئوصولدا ئەو قیلە ئەصەحە، دانەریش لەباسی ئەمردا ئەم قیلەی بە صەحیح داناوە، -هەرچەند لێرە بەنەقلێکی زۆر لاواز داینـاوە- بەڵام لە هەردوو بابەتەکەدا، واتە لەباسی عام و باسی ئەمردا، بەگوێرەی ئەوە دانەر قسەی کردووە کەوای زانیوە و بۆی دەرکەوتووە.

(٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە کە نموونەی:﴿ خذْ من اموالِهم ﴾ جەمعی معرف بە ئیضافە ئەوە ئەمرە بۆ وەرگرتنی زەکات لە هەموو جۆرە مالێك ، هەندێك وتوویانە نەخێر هەموو جۆرە ماڵێك ناگرێتەوە بەڵکو ئەگەر تەنها لەیەك جۆر ماڵ زەکاتی وەرگرتبێ ئەوە فەرمانەکەی جێبەجێ کردووە، ئامیدی هەڵوێستەی کردووە لەبارەی زۆر بەچاك زانینی یەکێك لەو دوو قەولە، قەولی یەکەمیان سەیری ئەوە ئەکا ماناکەی ئاوایە: من جميعِ الأموالِ، لە هەموو ماڵێك، بەڵام دووەمیان بۆ ئەوە ئەڕوانێ کە ماناکەی: من مجموعها ،واتە لە کۆی هەموو شتێك هەندێکی وەرگرە.

## ناوەڕۆك